# کوردو سەلجوقییەکان

## لێکۆڵینەوەیەک لە پەیوەندییە سیاسییەکانیان

(٤٢٠-٥٢١ک/ ١٠٢٩-١١٢٧ز)

**د. نیشتمان بەشیر محەمەد**

**وەرگێڕانی**

**ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا**



تێبینی: ئەم کتێبە لە بنجدا:
نامەیەکە وەک بەشێک لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی بڕوانامەی (دکتۆرا) لە (مێژووی ئیسلامی)، پێشکەشی ئەنجوومەنی کۆلێژی ئادابی – زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر کراوە.


**ناوی کتێب: کورد و سەلجوقییەکان**

- نووسینی: نیشتمانی بەشیر محەمەد
- وەرگێڕانی: ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: بەشدار نوری
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: ١٢٢
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٧٥ – (١٧٨)





دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی
www.mukiryani.com
asokareem@maktoob.com
Tel: 2260311

# ناوەڕۆک

## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

## پێشدەستی جوگرافی و مێژوویی

**یەکەم: پێشدەستی جوگرافی:**

کورد بە (یەکێک) لەو میللەتانە دەژمێردرێت، کە هەر لە چاخە کۆنەکانەوە، پێکهاتەی دانیشتووانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی پێکهێناوە، بەشداری کاریگەریشی لەو رووداوە سیاسییانەدا کردووە، کە بەسەر ناوچەکەدا هاتوون، ناوچە چیا سەختەکانی نێوان بانەکانی ئێرانی رۆژئاواو، وڵاتی نێوان دوو زێیەکانی بە وڵاتی خۆی گرتووە.

وڵاتی کورد، واتە (کوردستان)[١]، لە ماوەی چاخە یەکەمەکانی ئیسلام بەناوێکی نەتەوەیی یەکگیرو گشتگیر بۆ هەموو بەشەکانی نەناسراوە، بەڵکو بەناوی ئەو هەرێمە کارگێڕییانەی ناسراوە، کە بەسەریاندا دابەش دەبوو[٢].

لە ماوەی زەمەنی لێکۆڵینەوەکە – چەرخەکانی پێنجەم وشەشەمی کۆچی/ یانزەو دوانزەی زایینی – وڵاتی کورد بەسەر ئەم هەرێمانەی خوارەوەدا دابەشبووە:

١– هەرێمی چیاکان (الجبال)
٢– هەرێمی جەزیرەی فوراتی
٣– هەرێمی ئازەربێجان
٤– هەرێمی ئەرمینیا
٥– هەرێمی لوڕ (لوڕستان)
٦– هەرێمی شەهرەزوور

ئەمەو لەگەڵ هەندێ هۆزو تیرەو کۆمەڵەی کوردی دیکە، کە لە هەرێم و شوێنە پەرشوبڵاوەکاندا، لە هەرێمی فارس و خوزستان و ئێران و وڵاتی شامدا، بڵاوو نیشتەجێ ببوون[٣].

ژمارەیەک لە لێکۆڵەرەوان لەنامە زانکۆیی یەکانیان مێژووی کوردی ئەو هەرێمانەیان خستۆتە بەرباس، گرنگترینی ئەو لێکۆڵینەوانەش بریتینییەلە: نامە ماجستێرییەکەی



(حیسامەددین نەقشبەندی)ی تایبەت بەکورد لە (دینەوەرو شەهرەزوور)[٤]و، نامە دکتۆراییەکەی لە بارەی هەرێمی (ئازەربێجان)و[٥]، لێکۆڵینەوەکەی (فائیزە محەمەد عیززەت) لە بارەی کورد لە جەزیرەی (فوراتی و شارەزوور)[٦]. لێکۆڵینەوەکەی (ئیسماعیل شوکر رەسول) لە بارەی میرنشینی شەدادی لە هەرێمی ئاران[٧].. لێکۆڵینەوەکەی (سەلاحەددین ئەمین تەها) لە بارەی ئەرمینیا[٨] لێکۆڵینەوەی ماجستێری (رەمەزان شەریف) لەسەر لوڕستانی گەورەو[٩]، چەندین لێکۆڵینەوەی تریش[١٠].

ئەم لێکۆڵەرەوانە سنوورە کارگێڕییەکانی هەرێمە کوردییەکانیان بەدرێژی دەست نیشانکردووە، بۆیە پێویست ناکات ئەوەی نووسیویانە دووبارە بکرێتەوەو، تەنیا بەکورتی شتێک لەم بابەتە دەخەینەڕو، لەگەڵ ئاماژەدان، بەوەی کەوا سەلجوقییەکان هەندێ گۆڕانیان بەسەر نەخشە کارگێڕییەکانی هەرێمەکانی دەوڵەتی عەباسیدا هێناوە[١١].

هەروەها باس لە هەندێ مێژوونووس و شارناسی موسڵمان دەکەین، کە لە کتێبەکانیاندا تارادەیەک بەدرێژی ئاماژەیان بۆ هەرێمە کوردییەکان و هۆزە تیا نیشتەجێبووەکانیان کردووە[١٢]، ئەوەی تایبەتە بەهەرێمی چیاکان (الجبال)[١٣] لە ماوەی چاخە ئیسلامییەکانەوە، بەشەکانی رۆژئاواو، باکووری رۆژئاوای وڵاتی فارس (ئێرانی ئێستا)ی دەگرتەوە[١٤]، هەروەها بەشەکانی ناوەڕاست و رۆژئاوای بەشێکی دی لە وڵاتی کوردی پێکدێناو (جیا لە هەرێمی چیاکان)، ئەو ناوچانە وەکو هەرێمێک، بە گەلێ ناوی ترەوە، وەکو وڵاتی (پەهلەوی)یەکان و[١٥]، عێراقی عەجەمی[١٦] دەناسرا، کە زاراوەی دووەم (عێراقی عەجەمی) لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا داهێنرا، ئەمەش وەکو جیاکەرەوەیەک بۆی لە (عێراقی عەرەبی).. (یاقوتی حەمەوی) لەم بارەیەوە دەڵێت: (ئەو بۆ ئەو ناوە بنچینەیەکی کۆنی نەدۆزیتەوە، جەختیشی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە ئەم ناوە هەڵەیە بخرێتە سەر هەرێمەکە)[١٧]، لەگەڵ ئەوەشدا ناوی چیاکان (الجبال) لە لایەن شارناسەکانەوە زۆرتر مایەوەو بەکارهێنرا[١٨].

کورد لەو هەرێمەدا هەر لەسەردەمە دێرینەکان و لە کۆنەوە، نیشتەجێ ببوون، چونکە وەکو ئاشکرایە، چیاکانی زاگرۆس لە کۆندا لانەی ژمارەیەک میللەت و هۆزی وابوون کە پەیوەندییەکی بەتین بە کوردیانی دەبەستنەوە.

بەدرێژایی چاخی ئیسلامی، کورد ڕەگەزێکی مرۆیی گرنگیان پێکهێناوە، لە ڕەگەزەکانی دانیشتووانی چیاکان، لە ماوەی بزوتنەوەی فتوحاتی ئیسلامی بۆ ناوچەکە، ناویان هاتووە، لەو ڕاستییە مێژووییانەی لە بارەشیانەوە هەیە، ئەوان چیاکانیان بەماڵی خۆیان دادەنا، ئەوەندەش بەسە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە (یەعقوبی) (چیاکانی بەماڵی کوردە دڵڕەقەکان)[19] داناوە، (ابن حوقل)یش چیاکانی بە (هەواری زستانەی کوردو هاوینە هەوارەکانیان) داناوە[20].

سنووری هەرێمی چیاکان لەلایەن (ابن فضل الله العمري) کە لە (٧٤٩ک/ ١٣٤٨ز) کۆچی دوایی کردووە، زۆر فراوانتر بووەو چەمکەکەی گۆڕاوە، چونکە لای ئەو هەرێمی چیاکان (الجبال) زۆرینەی وڵاتی کورد دەگرێتەوەو، ناوی دەنێت (چیاکانی کورد)، بیست شوێنی سەر بەو هەرێمەش دەژمێرێت[21].

لەو ماوە زەمەنییەش، کە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەیگرێتەوە، بوونی کورد چڕ بۆتەوە لەو شارانەی دەکەونە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، ئەوانەش شاری کوردین، گرنگترینیان (هەمەدان[22]و نەهاوەند[23]و دینەوەر[24]و قرمسین[25] (کرمانشای ئێستا)و ماسبزان و سیروان و حەلوان و سیسر[26]و هی دیکە).

لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکانیشدا، لە ماوەی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینیش، دوو میرنشینی کوردی گەورە دروست بوون، هۆزی (بەرزەکانی) میرنشینی (حەسنەوییە)یان لە دەوروبەری ساڵی (٤٣٨ک/ ٩٥٩ز) دامەزراندو هۆزی (شازنجانی)ش میرنشینی (بەنی عەنناز)یان لە ساڵی (٣٨١ک/ ٩٩١ز) دامەزراند[27].

لەو هەرێمانەی دیکە، کە هەر لە کۆنەوە کوردیان تیادانیشتووە، هەرێمی جەزیرەی فوراتییە، بەواتا: ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان هەردوو ڕووبارەکانی دیجلەو فورات[28]، ئەم ناوچانە هەروەها بە (ئاقور)[29] و (ئارام نەهرایم)یش ناسراون[30]، بەڵام زاراوەی جەزیرە وەکو ناوێکی ڕەسمی زیاتر لە دانراوەکانی مێژوونووسان و شارناسان بەکارهێنراوە.

ئەوساکە هەرێمی (جەزیرە)، ناوچەیەکی فراوانی دەگرتەوە، هەندێ لە شارناسان چەندین شاری دیکەیان خستە سەر، چونکە زۆر لەو هەرێمە نزیک بوون[31].



دەستنیشانکردنی سنوورەکانی باکوری هەرێمی جەزیرەی فوراتی، لە بۆ شارناس و گەڕیدە موسڵمانەکان ئاسان نەبووە، چونکە دەکەوتنە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی (بیزەنتی)ی دوژمن بە دەوڵەتی ئیسلامی، بۆیە سنوورەکانی باکووری ئەو هەرێمە چەسپاو نەبووە، بەڵکو هەمیشە ئەگەری ئەوە هەبووە بچوک بێتەوە، یان فراوانتر ببێت، ئەمەش بەپێی ئەو دەسەڵاتە سەربازییەی هەریەکە لە دەوڵەتی ئیسلامی و بیزەنتی هەیانبووە[32].

بەڵام سنوورەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی جەزیرە، ڕوونبووەو جیاوازییەکی ئەوتۆی شیاوی باس لەسەریان، لە نێوان شارناس و گەڕیدەکان نەبووە، چونکە هەر دوو ڕووبارەکانی دیجلەو فورات دوو سنووری سروشتی بوون بۆی[33]، دەشکرێت ڕایە دژبەیەکەکان لە بارەی سنوورەکانی باشوری جەزیرە لەوەدا ڕێک بخەین، کە بڵێین: هێڵە تراویلکەییەکەی نێوان شارەکانی تکریت و هیت، هێڵی لێکجیاکەرەوەی نێوان هەرێمی جەزیرە لە باکوورو هەرێمی عێراق بووە لە باشوور[34]، دەشکرێت چیای بارما (حەمرین)ی هەڵکەوتوو لە دوایین سنوورەکانی جەزیرە لە باشوور، بەدوا خاڵی ناوچە کوردییەکاندا دابنێین لە عێراق، ئەو کێوە (ئیبن و خەلدون) ناوی دەنێت (چیای کوردان)[35]، لەبەر زۆری ئەو کوردانەی تیایدا نیشتەجێبوونە، هەروەها زیاد لەوەش دەڵێت، ئەم چیایە بە(ماڵی کوردان)[36] دادەنرێت.

کورد بەدانیشتوانە بنجی و کۆنەکانی هەرێمی جەزیرە دەژمێردرێن، چونکە هەر لە کۆنەوە، لە چاخە دێرینەکاندا تیایدا نیشتەجێ بوونە[37]، ئەو ناوچانەش کە کورد تیای ژیاون، بەناوی کاردۆخیا (Kardochia)، یان وڵاتی کاردۆخییەکان دەناسرا[38]، لێرەدا یەک لە لێکۆڵەرەوان وای دەبینێت، کە بەکارهێنانی وەکو ئەو زاراوانە، کە نزیک و نیمچە لێکچوون لەگەڵ ناوی کورد، بەسەر باکووری جەزیرەو لە ماوە زەمەنییە لێکجیاکان، هەروا بێ هودەو، بەڕێکەوت نەبووە، بەڵکو کە بەسەریدا بڕاوە، بۆ گوزارشتدان بووە لە دانیشتوانە کوردەکەی[39].. (مینۆرسکی)ش بۆ ئەوە دەچێت کە: ناوچەی(بهتان) بۆتان لە باکوری جەزیرە، بە وڵاتی دایک دادەنرێت بۆ کورد[40].

هۆزە کوردەکان لەسەرجەم ناوچەکانی جەزیرەی فورات نیشتەجێ بوونە، بەتایبەت لە بەشەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی و هەروەهاش ناوچەکانی درێژەوە بوو لەگەڵ ڕووباری

دیجلە[٤١]، کە ئەم ناوچانە، هەر لە کۆنەوە بە شوێنەکانی نیشتەجێبوونی کورد دەژمێردرێن.. گوتەکەی (هەمەزانی)ی کە لە (٣٣٤ک/ ٩٤٦ز) کۆچی دوایی کردووە ئەوە دەگەیێنت، کە: دانیشتوانی ناوچەکانی نێوان چیای جودی و ئەرمێنیا، هەر بەتەنیا کوردن[٤٢]، ئەمە بەکۆ لەگەڵ بەشەکانی باشوری هاوسنوور لەگەڵ هەرێمی عێراق و لەسەر کەناری ڕۆژهەلاتی دیجلەش، هەروەها کوردەکانی (دەنبەلی) لە دەوروبەری مووسڵدا نیشتەجێ بوونە[٤٣]، (ماڕانی)یەکانیش، کە یەک لە تیرە هەزبانییەکانن لە مێرگەکانی باشووری (مووسڵ)دا نیشتەجێ بوون[٤٤].

لە گرنگترین هۆزو تایەفەی کوردی دانیشتووش تیایدا (جۆلەمێرگی[٤٥]و داسنی[٤٦] و هەکاری[٤٧]و حەمیدی [٤٨]و حەسەنیە[٤٩]و بەختییە[٥٠]و مەحرانیەو کەیکان وجورقان و مارانی و دەنبەلی و بەشنەوییە و هەزبانییەو ماربەختستییە و شامییە)ن[٥١].

بەلآم دیارترین شارەکانی هەرێم، کە کورد زۆرینەی دانیشتووانەکەی پێکهێناوە. (میا+ فارقین[٥٢]و ئامەد[٥٣]و ئیبن و عومەر[٥٤]و کیفا[٥٥]و ماردین[٥٦]و ئەربل و ئەرزن وعەقرەو سنجارو حەسنیە)ن[٥٧].

هەرچی تایبەت بە ئازەربێجانیشەوەیە[٥٨]، ئەوە یەک لەو هەرێمانەبووە، کە کورد تیایدا ژیاون و بەولآتی خۆیان گرتووە، (شترک) دەڵێت: بەشی باکووری ڕۆژئاوای ئێران، هەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی زایینی، بەو ناوە ناسراوە[٥٩].

ئەوەی شایانی باسە، رای شارناسان لەبارەی دەستنیشانکردنی سنوورەکانی ئەو هەرێمە، لەیەک جیایە، بەلآم (نەقشەبەندی) توانیویەتی یەکخستنێک لەنێوان ئەو رایە دژبەیەکانە دروست بکات و بڵێت: لە ماوەی سەردەمی عەباسیدا، ئازەربێجان لە ڕۆژهەلآتەوەی، ولآتی دەیلەم و چیای (گەیلان)و ڕۆژئاوای دەریای خەزەر دەکەوتن، لە ڕۆژئاواشی یەوەی ئەرمێنیا و باکووری جەزیرە، لە باشوورییەوەی هەرێمی چیاکان و، ولآتی ران (ئاران)یش لە باکوری دەکەوتن[٦٠].

هەندێ لەشارناسان، هەرێمەکانی ئازەربێجان و ئاران و ئەرمینیا یان بەیەک هەرێم داناوەو ناویان ناوە(هەرێمی ریحاب)، ئەمەش بەهۆی پەیوەندی ئەو هەرێمانە بەیەک و تێکەلآوبوونی زەوییەکانیان لەگەڵ یەک[٦١].

کورد لە ئازەربێجاندا نیشتەجێ بوون و لە دانیشتووانە بنجییەکانی هەرێمەکە بوون، بەتایبەتیش لە بەشەکانی باشوورو، ڕۆژئاوای و ئەو ناوچانەشی کە دەریاچەی ورمێ دەوری دەدان، ئاماژە یەکەمەکانیش بۆ بوونیان تیایدا، دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری فتوحاتی ئیسلامی، کە لە دۆڵەکانی بلاشجان و ساترودان و چیای سبلان هەبوون[٦٢].

لە دیارترین هۆزە کوردییەکانی دانیشتووی ئازەربێجان (هەزبانی)یەکانن، ئەو هۆزە گەورەیەی بە تیرەو تایەفە زۆرەکانی ناسراوە، ئەوەش گەورەترین و ناودارترین هۆزی کوردە لە هەرێمی ئازەربێجان، ئەم هەزبانییانە لە زۆربەی ناوچەکانی هەرێمەکە نیشتەجێ بوونە، لەوانە لە سەلماس[٦٣]و مەراغە و ئەشنۆیە و نریزو ورمێ[٦٤]. ئەمەش دوای کۆچی تاکەکانی ئەو هۆزە دێت بۆ ئەو ولآتە، کە بەمە لەگەڵ هۆزە کوردییەکانی دیکەی ئەوێ تێکەڵ بوون و، بوونە دانیشتوانی ناوچەکە، (مەسعودی) دەڵێت: ئازەربێجان ولآتی هەزبانییەکانە[٦٥].

تاکەکانی ئەو هۆزە، لە ماوەی سەدەکانی چوارو پێنج و شەشی کۆچی، ڕۆڵێکی گرنگیان لە ڕووداوەکانی (ئازەربێجان)دا بینی و، جەمسەری سەرەکی ئاراستەکردنی زۆربەی ئەو ڕووداوانە بوون، سەرۆکەکانی ئەم هۆزە لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینیدا، لە پێکەوەنانی میرنشینێکی کوردی سەربەخۆ، سەرکەوتن، بەناوی میرنشینی (ڕووادی)وتا ڕۆژی ڕووخانی، ئەو میرنشینە ڕۆڵی خۆی هەبوو، بەلآم سەلجوقییەکان ڕووخاندیان، شایانی باسە (ڕووادی)یەکانیش تیرەیەکن لە (هەزبانییەکان)[٦٦].

تا دەرکەوتنی هۆزە تورکەکانی (غەز)و دوا بەدواشیان سەلجوقییەکان، کورد یەک لە گرنگترین رەگەزەکانی پێکهاتەی دانیشتوانی هەرێمەکەو بەشێوەیەکی یەکسان هەموو ناوچەکانی بوو، دوای ئەوە نیشتەجێکردنی تورکەکان لە شارەکانی ئەو هەرێمە دەستی پێکردو، ئەو هۆزە تورکانەی کە لە بنجدا مەڕدار بوون و بەهۆیەوەی هەر ڕۆژەی لە شوێنێک بوون، لەگەڵ سەرەتای سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، بەسەر (ئازەربێجان)دا ڕژان و لەمەوە ئیتر بە تورککردنی ناوچەکە دەستی پێکرد[٦٧].

گومان لەوەدا نییە، کە گەیشتنی تورکەکان بە هەرێمەکە، بووە هۆی گۆڕانکاری بەسەر پێکهاتەی دانیشتوانی ناوچەکە، چونکە یەک لەو شوێنەوارانەی هێرشە تورکەکان لەدوای خۆیاندا جێیان دەهێشت، قەرارگرتن و نیشتەجێبوون بوو، لەو ناوچانەی داگیریان دەکرد،

بۆیە دوای ئەوەی کورد زۆرینەی پێکهاتەی (ئازەربێجان)ی پێک دەهێنا، وای لێهات ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەو هەرێمە، زۆرینەی دانیشتوانەکەی بوون بە تورک[٦٨].

لە پاڵ (هەزبانییەکان) لە هەرێمی ناوبراودا، چەندین هۆزی کوردی دیکەش دادەنیشتن، بەڵام بەرێژەیەکی کەمترو لە هەندێک ناوچەی دیاریکراو، وەک بۆ نمونە (زەرزارییەکان) لە (ئەشنە)و دەوروبەری نیشتەجێ ببوون[٦٩]، چەندین قەڵاشیان لەو ناوچانە هەبوو، هەروەها هەر لەو هەرێمە، هۆزەکانی جەلالی (گەلاڵی)[٧٠]و (ماجەردان)[٧١]و (سەولی)ش[٧٢] دادەنیشتن.

بەڵام گرنگترین شارە کوردییەکانی هەرێمەکە (خوی)[٧٣]و(سەلماس)[٧٤]و (ورمێ)[٧٥]و (ئەشنۆ) و (مەرەند) و هەندێکی تر بوون[٧٦].

(ئەرمینیا)ش یەکێکە لەو هەرێمانەی، بەشێک لە وڵاتی کوردی لەخۆ دەگرت و لە پاڵ (ئەرمەن)دا، (کورد)یشی تێدا، دادەنیشت. ئەو هەرێمەش هەرێمێکی شاخاوییە، دەکەوێتە ئەوپەڕی باشووری زەوییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و باشووری چیاکانی (قەفقاس)[٧٧].

دوای ئەوەی فەتحی ئیسلامی (ئەرمینیا)شی گرتەوە، ئەو هەرێمە بووە گۆڕەپانی شەڕەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی ئیسلامی و بیزەنتی، بۆیە ئەستەمە بتوانین سنورێکی دیاریکراوی بۆ دەستنیشان بکەین، ئەوەبوو، جارێکیان شارەکانی دەکەوتنە دەست موسڵمانان و جارێکی دیکە (بیزەنتی)یەکان دەستیان بەسەردا دەگرتنەوە، بار بەم شێوەیە مایەوە، تا سەلجوقییەکان سەریانهەڵداو، تەرازوی هێزیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان وەرچەرخاند، ئیتر لە ئەنجامی هێرش و شاڵاوە یەک لە دوای یەکەکانیان، کە سەلجوقییەکان ئاراستەی ناوچەکانی دەسەڵاتی (بیزەنتی)یان دەکرد، مانەوەی بیزەنتییەکانیان، تەنها لە هەندێ بەشی ئەرمینیا هێشتەوە[٧٨].

لەگەڵ لێکجیایی رای شارناسەکانیش، لەبارەی دەستنیشانکردنی سنوورەکانی (ئەرمینیا)، دەکرێ بگوترێت. لە باکوورەوەی، چیاکانی (قەفقاس)و وڵاتی (کەرەج)[٧٩] سنوریان دەست نیشان دەکردو لە باشووریشیدا ناوچەکانی (هەکاری)و ویلایەتی (دیاربەکر)ی[٨٠]، سەر بە جەزیرەی فورات.. لە ڕۆژهەڵاتیشی هەرێمەکانی



(ئازەربێجان) و (ئاران)[٨١]و لە ڕۆژئاواشیدا هاوتخوبی وڵاتی ڕۆم بوو، کۆمەڵێک شارو قەڵای لەخۆ دەگرت، گرنگترین شارە کوردییەکانیشی بریتیبوون لە: (خەلاَت)، (ئارجیش)، (بارکری)، (بەدلیس)، (ملازگەرد) و هەندێکی دیکەش[٨٢].

(ئەرمینیا) لەلایێک، بەهۆی نزیکیی لە دەوڵەتی بیزەنتی و، لە لایێکی دیکەش، نزیکیی لە چیاکانی (قەفقاس)، کە چەندین میللەتی جۆراو جۆریشی لەخۆ دەگرت، هەموو ئەوانە وایان لێدەکرد، شوێنێکی بازرگانی گرنگی هەبێت، چونکە چیاکانی (قەفقاس) دوو ڕێگەیان لەخۆ دەگرت، ئەرمینیایان بە هەرێمەکانی دیکەی پشتەوەی دەبەستەوە، ئەوانیش ڕێگەی شاری (بابولئەبواب)و ڕێگەی قەڵای (بابولّلان) بوون، ئەم دوو ڕێگەیەش گرنگی ستراتیژییان هەبوو، بۆیە هەریەکەی دەستی بەسەردا بگرتبوونایە، دەیتوانی سەرجەم میرنشینەکانی سەر درێژایی ئەو چیایانە، بۆ خۆی ملکەچ بکات[٨٣].

لەماوەی نیوەی دووەمی هەزارەی سێیەمی پێش زایین[٨٤]، ناوچەکانی باشووری دەریاچەی (وان) بەناوی (کاردا)(Karda)وە دەناسرا، زاراوەی (کاردا)ش لەو شێوازانەیە، کە دەلالەت لە (کورد) دەکات، هەروەها ئەو ناوچەیە، لە کۆندا لەچوارچێوەی وڵاتی (کاردۆخیا) بووە، کە (زەینەفون)ی (فەرماندەی یۆنانی ساڵی ٤٠٠-٤٠١ پ.ز) بەوێدا تێپەڕی بۆ گەڕانەوە لە بۆ وڵاتەکەی، (شترک) دەڵێت: ناوچە شاخاوییە درێژە وەبووەکانی نێوان دەریاچەی (وان) لە باکوورو، دەشتی ئاشوور لە باشوور، لەکۆندا بەناوی (کوردوئین) دەناسرا، کە ئێستا بە (بوهتان) یان (هەکاری) ناودەبرێت[٨٥].

لە ماوەی سەرەتاییەکانی کۆچی [٨٦]، کورد بەردەوام لە شارەکانی (ئەرمینیا) بوونیان هەبووە، ئەو هەواڵانەی لەبارەشیان، لەماوەی هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچیدا هاتوون، بەڵگەن لەسەر مانەوەیان لەناوچەکەو، تیایدا شان بەشانی ئەرمەن ژیاون.

هۆزی (ڕووادی) بەدیارترین هۆزە کوردەکانی دانیشتووی (ئەرمینیا)و بەتایبەت شاری (دووین)[٨٧] دەژمێردرێت، ئەیووبییەکان کە لە کوردە (ڕووادی)یەکانن، دەدرێنە پاڵ ئەو شارە، کە لە سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی بەجێیان هێشت و بەرەو (عیراق) هاتن[٨٨]، کورد لە (دوین)ی بنکەی کۆنی (ئەرمینیا) هەبوون، ئەوکاتە ڕووبارێک لە ڕۆژئاوای (دبێل) لە (ئەرمینیا)دا[٨٩] بە (ڕووباری کوردان) دەناسرا.

جگە لە (رووادی)یەکان چەندین هۆزی دیکەی کورد لە (ئەرمینیا) نیشتەجێ بوون، لەوانە هۆزی (رۆزەکی)، کە شاری (بەدلیس) و ناوچەکانی باشووری دەریاچەی (وان) سەنتەری ئەو هۆزە بوون، (شەرەفخانی بەدلیسی) کە لە (١٠١٠ک/١٦٠١ز) کۆچی دوایی کردووە دەڵێت: (بەر لە حەوت سەدو شەست ساڵ پێش ئێستا، تاکەکانی هۆزی رۆزەکی بەرەو ئەو ناوچەیە هاتوون و، فەرمانڕەواییان تێدا کردووە)[٩٠]. بۆ زانیاریش ناوبراو کتێبەکەی خۆی لە ساڵی (١٠٠٥ک١٥٩٦ز) نووسیوە، ئەمەش ئەوە دەگەینێت، کە مێژووی ئەو هۆزە لەو ناوچانە بۆ سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زایینی دەگەڕێتەوە.

هەر لەو هەرێمە هەردوو هۆزی (بەختی)[٩١]و(بەشنەوی)ش ژیاون و ژمارەیەک قەڵای پارێزراویان لە هەرێمی (زۆزان) هەبووە[٩٢]. لەو قەڵایانەی سەر بە (بەشنەوی)یەکانن (بەرقە) و (بەشیر)ن[٩٣]، ئەو قەڵایانەش کەهی (بەختی)یەکان بوون: (حەزقیل) و (ئاتیل) و (عەلوس) و بێجگەی ئەمانەشن[٩٤].

سەرکردە و پێشەواکانی ئەم دوو هۆزە، بەشێکی باشی (سەربەخۆیی خودی)یان هەبوو و، فەرمانڕەوایی قەڵاکانی خۆیان دەکرد، پارێزگاریشیان لەو فەرمانڕەواییە سەربەخۆییەی خۆیان، تا سەردەمی سەلجوقی و دوای ئەوانیش کرد.

بوونی هۆزە کوردیەکان لە شارەکانی ئەرمینیا، ئەو راستییە گرنگە رەت ناکاتەوە، کە (ئەرمەن)ەکانیش لەگەڵ کورددا پێکەوە لە هەمان ناوچەدا ژیاون[٩٥]، هەرێمەکەش وەکو درانە پاڵ ئەوان ناونراوە(ئەرمینیا)[٩٦]، چونکە ئەوانیش وەکو کورد زۆر لە کۆنەوە لەوێدا نیشتەجێ ببوون و زۆرینەی دانیشتووانەکەیان پێک دەهێنا[٩٧].

بەڵام هەرێمی (لوڕستان)[٩٨]، (لوڕ)[٩٩]، ئەمە هەرێمێکی شاخاوی بچوک بوو، باری کارگێڕییەکەی لە هەموو سەردەمی عەباسییەکاندا، ئارامی بەخۆوە نەدیبوو، لەسەرەتادا، سەر بە هەرێمی (خوزستان) بوو، دواتر لێی جیاکرایەوەو خرایە سەر هەرێمی چیاکان[١٠٠]، چونکە (زیاتر کەشێکی کوردی بەسەردا زاڵبوو)[١٠١]و پەیوەندی بەوەوە هەبوو[١٠٢]، هەر لەگەڵ سەردەمی سەلجوقیش کرایە هەرێمێکی سەربەخۆ لە دوو بەش، یان دوولا پێک دەهات، ئەوانیش (لوڕستانی گەورە)بوو لە باشوورو(لوڕستانی بچوک)یش لە باکوور، رووباری (کاروان) لێکیانی جیادەکردەوە[١٠٣].

شارناسە موسڵمانەکان لەسەر دەستنیشانکردنی وردی سنوورەکانی ئەو هەرێمە، یان



ئەو دەڤەرەی (لوڕ) رێکنەکەوتوون، بەڵام بەپشت بەستن بەگێڕانەوەی شارناسەکان، دەکرێت بە نزیکی وێنەی سنوورەکانی بکێشرێت، ئەو هەرێمە دەکەوێتە نێوان ئاوایی (واست)ی هەرێمی عیراق لە رۆژئاواو هەرێمی خۆزستان لە باشوور و هەرێمی فارس و بیابانەکانی خوراسان لەرووی رۆژهەڵات وئاوایی(سەیمەرە)ی هەرێمی (چیاکان) لە باکوور[١٠٤].

ئێستاکەش ئەو هەرێمە خۆی لە ناوچەکانی بەشی رۆژئاوای ئێران دەنوێنێت، سنوورەکانی لە باکووردا تا شاری (نەهاوەند)و لە باشووریش تا چیاکانی (کە بیرەکۆهـ) درێژ دەبنەوە[١٠٥].

گرنگترین شارەکانی هەرێمی (لوڕ) بریتینە لە: (ئەیزج)[١٠٦]، (خورەم ئاباد)، (یشتر)، (بروجرد)، (سەیمەرە)، (کرند)[١٠٧]و بێجگەی ئەوانەش.

هۆزی (لوڕ)، (لوڕییەکان) بەگرنگترین هۆزی کوردی دانیشتووی (لوڕستان) دەژمێردرێن، بۆیە هەرێمەکە بەناوی ئەوانەوە ناسرا[١٠٨]، هەروەها هەر لەسەردەمی عەباسییەکانەوە یەک لە هۆزە گەورەو ناسراوەکان بووە[١٠٩]، (عومەری) دەڵێت: لوڕەکان (تایەفەیەکی بە ژمارە زۆرن، تیرەی لێکجیایان لە وڵاتەکەدا هەیە)[١١٠]، (ئیبنولحەوقەل)یش دەڵێت: (زۆرینە لە وڵاتی لوڕدا، کوردەکانن)[١١١]، (ئەبو فیداء)یش زیاد لەوە دەڵێت: (خەڵکێکی زۆرن لە کوردان)[١١٢]، بێگومانیش مەبەست لێیان، کوردە لوڕەکانن، کە ئەوسا دابەشدەبوونە سەر زیاتر لە بیست تیرە، لەوانە: (ئەسترکی) و (مەماکوی) و (بەختیاری)و(جوانکی) و(بیرامان) و(زامدیان) و(عەلانی)و(لوتوند)و(بتوند)و (راکی)و(خاکی)و (هارونی)و(ئاشکی)و (کوی)و(مەماسانی)و(ئاومکی)و (توابی)و (کداوی)و (ئاکورد)و (کولارد)و، چەندین هۆزی تر[١١٣].

(شارە زوور)یش بە یەکێک لە هەرێمەکانی وڵاتی کورد دادەنرێت، کە ئەویش دیسانەوە هەر کورد تیایدا نیشتەجێ بووە، لەبنجدا شارۆچکەیەک یان چەند شارێک، یان (چەند شارو گوندێک) بووە[١١٤]، بەڵام وایلێهات ناوەکەی بەسەر هەموو شارو شارۆچکەکانی نێو ئەو هەرێمە دابڕا، لە سەرەتادا شارەزوور سەر بە (موسڵ)ی بنکەی هەرێمی جەزیرە بوو، دواتر لە سەردەمی خەلیفە (هارونی رەشید)(١٧٠/١٩٣ک-

٧٨٦-٨٠٨ز) له (موسل) جیا بۆوەو، بە هەرێمی (چیاکان)ەوە لکێنرا[١١٥].

دەڤەری (شارەزوور) له باکوورەوەی بە شاری (ئەربل)و ناوچەکانییەوە، له ڕۆژهەڵاتەوە بە چیاکانی سەڵق (چیاکانی قەندیل)، له ڕۆژئاواوەی داقوقا و باجرمی (گەرمیان)[١١٦]، له باشووریش حەلوان و خانەقین و کەرخ جدان[١١٧] سنوورەکانی دروست دەکەن.

گرنگترین شارەکانیشی بریتین لە: (دار ئاباز)، (ئەلسامغان)، (دیلمستان)، (قسنا)، (بیردزدان)و... هتد[١١٨].

شارەزوور بە درێژی چەرخە ئیسلامییەکان، بەتەنیا ناوچەی کورد بووە، هەروەکو سەرچاوە جوگرافییەکان[١١٩] ئاماژەی بۆ دەکەن، کە دانیشتووانەکەی (هەموو کوردن)[١٢٠]، له هۆزەکانی (جەلالی)[١٢١]و (شەمردەلی)[١٢٢]و (عەیشانی)[١٢٣]و (بەرزیکانی) و (باسیان) و (باپیری)ن[١٢٤]. (موسعیری کوڕی موهەلهیل)یش، کە لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی، سەردانی شارەزووری کردووە، دەڵێت: (شارەزوور چەند شارۆچکە و گوندێکە، شارێکی گەورەشی تیایە، کە ئەمە سەنتەرەکەیەتی.. پێی دەگوترێت (نیم ئەزرای)، خەڵکەکەی یاخین لە سوڵتان، فرچکیان بە ناکۆکی گرتووەو چەشەیان لە یاخیبوون بردووە.. خەڵکەکەی توندو دڵڕەقن، خۆیان دەپارێزن و شوێنەکەیان پاس دەکەن، زۆربەی میرەکانیشیان، لە خۆیانن... کوردەکان بوێری ئەوەیان بۆ دروستکردن، بەسەر میرەکانیاندا زاڵ بین و پێچەوانەی خەلیفەکانیان بکەن، هەروەها وڵاتەکەیان، زستانە هەواری شەست هەزار ماڵە کوردە، لە هۆزەکانی (جەلالی)، (باسیان)، (حەکەمی)، (سۆلی)[١٢٥]. کورد لەماوەی چەرخە ئیسلامییەکان، بێجگە لەو هەرێمانەی لەپێشوودا ئاماژەمان پێکردن، کە ئەوان وڵاتی بنجی کوردانن، لە شوێن و هەرێمەکانی دیکەی نزیک بە وڵاتی خۆشیان ژیاون، ئەمەش لەسەر شێوەی کۆمەڵەی لە یەک جیاو هۆزی شوانکاری بەدوای لەوەڕدا گەڕاو جا ئەو کۆمەڵانە بەرۆڵی گەورەو بەرچاو لەمێژووی کورددا هەڵساون، بۆ نموونە: ئەیووبییەکان، کە لەبنجدا کوردی رووادی نیشتەجێی دەڤەری (دووین)ی سەر بە هەرێمی (ئاران)بوون، ڕۆڵیشیان لە مێژوودا ئاشکرایە[١٢٦].

هەروەها بڵاوبوونەوەی کورد لە هەرێمەکانی دەوروبەر، بە ژمارەیەک هۆکارو پاڵنەری



ئابووری و رامیاری و ژینگەیی و لە پێشەوەی هەمووانیش، گەڕان بەدوای لەوەڕگای نوێوە بووە.

ژمارەیەک لە هۆزو خێڵی کورد لە هەرێمی فارس نیشتەجێ بوون، ئەو هەرێمەی، کە دەکەوێتە سەر کەنداوی عەرەبی و یەکێکە لەو هەرێمانەی دەکەونە باشووری ڕۆژئاوای وڵاتی فارس (ئێرانی ئێستا).. لە باکوورەوە ئەسفەهان و خوراسان، لە باشوورەوە دەریای فارس (کەنداوی عەرەبی)، لە ڕۆژهەڵات هەرێمی خوزستان و لە ڕۆژئاواش هەرێمی (کرمان)[١٢٧] هاوسنووری ئەو هەرێمەن.

لەو هەرێمەدا، ئەو شوێنانەی کوردیان تیا نیشتەجێ بووە، ناونراوە (زموم)- کۆی زوم، یان زمە- کە ئەوانەش، وەکو یاقوتی حەمەوی و شارناسانی بێجگەی ئەویش[١٢٨] ئاماژەی بۆ دەکەن: (شوێن پێ خوست و حەوانەوەی هاوینە و زستانەی هۆزە کوردییەکان بوونە). (ئەسطەخری) و (ئیبن ولحەوقەل) زانیاری باش لە بارەی (زموم)ی فارس و ناوچەکانی تۆمار دەکەن، لەگەڵ هەموو ئەو شارو گوندو شارۆچکانەی لەخۆیان دەگرێت، هەروەها شتی دیکەش، لە بارەی گوزەران و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەنتەری خەلافەتی عەباسیدا[١٢٩] دەگێڕنەوە.

لەماوەی چوار سەدە یەکەمەکانی کۆچی، هەواڵەکانی کورد لە هەرێمی فارس بەردەوام دەکەونە بەرچاو، بەڵام ئەوەی لەسەدەی پێنجەمی کۆچی/ یانزەی زایینی لەبارەیانەوە دەگات، زۆر کەمە، لەوانەیە ئەوەش بەهۆی تێکەڵاوبوونیان بێت، لەگەڵ دانیشتووانی هەرێمەکە، یاخود بەهۆی هاتنی سەلجوقییەکانەوە بووە، بۆ جیهانی ئیسلامی، کە ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەواڵەکانی ئەوان باڵ بەسەر هەواڵی نەتەوەکانی دیکەو لەناویاندا کوردیش بکێشێت، ئەوەی شیاوی باسیشە، تا دەرکەوتنی مەغۆلییەکان، کورد لە (فارس)دا هەرمانەوە، بەڵام بە هاتنی ئەوان (شمشێرەکانی تەتەر لەناوی بردن)[١٣٠].

هەروەها چەندین کۆمەڵە خەڵکی کورد لە شارو ناوچە لێکبڵاوەکانی هەرێمی (ئاران)دا نیشتەجێ بوون[١٣١]، کە مێژووی ئەمەش بۆ سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە، (بەلازەری) ئاماژە بۆ (رووباری کوردان)[١٣٢] دەکات.. لە سەرەتای سەردەمی عەبەسایش، کورد لە شارەکانی (بەرزعە) و (بیلقان) و (باب) و (ئەبواب)- دەربەندی شیروان- و (جەنزە)-کەنجە-و بێجگەی ئەوانەش پەیدابوون[١٣٣].

له گێرانەوە مێژووییەکاندا ئەوە دەردەکەوێت، کە زۆرینەی کوردەکانی هەرێمی (ئاران) له تیرەو تایەفەکانی هۆزی هەزبانی گەورەو زۆر بلاوەبوو و بەتایبەتیش تیرەی (روادی) بوون.. هەروەها ئەو بنەماڵە شەدادییەی میرنشینی شەدادی دامەزراند، له بنەماڵە روادییە هەزبانییەکان بوو، کە له شاری (کەنجە)و دەوروبەریدا، دادەنیشتن[١٣٤].

له پاڵ (کورد)دا، (ئەرمەن)یش لەو هەرێمەی (ئاران)دا ژیاون، ئەمەش لەبەرئەوەی له ئەرمینیا نزیک بوو، بۆیە له شارەکانی (ئاران) بلاوبوونەوەو لەگەڵ(کورد)دا پشکدارییان له رووداوەکانی ناوچەکە کرد.. (فرای) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە بەر له فەتحی ئیسلامی، تورکیش لەو هەرێمەدا ژیاون، بەڵام ژمارەیان بەم شێوە زۆرنەبووە، وەکو دوای ئەوەی سەلجوقییەکان هاتنە نێو جیهانی ئیسلامی، زۆربوون، چونکە لەسەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی تورک بەرەو ئاران هاتن و وردە وردە لەو شوێنانەی باڵیان بەسەردا کێشا، تیایاندا نیشتەجێ بوون[١٣٥].

نزیکی سنوورەکانی (ئاران) له ژمارەیەک هێزی سیاسی نا ئیسلامی، گرنگییەکی دیکەی تایبەتی، بۆ شوێنەکەی زیاد کرد، چونکە هەندێ له ناوچەکانی دوا سنوور بوون، لەراستیشدا ئەو هەرێمە بەوهۆیەوە، له چەندین ماوەی مێژوویی زۆردا، برێکی گەورەی سەربەخۆیی بەخۆوە بینیوە، چونکە وەکو گوتمان دەکەوتە دوایین سنوورەکانی ئیسلامی و هەمیشە لەوەبوو، بکەوێتە ژێر هێرش و پەلاماری دوژمنان، بۆیە دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەتی ئیسلامی، له زۆربەی کاتەکاندا، هەوڵی نەدەدا، کار لەپێناو بەستانەوەی بکات، بەسەنتەری فەرمانڕەوایی، بۆیە کوردەکان تیایدا، واتە له (ئاران) سەرکەوتن لەوەی بناغەی فەرمانڕەواییەتێکی سەربەخۆ، بۆ خۆیان دابمەزرێنن.

دواجار، دیسانەوە کورد له هەرێمی خوزستان (ئەهوازی ئێستاش)دا هەبوون، کە ئەم (خوزستان)ە، هەرێمێکی بچوکی باشووری رۆژئاوای وڵاتی فارس و نزیک هەرێمی چیاکان، بەتایبەتیش بەشەکانی باکوورو باکووری رۆژهەڵاتییەتی[١٣٦].

له گرنگترینی ئەو شارانەش، کە کورد یەک له رەگەزەکانی دانیشتوانی پێکهێنا، جوندنیسابوور[١٣٧]و رامهورمز[١٣٨]و داربان[١٣٩] بوون، لەو شارانەشدا له ماوەی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینی[١٤٠] کورد رۆڵی خۆیان هەبوو، هەروەکو (ئیبن و لبەتوتە)ی گەریدەش ئاماژەی بۆ دەکات، تا سەردەمەکانی دووایش کورد لەو شارانە



هەرمابوون، وەکو خۆی دوای سەردانەکەی بۆ ئەو ناوچانە بینیونی و گوتویەتی (هەندێک گوند هەیە کورد تیای دادەنیشن)[١٤١].

**دووەم: پێشدەستی مێژوویی:**

**ا- باری سیاسی وڵاتی کورد، بەر له دەرکەوتنی سەلجوقییەکان:**

وڵاتی کورد لەماوەی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینی و تا سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان -واتە چەرخی بووەیهی- پڕبوو له میرنشین و دەسەڵاتە خێڵەکییە سەربەخۆکان، هەندێکیان گەیشتنە قۆناغی پێگەیشتن و هەنگاوی بوێرانەیان بەرەو سەربەخۆیی تەواو هەڵگرت، گەیشتنە ئەو رادەیەی پارەی تایبەت بە خۆیان لێبدەن و خوتبە بەناوی خۆیان بخوێننەوە، ئەم دوو هەنگاوانەش بە گرنگترین سیماکانی سەربەخۆیی میرنشینەکان دەژمێردرێن، له چەرخە ئیسلامییەکاندا[١٤٢].

بێگومان ئەو سیاسەتە لامەرکەزییەش، کە بووەیهییەکان بەریانگرت، رۆڵێکی بەرچاوی لەوەدا هەبوو، چونکە میرە بوویهییە یەکەمەکان، بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکانی دەوڵەتە فراوانەکەیان و بەتایبەتیش له وڵاتی کورد، کە ئاسان نەبوو، بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆ، یان دەسەڵاتە ناوەندییەکە[١٤٣]، هاتن سیاسەتی لامەرکەزییان پەیڕەو کرد، چونکە وڵاتی کورد، وەکو (شەرەفخانی بەدلیسی) جەختی لەسەردەکاتەوە: (سوڵتانە گەورەو ترسێنەرە بەڕێزەکان)، نەوێران (دەستی داگیرکردنیان بۆ سەر درێژ بکەن، بەڵکو بەوەندە وازیان له دانیشتووانە کوردەکەی هێنا، دیاری و بەرتیلیان لێوەربگرن، بۆیە بەسەربەخۆ مایەوەونەکەوتە ژێر باڵی دەوڵەتێک له دەوڵەتەکان[١٤٤].

لەلایێکی دیکەوە، له سایەی سیاسەتی لامەرکەزی بووەیهی، له وڵاتی کورددا، کەش و زەمینەی دروستبوونی میرنشینە سەربەخۆکان و نیمچە سەربەخۆکان هاتە پێش، ئیتر ژمارەیەکی زۆری خێڵ و هۆزو تایەفەی کوردی زەقبوونەوە[١٤٥]، کە هەندێکیان بەهێزبوون و له ناوچەی خۆیاندا دەسەڵاتدار بوون، ئەمە لەپاڵ چەندین قەڵاو گوندی چیایی و حامییەی سەربازی له هەموو لایەکی کوردستان، کە گەریدەی تورکی (ئەولیا چەلەبی) ژمارەی قەڵاکانی وڵاتی کوردی بە حەفت سەدو حەفتا قەڵا خەملاندووە[١٤٦].

وەکو له پێشدەستییە جوگرافییەکە باسی لێوەکرا، وڵاتی کورد بە شێوەیەکی گشتی

شاخاوی و سەخت بوو، ئەم وڵاتە هەروەها ڕێگاکانی زەحمەت بوون و قورس بوو، سوپای نیزامی بخزێتە ناوی، زنجیرە چیاکانیش بوونە بەربەستێکی ڕێگر، خاوەن قەڵا کوردەکانیان، لە هێرشی دوژمنان پاراست، وەکو شورەیێکی بەهێز، نەیانهێڵا ڕووبەڕووی مەترسییە دەرەکییەکان ببنەوە، هەروەها لاوازی خەلافەتی عەباسی و جیابوونەوەی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لێی، بەهۆکارێکی دیکە دەژمێردرێت، کە یارمەتی دروستبوونی میرنشینە کوردیەکانی دا، چونکە نیشانەکانی جیابوونەوە لە لاشەی خەلافەتی عەباسی، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا، لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زاینی، دیاری دا، هەندێک خاوەن حەزو ئارەزووی جیابوونەوە، هەوڵیاندا لەپێناو هێنانەدی چەندین کیانی سەربەخۆ لە لاشەی خەلافەتدا کاربکەن[١٤٧].

لەنێو کوردیشدا، دیسانەوە هەر لە سەرەتاکانی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینی، هەوڵدان لەپێناو گەیشتنە سەربەخۆیی خودی دیاری دا، ئیتر چەندین میرنشینی خێڵەکی میراتگری کوردی بچوک دەرکەوتن، بەمەش ماوەی سەرکردایەتییە خێڵەکییە خۆ جێییە جۆراوجۆرو، خاوەن دەسەڵاتە سنوردارەکان، تێپەڕێنرا، کە لەماوەی سەدەی سێیەمی کۆچی، لە هەندێک لە هەرێمە کوردییەکاندا باوی سەندبوو[١٤٨].

لەراستیشدا سەرۆک هۆزە کوردیە بڵاوەبووەکانی هەرێمەکانی ئاران و ئازەربێجان و چیاکان و جەزیرە و شارەزوور، لە سەپاندنی پایەکانی دەسەڵاتەکانیان، لە ناوچەکانی ژێردەستی خۆیان سەرکەوتن، ئیتر قەدەری کوردە عەیشانییەکانی شارەزوور ئەوەبوو، لەماوەی سەردەمی عەباسی ببنە خاوەن یەکەم میرنشینی کوردی، ئەگەرچیش ماوەیەکی کەم لە(٣٠٠-٣٥٠ک/٩١٢-٩٦١ز) فەرمانرەوایێتییان کردو، نەگەیشتنە سەردەمی سەلجوقی[١٤٩].

**لە گرنگترین میرنشینە کوردییەکانیش:**

### ١- میرنشینی شەدادی:

ئەم میرنشینە لە هەرێمی (ئاران) دروست بوو، (محەمەدی کوڕی شەداد) سەرۆکی بنەماڵەی شەدادی کوردی، کە ئەم بنەماڵەیە یەکێکە لە بنەماڵەکانی سەر بەهۆزی هەزبانی بڵاوەبوو لە (ئاران)، لە ساڵی (٣٤٠ک/٩٥١ز)دا[١٥٠]، سەرکەوت لە دانانی



بنچینەکانی میرنشینی شەدادی، بۆ ئەمەش، لەلایێک ئەو بارە سیاسییەی قۆزتەوە، کە خەلافەتی عەباسی لەژێر چنگی بووەیهییەکاندا، پێیدا تێدەپەڕی. لەلایێکی تریشەوە سوودی لە بەدیل گیرانی (مەرزەبانی یەکەمی) میری سالاری، لە لایەن بووەیهییەکاندا، وەرگرت[١٥١].

باری گشتیش لە (ئاران)دا لە سەرەتای چەرخی بووەیهی، لە باربوو بۆ هەڵسانی میر محەمەد بەو هەنگاوە، چونکە وەکو ئاماژەمان بۆ کرد، خەلافەتی عەباسی دەسەڵاتی ئەوەی نەمابوو، پارێزگاری لە زاڵبوونی خۆی بەسەر هەرێمەکانی سەر بە دەوڵەتەکەیدا بکات، سیاسەتی بووەیهییەکانیش هەر لەبنجدا لامەرکەزی بوو، جگە لە هەموو ئەمانەش، ئەو میرە کوردە، بەو پێیەی سەرۆکی خێڵێکی بەهێزو بەدەسەڵات و خاوەن پلەوپایەیە، خۆیشی بەهێزو دەسەڵات جیادەکرایەوە[١٥٢].

ئیتر میرنشینی شەدادی[١٥٣] وایلێهات فراوانبوو، تا هەموو (ئاران)ی گرتەوە، چونکە دوای ئەوەی بە تەنیا شاری دووین(دبیل)[١٥٤]ی دەگرتەوە، دوای چەند ساڵێک وایلێهات سنوورەکانی (ئاران)ی دەبەزاندو، چەند بەشێکی ئەرمینیا و ئازەربێجانیشی لەخۆ دەگرت[١٥٥].

لەماوەی هێرشەکانی(غەز) و سەرهەڵدانی سەلجوقییەکانیش میر (ئەبولئەسوار شاور)[١٥٦]، میری شەدادییەکان بوو.

### ٢- میرنشینی ڕووادی:

بنەماڵەیەکی دیکەی هەزبانی و، لەخێڵی ڕووادی، توانی میرنشینێکی دیکەی کوردی سەربەخۆ لە هەرێمی ئازەربێجان دابمەزرێنێت، یەک لە لێکۆڵەران بە بەڵگە و گەواهییە مێژووییەکان ئەوەی سەپاندووە، کە ڕووادییەکان دەگەڕێنەوە سەر هۆزی هەزبانی کوردی، هەروەها جەختی لەسەر ئەوەش کردۆتەوە، کە هیچ پەیوەندییەک لەنێوان هەردوو بنەماڵەی ڕووادییە یەکەمەکان، کە فەرمانڕەوایێتی ئازەربێجانیان کردووەو، ئەوانەی دەگەڕێنەوە سەر خێڵی (ئەزد)ی عەرەبی و، لەنێوان ڕووادییە دووایینەکان دا نییە، ئەوانەی سەرکەوتن لە دامەزراندنی میرنشینێکی کوردی سەربەخۆ لە هەرێمەکە، لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی چواری کۆچی/دەی زایینی[١٥٧].

زانیارییەکانی لەسەر ئەم میرنشینە بە شێوەیەکی گشتی کەمن و ناتوانن مەبەست بپێکن، چونکە سەرچاوە عەرەبی و فارسییەکان بێدەنگییان نواندووە، لە باسی رووادییەکان و فەرمانڕەوایەتیەکەیان لە ئازەربێجان، بۆیە زانیارییە تایبەتیەکانی لەبارەی چۆنیەتی دامەزراندنی ئەو میرنشینە، تا ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز) زۆر تەمومژاوییە، بەڵام لەو ساڵەدا هێرشی هۆزەکانی (غەز) بۆسەر شارەکانی ئەم هەرێمە دەست پێدەکات[١٥٨]، ئینجا (ئیبنو لئەثیر) دێت بەدرێژی باس لەو هێرشانە دەکات و ئاماژە بۆ هەواڵی میرە رووادییەکانیش دەکات[١٥٩].

لە سەرەتای سەردەمی بووەیهی (دەوروبەری ساڵی٣٤٣ک/٩٥٤ز)، میر (محەمەدی کوڕی حوسێنی رووادی) سەرۆکی خێڵی رووادی، توانی دەسەڵاتی خۆی بەرەو ئازەربێجانیش درێژ بکاتەوە، دوای ئەوەی فەرمانڕەوایی لە هەندێ ناوچەی ئەرمینیا دەکرد، لەو ساڵەدا بەدیل گیرانی سالار (مەرزەبان)ی بەهەلزانی، کە فەرمانڕەوایی ئازەربێجان و ئارانی دەکردو، روکنولدەولەی بووەیهی لە ساڵی(٣٣٧ک/٩٤٨ز) گرتی و لە بەندیخانەی خست[١٦٠].

بەدیل گیرانی میر (مەرزەبان)یش لەلایەن بووەیهییەکان، هەلێکی گونجاوی هێنایە پێش بۆ میرە کوردە شەدادییەکان لە ئاران و رووادییەکان لە ئازەربێجان، بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر چی زۆرتری شارو ناوچەکانە، دابسەپێنن.

زانیاری دیکە لەبارەی دامەزرێنەری میرنشینەکە (محەمەدی کوڕی حوسێن)ی رووادی نییە، چونکە ئەم تەمەنی لە فەرمانڕەوایەتیکردندا درێژنەبوو، لە ساڵی (٣٤٥ک/٩٥٦ز) مردوو، کوڕەکەی خۆی (حوسێنی کوڕی محەمەد) جێی گرتەوە[١٦١]، کە ئەویش هات (تەبرێز)ی داگیرکرد، کاروبارەکانی رێکخست، شورەکانی بیناکردو لە ساڵی (٣٥٠ک/٩٦١ز) کردییە پایتەختی خۆی[١٦٢].

بەدوای یەکتریدا ژمارەیەک میر فەرمانڕەوایەتی ئەو میرنشینە کوردییەیان لە ئازەربێجاندا کرد[١٦٣]، تا کاتی گەیشتنی (غەز)ەکان، (هسوزانی کوڕی مەملانی رووادی) (٤١٦-٤٥٠ک/١٠٢٥-١٠٥٨ز)[١٦٤]، میری ئەو میرنشینە بوو.

لەراستیشدا زانیاری لەبارەیان تا ئەوپەڕی کەمە، ئەوەی هەشە لەدوا بەشی ماوەی مێژووی (الباب والابواب)ی مێژوونوسێکی نادیاردا، پەرش وبڵاوە، جگە لەوەش،



مێژوونووسی فارسی (ئەحمەدی کەسرەوی) لە کتێبەکەیدا (شهریاران گمنام) هەندێ شتی لە بارەیانەوە، لە سەرچاوە ئەرمەنییەکاندا گواستۆتەوە.

### ٣- میرنشینی دۆستەکی (مەڕوانی):

لە هەرێمی جەزیرەش لەگەڵ سەرەتاکانی دەیەی حەوتەمی سەدەی چواری کۆچی/دەی زایینی، میر باد (بازی کوردی) ئەبولشوجاعی کوڕی دۆستەک، توانی میرنشینێکی کوردی دابمەزرێنێت، کە بە میرنشینی (دۆستەکی-مەڕوانی) ناونرا[١٦٥].

بیرورِا لەبارەی ئەو خێڵەی میر (باد) بۆی دەگەڕێتەوە لێکجیاوازن، ئەوەتا کاتێک (فارقی) مرد و لە (٥٧٢ک/١١٧٥ز) جەخت لەسەر ئەوە دەکات، ئەو لە هۆزی (خاربەختی) کوردییە[١٦٦]، هەریەکە لە (روزراوری) و (ئیبنولئەثیر) باس لەوەدەکەن، کە لە کوردە حەمیدییەکانە[١٦٧]، بەڵام لەراستیدا راکەی (فارقی) لەراستی نزیکترە، چونکە ئەو مێژوونووسە، خەڵکی ناوچەکەیەو زیاتر گرنگیدەرو شارەزاتریشە بە هەواڵەکانی میر (باد) و خێڵەکەی.

زۆربەی مێژوونووسان باسیان لە میر(باد)و ئەو سیفەتانەشی کردووە، کە پێیان جیاکراوەتەوە، سەرکردەیەکی لێهاتوو بووە، ناسراو بووە بەبیرتیژی و سەخییانە ماڵی بەسەر هەژارو کەسانی پێویستدا بەخشیوە، لەبەرئەوەش بەئازایەتی جیادەکرایەوە، هەڵستا بەهێرش بردن، بۆسەر هەندێ ناوچەی رۆمە بێزەنتییەکان و، دەستی بەسەر دەستکەوتانێکی زۆر داگرت[١٦٨]، پیاوانێکی زۆری خێڵەکەیشی بەدەوریدا کۆبوونەوە، بەمەش بەهێزترو، دەسەڵاتیشی زیاتر بوو، توانی زاڵبێت بەسەر شارە گەورەکانی (جەزیرە)، بەوێنەی (میافارقین) و(حسن کیفا) و (ئامەد)و (ماردین)[١٦٩]، بەمەش بناغەی میرنشینێکی کوردی لە دڵی هەرێمەکە دانا، قەدەری وابوو، لەو رووداوانەی دواتر لەناوچەکە روویانداو، بەتایبەت لە ماوەی سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان وەکو هێزێکی سیاسی لە جیهانی ئیسلامی، ئەو میرنشینە رۆڵێک یاری بکات.

میر (باد)ی دامەزرێنەر ساڵی (٣٨٠ک/ ٩٩٠ز) کوژرا[١٧٠] بەمەش دەسەڵات بۆ خوشکە زاکانی گوازرایەوە، ئەوانەی بە (مەڕوانی)یەکان دەناسران، کە لەگەڵ میر (باد)بوون و، هاوبەشی بوون لە شەڕەکانی، لە دژی (حەمدانییەکان)، ئیتر گەورەترینیان

کە (ئەبو عەلی حەسەن)بوو، لە شوێنی خاڵۆیدا دەسەڵاتی گرتە دەست (٣٨٠-٣٨٧ک/ ٩٩٠-٩٩٧ز)، لێرەوەش ئیتر میرنشینەکە بە (مەڕوانی) ناسرا[١٧١].

بوونی میرنشینی مەڕوانی لەو شوێنە جوگرافییە پڕ لە مەترسییەو لە هەموو لایەکی دەورەدراو بەژمارەیەک هێزی سیاسی، گرنگییەکی تایبەتی بۆ زیاد کرد، هەروەها ئەو میرنشینە لە هەمان کاتدا، کاریکرد بۆ فراوانکردن و درێژکردنەوەی دەسەڵاتەکەی بۆ شارە هاوسنوورەکانی بەتایبەت لە شارە بێزەنتییەکاندا، بۆیە ئەم میرنشینە بووە سەرچاوەی نیگەرانی بۆ ئەو هێزانە، کە بەردەوام هەوڵیان دەدا، بۆ خۆ سەپاندن و بەهێزبوونی زیاتر..

لە ماوەی هێرشی (غەز)و دروستبوونی دەوڵەتی سەلجوقیش، میری ئەو میرنشینە، (نەسرولدەولە ئەحمەدی کوڕی مەڕوانی کوردی) بوو[١٧٢].

### ٤- میرنشینی (عەننازی)[١٧٣] (شازنجانی):

(میر ئەبولفەتح محەمەد کوڕی عەننازی کوردی) سەرۆکی هۆزی (شازنجانی) گەورە، ئەو میرنشینەی دامەزراند[١٧٤]، (مەسعودی) لەلای خۆیەوە (شازنجانی)ە لەنێو هۆزە کوردییەکانی دانیشتوانی هەرێمی (چیاکان)دا، ژماردووە[١٧٥].

تاکەکانی هۆزی (شازنجانی) دەستێکی باڵایان لە پاراستنی ڕێگەی (خوڕاسان) و وڵاتەکەیاندا هەبوو، لە دوژمنکاری چاوتێبڕیوان، ئەمەش هەر لە سەرەتاکانی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زاینی.

بووەیهییەکانیش لە سەرەتای سەردەمی خۆیاندا، پشتیان بە میرەکانی ئەو هۆزە بەست، بۆ پاسکردنی ناوچەکە، ئیتر سەرکردەکەیان (ئیبن و ئەبی شەوکی کوردی) لە ساڵی (٣٣٩ک/ ٩٥٠-٩٥١ز) پۆستی جێگرەیەتی بەسەر حەلوان و ڕێگەی خوراسان دا وەرگرت[١٧٦]، دوای ئەوەش میرە (شازنجانی)یەکان، مافەکانی ئەو پۆستەیان، بۆ توندکردنی باڵکێشانیان بەسەر ناوچەکەدا، بەکار دەهێنا.

لە سەرەتای دامەزراندنیدا، باری سیاسی میرنشینی عەننازی، بەهۆی ناکۆکی و ململانێ خێڵەکییەکانی لەگەڵ میرنشینی (حەسنەوەیهی) (٣٤٨-٤٠٦ک/٩٥٩-١٠١٥ز) جێگیر نەبوو، چونکە ململانێ لە نێوان میرەکانی هەردوو میرنشیندا باوی



سەندو دەستێوەردانی بووەیهییەکانیش ڕۆڵێکی ئاشکرای هەبوو، لە گەورەکردنی ئەو ناکۆکییانەی نێوان هەردوولا، لەبەرئەمە لە سەرەتادا میرنشینی (عەننازی) دەسەڵاتێکی دیاریکراوی هەبوو، تەنها بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەستی خۆی لە (حەلوان) و دەوروبەرەکەی کورت دەبووەوە[١٧٧].

دوای ئەوە میرە (شازنجانی)یەکان لە فراوانکردنی دەسەڵاتەکەیاندا سەرکەوتن، لەم ڕووەشەوە چاکەی گەورە بۆ دامەزرێنەری میرنشینەکە، میر (ئەبو لفەتح) دەگەڕێتەوە. ئەم میرنشینە لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، دەستی کرد بە باڵکێشان بەسەر چەندین ناوچەی هەرێمی چیاکان، بۆ ئەمەش روخانی میرنشینی (حەسنەوەیهی)ی لە ساڵی (٤٠٦ک/١٠١٦ز) بە هەلزانی[١٧٨]، ئیتر موڵکی حەسنەوەیهییەکان بۆ عەننازییەکان مایەوە، بەمەش وایلێهات میرنشینی (عەننازی) ئەم شارانەی خوارەوە لەخۆ بگرێت: (حەلوان)، (دینەوەر)، (قەرمێسین)، (شارەزوور)، (داقوق)، (سامیغان)، (خانەقین)، (بەندێجین)، (دسکەرە)و بێجگەی ئەوانەش[١٧٩].

### ٥- میرنشینی هەزبانی:

یەک لە میرنشینە کوردییەکانی دیکە، میرنشینی هەزبانییە، تاکەکانی ئەم هۆزە، سەرکەوتن لەوەی میرنشینێکی سەربەخۆ، بۆ خۆیان دابمەزرێنن، (ئەربل)یان کردە پایتەختی خۆیان، چونکە هەزبانییەکان هەر لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی[١٨٠]، لەو شارەدا نیشتەجێ دەبن و بۆ خۆیان دەست بەسەر قەڵاو ناوچەکانی دادەگرن. نزیکەی سەدەیەکیش بەم شێوەیە دەمێننەوە، تا پاشی ئەمە لەسەر دەستی ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) میرنشینەکەیان دەڕوخێت[١٨١].

میرنشینی هەزبانی، وەکو هەر میرنشینێکی تری کوردی، زانیاریی لە بارەیەوەی کەمە، گرنگترین کێشەیەکیش بۆ لێکۆڵەر، لە مێژووی ئەو میرنشینانە، ئەو بۆشاییە زەمەنییە درێژانەیە، کە تیایاندا هەواڵ لە بارەیان نییە.

مێژووی دەسەڵاتی هەزبانییەکان، تا ساڵی (٤٢٠ک/ ١٠٢٩ز) نادیارە، کە لە ماوەی ئەو ساڵەدا میری هەزبانییەکان لە هەولێر، میر (ئەبولهەیجای هەزبانی) بووە[١٨٢]، بەڵام سەرچاوەکان ئاماژە بۆ سەرەتاکانی سەردەمەکەی و ماوەی

فەرمانڕەوایەتی کردنەکەی ناکەن، هەر ئەوەندە دەڵێن: میر(عیسای کوڕی موسای هەزبانی) لە دوای خۆیدا، ئەو دادەنێت بۆ فەرمانڕەوایی کردنی میرنشینەکە[١٨٣]، رای ڕاستتریش ئەوەیە، کە (ئەبولهیجاء) نازناوی ئەو میرە بووە، نەک ناوی خۆی، بەواتا میر(موسا)ی باوکی (عیسا)و، (ئەبولهیجاء) هەردووکییان، هەر یەک کەسن و دوای مردنی باوک، (عیسا)ی کوڕی جێگەی گرتۆتەوەو لە شوێنیدا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.

ئەو میرنشینانەی – لە پێشتردا باسیان لێوەکرا –، واتە (شەدادی)و (ڕووادی)و (مەڕوانی)و (عەننازی)و (هەزبانی)، کە لەهەر چوار لای هەرێمە کوردییەکان بڵاوببوونەوە، دەکرێت، وەکو کیانی سیاسی سەربەخۆ، دامەزراو لەسەر بنەمای بەتین بۆ فەرمانڕەوایی ناوچەکانیان، بژمێردرێن، لەکاتی سەرهەڵدانی سەلجوقییەکانیش چەندین هێزی سیاسی پایە گەورەیان پێکهێناو لەگەڵیاندا، هاوچەرخ بوون و چوونە نێو پەیوەندی جۆراوجۆر.

بێجگە لەم میرنشینانە، لە وڵاتی کوردو قەڵاکانیدا، ژمارەیەک دەسەڵاتی خێڵەکی نیمچە سەربەخۆ بڵاوبۆوە، بەواتا ئەو دەسەڵاتانە نەگەیشتنە ئەو ئاستەی میرنشینی سەربەخۆ، بۆ خۆیان دابمەزرێنن، لە (دیارترینی ئەو دەسەڵاتانەش (جاوانی)[١٨٤]و (هەکاری)و (حەمیدی) و (بەشنەوی)یەکانن، هەروەها دەشێت سەرەتاکانی دامەزرانی میرنشینی (فەزلەوی) لە کوردستانی گەورەش، هەر بۆ ئەو ماوە زەمەنییە بگەڕێنینەوە[١٨٥].

### ب– باری میرنشینە کوردییەکان، لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی:

دوای خستنەڕووی، دیارترین ئەو میرنشینانەی، کە لە هەرێمە کوردییەکان، لە ماوەی سەدەی چواری کۆچی/ دەی زایینی، دامەزران و لە ماوەی سەردەمی سەلجوقیش هەر مانەوە، ئێستاکە کاتی ئەوەیە، ئاماژە بۆ باری ئەو میرنشینانە، لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، واتە ئەوکاتەی سەلجوقییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، تیای دەرکەوتن، بکەین، چونکە دەرکەوتنی سەلجوقییەکان، کاریگەری درێژ ماوەی، بەسەر ئاییندەی ئەو میرنشینانەدا هەبوو.



دەتوانین بڵێین، باری میرنشینە کوردییەکان، لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی بەشێوەیەکی گشتی ئارام بوو، هەروەها لە بەرەوپێشچوونێکی بەرچاودا بوو، چونکە نزیکەی پەنجا ساڵ بەسەر دامەزراندنیاندا تێپەڕی بوو، بەواتا قۆناغی بەهێزکردنی دەسەڵاتیان بڕیبوو و لەگەڵ هەموو ئەو کێشە و مەترسییانەی دەوری دەدان، هەرێمە کوردییەکان بەهۆی شوێنە جوگرافییە نزیکەکەیان لە هێزە نائیسلامییەکان، سەرچاوەی مەترسییەکی هەمیشەییان بۆ دروست دەبوو، جا میرنشینە کوردییەکان هەوڵیاندا مەترسییە لە خۆ نزیکەکانیان دووربخەنەوەو لەکارکردنیش بۆ دروستکردنی بارێکی ئارام، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت، هەر سەرکەون.

هەرچی تایبەتە بەمیرنشینی (شەدادی)، کۆمەڵێک میر بەدوای یەک فەرمانڕەوایەتییان گرتە دەست، لەوانە میر (فەضلون) (٣٧٥-٤٢٢ک/ ٩٨٥-١٠٣٠ز)[١٨٦]، ئینجا دوای ئەو (موسا)ی کوڕی و پاش ئەویش (لەشکری)[١٨٧]هاتن.

لەکاتی دەرکەوتنی سەلجوقییەکان و فراوانبوونەکانیان، لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا، میر (ئەبولئەسوار شاور)(٤٤١-٤٥٩ک/ ١٠٤٩-١٠٦٧ز)[١٨٨] میری میرنشینەکە بوو، کە بەدیارترین میرەکانی دادەنرێت و بە (پاشایەکی گەورەو دادگەرو ئازا) وەسف دەکرێت[١٨٩]، هەروەها پیاوێکی سیاسی خۆڕاگربووە، سەردەمەکەی ڕووداوی ترسناکی بەخۆوە دیوە، لە پێشەوەی هەموویان، ئەو شەڕانەی کە لە دژی ئەرمەن و ڕۆمە بێزەنتییەکان کردی[١٩٠]، بۆیە زۆرجار میرنشینی شەدادی ڕووبەڕووی مەترسی هێزە سیاسییەکانی دەوروبەری دەبووەوە، زیاد لە مانە (ئەبولئەسوار) هاوچەرخێتی سەلجوقییەکانیشی کرد.

بەڵام میرەکانی میرنشینی ڕووادی هەوڵی فراوانکردنی ناوچەکانی دەسەڵاتیان دا، بەپلە (یەک)یش، ڕوویان بەرەو شارەکانی ئەرمینیا بوو، بۆیە میرەکانی میرنشینەکە لەم ڕووەوە هێرشی زۆریان کرد[١٩١]، لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچیش میر (وەهسوزانی کوڕی مەملانی ڕووادی) فەرمانڕەوای میرنشینەکە بوو[١٩٢]، کە هاوچەرخێتی هێرشی (غەز)ەکانی بۆ سەر وڵاتەکەی خۆی کردو دواتر ڕووبەڕووی مەترسی سەلجوقی بووەوە. میر (وەهسوزان) ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوایێتیی کرد، باری میرنشینەکەشی لەڕووی سیاسییەوە ئارام بوو، چونکە ئەو کاری لەسەر گرنگیدان

بەهەردوو ئاستی ناوەوەو دەرەوەی دەکرد، بەڵام کەوتە ژێر پاڵەپەستۆیەکی گەورەی سەلجوقییەکان، چونکە دەستیان لە کاروبارەکانی ناوەوەی میرنشینەکە وەردا، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی سەربەخۆییەکەی بکەوێتە ژێر هەڕەشەو لاواز بێت.

لە (دیاربەکر)ی پایتەختی میرنشینی مەڕوانیش، میر (ئەحمەدی کوڕی مەڕوان)ی ناسراو بە (ناسرلدەولە)، پۆستی میری میرنشینەکەی گرتە دەست و، لە (٤٠١-٤٥٣ک/ ١٠١١-١٠٦١ز) فەرمانڕەوایێتی کرد[١٩٣]، شایانی باسە هاتنە سەر تەختی (ناسرولدەولە) لە دوای کوژرانی (مومەهیدولدەولە)ی برای بوو، وەکو دەربش دەکەوێت، بەکوژرانی ئەمەی دووەم، کێشەو شڵەژانێک روو لە شارەکانی میرنشینەکە دەکات، بەڵام میر (ناسرولدەولە) توانی بەسەر ئەو بارەی دیاربەکرو شارەکانی تریدا زاڵبێت و کاروبارەکانی هێنایەوە باری ئاسایی خۆی[١٩٤].

(ناسرولدەولە) لەسەر بنەمای بەهێز، دەستی بەرێکخستنی کاروباری میرنشینەکەی کرد، (والی) لە شارەکاندا دانان و فەرمانبەری بەتواناشی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دامەزراند[١٩٥]، لەبەرئەوەش لەسەردەمی (ناسرولدەولە)دا، ئەو میرنشینە گەیشتە لوتکەی پێشکەوتنی سیاسی و ئابووری، بۆیە دانپێنانی ولاتانی دەوروبەری بەدەست هێناو، خەلیفەی عەباسی ناونیشانی (ناسرولدەولە)ی پێدا[١٩٦]، هەروەها خەلیفەی فاتیمی (حاکم بیئەمروڵڵا)ش (٣٨٦-٤١١ک/ ٩٩٦-١٠٢٠ز) بەرەسمی دانی پێدانا، جگە لە دانپێنانی (ئیمپراتۆری بیزەنتی)ش[١٩٧].

زۆربەی مێژوونووسانیش بەفەرمانڕەوایێتی ئەو میرە هەڵدەڵێن، کە میرنشینەکەی خستبووە چ ئاشتی و ئارامی و بارێکی خۆشی ئابووری، (ئیبن و کەثیر) لە بارەیەوەی دەڵێت: (وڵاتەکەی لەسەرجەم وڵاتان بەئاسایشتر و خۆشترو، زۆرتریش دادگەری تیابوو)[١٩٨].. (زەهەبی)ش پیایدا هەڵدەڵێ و دەڵێت: (ئاقڵ و رژدو دادگەر بوو)[١٩٩].. (ئیبن و خەلەکان)یش زیاد لە مانە دەڵێت: (پیاوێکی دڵخۆش و هیممەت بەرزو سیاسەت باش و زۆر لەسەر شتی خۆی سوور بوو)[٢٠٠].

هەرچی تایبەت بەمیرنشینی (عەننازی)شە، ئەوا ئەگەرچی کێبڕکێی حەسنەوەیهییەکانیشیان لە دژدا نەما، بەڵام باری سیاسیی هەر جێگیرنەبوو، چونکە میرنشینەکە لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی، لە ئەنجامی ململانێی نێوان میرەکانی



لەسەر وەدەست گرتنی دەسەڵات، باری سیاسیی زۆر نائارامی بەخۆوە بینی، لەسەرەتای ئەم سەدەی ئاماژەی بۆ کرا، فەرمانڕەوایێتی میرنشینەکە بەدەست میر حیسامولدەولە (ئەبولشەوک) بوو، کە هاوچەرخێتی هێرشەکانی (غەز)ی بۆ سەر وڵاتەکەی کرد، مردنیشی لە ساڵی (٤٣٧ک/ ١٠٤٦ز) کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، لەسەر دروستکردنی ململانێی توند لەنێوان تاکەکانی ئەو بنەماڵە دەسەڵاتدارە، لە بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، بۆیە (موهەلهیلی) کوڕی (ئەبولفەتح)ی برای، لە هەڵومەرجێکی ئەوپەڕی خراپدا کاروبارەکانی گرتە دەست، لە لایێکی دیکەوە، میرنشینەکە دووچاری مەترسی هێرشەکانی سەلجوقییەکانیش بووەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو بارانەش (موهەلهیل) توانی پارێزگاری لە دەسەڵات و لە میرنشینەکەیشی بکات[٢٠١].

بەڵام میرنشینی هەزبانی لە (ئەربل)و دەوروبەری، تەمومژێک بەسەر مێژووی میرەکانی و، ریزبەندی دەسەڵات گرتنە دەستی میرەکانی، دەکەوێت، لە ساڵی (٤٣٧ک/ ١٠٤٦ز) میر (عیسای کوڕی موسای هەزبانی)[٢٠٢] فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی کردووە، وا دەردەکەوێت، میرنشینەکە بەدەست ململانێیەکی ناوەخۆی، نێوان تاکەکانی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکەی، لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات، نالاندبی، ئەم بارەش رێ بۆ ئەوە خۆش دەکات، هەندێ هێزی سیاسی و بەتایبەت عەقیلییەکانی خاوەنی مووسڵ[٢٠٣]، دەست بخەنە نێو کاروبارەکانی ناوەخۆی، چونکە میرنشینی هەزبانی سۆزی بۆ عەقیلییەکان هەبوو.

ئەم دەستێوەردانەی عەقیلییەکانیش، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، لەسەر چالاککردنی ناکۆکییەکانی نێوان میرە هەزبانییەکان، بۆیە لەکاتی دەرکەوتنی سەلجوقییەکان، بارەکانی ئەم میرنشینە چەسپاوو جێگیرنەبوو، بەپێچەوانەی ئەوەی کەوا میرنشینەکانی دیکە لەسەری بوون.

بەر لە دەرکەوتنی سەلجوقییەکانیش، ئەو میرنشینە باری زۆر مەترسیداری بەخۆوە بینی، میر(موسا)ی ناسراو بە(سالار) بەرەو عەقیلییەکان هات، لە گوتەی سەرچاوەکان ئەوە دەردەکەوێت، کە لە ساڵی (٤٣٧ک/ ١٠٤٦ز) (عیسا) لەلایەن کوڕە برایێکی خۆی دەکوژرێت، جا کاتێک (سالار) بەو هەواڵە دەزانێت، لەگەڵ (قەرواشی عەقیلی) بەپەلە بەرەو (ئەربل) دێتەوە، تیایدا لە شوێن برا کوژراوەکەی، دەست بەسەر

کاروبارەکاندا دەگرێت[٢٠٤].

لە ساڵی (٤٤٠ک/ ١٠٤٩ز)یش فەرمانڕەوای ئەو میرنشینە، میر ئەبولحەسەنی کوڕی موسەکی هەزبانی) بووە [٢٠٥]، کە دواتر ناکۆکییەک لە نێوان خۆی و (ئەبو عەلی) برای دروستبوو، سەرەنجام بووە هۆی دوورخستنەوەی (ئەبولحەسەن) لە فەرمانڕەوایی و (ئەبو عەلی کوڕی موسەک)ی برای کاروبارەکانی (ئەربل)ی گرتە دەست.. ئەمەی دواییش هاوچەرخی ماوەی دەرکەوتنی سەلجوقییەکان و باڵکێشانیان بوو، بەسەر هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەو میرەی دواییش واتە (ئەبو عەلی)، لە دەسەڵاتدا مایەوە، چونکە چووە ژێر گوێڕایەلیکردن بۆ سەلجوقییەکان[٢٠٦].

بەڵام باری سەرکردایەتییە خێڵەکییە نیمچە سەربەخۆو بڵاوەبووەکان لە قەڵاکانی وڵاتی کورد، ئەوەی لە بارەیان گوتراوە، کەمە، هۆکەش بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە، کە ئەم سەرکردایەتییانە، نەیانتوانیوە میرنشینی خێڵەکی بۆ ماوەیی دابڕاوو بچوک لە قەڵاکانی وڵاتی کورددا، دروست بکەن، ئەوەی سەرنج راکێشیش بێت، دەسەڵاتی ناوەندی خەلافەتی عەباسی، دەستی نەگەیشتۆتە ئەم سەرکردایەتییانە، بۆیە بۆ چەندین سەدەی بەدوای یەک، توانیویانە پارێزگاری لە فەرمانڕەوایێتی خۆیان بکەن، سەلجوقییەکانیش هەوڵیان نەداوە نەیانهێڵن، چونکە سەرکردایەتی خێڵەکی بچووک بووینەو هیچ مەترسییەکیان بۆ سەر دەسەڵاتی ئەوان دروست نەکردووە.



## پەراوێزەکانی پێشدەستی

١- زاراوەی کوردستان، لەسەرچاوە مێژوویی و جوگرافییەکانی ماوە زەمەنیەکەی لێکۆڵینەوەکەمان (٤٢٠-٥١٢ک/١٠٢٩-١١٢٧ز) نەهاتووە، لەبەرئەوە پێویستیەتی لێکۆڵینەوەی زانستی، ئەوە دەخوازێت لە ناواخنی نامەکەدا بەکاری نەهێنین، بۆیە لە باتی ئەمە، زاراوەی -وڵاتی کورد- بۆ ئەو هەرێمانە بەکاردێنین، کە لەماوەی ئاماژە بۆ کراوی سەروودا، کوردیان تیا نیشتەجێ بووە، ئەگەرچیش زاراوەی کوردستان لە خەڵکی ناوچەکە نامۆ نەبووە، بۆ یەکەم جار ئەم ناوە، لەناوەراستەکانی سەدەی حەوتی کۆچی/سێزدەی زاینی بۆ وڵاتی کورد بەکارهێنرا، ئەو هەرێمەی ئەو ناوەی خرایە سەر، هەرێمێکی کارگێری بوو، شارەکانی رۆژئاوای هەرێمی چیاکانی دەگرتەوە، لەگەڵ شانزە شارو شارۆچکە، پایتەختەکەی قەڵای (بیار)ی باکوری هەمەدان بوو.. لەنێوان لێکۆڵەرانیش ئەوەباوە، کە یەکەم کەس ئەو زاراوەی بەکارهێنا، مێژوونووس و شارناسی فارسی (حەمدوڵلای مستەوفی قەزوینی) مردوو لە (٧٥٠ک/١٣٤٩ز) بوو، ئەمەش لە کتێبەکەیدا (نزهة القلوب)، یەک لە لێکۆڵەرەوانیش گەیشتە ئەو رایەی، کە (قەزوینی) یەکەم کەس نەبووە، ئەو زاراوەیەی بەکارهێنابێ، بەڵکو وشەی (کوردستان)، لە نووسراوەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتی کۆچی/سێزدەی زاینی، چەندین جار هاتووەو هەندێ لە مێژوونووس و گەریدەکان بە دەیان ساڵ بەپێش (قەزوینی) کەوتونە، لە بەکارهێنان و تۆمارکردنی وشەی کوردستان لە کتێبەکانیان، ئەوەتا گەریدەی ئیتالی(مارکۆ بۆلۆ) Marco Polo، کە لە (٧٢٣ک/١٣٢٣ز) مردووە، کە دەستی کردبوو، بە گەشتێک بۆ هەرێمەکانی رۆژهەڵات ساڵی (٦٧٠ک/١٢١٧ز)، لە گەشتەکەیدا باسی لە وشەی کوردستان کردووە، هەروەها مێژوونووسی مەغۆل (رەشیدەدین فەزلوڵلای هەمەدانی) مردو لە (٧١٨ک/١٣١٨ز)، لە کتێبەکەی خۆیدا (تأريخ المغول)، زیاتر لە جارێک وشەی کوردستانی بەکارهێناوە، واش دەردەکەوێت، کە ئاماژەی مێژوونووسان و شارناسان بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە بدات، کە وشەی کوردستان، ئەو ساکە لەنێو کورداندا هەبووەو بەکارهێنراوە، ئەمەش ناوێکی نەتەوەییە، مەبەست لێی وڵاتی کوردە.. بڕوانە:

گەشتی مارکو بولو، وەرگێڕانی (عەبدولعەزیز جاوید)، میسر، ١٩٧١ز، لاپەڕە (٤٥)؛ نزهة القلوب، (تهران، ١٣٣٦ ه.ش)، لاپەڕە (١٢٧)؛ جامع التواريخ، وەرگێڕانە عەرەبییەکەی، قاهیرە، (د.ت)، لاپەڕە (٢٦١)؛ باسيل نيكيتين، الاكراد اصلهم وتأريخهم، (بيروت، ١٩٥٨)

لاپەڕە (٢٥)؛ بۆ زیاتریش زانیاری لەسەر ئەو بابەتە، بڕوانە: زرار سدیق تۆفیق، کوردستان في القرن الثامن الهجري، نامەیەکی دکتۆرایە چاپ نەکراوە، (زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٩ز)، لاپەڕەکانی (١٢-١٤).

٢- محەمەد ئەمین زەکی، خلاصة تاريخ الكرد و كردستان، وەرگێڕانی: محەمەد عەلی عەونی، (بەغداد، ١٩٦١ز) لاپەڕە (٣٥٥)؛ زرار سدیق تۆفیق، الكورد في العصر العباسي، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٤ز)، لاپەڕە (١٢).

٣- ئەو هەرێمانەی کوردیان تیا بلاوبووەوە، وەکو لە سەردەمی عەباسییەکاندا کورد بەزۆری تیایان نیشتەجێ بوون، لە سنورو چوارچێوەی ولاتەکەیان نەبوون.. بڕوانە: ئەلئوسطەخری، مسالك الممالك، (لیدن،١٩٢٧ز)، لاپەڕە (٩٩،٩٨)؛ ئیبنو لفەقیهـ ئەلهەمەدانی، مختصر كتاب البلدان، (لیدن،١٣٠٢ك)، لاپەڕە (٢٠٣-٢٠٤)؛ ئیبنو لحەوقەل، صورة الارض، (بیروت، ١٩٧٩ز)، لاپەڕە (٢٤٠)؛ مقدمة ابن خلدون، القاهرة، لاپەڕە (٥٨)، (بەبێ ساڵی چاپ).

٤- (الكرد في الدينور وشهرزور خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين)، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی بەغداد، ١٩٧٥ز).

٥- اذربيجان، دراسة في احوالها السياسية والحضارية (٤٢٠-٦٥٤ك/١٠٢٩-١٢٥٦ز)، نامەیەکی دکتۆرای بلاونەکراوەیە، (زانکۆی بەغداد، ١٩٨٤ز).

٦- (الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام)، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩١ز).

٧- (الشداديون في بلاد اران) لە ٣٤٠ تا ٥٩٥هـ/٩٥١-١١٩٨م، دراسة سياسية، حضارية، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەددین- ١٩٩٠ز).

٨- (الحياة العامة في ارمينيا)- دراسة في اوضاعها الادارية و الإجتماعية والاقتصادية (٣٠هـ/٦٥١م- ٢٤٧هـ/٨٦٢م)، نامەیەکی دکتۆرای بلاونەکراوەیە، (زانکۆی بەغداد- ١٩٧٩ز).

٩- (لورستان الكبرى)، (٥٥٠-٨٢٧هـ/ ١١٥٥-١٤٢٤م) نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٤ز).

١٠- بڕوانە: زرار صدیق تۆفیق: الكرد في العصر العباسي؛ نیشتمان بەشیر محەمەد، الاحوال السياسية والاجتماعية والاقتصادية لغربي اقليم الجبال، خلال القرن الرابع والخامس الهجريين)، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٤ز).



١١- لە بارەی ئەم گۆڕانکارییانە، بڕوانە: لستەرنج: بلدان الخلافة الشرقية، وەرگێڕانی: بەشیر فرەنسیس و، گۆرگیس عەواد، (بەغداد، ١٩٩٤ز)، لاپەڕەکانی (٢٢٧-٢٨٨)؛ كردستان في القرن الثامن الهجري، لاپەڕە (١٦).

١٢- مەسعودی و مەقریزی ناوی ژمارەیەک هۆزی کوردیان هێناوە، ئەوانیش هۆزەکانی (بازنجان) و (شوهنجان) و (شازنجان) و(نشاورە) و(بوزیکان)و (لوڕ)و (جورقان)و (جاوان)و (بارسیان)و (جەلالی)و (مەستەکان)و (جابارقە)و (جروغان)و (کەیکان)و (ماجەردان)و (هەزبانی)و (سیرلجی)و (مەهرانی)و (زەرزاری)و(حەمیدی)و (بەشنەوی)و بێجگەی ئەمانەن، (التنبيه والاشراف)، (بیروت، ١٩٨١م) لاپەڕە (٩٤)؛ مروج الذهب، شرۆڤەکردنی (موفید محەمەد قەمیحە)، (بیروت، ١٩٨٦م) بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥)؛ السلوك: ساغکردنەوەی (محەمەد عەبدولقادر عەتا)، (بیروت، ١٩٧٧م)، ج١، لاپەڕە (١٠١)؛ (مەسعودی)ش دەڵێت: (هەر جۆرێکی کورد، زمانێکی کوردی تایبەت بەخۆیان هەیە)، مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٣).

١٣- بەچیاکان ناسراوە، چونکە زۆرینەی چیایە بەرزە سەرکەشەکانن: (ئیبنو لحەوقەل): صورة الارض، لاپەڕە (٣١٥).

١٤- ئێستاکە، کوردستانی رۆژهەڵاتی، ئێرانی، دەگرێتەوە.

١٥- (ئیبنو خەرداذبە)، المسالك والممالك، (بریل، ١٨٨٩ز)، لاپەڕە (٥٧)؛ (ئیبنو لفەقیهـ ئەلهەمەدانی): مختصر كتاب البلدان، لاپەرە (٢٠٩)؛ (مەقدسی)، احسن التقاسيم، (لیدن، ١٩٠٦)، لاپەڕە (٣٨٤)؛ دانەرێکی نەناسراو، دەستنوسی (خلاصة عجائب البلدان)، (دار صدام للمخطوطات). بەغداد، لەژێر ژمارەی (٣٣٧٢)، (٢٦).

١٦- (لسترنج)، بلدان الخلافة الشرقية، لاپەرە (٢٢٠)؛(بەدری محەمەد فەهد): تاريخ العراق في العصر العباسي، الاخير (بغداد، ١٩٧٣ز)، لاپەڕەکانی (٨-١٠).

١٧- معجم البلدان، دار صادر، بیروت، (بەبێ ساڵی چاپ)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٩٩).

١٨- (یەعقوبی)، كتاب البلدان، (بریل، ١٩٨٢ز)، لاپەرە (٢٦٩)؛ (ئیبنورستە: الاعلاق النفسية، (لیدن، ١٨٩١ز)، لاپەرە (١٦٦)؛ (ئیدریسی)...: نزهة المشتاق، (بەبێ ساڵی چاپ) لاپەڕە (٢٢٩)؛ معجم البلدان: بەشی دووەم، لاپەڕە (١٠٣)؛ (ئەبو لفیداء): تقويم البلدان، (باریس، ١٨٤٠ز)، لاپەرە (٤٠٨).

١٩- البلدان، لاپەرە (٢٣٤).

٢٠- صورة الارض، لاپەڕە (٣٠٦).

٢١- مسالک الابصار، دەستنوسێکی وێنەدارە، کۆڕی زانیاری عێراقی، بەغداد، لە ژێر ژمارەی (٢/ ٢٧٩٧)، سفری سێیەم، ١٢٦؛ (قلقشەندی: صبح الاعشی، راڤەی: محەمەد حوسێن شەمسەدین، (بەیروت، ١٩٨٧، لاپەڕە (٣٦٦).

٢٢- هەمەدان، لە شارە گەورەکانی هەرێمی چیاکانە، دەکەوێتە ناوەڕاستی، لەسەر ڕێگەی (حەج)و کاروانچیان، شەست و حەوت فەرسەخ لە حەلوان دوورە، کە هەر فەرسەخێک بەنزیکەی شەش کلیۆمەتر یەکسانە؛ (ئەبو لفیداء): تقویم البلدان، لاپەرە (٤١٧)؛ (قلقشەندی): صبح الاعشی، بەشی چوارەم لاپەڕە (٣٧٠)؛ (هنتس ڤالتەر)، المکاییل و الاوزان الاسلامیة، وەرگێڕانی: ئەمەل ئەلعەسەلی، (عمان، ١٩٧٠ز)، لاپەرە (٩٤).

٢٣- نەهاوەند دەکەوێتە باشوری شاری هەمەدان، نێوانیان چواردە فەرسەخە، نزیکەی ٨٤ کیلۆمەترە.. (رحلة بنیامین التتیلي)، وەرگێڕانی: عەزرا حەداد، (بەغداد، ١٩٤٥ز)، لاپەرە (٩٤).

٢٤- دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری گەنکورو قرێمسین؛ (لسترنج): بلدان الخلافة الشرقیة، لاپەڕە (٢٢٤)، تا کاتی ئێستاش پاشماوەکانی ماوە لە ڕۆژئاوای گەنکور؛ محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی: (دینور و مشاهیرها)، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (٦)، ١٩٧٨ز، لاپەرە (١٥٣).

٢٥- دەکەوێتە نێوان حەلوان و هەمەدان، لەوەی دووەم سی فەرسەخ، نزیکەی (١٨٠) کیلۆمەتر دوورە؛ (ابن الاثیر): اللباب، بەشی سێیەم (بیروت، ١٩٨٠ز)، لاپەرە (٢٨).

٢٦- لە بارەی شوێنی شارەکانی (ماسەبدان)و (سیروان)و (حەلوان)و (سیسر)و شارەکانی دیکە، بڕوانە: نەخشەی ژمارەی (١)، کە، کەوتۆتە پاشکۆی ئەو کتێبە.

٢٧- لەسەر میرنشینی عەننازی، بڕوانە: لاپەڕەکانی (٤٠-٤١)ی دەقە عەرەبییەکە.

٢٨- ئیبنو عەبدورەب: العقدالفرید، ساغکردنەوەی: محەمەد سەعید ئەلعوریان، (بەیروت، ١٩٤٥ز)، بەشی حەوت، (٣٧٥)؛ صورة الارض، لاپەڕە (١٨٩)؛ بەکری، معجم ما استعجم، ساغکردنەوەی: مستەفا ئەلسەقا، (القاهرة، ١٩٤٧ز)، ج ٢، لاپەڕە (٣٨١)؛ معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەرە (١٣٤)؛ قەزوینی: آثار البلاد، دار صادر، بیروت بەساڵی چاپ، لاپەڕە (٣٥١)؛ الظاهري: زبدة کشف الممالك، (پاریس، ١٨٩٤ز)، لاپەڕە (٥٠)؟.

٢٩- ئەم زاراوەیە هەریەکە لە (مەقدسی)و (یاقوتی حەمەوی) بەکاریان هێناوە، بڕوانە: احسن



التقاسیم، لاپەرە (١٣٦)؛ معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٤).

٣٠- واتای نێوان دوو زێیەکان دەگەیەنێت، بۆ زیاتر زانیاریش لە بارەی ئەم ناوانە، بڕوانە: محەمەد جاسم حەمادی: الجزیرة الفراتیة والموصل، (بغداد، ١٩٧٧ز)، لاپەڕەکانی (٣٦-٣٨)؛ هەروەها: (سەوادی عەبد محەمەد: الاحوال الاجتماعیة والاقتصادیة في بلاد الجزیرة الفراتیة، (بغداد، ١٩٨٩٨ز)، لاپەڕەکانی (٣٣-٣٥).

٣١- ئیبنو خەردزابە: المسالك والممالك، لاپەڕە (٩٥)؛ ئیبنو رستە: الاعلاق النفسیة، لاپەڕەکانی (١٠٦-١٠٧).

٣٢- تۆفیق: الکرد فی العصر العباسی، لاپەڕەکانی (٢٤-٢٥).

٣٣- Hadual AL ALam, Translated and explained by V. Minorsky, London, 1937, P48, عەبدولعەزیز ئەلدوری: تاریخ العراق الاقتصادي في القرن الرابع الهجري، (بەغداد، ١٩٤٨ز)، لاپەڕە (٦)؛ حەمادی: الجزیرة الفراتیة والموصل، لاپەڕە (٣٩).

٣٤- حەمادی: الجزیره الفراتیه والموصل، لاپەڕە (٤١).

٣٥- المقدمة، لاپەڕە (٦٥).

٣٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٧- حەمادی: الجزیرة الفراتیة والموصل، لاپەرە (١٧٢).

٣٨- زەینەفون: حملة عشرة الاف فارس، وەرگێڕانی: یەعقوب ئەفرام مەنسور، (موصل، ١٩٨٥ز)، لاپەڕەکانی (١٦٦-١٨١)، درایڤەر: الکرد في المصادر القدیمة، وەرگێڕانی: فوئاد حەمە خورشید، (بەغداد، ١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٣١)؛.

Ency of islam, Art - kurd, Vol. 5 , p447...

جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئەو ناوچەیە، ئەو ساکە بەناوانی دیکە دەناسرا، لەماوەی چەرخەکانی تری دوای هێرشەکەی (زەینەفون)یش، بەناوی(کوردئین) لەلای مێژوونووسانی ڕۆمان و لەسەرچاوە سریانییەکانیش بە (کاردۆ) ناسراوە.. بڕوانە: جەمال ڕەشید: دراسات کردیة في بلاد سوبارتو، (بەغداد، ١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٦٦).

٣٩- تۆفیق: الکرد في العصر العباسي، لاپەڕە (٢٦).

٤٠- الاکراد، وەرگێڕانی: مارف خەزنەدار، (بەغداد، ١٩٦٨ز)، لاپەڕە (١٤).

٤١- ئەلهەمەزانی: صفة جزیرة العرب، ساغکردنەوەی: محەمەدی کوڕی عەلی ئەکوەع، (صەنعاء،

١٩٨٣ز)، لاپەڕە (٢٤٧)؛ معجم البلدان، ج٢، لاپەڕە (٤٥)؛ شەیخ ئەلرەبو ئەلئەنصاری، نخبە الدهر، (لاییزک، ١٩٢٣ز) لاپەڕە (٢٥٥).

٤٢- صفه جزیره العرب، لاپەڕە (٢٤٧).

٤٣- فەیروز ئابادی: القاموس المحیط، (بەیروت، ١٩٩١ز)، ج٣، لاپەڕە (٥٥٣)؛ ئەلزەهەبی: المشتبه فی الرجال اسمائهم وانسابهم، ساغکردنەوەی: عەلی مەحمود ئەلبجاوی، (قاهیرە، ١٩٦٢ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٣).

٤٤- ئیبن و خەلەکان: وفیات الاعیان، ساغکردنەوەی: ئیحسان عەباس، (بەیروت، ١٩٦٨ز)، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٤٣)؛ (مارکۆ بۆلۆ)ی گەڕیدە، دەڵێت: بەشە چیاکانی باکووری موسڵ، رەگەزێکی مرۆڤ تیایدا دادەنیشن، پێیان دەگوترێت: (کورد)، هەندێکیان موسڵمانن و ئەوانی دیکەیان (مەسیحی)ن..؛ رحلة مارکو پولو، لاپەڕە (٣٦).

٤٥- کە بەجۆلەمێرگی ناونراوە، درانە پاڵە بۆ ناوچەی جۆلەمێرگ لە جەزیرە؛ مسالک الابصار، (١٣٢)؛ صبح الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧٧).

٤٦- بۆیە بە (داسنییەکان) ناسران، چونکە دانیشتووانی چیای (داسن)ی باکووری مووسڵ بوون، (یاقوت) لەبارەیانەوە دەڵێت: (خەڵکێکی زۆر لە تایەفەکانی کورد، پێیان دەگوترێت داسنییەکان).. یاقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (٤٣٢)؛ قلقشندی: صبح الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧٨).

٤٧- کوردە هەکارییەکان لە ناوچەکانی باکووری مووسڵ، لە ناوچەی هەکارو قەڵای ئاشب(عەمادییە) نیشتەجێ بوون.. فارقی، تاریخ امد ومیافارقین، ساغکردنەوەی: بەدەوی عەبدول لەتیف، (قاهیرە، ١٩٥٩ز)، لاپەڕە (٥٥)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٤٠٨).

٤٨- هۆزی (حەمیدی) ئەوساکە کۆمەڵێک قەڵای لە جەزیرەدا هەبوو، لەوانە قەڵاکانی (عەقر) و (شوش)، یەکەمیان بە (عەقری حەمیدی)یە ناسرا؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٣٩)؛ دەستنووسی: مسالک الابصار، و (١٢٧)؛ (قلقشندی): صبح الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧٥).

٤٩- (ئیبن و خەلدون) ئاماژە بۆ کوردی (حەسەنی)، ئەوانەی دەدرێنە پاڵ شاری (حەسەنیە)، (زاخۆی ئێستا) دەکات.. تاریخ ابن خلدون: (بەیروت، ١٩٨٦ز)، بەرگی چوارەم، لاپەڕە (٣١٩).

٥٠- هۆزی بەختی قەڵای زۆرو بەتینی هەبوو لە ناوچەی زۆزان.. معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە



(١٥٨)؛ سەلام حەسەن تاها: جزیرة ابن عمر، نامەییەکی ماجستێری بڵاونەکراوەیە، لە (زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩ز)، لاپەڕە (٣٧).

٥١- بۆ زانیاری زیاتر لە هۆزە کوردییەکانی دیکەو شوێنی تیا گیرسانەوەیان.. بڕوانە: زرار سەدیق تۆفیق: الزعماء واصحاب القلاع الکرد فی بلاد هکاری: گۆڤاری (مەتین)، (دهۆک، ١٩٩٥ز)، ژمارە(٤٧).

٥٢- میافارقین: ناودارترین شاری (دیاربەکر)ە، دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری رۆژهەڵاتی جەزیرەو دووری چەند فەرسەخێک لە باکووری رووباری (دیجلە)، بەشورە پتەوەکەی بەناوبانگە، ئەم شورەیەش یەک لەو هۆکارانەبوو، کە گرنگییەکی زیاتریان بۆ ئەو شارە درووستکردو هەر بەو هۆیەوەش بوو، کە میرە مەڕوانییەکان کردیانە پایتەختی خۆیان.. ئەلمە قدسی: احسن التقاسیم، لاپەڕەکانی (١٤٠-١٤١)؛ شاکر مستەفا، المدن في الاسلام، ١٩٨٨ز، لاپەڕە (١٠٠).

٥٣- لەبارەی شوێنی (ئامەد)و قەڵاکانی بڕوانە: لاپەڕە (٢٠٧) لە لێکۆڵینەوە عەرەبییەکە.

٥٤- جەزیرەی ئیبن و عومەر: یەک لە شارەکانی جەزیرەیەو دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە، بۆیە پێی دەگوترێت (دیجلە) چونکە لە سێ لاوە بە ئاو دەورەدراوە، سی فەرسەخ، یان (١٨٠) کیلۆمەتر، لەدووری (موسل) دەکەوێت؛ ئەلمەقدەسی: احسن التقاسیم، لاپەڕە (١٣٩)، شایانی باسە ئەم ناوچەیە تا سەردەمی خەلیفەی عەباسی (مەئمون)، هەر بە جەزیرەی کوردان ناو دەبرا؛ ئیبن و شەداد، الاعلاق الخطیرة، (دیمەشق، ١٩٧٨ز)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٧).

٥٥- حسن کیفا: لە شارە زۆر پارێزراوەکانی حەوزی دیجلەیە، دەکەوێتە نێوان جەزیرەی ئیبن و عومەر و میافارقین.. شترک: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی (حصن کیفا)، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١١).

٥٦- ماردین: قەڵایەکی پارێزراوە لەسەر لوتکەی چیاو هەمان ناوی هەیە، دەکەوێتە نزیک (خابوور)ی یەک لە زێیەکانی (دیجلە).. رحلة ابن جبیر، ساغکردنەوەی (حسێن نەسار)، (میسر، ١٩٥٥ز)، لاپەڕە (٢٧٧)؛ ویکرام: مهد البشریة: وەرگێڕانی (جەرجیس فەتحوڵلا)، (بەغداد، ١٩٧١ز)، لاپەڕە (٤٧)؛ فەیسەل ئەلسامر: الدولة الحمدانیة في الموصل وحلب، (بەغداد، ١٩٧٠ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٤١).

٥٧- لەبارەی شوێنی ئەو شارانە، بڕوانە: نەخشەکانی ژمارە(١) و (٢)، کە لە پاشبەندی کتێبەکەدا هاتوون.

٥٨- لەبارەی ناوی بنچی ئازەربێجـان و سنوورەکـانی و گـرنگتـرین شـارەکـانی ئەوهەرێمـە، بڕوانە: نەقشەبەندی: ئازەربێجان، لاپەڕەکانی (٣٤)و (٨٢)؛ (ئیبتیهال مالّوڵلا حوسێن): اذربیجان في صدر الاسلام، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە،(موسل، ١٩٨٨ز)، لاپەڕەکانی: (٢٢-٥٩)؛ دائرة المعارف الاسلامية الكبرى، (تەهران، ١٩٩١ز)، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١١١).

٥٩- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی ئازەربێجان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٦٣).

٦٠- ئازەربێجان، لاپەڕەکانی (٣٧، ٣٨).

٦١- ئەلئـەسـتـەخـری: مـسـالك المـمـالك، لاپەڕە (١٨١)؛ صـورة الارض: لاپەڕە (٢٨٥)؛ احـسـن التقاسیم، لاپەڕە (٣٧٤).

٦٢- ئەلبـلازەری: فـتـوح البلدان، سەلاحەدین مـونجـید بلاوی کـردۆتەوە، (قـاهیـرە، ١٩٥٧ز)، پاری یەکەم، لاپەڕە (٤٠٠)؛ ئیبنولفەقیە ئەلهەمەزانی، مختصر کتاب البلدان، لاپەڕە (٢٩٣)؛ معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٢٩).

٦٣- شاری سەلماس، یەکێکە لەو شارانەی هەزبانییەکان تیایدا نیشتەجێبوونەو فەرمانڕەواییان تێدا کردووە، لە یەک لەو گێڕانەوانەی (ئیبن و مەسکەویە) دەیگێڕێتەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەو هۆزە، لەو شارەدا نیشتەجێ بووەو فەرمانڕەوایی تێداکردووە، سەرۆکی ئەم هۆزەش لە شارەکەدا سوپایەک لە (جەمـاوەری هەزبانی) دروست دەکات؛ تجارب الأمم، (میـسـر، ١٩١٤ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٦٦).

٦٤- صورة الارض، لاپەڕە (٢٨٩).

٦٥- مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥).

٦٦- ئیبن و خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی (٧)، لاپەڕە (١٣٩)؛ موکریانی: ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٣٤).

٦٧- مینورسکی: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی ئازەربێجان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٠)؛ بارتۆلد: مادەی ئاران، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٦٩).

٦٨- مینورسکی: مادەی ئازەربێجان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٣).

٦٩- ئەلمەسعودی: التنبیه والاشراف، لاپەڕە (٧٨)؛ صبح الاعشی، بەشی چوارەم. لاپەڕە (٣٧٦)؛ مـینورسکی: دائرة المعـارف الاسـلامـیـة، مـادەی (ئەشنە)، بەشی (٣)، لاپەڕە (٤٤٣)؛ بۆ شـارەزابوونی زیاتر لەسـەرهۆزی (زەرزاری) و واتای زاراوەیی ئەو وشـەیەو ناوچەکـانی



تیابلاوبوونەوەیان، بڕوانە: نەقشەبەندی: ئازەربێجان، لاپەڕەکانی (١١٧، ١١٨).

٧٠- ئەلمەسعودی: مروج الذهب، بەشی(٢)، لاپەڕە (١٣٥)؛ دەستنووسی: مسالك الابصار، لاپەڕەکانی (١٢٥-١٢٦).

٧١- ئەلمەسعودی: مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥)؛ نەقشەبەندی: ئازەربێجان، لاپەڕە (١٢٢).

٧٢- دەستنووسی: مسالك الابصار، لاپەڕەی (١٢٦).

٧٣- خوێ: لە شارەکانی ئازەربێجانە، دەکەوێتە دووری بیست فەرسەخ، نزیکەی(١٢٠) کیلۆمەتر، لە باکووری ڕۆژئاوای تەبرێز.. ئەلئەستەخری: مسالك الممالك، لاپەڕە (١١٤)؛ (ئەبو ئەلفیداء): تقویم البلدان، لاپەڕەکانی (٣٩٦-٣٩٧).

٧٤- (سەلماس) دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای دەریاچەی ئورمییە، ئەمەش دوایین سنوورەکانی ئازەربێجانە لە ڕۆژئاوا؛ (ئەبو ئەلفیداء)، تقویم البلدان، لاپەڕە (٣٩٠).

٧٥- (ئورمییە): ناوی ئەم شارە بە شێوازی جۆراوجۆر هاتووە، لەوانە: (ئەرمییە) و (ئورمییە)، دانیشتوانە کوردەکەشی ناوی دەنێن (ورمێ)، نزیکەی هەشت کیلۆمەتر لە دەریاچەکەی دوورە.. ئیبن و خەردزابە: المسالك والممالك، لاپەڕە (١٢١)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٥٩).

٧٦- لە بارەی شوێنی ئەم شارانە، بڕوانە: نەخشەی ژمارە(٣) لە پاشبەندی ئەو کتێبە.

٧٧- ئەلئەستەخری: مسالك الممالك، لاپەڕەکانی (١٨٧-١٨٨)؛ معجم البلدان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٦٠)؛ تاها: الحیاة العامة في ارمینیا، لاپەڕە (٢٤)؛ (شترک): دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی ئەرمێنیا، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٣).

٧٨- شترک، دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی ئەرجیش، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٥٣٩)؛ Minorsky: studies in caucasain history, Combridge, 1953, P2.

٧٩- گەرەج: میللەتێکی نەسرانین، لە ولاتی (ئەبخاز) دادەنیشتن، کە ناوچە درێژەوە بووەکەی نێوان زنجیرە چیای (قەوقاس) و تا کەنارەکانی دەریای ڕەش دەگرێتەوە، سەرچاوەکان ناوی ولاتی (گەرەج) یان بەسەر ولاتی (ئەبخاز)دا دەبرد، ئەمەش چونکە بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا لە (ئەبخازیا) دەرکەوتن، لە سەرەتای چەرخی عەباسی و فەرمانڕەوایی ولاتی (گەرەج) یان کرد.. ئەلئەستەخری، مسالك الممالك، لاپەڕە (١٩١)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە

(٦٤)؛ نەقشەبەندی: آذربیجان، لاپەڕە (١٤٢)، پەراوێزی(١).

٨٠- لەبەر سنووره هاوبەشەکانی ئەرمێنیا لەگەڵ ویلایەتی دیاربەکر، بۆیە زۆرجار هەندێ لە شارەکانی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئەو هێزە سیاسیانەی کە لە (دیاربەکر) فەرمانڕەواییان دەکرد، ئەمەش لە رۆژانی فەرمانڕەوایی میرنشینی (مەڕوانی) کوردی روویدا، کە باڵیان بەسەر شوێنانی گرنگی هەرێمی هاو سنووری وڵاتەکەیاندا کێشا.

٨١- ئیبن و لفەقیە ئەلهەمەزانی: مختصر کتاب البلدان، لاپەڕە (٢٨٦)؛ ئەلقەزوینی: آثار البلاد، لاپەڕە (٤٩٥).

٨٢- لە بارەی شوێنی ئەو شارانە، بڕوانە نەخشەی ژمارە(٤)ی پاشبەندی ئەم کتێبە.

٨٣- تاها: الحیاة العامة في ارمینیة، لاپەڕەکانی (٢٤-٢٥).

٨٤- مینۆرسکی: الاکراد، لاپەڕە (١٤)؛ درایڤەر: الکرد في المصادر القدیمة، لاپەڕە (١٣)، ئەمین زەکی: الخلاصة، لاپەڕە (٣٨)؛ عەبدولرەقیب یوسف: الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی، (بەغداد، ١٩٧٢ز) بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٧).

٨٥- دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی ئەرمینیا، بەشی سێ، لاپەڕە (٣٣).

٨٦- لە بارەی هەواڵی کورد لە ئەرمێنیا لە ماوەی سەدەکانی یەکەمی کۆچی، بڕوانە: ئەلدینەوەری: الاخبار الطوال، ساغکردنەوەی: عەبدولمونعیم عامر، (قاهیرە، ١٩٦٠ز)، لاپەڕە (٤٠٦)؛ ئیبن و لئەثیر: الکامل في التاریخ (بەیروت، ١٩٧٨ز) بەشی هەشت، لاپەڕە (٥٣٩)، (ئیبن و لئەثیر) دەڵێت: (پاشاکانی ئەرمێنیا لە ئەرمەن و کوردانن).

٨٧- (دووین) یان (دبیل): لە شارە بەناوبانگەکانی ئەرمێنیایە، دەکەوێتە دوایین خاڵە سنوورییەکانی لەگەڵ ئێران، بنەماڵەی ئەیوبی کوردی دەدرێنە پاڵ ئەو شارە.. یاقوت: المشترک، لاپەڕە (١٧٥).

٨٨- ئیبن و خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی حەوت، لاپەڕە (١٣٩)؛ ئیبنولکەثیر: البدایة و النهایة، (قاهیرە، بەبێ مێژووی چاپبوون)، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٢٩٩)؛ شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە، وەرگێڕانی: مەلا جەمیل بەندی رۆژبەیانی، (بەغداد، ١٩٥٣ز)، لاپەڕە (١٢٥)؛ محەمەد ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیة، وەرگێڕانی: محەمەد عەلی عەونی، (بەغداد، ١٩٤٨ز)، لاپەڕە (١٦٧).

٨٩- ئەلبەلازەری: فتوح البلدان، بەشی یەک، لاپەڕە (٢٣٧)؛ یاقوت معجم البلدان، بەشی یەک، لاپەڕە (١٤٦).



٩٠- شەرەفنامە، لاپەڕەکانی (٣٨٧-٣٩١).

٩١- بێجگە لە (بەختی)، هۆزی (خاربەختی)ش لەو هەرێمە دەژیان، کە لە راستیدا چاکەی دامەزراندنی میرنشینی (مەڕوانی) کوردی بۆ میرەکانی ئەو هۆزە دەگەڕێتەوە، تاکەکانی ئەو هۆزە لە ناوچەکانی باشووری بەدلیسی، تا سنوورەکانی جەزیرە، نیشتەجێ بوون؛ ئەلفاروقی: تاریخ امدو میافارقین، لاپەڕەکانی (٤٩، ٥٠).

٩٢- (زۆزان): یاقوت لە بارەیەوە دەڵێت: ئاواییەکی نێوان ئەرمێنیا و ئازەربێجانە، قەڵای زۆرو پتەوی هۆزەکانی (بەشنەوی و بەختی)ی کوردی لەخۆ دەگرت.. معجم البلدان، بەشی(٣)، لاپەڕە (١٥٨)؛ فەیسەل ئەلسامر: الدولة الحمدانیة في الموصل وحلب، بەشی یەک، لاپەڕەکانی (١٥٢، ١٥٣).

٩٣- ماردینی بەهۆزی بەشنەوی کوردی دەڵێت: بەجنەوی.. بڕوانە: عەبدولسەلام ماردینی: تاریخ ماردین، دەستنوسێکی وێنەدارە، ئەستەمبۆل، لاپەڕەی(٢١١).

٩٤- یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەک، لاپەڕە (٤٢٩)، بەشی سێ، لاپەڕە (١٥٨).

٩٥- لە بارەی ناوچەکانی تیاژیانی ئەرمەن لە ئەرمێنیا، بگەڕێوە بۆ: تاها: الحیاة العامة في ارمینیە، لاپەڕەکانی (٤٩، ٥٠، ٦٣، ٧٠).

Studies in caucasian history, PP 24-27.

٩٦- شترک: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی ئەرمێنیا، بەشی سێ، لاپەڕە (٣٣).

٩٧- رحلة مارکو پولو، لاپەڕە (٣١).

٩٨- لورستان: ئێستاکە بەشێکی کوردستانی رۆژهەڵاتە، کە بێجگە لە لورستان ئەردەلان و ئازەربێجانی رۆژئاواش دەگرێتەوە.. عەلی سەیدۆ گۆرانی: من عمان الی العمادیة، (عمان، ١٩٣٩ز)، لاپەڕە (٢٢٢).

٩٩- لە بارەی ناوی بنجی لوڕ، بڕوانە: رەمەزان شەریف: لورستان الکبری، لاپەڕە (١٨).

١٠٠- ئەلئەستەخری: مسالك الممالك، لاپەڕە (٩٤)؛ ئیبن و لحەوقەل: صورة الارض، لاپەڕە (٢٣٢).

١٠١- ئیبن و لحەوقەل: صورة الارض، لاپەڕە (٢٣٢).

١٠٢- یاقوت: معجم البلدان، بەشی پێنج، لاپەڕە (٢٥).

١٠٣- لسترنج: بلدان الخلافة الشرقیة، لاپەڕە (٢٣٥).

١٠٤- ئەلئەستەخری: مسالك الممالك، لاپەڕە (٥١)؛ معجم البلدان، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٦).

١٠٥- لورستان الكبرى، لاپەڕە (٢٠).
١٠٦- (ئەیدەج): یەک لە شارەکانی لوڕستانی گەورەیە، لە هەرێمی چیاکان نزیکە و دەکەوێتە نێوان ئەهوازو ئەسفەهان.. یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەک، لاپەڕە (٢٨٨)؛ رحلة ابن بطوطة، ساغکردنەوەی: عەبدولهادی ئەلتازی (رباط/١٩٩٧ز)، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٢٤).
١٠٧- لە بارەی شوێنی ئەم شارانە، بڕوانە نەخشەی ژمارە(١)، کە لە پاشبەندی ئەم کتێبەدا هاتووە.
١٠٨- یاقوت: معجم البلدان، بەشی پێنج، لاپەڕە (١٦).
١٠٩- ئەلمەسعودی: مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥).
١١٠- دەستنووسی (مسالك الابصار)، لاپەڕەی(١٣٥).
١١١- صورة الارض، لاپەڕە (٢٣٢).
١١٢- تقويم البلدان، لاپەڕە (٣١٣).
١١٣- بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕە (٤٦)؛ ئەمین زەکی: الخلاصة، لاپەڕە (١٤).
١١٤- موسەعیری کوڕی موهەلهیل: الرسالة الثانية، ساغکردنەوەی: بوترس بولفاکوف و ئانس خالیدۆف، وەرگێڕانی: محەمەد مونیر موڕسی، (قاهیرە/ ١٩٧٠ز) لاپەڕە (٥٨)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٧٥).
١١٥- قودامەی کوڕی جەعفەر: الخراج وصناعة الكتابة، (بەغداد، ١٩٨١ز)، لاپەڕە (١٧٥)، یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٧٥)؛ مستەوفی قەزوینی: نزهة القلوب، لاپەڕە (١٢٧).
١١٦- پارێزگای کەرکوکی ئێستا.
١١٧- الرسالة الثانية، لاپەڕەکانی (٥٨-٥٩)؛ معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٧٥)، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤٤٩).
١١٨- هەریەکە لە نەقشەبەندی و فائیزە محەمەد عیزەت، بەدرێژی لە بارەی شارەکانی شارەزووریان نووسیوە، بڕوانە.. الكرد في الدينور، لاپەڕەکانی (٤٨-٨٤)؛ الكرد في الجزيرة وشهرزور، لاپەڕەکانی (٥١-٥٣).
١١٩- ئەلهەمەدانی، صفة جزيرة العرب، لاپەڕە (٢٤٧)؛ ئیبن و حەوقەل، صورة الارض، لاپەڕە (٣١٥)؛ یاقوت، معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٥٧)، ئەلقلقشندی: صبح الاعشى، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧٣).



١٢٠- بەغدادی: مراصد الاطلاع، ساغکردنەوەی: عەلی محەمەد ئەلبجاوی، (قاهیرە/ ١٩٥٤ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٨٢٢).
١٢١- لە بارەی جەلالییەکان لە شارەزوور، بڕوانە: الكامل، بەرگی هەشت، لاپەڕە (١٦٣)، (ڕووداوەکانی ٣١٤ک).
١٢٢- الكامل، بەشی حەوت، لاپەڕە (٣٣٣)، (ڕوداوەکانی ٢٦٦ک).
١٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، بەرگی هەشت، لاپەڕە (٧٠٥)، (ڕووداوەکانی ٣٦٩ک).
١٢٤- دەستنووسی (مسالك الابصار)، لاپەڕەی (١٢٦)؛ ئەلقلقشندی: صبح الاعشى، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧٤).
١٢٥- الرسالة الثانية: لاپەڕەکانی (٥٨-٥٩).
١٢٦- ئیبن و خەلەکان: وفيات الاعيان، بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (٢٥٥-٢٦١).
١٢٧- ئەلمەقدسی: احسن التقاسيم، لاپەڕە (٤٢٠)؛ یاقوت، معجم البلدان، بەرگی چوارەم، لاپەڕەکانی (٢٢٦-٢٢٧).
١٢٨- ئیبن و لفەقیە ئەلهەمەزانی: مختصر كتاب البلدان، لاپەڕە (٢٠٣)؛ ئیبن و خەردزابە: المسالك والممالك، لاپەڕە (٤٧)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم، لاپەڕەکانی (٢٢٦-٢٢٨).
١٢٩- بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە، بڕوانە: مسالك الممالك، لاپەڕەکانی (٩٨-١١٥)؛ صورة الارض، لاپەڕە (٢٣٦)؛ بۆ زیاتریش بڕوانە: ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر: ذكر الاكراد في كتابات المسلمين الاوائل، گۆڤاری (كلية الآداب)، زانکۆی بەغداد، ژمارە (٢٤)، (١٩٧٩ز)، لاپەڕەکانی (٣٣١-٣٤٢).
١٣٠- شەیخول ڕەبوە ئەلئەنصاری: نخبة الدهر، لاپەڕە (١٧٩).
١٣١- وەکو تێبینی دەکرێت، لە دانراوەکانی شارناسانی دوایی، سنوورەکانی بە وردی دەستنیشانکراون، لە باکوورییەوەی چیاکانی قەوقاس سنووریان بۆ دروست دەکرد، لە باشووریش هەرێمی ئازەربێجان و ڕووباری ئاراس (الرس) جیاکەرەوەیەکی سروشتی نێوانیان بوو، لە ڕۆژهەڵاتیەوەشی دەریای قەزوین (الخذر) و لە ڕۆژئاواشیەوە ئەرمینیا و وڵاتی گەرەج هاوسنووری بوون.. یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٣٦)؛ المشترك وصفا، لاپەڕە (١٩)؛ ئیبن و لوەردی: فريدة العجائب وفريدة الغرائب، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (١١٠).
١٣٢- فتوح البلدان، پاری یەکەم، لاپەڕە (٢٣٧).

١٣٣- احسن التقاسيم، لاپەڕەکانی (٣٧٤-٣٧٥).

١٣٤- ئەحمەد کەسرەوی: شهریاران گمنام، (تەهران، ١٩٣٠ز)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٧٣)؛ ڕەسول: الشدادیون، لاپەڕە (٤٠).

١٣٥- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی ئاران، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٥٦٩-٥٧٢).

١٣٦- قەزوینی: اثار البلاد، لاپەڕە (١٢٥)؛ ئەبولفیداء: تقویم البلدان، لاپەڕە (٣١١)؛ ئەلقلقشندی، صبح الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٨٨).

١٣٧- (جوند نیسابور) یەک لە شارە کۆنەکانی خوزستانە، سابوری کوڕی ئەردەشێر بینای کردووە.. یاقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٠).

١٣٨- رامهورمز: یەک لە ئاواییەکانی ئەهوازی وڵاتی خوزستانە، زۆرینە بە (رامز) ناویان دەبرد.. یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (١٦)؛ ئەبولفیداء: تقویم البلدان، لاپەڕە (٣١٩).

١٣٩- داربان: لەسەرچاوە جوگرافییەکاندا دەستنیشانی شوێنەکەی نەکراوە، بەڵام لە درێژەی باسەکان، وا دەردەکەوێت لە نزیکی ئەهوازەوە بووبێت.. تەبەری: تاریخ الرسل والملوك، ساغکردنەوەی: محەمەد ئەبو لفەزل ئیبراهیم، (قاهیرە، ١٩٧٧ز)، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٤٥٤-٤٥٥)؛ ئەم مێژوونووسە هەر بە ئاماژە کورتەکانی، بەگوتەی (کوردە داربانییەکان) واز دێنێ، (ڕووداوەکانی /٢٦٦ک)؛ ئیبن ولئەثیر، الکامل، بەشی حەوت، لاپەڕە (٣٣١).

١٤٠- لە بارەی بوونی کورد لە ماوەی سەدەی چواری کۆچی، لە هەرێمی فارس، بڕوانە: مەسکەویە: تجارب الامم، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٢١)، (ڕووداوەکانی/٣٣٨ک).

١٤١- رحلة ابن بطوطة، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨).

١٤٢- بەهزاد شەرەفخان: دراوی کوردی(کوردو لێدانی پارەی تایبەت بە خۆی)، گۆڤاری شانەدەر، ژمارە(٣)، (هەولێر/ ١٩٩٧ز)، لاپەڕەکانی (٧-٨).

١٤٣- کاهین: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی(بەنو بووەیه)، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (٣٦٤، ٤٧٨)؛ محەمەد جەمالەدین سرور: تاریخ الحضارة الاسلامية في الشرق، (قاهیرە، ١٩٦٥ز)، لاپەڕەکانی (٨٦-٨٧).

١٤٤- شەرەفنامە، لاپەڕە (٢٨).

١٤٥- مەسعودی: مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥)، مەقریزی: السلوک، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٠١).



١٤٦- ژمارەی پیاوی هۆزە کوردییەکان، بە نیو ملیۆن پیاو دەستنیشانکراون، سیاحەتنامە، وەرگێردراوە کوردییەکەی، سەعید ناکام، (بەغداد، ١٩٧٩ز)، لاپەڕە (٩١).

١٤٧- سابی: المنتزع من کتاب التاجي، ساغکردنەوەی: محەمەد حوسێن زوبێدی، لەپێشەکی ساغکەرەوەدا، بەغداد، ١٩٧٧، لاپەڕە (١٧)؛ جورجی زێدان: تاریخ التمدن الاسلامي، بەیروت، (بەبێ ساڵی چاپ)، بەشی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٤٦-٤٤٧)؛ عەلی بەییومی: قیام الدولة الايوبية في مصر، (قاهیرە، ١٩٥٢ز)، لاپەڕە (١٨).

١٤٨- الكرد فی العصر العباسی، لاپەڕە (١٤٨).

١٤٩- سەنتەری فەرمانڕەوایی میرنشینی (عەیشانی)بوو لە شارەزوور، لەوانەشە ناوی میرنشینەکە، لەناوی هۆزی (عەیشانی)یەوە هاتبێت، کە لەو دەوروبەرە دەژیان، بەشتێکی ئاساییشی دەبینین، کە شارەزوور بەر لە هەرێمە کوردییەکانی دیکە بەسەربەخۆیی خۆی گەیشتبێت، چونکە بە گەواهیدانی شارناس و مێژوونووسان، خەڵکی ئەو هەرێمە هەمیشە یاخی بوونە لە سوڵتان (دەسەڵاتی ناوەندی)، گوتەی مێژوونووس (مەسکەویە)ش بەڵگەیە بۆ ئەمە، کە دەڵێت: (ئەو شارەزوورە تا ئێستاش لە سوڵتان قەدەغەکراون، لەبەر قایمی شوێنی وڵاتەکەیان و لەبەرئەوەش لە دەروونی خۆیاندا خۆ بەزلزان و توڕەوتوندن، بۆیە ژێر ڕکێڤ ناکەون...) لەبارەی ئاماژەی شارناسان لەسەر شارەزوور، بڕوانە: موسعیری کوڕی موهەلهیل: الرسالة الثانية، لاپەڕە (٥٨)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕەکانی (٣٧٥-٣٧٦)؛ لە بارەی گوتەی مێژوونووسیش بگەڕێوە بۆ: تجارب الامم، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٨)، ڕووداوەکانی ساڵی ٣٦٩ک.

١٥٠- مونجیم باشی: جامع الدول (بەشێک لە بارەی شەدادییەکان)، مینۆرسکی ساغی کردۆتەوەو چاپی کردووە، (کەمبرج/ ١٩٥٨ز)، لاپەڕەکانی (٣-٤)؛ کەسرەوی: شهریاران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٧٣)؛

موکریانی: کوردستانی موکریانی؛ (ڕواندوز، ١٩٣٨) لاپەڕەکانی (٣٨٧-٣٨٨)؛ و (Minorsky: A history of sharvan and Darband, (Cambridge, 1958), p 74)

١٥٢- ئیبن و مەسکەویە: تجارب الامم، بەشی دووەم، لاپەڕە (١١٥)؛ ئیبنولئەثیر:الکامل، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (٤٧٨-٤٨٠)؛ ئیبنوکەثیر:البداية والنهاية، بەشی یانزەم، لاپەڕە (١٧٣).

١٥١- ڕەسول: الشدادیون في بلاد اران، لاپەڕە (١٧٣).

١٥٣- بۆ ئەوەی درێژ دادڕ نەبین و شت دووبارە نەکەینەوە، بۆیە بەپێویستی نابینین بەدرێژی لە بارەی

میرنشینی شەدادی بنووسین، چونکە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەم بارەوە هەیە، یەک لە لێکۆڵەرەوان، بەشتێک لە درێژی، لە بارەی چۆنییەتی سەرکەوتنی کوردە شەدادییەکانی، لە دامەزراندنی بناغەی میرنشینەکەیان و دیارترین میرەکانی نووسیوە، هەروەها باسی لە پەیوەندییەکانی ئەو میرنشینەی لەگەڵ هێزە سیاسییە ئیسلامییەکانی دیکەدا کردووە، بڕوانە: رەسول: الشدادیون في بلاد اران، لاپەڕەکانی (٤٩-٧٣)؛ هەروەها بگەڕێوە بۆ: قادر محەمەد حەسەن: الامارات الكردية في العهد البويهي، نامەیەکی ماجستێری بڵاونەکراوە، (هەولێر، ١٩٩٩ز)، لاپەڕەکانی (٢٨-٣١).

١٥٤- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕەکانی (٣-٤)؛
Studies in Caucasian history, P. 167.

١٥٥- کەسرەوی: شەهریاران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٧١)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الكردية، لاپەڕە (٩١).

١٥٦- بڕوانە: زنجیرەی میرە شەدادییەکان، کە لە پاشکۆکانی ئەم کتێبەدا هاتوون.

١٥٧- نەقشەبەندی: اذربیجان، لاپەڕەکانی (١١٤-١١٧)؛ زۆرێکیش لە مێژوونووسان جەختیان لەسەرئەوە کردۆتەوە، کە (رووادی) یەک لە هۆزە کوردەکانەولە (هەزبانییەکانەوە) جیابوونەتەوە، هەروەها لە هۆزە گەورەکانیان ژماردوون،(ئیبن ولئەثیر)بە (ئابڕومەندترینی کوردانی)ژماردوون.. الکامل، بەشی یانزەم، لاپەڕە (٣٤١ك)، ئیبن و خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی حەوتەم، لاپەڕە (١٣٩)؛ بەدلیسی: الشرفنامة، لاپەڕە (٧٨).

١٥٨- لە بارەی هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر ئازەربێجان، بڕوانە: هەردوولاپەڕەی (٥٠-٥٧)یی لێکۆڵینەوە عەرەبییەکە.

١٥٩- الکامل، بەشی نۆیەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٧٧-٣٩١)؛ بڕوانە: زنجیرەی میرەکانی میرنشینی رووادی، لە پاشکۆکانی ئەم کتێبە.

١٦٠- Stadies in Caucasian history, p. 168.

١٦١- ئیبن و لحەوقەلی شارناس و ئیبن و مەسکەویەی مێژوونووس، دوو گوتەمان بۆ دەگوازنەوە، تیایاندا ناوی میر (حوسێنی کوڕی محەمەد) هاتووە، یەکەمیان بە (ئەبولهیجا، ئەلروادی) ناوی بردووەو دووەمیشیان بەناوی (حوسێنی کوڕی محەمەدی رووادی) باسی لێوەکردووە، ئەوەی چاو بەدرێژەی قسەکانیاندا بگێڕێت، لە بارەی میری ناوبراوەوە، بۆی دەردەکەوێت، کە ناوبراو لەو ماوە



مێژووییەی ئاماژەی بۆکراوە، میری ئازەربێجان بووە.. صورة الارض، لاپەڕە (٢٨٩)؛ تجارب الامم، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨٠).

١٦٢- Stadies in Caucasian hitory, P. 168.

١٦٣- لە بارەی میرانی رووادی، بگەڕێوە بۆ: نەقشەبەندی: ئازەربێجان، هەردوولاپەڕەکانی (١٣٣-١٧٥).

١٦٤- ناصر خەسرۆ: سەفەرنامە، وەرگێڕانی: یەحیا خەششاب، (قاهیرە، ١٩٤٥)، لاپەڕە (٥)؛ ئیبن و لئەثیر: الکامل، لاپەڕە (٦٥٠)؛ Minorsky, Ibid, p. 168

١٦٥- فارقي: تاریخ امد و میافارقین، هەردوولاپەڕەکانی ٤٩-٥٢؛ ئیبن و لئەثیر: الکامل، بەرگی نۆیەم، هەردوو لاپەڕەکانی ٧١-٧٤؛ ئیبن و خەلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٥٢٨-٥٢٩)؛ ئیبن و تەغری بەردی: النجوم الزاهرة، (قاهیرة، ١٩٣٢ز)، بەشی پێنجەم.

١٦٦- تاریخ امد و میافارقین، لاپەڕە (٤٩).

١٦٧- ذیل تجارب الامم، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٨٤)؛ الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٥).

١٦٨- روزراوری: ذیل تجارب الامم، (ئەمدروز) راستی کردۆتەوە، (مصر، ١٩١٦ز)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٨٤)؛ ئیبن و لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٥)؛ ئیبن و تەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی چوارەم، لاپەڕەکانی (١٤٥-١٤٦)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەکەم لاپەڕە (٥٦).

١٦٩- فارقي: تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕەکانی (٥١-٥٢-٥٤-٥٦).

١٧٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٥٧-٥٨)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٧٠-٧١).

١٧١- فارقي: تاریخ امد و میافارقین، لاپەڕەکانی (٥٩-٦٠)؛ لەم بارەیەوە بڕوانە زنجیرەی میرەکانیان لە کۆتایی ئەم کتێبە.

١٧٢- یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەکەم.

١٧٣- لە بارەی ناونانی میرنشینەکە بە (عەننازی) بڕوانە: نەقشەبەندی: الکرد في الدینور، لاپەڕە (١١٦)، پەراوێزی ژمارە(١)؛ حەسەن: الامارات الكردية في العهد البويهي، لاپەڕە (٣٩)، پەراوێزی ژمارە (٢).

١٧٤- ئیبن و لئەثیر، الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٢٢٥)، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٣٨)؛ بەدلیسی:

شەرەفنامە، لاپەڕەکانی (٣٩-٤٠).

١٧٥- مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥).

١٧٦- ئیبن و مەسکەویە: تجارب الامم، بەشی دووەم، هەردوو لاپەڕەکانی (١٣٩-١٥٥).

١٧٧- نەقشەبەندی: الکرد فی الدینور، لاپەڕە (١٩٦).

١٧٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٨٨).

١٧٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٩٦).

١٨٠- ئیبن و لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٤٩)؛ موحسین محەمەد حوسێن: اربیل في العهد الاتابکي، (بەغداد، ١٩٧٤ز)؛ ئەحمەد عەبدولعەزیز: الهذبانیون في اذربابیجان واربل، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوە، (زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٠ز)، لاپەڕە (٥٢)؛ لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی (٤٤٠ک)، ئیبنولئەثیر ئاماژە بۆ ناکۆکییەک دەکات لە نێوان یەک لە میرانی عەقیلی لەگەڵ کوردانی حەمیدی و هەزبانی، هەروەها ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات، کە حەمیدییەکان کۆمەڵێک قەڵایان لە تەنیشت (مووسڵ)دا هەیە، لەوانە قەڵای (عەقر)و قەڵا نزیکەکانی تر.. هەزبانییەکانیش قەڵای هەولێرو، ناوچەکانی سەر بە(هەولێر)یان هەیە.. الکامل: بەشێ نۆیەم، لاپەڕە (٥٤٩)؛ زوبێر بیلال ئیسماعیل: اربیل في ادوارها التاریخیة، (نەجەف، ١٩٧٠ز) لاپەڕە (١٤٧).

١٨١- بڕوانە لاپەڕەکانی (٢١٧-٢١٨)ی دەقە عەرەبییەکە.

١٨٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، قاهیرة، (بەبێ ساڵی چاپ)، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ مەحمود: الهذبانییون في ازربیجان، لاپەڕە (٥٣).

١٨٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٤٣١).

١٨٤- جاوانییەکان: هۆزێکی کوردی دانیشتووی هەرێمی چیاکان بوون.. مەسعودی: مروج الذهب، بەرگی دووەم، لاپەڕە (١٣٥)، ئینجا ئەم هۆزە بەرەو ناوچەکانی ناوەڕاستی عێراق دابەزیون و لە (بەندیجین) (مەندەلی)و(دەسکەرە)و(نەهراوان) و(حیللە) دانیشتوون، دەکرێت ئەم ناوچانەش بەدرێژەوەبوونێکی ئاسایی وڵاتی کورد بژمێردرێن، ئەم هۆزە چەند تیرەیەکیشی هەبوو، لەوانە (نێرگسی)و (بەشیری)و (مەداری).. ئەسفەهانی: فریدة القصر، ساغکردنەوەی: محەمەد بەهجەت ئەثەری، بەغدا، ١٩٧٣) بەشی چوارەمی، بەرگی دووەم، لاپەڕەکانی (٤٣٢-٥٣٤)؛ مستەفا جەواد: جاوان القبیلة الکردیة المنسیة؛ و مشاهیر الجاوانیین، (بەغداد، ١٩٧٣ز)،



هەردوو لاپەڕەکانی (٧-١٠)؛ بۆ شارەزایی زیاتریش، بگەڕێوە بۆ: بەهزاد شەرەفخانی: گۆڤاری (مەتین)، ژمارە (٥٤)، هەردوو لاپەڕەکانی (١١٣-١١٦).

١٨٥- ئیبنولفوتی: تلخیص مجمع الاداب، ساغکردنەوەی (مستەفا جەواد)، (دیمەشق، ١٩٦٢ز)، بەشی چوارەم: پاری یەکەم، لاپەڕە (٣٧٩).

١٨٦- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕەکانی (١٠-١١)؛ ماوەی فەرمانڕەوایی میر (فەزلون) بەماوەییێکی جیاو کەم وێنە، لە مێژووی میرنشینی شەدادی دەژمێردرێت، چونکە ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوایی کردو لەو ماوەیەدا، توانی ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات، هەروەها بەهێرشەکانی بۆ سەر (خەزەر) ناسرا، ئەوەتا لە ساڵی (٤٢١ک/ ١٠٢٩ز)دا بەپاڵنەری جیهادکردن، هێرشێکی بردە سەر وڵاتی (خەزەر)و شکستێکی گەورەی بەسەردا هێنان.. ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، ساغکردنەوەی: جینان جەلیل هەمەوەندی، ٠بەغداد، ١٩٨٧ز)، لاپەڕە (٤٤٥).

١٨٧- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (١٢)؛ کەسرەوی: شهریاران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٨٧)؛
Studies in Caucasian hitory, P. 46

١٨٨- جامع الدول: لاپەڕە (١٦)؛ فرای: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی ئاران، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٧٢).

١٨٩- کەیکاوسی کوڕی ئەسکەندەر: قابوسنامە، (تەهران، ١٣٧٨ کۆچی هەتاوی)، ، لاپەڕەکانی (٤١-٤٢).

١٩٠- لە بارەی شەڕەکانی میر شاور لەگەڵ ڕۆم، بگەڕێوە بۆ: شهریاران گمنام، بەشی سێیەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٩٥-٣٠٤)؛ ڕەسول: الشدادیون في بلاد اران، لاپەڕەکانی (٩١-٩٤)، لەگەڵ لاپەڕەکانی (٧٣-٨٣).

١٩١- شهریاران گمنام، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (١٦٨-١٧٠)، بە ڕاگواستن لە مێژووی ئاسۆغیکی ئەرمەنی؛ موکریانی: کوردستانی موکریانی، لاپەڕەکانی (٢٤٤-٢٥٠)؛
Studies in Cancasian history, p. 168.

١٩٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٥٠).

١٩٣- فارقی: تاریخ امدومیافارقین، لاپەڕەکانی (٩٣، ١٠٤)؛ ئیبن و خەلەکان: وفیات الاعیان،

بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (١٥٩-١٦٠)؛ ئیبن و تەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٦٩).

١٩٤- فارقی: تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕەکی (٩٥-١٠٣)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی (٩)، لاپەڕە (١٤٣)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٦١-١٩٦).

١٩٥- فارقی: تاریخ امدو میافارقین، لاپەڕەکانی (١٠٢-١٠٣)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەرگی یەکەم، لاپەڕە(١٧٠).

١٩٦- تاریخ امدومیافارقین، لاپەڕە (١٠٨)؛ (فارقی) دەڵێت: نێردراوی خەلیفەی عەباسی (قادر بیلّلا)، لەگەڵ خۆیدا، فرمانەکانی لەکارلابردن و تەشریف و داناننیشی، بە (والی)یەتی (ئەحمەدی کوڕی مەڕوان) بەسەر هەموو دیاربەکرو قەڵاکانی، پێبوو.

١٩٧- فارقی: تاریخ امدومیافارقین، لاپەڕەکانی (١٠٩-١١٠)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٧٤).

١٩٨- البدایة والنهایة، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٨٧).

١٩٩- العبر في خبر من غبر، ساغکردنەوەی: فوئاد سەید (کوەیت، ١٩٦١)، بەرگی حەوت، لاپەڕە (٢٢٩).

٢٠٠- وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (٥٧).

٢٠١- نەقشەبەندی: الکرد فی الدینور، لاپەڕەکانی (٢٢٥-٢٣٠).

٢٠٢- ئیبنولئەثیر، الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣١).

٢٠٣- عەقیلییەکان لە موصل لە ساڵانی (٣٨٠-٤٨٩ک/ ٩٩٠-١٠٩٦ز) فەرمانڕەواییتییان کرد.

٢٠٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المتخصر، (بەیروت، ١٩٩٦ز) بەشی یەکەم، لاپەڕە (٤٨٦).

٢٠٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٤٩).

٢٠٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# پێشەکی و چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکە

سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان لە ماوەی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، لەسەر شانۆی رووداوەکانی هەرێمەکانی دەوڵەتی عەبباسی، بووە هۆی هێنانی گۆڕانی گەورە بەسەر نەخشەی سیاسی ئەو ناوچانە، چونکە سەلجوقییەکان کاریان کردە سەر هەموو لایەنەکانی ژیان، بەتایبەتیش دوای ئەوەی هاتنە نێو (بەغداد)ی پایتەختی دەوڵەتی عەبباسی لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز).

ئیتر وای لێهات سوڵتانی سەلجوقی بووە خاوەن دەسەڵاتی بەراستی لە (بەغداد)و، هەموو هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی، ژێر رکێفی ئەو کەوتن، میرو پاشا دەسەڵاتدارەکان و، لە نێوانیشیان میرو سەرکردە کوردەکانی خاوەن میرنشینە سەربەخۆکان، ئەوانەی هیچ رێگەیەکی دیکەی جگە لە ملکەچی بۆ سوڵتانی سەلجوقی و، گوێڕایەڵیکردنیان و، داننان بە دەسەڵاتیان لەسەر وڵاتەکانیان بۆ نەمایەوە، هەموو ئەمانە ملی سۆزو گوێڕایەڵییان بۆ سوڵتانی سەلجوقی کەچ کرد.. لە بەرامبەریشەوە سوڵتانە سەلجوقییە یەکەمەکان، مانەوەی میرنشینە کوردییەکان و، داننان بەدەسەڵاتی میرە کوردەکان بەسەریانەوەیان، لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەباش زانی.

بەڵام سیاسەتی سەلجوقییەکان لەسەر ئەم رێچکەیە نەمایەوە، بەڵکو بۆ سیاسەتی دژایەتیکردنی میرنشینە کوردییەکانی نێو چوارچێوەی دەوڵەتەکەیان گۆڕاو، دوای ئەوەی هێزەکانی خۆیان لە عێراقدا بەهێزکرد، کۆتایی ئەم دوژمنایەتییە بەژێر دەستخستنی سەرجەم میرنشینە کوردییەکان هات.

لەم ماوەیەشدا پەیوەندی جۆراوجۆر، لە نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکان و، میرە کوردە خۆجێییەکان دامەزرا، جا ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ بەدواداچوونی سیاسەتی سوڵتانە سەلجوقییەکان بەرامبەر بەکوردو میرنشینەکانیان و، پەیوەندی سیاسییان لەگەڵ یەکتردا.

گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەوەدا خۆ حەشار دەدات، کە پەردە لەسەر قۆناغێکی گرنگ



لە قۆناغەکانی مێژووی کوردی ئیسلامی هەڵدەداتەوە، کە تا وەکو ئێستا بەشێوەیەکی تەواو، لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی لێینەکۆڵدراوەتەوە، ئەگەر چیش دیراسات و سەرچاوەو نامەی زانکۆیی هەبن، ئاماژەیان بۆ (سەلجوقییەکان)[1] کردبێ، بەڵام ئەم دیراساتانە باسیان لە رۆڵی کوردو مێژووەکەی لە ماوەی سەردەمی سەلجوقییەکان نەکردووە، ئەمەش یەک لە پاڵنەرە سەرەکییەکانم بوو، بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە.

پاڵنەرەکەی دیکەشم بۆ هەڵبژاردنی بابەتی (کوردو سەلجوقییەکان)، لەوەدا خۆ دەنوێنێ، کە کورد لە ماوەی سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان دا، لە هێزە سیاسییەکانی دیکەی ناوچەکەدا کەمتر نەبوونە، لە وڵاتەکانی خۆیاندا میرنشینی سەربەخۆ، دەسەڵات و حوکمی تایبەت بەخۆیان هەبووە، سەلجوقییەکانیش بەرۆڵی خۆیان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دەرکەوتن و، دەوڵەتەکەیان لە (خوراسان) دامەزراند.. کاتێکیش کەوتنە خۆ، بۆ باڵکێشان بەسەر هەرێمە ئیسلامییەکاندا، هەرێمە کوردییەکان کەوتنە چوارچێوەی نەخشە فراوانیخوازەکانیان.. گەیشتنی سەلجوقییەکانیش بەکورد، لەسەر زەوی وڵاتانی کورد، بووە هۆی دروستبوونی پەیوەندییە سیاسییەکان لە نێوان هەردوولا، ئیتر شێوازێکی پێشکەوتووی پەیوەندی لە نێوانیاندا دامەزرا، کە خۆی لە گۆڕینەوەی باڵوێزو وەفدی جۆراوجۆردا دەنواند، هەروەها میرە کوردەکان بڕی دیاریکراو لە پارەو دیارییان بۆ سوڵتانەکانیان دەنارد، ئینجا کار هەر لەسەر ئەمانە کورت نەدەبووەوە، بەڵکو پەیوەندییە باشەکانی نێوانیان لە قۆناغەکانی یەکەمدا، پاڵنەرێکی بەهێز بوو بۆ دروستبوونی هەندێ خزمایەتی سیاسی لە نێوانیاندا.

لەکاتی کۆکردنەوەو ئامادەکردنی مادەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەم، ئاستەنگی زۆرم هاتنە پێش، کە گرنگترینیان: کەمی زانیاری بوو لە بارەی کوردو، ئەوەی هەشبوو پەرش و بڵاوی نێو رووپەڕەکان بوو، چونکە مێژوونووس و نووسەرە موسڵمانەکان جگە لە (ئیبن و لئەثیر)، ئەوانی دیکە لە دانراوەکانیاندا زۆر بەکەمی ئاماژە بۆ کورد دەکەن.. بۆیە بەشی گەورەی ئەو زانیاریانەی لە بارەی کوردو میرنشینە کوردییەکانن، کەوتوونەتە درێژەی باسی مێژوونووسان و، پەراوێزی بابەتە مێژووییەکانی دیکە، بەتایبەتیش لە ماوەی سەردەمی سەلجوقییەکاندا. ئینجا هەندێک لە سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەم فارسی بوون،

که ئەو زەمانەشم نەدەزانی، بۆیە ماندووبوونەکەم دوو قات کەوت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ئاستەنگانەش، هەوڵماندا بەردەوام بین، ئەمەش لە پێناو وەلانانی تەمومژی سەر هەندێ لایەنی نادیار، لە پەیوەندییەکانی نێوان کوردو سەلجوقییەکاندا. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدەدات لە هەموو رووێکەوە پەیوەندییەکانی نێوان سەلجوقییەکان و، میرو پێشەوا کوردەکانی خاوەن میرنشینە کوردییەکان لە ماوەی سەدەیەکدا (٤٢٠-٥٢١ / ١٠٢٩-١١٢٧ز) بخاتەڕوو، جا ئەم پەیوەندییانە پەیوەندی ئاشتی، یاوەخود پەیوەندی شەڕ بن.

مێژووی یەکەم خۆی لە هێرشی هۆزەکانی (غەز - تورکەکان) کە سەلجوقییەکان بەشێکن لە مانە - بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان دەنوێنێ، کە سەرەتاکانی بەیەکدا کەوتنی نێوان سەلجوقییەکان و کوردانی دانیشتووی وڵاتەکانیان لێرەوە دەستی پێکرد.. ساڵی (٥٢١ک-١١٢٧ز)یش کە کۆتایی ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەیە، خۆی لە تیاچوونی دەسەڵاتی سەلجوقییەکان بەسەر هەرێمە کوردییەکان و، دامەزراندنی ئەتابەکیەی زەنگی لەسەر دەستی (عیمادەدینی زەنگی) لە (مووسڵ) دەنوێنێ، کە بەمە زۆربەی هەرێمە کوردییەکان بەوێنەی (هەرێمەکانی جەزیرەو، هەکاری و، زۆزان و، ئەربل و، شەهرەزوور) کەوتنە ژێر دەسەڵات و هەڵسوکەوتی ئەتابەکییەکان.

ئەم نامەیە پێشەکییەک و پێشەدەستییەکی جوگرافی و مێژوویی و، پێنج بەش و سەرەنجام و هەندێ دارە ژیانی هاوپێچ و، چەند نەخشەیەک بەخۆوە دەگرێت.

پێشەدەستییە جوگرافییەکە پێناسەیەکی وڵاتی کوردو، دەستنیشانکردنی سنوورەکانی وەک سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکە دەخاتەڕوو.. هەروەهاش ئاماژە بۆ ئەو هەرێم و دەڤەرانەی وڵاتی کوردی بەسەردا دابەشدەبێت دەکات، گرنگترین ئەو هۆزە کوردانەش دەردەخات کە بەشدار بوونە لە دروستبوونی رووداوەکان.. لە دوای هەموو ئەمانەش ئاماژە بۆ ئەو شارە گرنگانەی کورد دەکات، کە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا خاوەن پلەو پایەیەکی دیاریکراو بوون.

بەڵام هەرچی پێشەدەستییە مێژووییەکەیە، ئەوا باس لە دوو لایەن دەکات. یەکەم: تایبەتە بەباری سیاسی وڵاتی کورد بەر لە سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان، تیاشیدا بەکورتی قسە لەسەر گرنگترین ئەو میرنشینە کوردییانە کراوە، کە لەماوەی سەردەمی سەلجوقییەکاندا ماونەتەوە، یان بەواتایەکی روونتر لێرەدا جەخت لەسەر ئەو میرنشینە



کوردییانە کراوەتەوە کە هاوچەرخی سەلجوقییەکان بوونە (چونکە هەندێ لەمیرنشینەکان بەر لەو مێژووە رووخاون)، لە نێو ئەو میرنشینانەش، میرنشینەکانی (شەدادی - رووادی - مەڕوانی - عەننازی (شازنجانی) - هەزبانی).

بەڵام لایەنی دووەمی پێشەدەستییە مێژووییەکە، تیایدا باس لە باری ئەو میرنشینانە لە سەرەتاکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی دەکرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی کورت لە بارەی حاڵی کوردو دەسەڵاتەکەیان بەر لە دەرکەوتنی سەلجوقییەکان بداتە دەست.

بەشی یەکەم، لە دەرکەوتنی (غەز - سەلجوقییەکان) دەکۆڵێتەوە، بنەچەی سەلجوقییەکان، هاتنیان بۆ نێو ئیسلام، ململانێکانیان لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەوی، ئینجا دروستبوونی دەوڵەتی سەلجوقی و، هەوڵەکانی (تەغرول بەگ) لە چەسپاندنی پایەکانی ئەم دەوڵەتە، لەگەڵ گەیشتنی (غەز - سەلجوقییەکان) بەهەرێمە کوردییەکان و، لەوێوە هێرشکردنیان بۆ هەرێمەکانی (ئەزربایجان و، جزیرەی فوراتی) کە بەمە توانیان دەسەڵاتی خۆیان بۆ هەندێ لەو هەرێمانە درێژ بکەنەوە، ئەگەرچیش کوردەکان بەرەنگاریان بوونەوە، بەڵام ئەوان لە میرە کوردە خۆجێییەکان سۆزو گوێڕایەڵییان دەستکەوت و میرەکانی (شەدادی و رووادی و مەڕوانی و عەننازی) دانیان پێدانان.

بەشی دووەم، هەڵوێستی کورد لە رووداوەکانی سەرەتای سەردەمی سەلجوقییەکان رووندەکاتەوە، چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان وەکو هێزێکی سیاسی لە جیهانی ئیسلامی رووداوی گرنگ بەرجەستەبوون، ئەم رووداوانەش شوێنەواری گەورەیان بەسەر باری سیاسی ناوچەکەدا جێهێڵا.. جا ئەم بەشە هەڵوێستی کورد لەمەڕ هاتنە نێو (بەغداد)ی سەلجوقییەکان لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) رووندەکاتەوە، کە ئەمەش لە رووداوە گرنگەکانە، چونکە خەلیفەی عەبباسی ئەگەرچیش لە بارێکی لاوازیدا دەژیا، بەڵام پایەیێکی رۆحی گرنگی داگیر دەکرد.. هەروەها ئەم بەشە هەڵوێستی کورد لە بزاڤی (بەساسیری) و ململانێی فاتمی - عەبباسی (سەلجوقییەکان)و، یاخیبوونی (ئیبراهیم یەنال) دەخاتەڕوو، دوای ئەمانەش یەک لە باسەکانی ئەم بەشە تایبەتکراوە بەکارگێڕییەتی سەلجوقییەکان لە وڵاتی کورد، دوای سۆزی میرنشینە کوردییەکان لە بۆیان.

بەشی سێیەم، باس لە هەڵوێستەکانی هەریەکە لە سوڵتان (تەغرول بەگ)ی سەلجوقی و، سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) لە میرنشینە کوردییەکانی بڵاوە بوو، بە وڵاتی کورد دەکات و، گرنگترین سیماکانی پەیوەندی سیاسی نێوانیان دەخاتەڕوو، ئیتر ئەم لایەنە جەخت لەسەر زەقکردنەوەی ڕۆڵی کورد لە نێو سوپای سەلجوقی دەکاتەوە، کە بوونیان لەنێو ریزەکانی ئەو سوپایە ڕۆڵی خۆی هەبووە لە ڕووداوەکانی ناوچەکە، لە کۆتایی بەشەکەش ئاماژە بۆ ڕۆڵی کورد لە شەڕی (ملازگەرد)ی مێژوویی ساڵی (٤٦٣ك/ ١٠٧١ز) کراوە، ئەو شەڕەی کە جیاکەرەوە بووە لەنێوان دەوڵەتی سەلجوقی و ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، لەم شەڕەشدا کوردەکان ڕۆڵێکی باشیان دیوە لە شەڕکردن لە پاڵ سەلجوقییەکان.

بەشی چوارەم، باس لەسیاسەتی ناوەندی سوڵتانە سەلجوقییەکان و، رووخانی میرنشینە کوردییەکان دەکات، لەم چوارچێوەیەشدا قسە دێتە سەر ئەو سیاسەتە ناوەندییەی سوڵتان (مەلەکشاه) پەیڕەوی کردو، ئەو شوێنەوارانەی کە بەسەر میرنشینە کوردییەکان جێیهێلا. چونکە ئەم سیاسەتەی بووە هۆی رووخانی زۆربەی ئەو میرنشینانە.. ئیتر ئەو بەشە باس لە رووخانی میرنشینەکانی (شەدادی و روادی و مەروانی) دواتریش ئەو لاوازبوون و توانەوەیە دەکات، کە رووی لە میرنشینی (عەننازی) کرد. هەروەها ئەو بەشە سروشتی حوکمی سەلجوقییەکانیش لە کارگێڕییان بۆ هەرێمەکانی (ئاران و ئازەربێجان و دیاربەکرو چیاکانیش (الجبال) بە شێوەیەکی راستەوخۆو، دوای زاڵبوونیان بەسەر میرنشینە کوردییەکان بەخۆوە دەگرێت.

بەشی پێنجەم و دوواییش، لە بارەی باری سیاسی هەرێمە کوردییەکان لە دوای مردنی سوڵتان (مەلەکشاه) ساڵی (٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز) دەدوێت، لەم ماوەیەدا ناکۆکییەکی توندو، چەندین شەڕی خوێناوی بۆ گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات، کەوتە نێو کوڕەکانی (مەلەکشاه)و، ئەم ململانێیەش کاری کردە سەر وڵاتی کورد، جگە لە مانەش هەر لەم بەشەدا ئاماژە بە سەرهەڵدانی تاجی دەوڵەت (تەتشی کوڕی ئەلب ئەرسەلان)و زاڵبوونی بەسەر هەرێمە کوردییەکان دەکرێت..

یەکێش لەو ئەنجامانەی کە ئاکامی ناکۆکییەکانی نێوان سەلجوقییەکان بۆ گەیشتنە دەسەڵات لێیەوەی بەکۆتاهات، توانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقییەکان و، لە دەستدانی دەسەڵاتیان بەسەر هەرێمەکانی ژێر دەستیانەوەبوو، ئەمەش بووە هۆی



سەرهەڵدانی سیستمێکی نوێ بۆ فەرمانڕەوایی، کە بەشێک بوو لە سیستمی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان، بەڵام کاری بۆ سەربەخۆبوونی هەرێمەکانی ئەو دەوڵەتە دەکرد، ئەویش سیستمی ئەتابەکیەتەکان بوو، کە لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی سەریهەڵداو، هەندێ لە خاوەن دەسەڵات و حەزە گەورەکان جیابوونەوەو، بۆ خۆیان دەسەڵاتێکی سەربەخۆیان دامەزراند.

جا هەندێک لە ئەتابەکیەکان لە هەرێمە کوردییەکان سەریان هەڵدا، بۆیە دوا باسی ئەم بەشە بۆ لێکۆڵینەوە لەو ئەتابەکیەتانە و گرنگترینیان تەرخانکراوە، کە خۆی لە ئەتابەکیەتی (ئەرمینیا)یان وەک ناونراوە ئەتابەکیەی (پاشاکانی ئەرمەن) دەبینێتەوە، کە لە شاری (خەلات)ی کوردی دامەزراو، تاکەکانی ئەم ئەتابەکیەتە فەرمانڕەوایی ژمارەیەک شارو قەڵاکانی هەرێمی (ئەرمینیا)یان کرد، کە زۆربەی قەڵاکانی هی کورد بوون.

هەروەها ئەم بەشە تیشک دەخاتە سەر میرنشینی (ئەرتەقی) لە (دیاربەکر) و (ئەحمەد دیلی) لە (ئازەربێجان).. دیسانەوە لەو بەشە ئاماژە بۆ باری سیاسی کورد لە سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی و، تا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتی زەنگی لە (مووسڵ) لە ساڵی (٥٢١ك/١١٢٧ز) دەکرێت، کە ئیتر لەوێوە کۆتایی لێکۆڵینەوەکە، بەسەرهەڵدانی (عیمادەدینی زەنگی) دێت، چونکە سەرهەڵدانی (عیمادەدینی زەنگی) بە یەک لە هۆکارەکانی رووخانی بەشە ماوەکەی میرنشینو، خاوەن قەڵاکانی وڵاتی کورد دادەنرێن.

هەرچی (سەرەنجام)یشە، خوێندنەوەیەکی کورتی دەرەنجامەکانی لێکۆلینەوەکە بەخۆوە دەگرێت.

زیاد لەمانەش، ئەم نامەیە ژمارەیەک (داره ژیان)ی هاوپێچی پەیوەست بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەو، چەند نەخشەیەکی هەرێمە کوردییەکانیش بەخۆوە دەگرێت.

**نرخاندنی سەرچاوە سەرەکییەکان:**

بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە، پشتمان بەژمارەیەکی گەورەی سەرچاوەی دەستنووس و چاپکراو و، بۆ گەڕاوە (المرجع)ی نوێ و، بە زمانی جۆراو جۆر، بەستووە.. هەندێ لەو سەرچاوانە بوونەتە گرنگترین پاڵپشت و، زانیاری زۆر دەگمەن و بەنرخیان بە

لێکۆڵینەوەکە بەخشی یە، بەڵام ئێمە لێرەدا (لەبەر زۆرییان) تەنها بە خستنەڕوو و نرخاندنی هەندێ لەسەرچاوەو بۆ گەڕاوە (المرجع)ی زۆر سەرەکی واز دێنین، ئەوانیش:

**یەکەم: دەستنووسەکان:**

لەکاتی نووسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، پەنا بۆ ژمارەیەک دەستنووس براوە، لە پێش هەمووییان دەستنووسی (مسالک الابصار)ی (فەزلوڵلای عومەری) کە لە (٧٤٩ک/١٣٤٨ز)کۆچی دوایی کردووە، کە لە راستیدا زانیارییە جوگرافییەکانی لەبارەی وڵاتی کورد گرنگییەکی تایبەتی هەبوو، لە دەستنووسەکەیدا زانیاری وردی لە بارەی تایەفە و هۆزە کوردییە زۆر دیارەکان و، شوێنی تیا هەبوون و، تیا قەرار گرتنیانی ئاماژە بۆ کردووە، بۆیە ئەم ئاماژانەی (عومەری) لاپەڕە تایبەتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی بە پێشدەستییە جوگرافییەکەش دەوڵەمەند کردووە، کە تیایدا دەستنیشانی هەرێمە کوردییەکان و دیارترین هۆزە تیا دانیشتووەکانیان دەکرێت.

هەروەها بۆ هەندێ ئاماژەی کورت و خێرا، سوود لە چەند دەستنووسێکی دیکەش وەرگیراوە، لەوانە دەستنووسی (شذور العقود)ی (ئیبنول جوزی) کە لە (٥٩٧ک/١٢٠٠ز) کۆچی دوایی کردووە، کە تیایدا بەشێوەیەکی سەرەکی جەختی لەسەر رووداوەکانی سەردەمی (بوەیهییەکان) و، سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان کردۆتەوە.

دیسانەوە سوود لە دەستنووسی (خلاصة عجائب البلدان)ی دانەر نادیاریش وەرگیراوە، لەو زانیارییە جوگرافییانەی تیای هاتووە، لەگەڵ دەستنووسی (تاریخ الکرد)ی (ئەب ئەنستاس ماری کرەملی)ش کە تیایدا دەقێکی گرنگ لەبارەی پەسنەکانی کوردەوە هاتووە.

**دووەم: سەرچاوە چاپکراوەکان:**

لە بواری لێکۆڵینەوە لە مێژووی سەلجوقییەکان، یەکەم شت کە سەرنجی لێکۆڵەر رادەکێشێ زۆری سەرچاوەی هاوچەرخە لە بارەیان، بەڵام ئەم سەرچاوانە تایبەتن بە ماوەی جووڵە کردنەکانیان لە (وڵاتی ئەودیوی زێ و خوراسان)دا.



ژمارەیەک مێژوونووس هاوچەرخی ئەم جووڵە کردنانەیان بوونە، لەوانەش (کوردیزی) مردوو لە دەوروبەری (٤٤٠ک/١٠٤٨ز)، لە کتێبەکەیدا (تاریخ الکردیزی)یان (زین الأخبار) کە تایبەتە بە تایەفە و هۆزە تورکەکان.

مێژوونووسێکی تر (کاشغری)یە، خاوەنی (دیوان لغات الترک)ە، کە ئەم کتێبەی لە ساڵی (٤٦٦ک/١٠٧٣ز) داناوە.

(بەیهەقی)ش یەکێکی دیکەی ئەو مێژوونووسانەیە، کە هاوچەرخی سەردەمی ململانێی نێوان سەلجوقی و غەزنەوییەکان بووە، بەتایبەت لە رۆژگاری سوڵتان (مەسعودی غەزنەوی)، کە وەکو نووسەرێکی ئەو سوڵتانە کاریکردووە، لە مێژووەکەیدا بەدرێژی تیشکی خستۆتە سەر ئەو شەڕانەی لەنێوان هەردوولا (غەزنەوی و سەلجوقییەکان)دا رووی دەدا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم مێژوونووسانە نووسیویانە، بەو پێودانگەش کە شایەدی هەموو ئەو رووداوانە بوونە، کە لەو سەردەمەدا هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی پێیاندا تێپەڕیون، ئینجاش گێڕانەوەکانیان بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودیان زۆر دیاریکراو بووە، بەتایبەت لەوەی کەوا لەسەر کورد بێ، کە ئەمەش کرۆکی بابەتی نامەکەیە، چونکە باسیان لە هەواڵی کوردان نەکردووە، بۆیە کتێبی (الکامل فی التأریخ)ی (ئینبول ئەثیری جەزری) مردوو لە (٦٣٠ک/١٢٣٢ز) بەسەرچاوەی ژمارە (یەک) و سەرەکی دادەنرێت، بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد، لە ماوەی سەردەمی ئیسلامی و، لەناویشیدا سەردەمی سەلجوقی، ئەمەش چونکە ژمارەیەکی گەورەی گێڕانەوەو هەواڵی دەگمەن و گرنگ (لەبارەی کوردەوە) بەخۆوە دەگرێت، بەجۆرێک کە ئەگەر ئەو سەرچاوەیە نەبووایە، لاپەڕەیەکی زۆری مێژووی کوردی ئیسلامی، تەواو بەنادیاری دەمانەوە.

ئەم مێژوونووسە لە (مووسڵ) ژیاوەو، سەرچاوەکانی مێژووی هەرێمە کوردییەکانی لەبەر دەست دابووە، بۆیە هیچ لێکۆڵەرێکی کورد ناتوانێت فەرامۆشی زانیارییەکانی ئەم سەرچاوەیە بکات، لەوانەشە ئەو نەبوونە زانیارییەی سەبارەت بەهەندی ماوەی مێژوویی تایبەت بە لێکۆڵینەوەکەمان، کە بەدەستیەوەمان ناڵاند، هۆکەی لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ، کە (ئیبن ولئەثیر) باسی لەم ماوانە نەکردبێت، بۆیە بە نادیاری لە لاماندا مابێتەوە، ئەوەشی شارەزایی لەسەر بەشەکانی ئەم نامەیەدا هەبێت، دەرک بە چەندێتی

گرنگی ئەو زانیارییانە دەکات، کە ئەو مێژوونووسەمان لەبارەی زۆربەی میرنشینە کوردییەکان تۆماری کردوون، تەنانەت ئەو زانیارییانەی خاوەنی (الكامل) لەبارەی میرنشینی (مەڕوانی) نووسیونی، لە لایەن (فارقی) پسپۆر بە لێکۆڵینەوەی ناوچەکەش نەهاتوون.

هەر لەسەرچاوە سەرکییەکان، کتێبێک کە لە گرنگیدا بەدوای (الكامل)دا دێت، (مرآة الزمان)ی (سەبتی ئیبنولجۆزی) مردوو لە (٦٥٤ک/١٢٥٦ز)ییە.. گرنگی گێڕانەوەکانی (سەبت)یش خۆی لەو هەواڵە وردانەیدا حەشار دەدات، کە لە بارەی رووداوەکانی پەیوەست بەهاتنە ناو بەغدادی سەلجوقییەکان تۆماری کردوون، لەگەڵ ئەو هەواڵانەش کە لە بارەی پێشهاتەکانی دوای هاتنی سەلجوقییەکان بۆ بەغداد نووسیونی، وەکو بزووتنەوەی (بەساسیری) و یاخیبوونەکەی (ئیبراهیم یەناڵ)، لێرەشدا ئەو مێژوونووسە تاکە نووسەرە کە هەواڵی گرنگی لەبارەی رۆڵی کورد لە هەردوو ئەو بزووتنەوانە بەدرێژی نووسیوە. هەروەهاش دەکرێ ئەو مێژوونووسە بە تەنیا مێژوونووسێکی ئیسلامیی دابنێین، کە لە دوو توێی کتێبەکەیدا، زانیاری لەبارەی هێرشەکانی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بۆ سەر هەرێمی (ئەرمینیا) خستبێتەڕوو، لە ماوەی ئەوەشدا ئاماژەی بۆ هەواڵەکانی میرەکانی (شەدادی) کردووە، ئەوانەی کەوا فەرمانڕەواییێتی (ئاران)یان کردووە.. ئەم گێڕانەوانەش لەگەڵ ئەوەشدا کە (مینۆرسکی) لەدوا بەشی کتێبی (تاريخ الباب والابواب)ی دانەرێکی نەناسراودا بڵاوی کردوونەتەوە، تەنیا زانیارین لەبارەی ئەو میرنشینە کوردییە، کە لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا خەریکە هەواڵی نامێنێت..

دیسانەوە گرنگە ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە خاوەنی (مرآة الزمان) خاوەن چاکییەکی زۆر گەورەیە بەوەی کەوا بەدرێژی هەواڵەکانی شەڕی (ملازگەرد)ی مێژوویی تۆمار کردووە، کە تیایدا گرنگی داوەتە رۆڵی کوردانی خەڵکی (ئەرمینیا)، لەو رووبەڕووبوونەوەیاندا، کە لە دژی بێزەنتینییەکاندا نواندیان.

بەڵام کتێبی (تاريخ الفارقي)یان(تاريخ امدوميا فارقين)ی (فارقی) مردوو لە (٥٧٢ک/ ١١٧٦ز)، لە سەرچاوە زۆر گرنگەکانە، لە گێڕانەوە تایبەتییەکانی لە بارەی مێژووی میرنیشینی (مەڕوانی) کوردی لە (جزیرە)، سوودی لێوەرگیراوە، چونکە



نووسەرەکەی تاکە مێژوونووسێکە، کە چەندین دەقی خاوەن گرنگی زۆر گەورەی لە بارەی میرەکانی ئەو میرنشینە نووسیبێ. گرنگی ئەو کتێبەش لەوە دێت، کە دانەرەکەی خەڵکی (میافارقین)ە، هەروەها باپیرەشی وەک بەرپرسێکی دارایی دەوڵەتی مەڕوانی لە (حسن کیفا) کاری کردووە، بۆیە دەشێ مێژووەکەی بەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکرا و هاوچەرخی رووداوە تایبەتەکان بە مەروانیەکانی دابنێین، هەروەها (فارقی) لە مێژووەکەیدا بەدرێژی باس لە چۆنیەتی پەیوەندییەکانی نێوان میرەکانی ئەو میرنشینە و سوڵتانە سەلجوقییەکان و، کەوتنی میرنشینەکەو، هەڵسانەوەو دروستبوونەوەشی دەکات، بەڵام لەگەڵ پڕ بایەخی دەقەکانیشی، نووسەری ئەم کتێبە لە دەستنیشانکردنی ساڵی رووداوی هەندێ لەرووداوەکاندا بەهەڵەداچووە.

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە، سوودی لە گێڕانەوە پڕ بایەخەکانی بانگخوازی فاتیمی (هبة الله الشيرازي)ی مردوو لە (٤٧٠ک/١٠٧٧ز) وەرگرتووە، لە یاداشتە نووسراوەکەی بە ناونیشانی (سيرة المؤيد في الدين)، چونکە لەم کتێبە، هەواڵی هەندێ لە میرە کوردەکانی ماوەی بزووتنەوەی (بەساسیری) هاتووەو، پەیوەندی و هاتوچۆکانی ئەم میرانە لەگەڵ بزووتنەوەکە بەدرێژی تیشکی خراوەتە سەر، ئینجا ئەم هەواڵانە بە کۆمەڵێک نامەی گۆڕدراوە پشت ئەستوور کراون، کە لەنێوان ئەوان و میرە کوردەکاندا گۆڕدراونەتەوە.

(ابن العديم)ی مردووش لە(٦٦٠ک/ ١٢٦٢ز) لەکتێبەکانیدا (زبدة الحلب) و (بغية الطلب)، ئاماژەی زۆر دەگمەن و کەم وێنەی لەبارەی کوردەوە تۆمار کردووە، کە سەرچاوەکانی دیکە بەخۆوەیان نەگرتون، جا ئەم دەقە کەم و سادانەی (ابن العديم) بەسبوون بۆ خستنەڕووی وێنەیەکی روونی هەندێ لایەنی پەیوەندی نێوان کوردو سەلجوقییەکان.

ژمارەیەک لە مێژوونووسان، دانراوەکانی خۆیان بۆ مێژووی سەلجوقییەکان تایبەت کردووە، کە لێکۆڵەری لەو بوارە، بۆی ناکرێت چاوپۆشی لەم تەرزە سەرچاوانە بکات، ئەوانەش لە پێش هەموویان (اخبار الدولة السلجوقية)ی (حوسەینی)ی مردوو لە (٦٢٢ک/١٢٢٧ز)یە، کە بە (زبدة التواريخ في اخبار الامراء والملوك السلجوقية)ش ناودەنرێت.. نووسەر لەم کتێبەدا هاتووە هەواڵ و پەیوەندی و سیاسەتەکانی سەرجەم

سوڵتانەکانی تۆمار کردووەو، هەر لەم کتێبەشیدا گێڕانەوەی دەگمەنی لەبارەی هێرشەکانی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بۆ سەر شاری (ئانی) و، بەشداری کوردە (شەدادی)یەکانی لە پاڵ سەلجوقییەکان لەو هێرشانەدا خستۆتەڕوو، جگە لەمانەش شتانی تایبەت بە میرە کوردەکانی هەردوو میرنشینی (شەدادی) و (شوانکارە)ش لەم کتێبەدا بەرجەستە دەبن.

کتێبەکەی (بەنداری)ی مردوو لە (٦٤٣ک/١٢٤٥ز)یش بەناونیشانی (تاريخ دولة ال سلجوق)، کە ئەمە کورتکراوەی کتێبی (زبدة السفرة ونخبة العصرة)ی نووسەری ئەسفەهانی (عیماد)ە، یەکێکی دیکەیە لەو سەرچاوانە، باس لە مێژووی سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان و باڵکێشانیان بەسەر جیهانی ئیسلامی و، لە چوارچێوەشیدا هەرێمە کوردییەکان، دەکات.. هەروەها لەم کتێبەدا، زانیاری لە بارەی هەواڵی کورد، لەماوەی سەردەمی سەلجوقی و، بەتایبەتیش میرەکانی میرنشینەکانی(بەنی عەنناز)و، میر (هەزار ئەسپ)ی کوردی هاتووە.

یەکێکی تر لەو سەرچاوانەی، لە بارەی مێژووی سەلجوقییەکان، کە بەشەکانی لێکۆڵینەوەکەمانی، بە دەقەکانی خۆی، دەوڵەمەند کردووە، کتێبەکەی (ابن النظام الحسيني)ی مردوو لە (٧٤٣ک/١٣٤٢ز)یە، بەناونیشانی (العراضة في الحكاية السلجوقية).. ئەمە لەگەڵ خراپییەکانی ئەو سەرچاوەیەش، لەوەی کەوا بەشێوازێکی ڕەوانبێژیانە نووسراوەو، دێرە شیعری تێهەڵکێشکراوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پچڕانی زنجیرەی ئەو هەواڵانەی تیایدا هاتوون.

هەروەها لێکۆڵینەوەکەمان، سوودی لە کتێبەکەی (ڕاوەندی)ی، مردوو لە (٦٠٣ک/١٢٠٦ز) بەناونیشانی (راحة الصدور واية السرور) وەرگرتووە، بەوەی کەوا چەند گێڕانەوەیەکی لە بارەی کوردەوەی تێدا هاتووە.

لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی دیکەش، کە ئەم لێکۆڵینەوەی بەزانیارییەکانی پشت ئەستوور کردووە، کتێبەکەی (ئیبنولقەلانسی)ی مردوو لە (٥٥٥ک/١١٥٩ز)یە، بەناونیشانی (ذيل تاريخ دمشق).. کە ئەمە لەکتێبەکانی تایبەت بەمێژووی شاران دەژمێردرێت، باس لە هەواڵی سەلجوقییەکان، هەر لە سەرهەڵدانیانەوەو، هەتا فراوانبوونی دەسەڵات و، باڵکێشانیان بەسەر ناوەندی خیلافەتی عەبباسی و، ئەو ڕووداوانەش کە بەدوای ئەم گۆڕانکارییانەدا هاتوون، هەموو ئەمانە باس دەکات، جا



دەکرێت بڵێین ئەو زانیارییانەی، لە بارەی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان، کە لەم کتێبەدا هاتووە، زانیاری کەمن و، وەکو پێویست نین، بەڵام ئەو گێڕانەوانەی تری کە بەدوایاندا دێت، زانیاری تەواون.

گرنگی ئەو کتێبەش لەوەدا خۆ حەشار دەدات، کە دانەرەکەی هاوچەرخی زۆرێکی ڕووداوەکان بووە، چونکە لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی، هاوچەرخی سەلجوقییەکان بووە، بۆیە زۆربەی گێڕانەوەکانی جێی بڕوان.

بەڵام هەرچی مێژوونووسی بەغدادی (ئیبنو لجەوزی)ی مردوو لە (٥٩٧ک/١٢٠٠ز)یە، لە کتێبەکەیدا (المنتظم في تاريخ الملوك والامم)، گێڕانەوەکانی بە نرخ و گرنگن، لەگەڵ ئەوەشدا کە وەکو پێویست نین و کەمن.. لەوانەشە هۆی ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ئەم مێژوونووسە ڕووداوەکانی بەگوێرەی ساڵی ڕوودانیان بەدوای یەکدا ڕیزکردووە، ئینجا کورتەی ژیانی مردووەکانی هەموو ساڵێکی نووسیوە، بۆیە زۆربەی ڕووداوەکانی، بەکورتی خستۆتەڕوو بۆیەش تەواو مەبەست بەدەستەوە نادەن.

ئەوەی تایبەتیشە بەو سەرچاوانەی دیکە، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتی پێ بەستوون، ئەوا زۆرن و، لێرەدا مەبەست ئەوە نییە هەموانیان بخەینەڕوو، بەڵکو مەبەست ئەوەبوو باس لە زۆر گرنگەکانیان بکەین، دەنا لێکۆڵینەوەکە لەم ڕووەوە سوودی لە گەلێک کتێبی مێژوویی وەرگرتووە، تەنها ناوەکانیان ئەوانەی دەمانەوێت ئاماژەیان بۆ بکەین، بریتینە لە: کتێبی (المختصر)ی (ئەبی لفیداء)ی مردوو لە (٧٣٢ک/١٣٣١ز).. (البداية والنهاية)ی (ئیبنو کەثیر)ی مردوو لە (٧٧٤ک/١٣٧٢ز).. کتێبەکانی (ئیبنولعیبری)ی مردوو لە (٦٨٥ک/١٢٨٦ز) بەناونیشانەکانی (تاريخ مختصر الدول) و (تاريخ الزمان).. کتێبەکانی (زەهەبی)ی مردوو لە (٧٤٨ک/١٣٤٧ز)، بە ناونیشانەکانی (دول الاسلام) و (العبر في خبر من غبر) و (تاريخ الاسلام).. لەگەڵ دەیان سەرچاوەی دیکەش، کە ناوەکانیان لە لیستی کۆتایی لەم لێکۆڵینەوەیەماندا هاتووە.

**سێیەم: سەرچاوە فارسییەکان:**

وەکو لە پێشەکیدا ئاماژەمان بۆکرد، سەرچاوە فارسییەکان بەدرێژی باسیان لە ماوەی دەسەڵاتی سەلجوقییەکان کردووە، هەر لەبەر ئەوەش ویستمان بۆ دەوڵەمەندکردنی بەشەکانی ئەم کتێبە، سوود لە هەندێکیان وەربگرین..

گرنگترینی ئەم نووسراوانە، کتێبی (سەلجوقنامە)یە، کە (نیسابوری)ی مردوو لە (٥٨٢ک/١١٨٦ز) دایناوە، ئەمەش دەکرێت بەباشترینی هەموو ئەو کتێبانە دابنرێت، کە لەبارەی سەلجوقییەکانەوە نووسراوە، چونکە مێژوویێکی گشتگیرەو بەگشتی هەموو ماوە زەمەنییەکەی تەمەنی سەلجوقییەکان دەگرێتەوە، نووسەرەکەی تیایدا سەردەمی زۆربەی سوڵتانەکانیانی باس کردووە، گرنگی ئەو نووسراوەش لەوەدایە، کە نزیکترین سەرچاوەیە لە رووداوە مێژووییەکان، چونکە نووسەرەکەی لە پیاوەکانی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینییە.. ئەم لێکۆڵینەوەیەش سوودی لە رایەکانی وەرگرتووە، بەتایبەت بۆ باسی سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی، لەگەڵ ئەو زانیارییانەی دیکەش، کە لەدوو توێیدا لەبارەی کوردەوەی بەخۆوەگرتووە.

شان بەشانی دانراوەکەی (نیسابوری)، هەردوو کتێبەکانی مێژوونووس و جوگرافی ناسی فارسی (حەمدوڵڵای مستەوفی قەزوینی) مردوو لە (٧٥٠ک/١٣٤٩ز) گرنگی تایبەتیان بۆ بەشەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەبوو، .. دانراوە جوگرافییەکەی (نزهة القلوب) لەبارەی شوێنی شارەکان، بووە پشت بەستراوی یەکەم بۆ دەستنیشانکردنی جوگرافیای وڵاتی کورد، هەرچەندەش کتێبەکە زۆر لەدوای ماوە زەمەنییەکەی لێکۆڵینەوەکەمان نووسراوە، بەڵام (مستەوفی) لە یەکەمەکانی ئەو جوگرافیناسانەیە، کە زاراوەی (کوردستان)یان لە دانراوەکانیاندا بەکارهێناوە، ئاماژەی بۆ سەرجەم شارە کوردییەکان کردووەو، شوێنە جوگرافییەکانیانی دەستنیشانکردووە.

هەرچی کتێبە مێژووییەکەشیەتی (تاریخ گزیدە)، ئەوا لەرووی گرنگییەوەی لە کتێبە جوگرافییەکەی کەمتر نییە، نووسەر تیایدا مێژووی ئیسلامیی نووسیوەو، بەپلەیەکی سەرەکی جەختی لەسەر ئەو هێزە سیاسییانە کردۆتەوە، کە لەجیهانی ئیسلامیدا زەقبوونەتەوە، لەنێو ئەو هێزانەش (بووەیهی) و (سەلجوقی)یەکان، زیاد لەمانەش مادەیەکی زانستی بێ عەیبی لەبارەی میرنشینە کوردییەکاندا تێدا پێشکەشکردووە.

هەروەها دەکرێت ئاماژە بۆ کتێبەکەی (ئەحمەد کەسرەوی) بەناونیشانی (شهریاران گمنام) بکرێت، هەرچەندەش ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی سەرەکی نییە، بەڵکو لە بۆگەڕاوە (المراجع)ە نوێیەکانە، بەڵام زانیارییەکانی گرنگییەکی زۆریان هەیە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان، چونکە دانەرەکەی جەختی کردۆتەوە لەسەر نووسینەوەی مێژووی میرنشینی (روادی)و، دواتریش میرنشینی (شەدادی)و، پەیوەندییەکانی نێوانیان، هەروەها تیشکی خستۆتە سەر سەلجوقییەکان و، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەردوو میرنشینی ناوبراو و، هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان.. دەشکرێ گێڕانەوەکانی (کەسرەوی) لەبارەی (رووادی)یەکان، لە (ئازەربێجان)، بەگێڕانەوەی کەم وێنە بژمێردرێن، ئەمە چ جای ئەوەی ئەوپشتی بەسەرچاوە ئەرمەنییەکان بەستووە، دێت گۆشەنیگای مێژوونووسە ئەرمەنەکانمان، لەبارەی رووداوەکانی ناوچەکە، بۆ دەخاتە بەرچاو، بەڵام لەگەڵ گرنگیشیدا، ئەو کتێبە چەندین کەموکوڕی تیایە، کە رەنگبێ زەقترینیان لەوەدا بەرجەستە بێت، کە (کەسرەوی) گێڕانەوەکانی سەرچاوە ئەرمەنییەکانمان زۆر بەوردی بۆ دەگێڕێتەوە، بێ ئەوەی راو بۆ چوونێکی لە بارەیانەوە هەبێ.

زیاد لەو سەرچاوانەی پێشوو، ئەم لێکۆڵینەوەیە پشتی بە چەندین سەرچاوەی تری فارسی بەستاوە، بەڵام گرنگییان لەوانەی پێشوو کەمتر بووە، لەو سەرچاوانەش کتێبی (تاریخ روضة الصفا )ی مێژوونووس (میر خواند)ی مردوو لە (٩٠٣ک/١٤٩٨ز)یە، لەگەڵ کتێبی (تاریخ حبیب السید)ی (خواند میر)ی مردوو لە (٩٤٢ک/١٥٣٥ز)و، چەندین بۆگەڕاوە (المراجع)ی بە فارسی نووسراوی دیکە، لەوانە: کتێبی (دودمان اریاتی کردو کردستان)ی (موزەفەر زەنگەنە)و، کتێبی (تاریخ عمومی اذربیجان)ی (سیروان کاویان بۆر)و، چەندین سەرچاوەو بۆگەڕاوەی تریش.

**چوارەم: بۆ گەڕاوەکان (المراجع):**

هەرچی تایبەتە بە بۆگەڕاوەکان، ئەوا ئەوانیش بە زانیارییەکانیان، لاپەڕەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیان بەهرەمەند کردووە، هەرچەندەش هەندێکیان زانیاری تەقلیدییان لەخۆ گرتووە، بەواتە پشتم بەسەرچاوەکان بەستووە، لەپڕێکا دانەیەکی سەرچاوە بنجییەکەم دەستکەوتووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت، کە بۆگەڕاوەی گرنگ نەبێت، چونکە هەندێکیان شیکارو دەرەنجامی زانستی باشیان لەبارەی ماوە زەمەنییەکەی لێکۆڵینەوەکەمان پێشکەشکردووە، لێرەدا ناونیشانی ئەو بۆگەڕاوانە ئاماژە بۆ دەکەین، کە بەشێوەیەکی گەورە سوودیان بەم نامەیە گەیاندووە، لە پێشینەشیان ئەو بۆگەڕاوانە دێن، کە تایبەت بەسەلجوقییەکانەوە نووسراون، لەوانە کتێبی (سلاجقة ایران والعراق)ی

(عەبدولنەعیم محەمەد حەسەنێن)و کتێبی (السلاجقة)ی (تامارا رایس) و (تاریخ العراق في العصر السلجوقي)ی، (حسێن ئەمین ئەلمەعنون)، بەڵام لەگەڵ گرنگی ئەم کتێبانەش، زانیارییەکانیان لەبارەی کوردەوە کەم بوون.

لە پاڵ بۆ گەڕاوە تایبەت بە سەلجوقییەکان، ئەم لێکۆڵینەوەیە، کۆمەکی لە ژمارەیەک دانراوی لەبارەی مێژووی میرنشینە کوردییەکان وەرگرتووە، لەوانەی لەلایەن لێکۆڵەرە کوردەکانەوە نووسراون، لەوانەش دیارترینیان:

کتێبەکەی (عەبدولرەقیب یوسف)، (الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى) بەهەردوو بەشەی (سیاسی) و (ژیاری)یەکەی.. کتێبەکانی (محەمەد ئەمین زەکی) بەتایبەتی (تاريخ الدول والامارات الكردية)، زیاد لە مانەش، سوود لەو نامە زانکۆییانەش وەرگیراوە، کەوا مێژووی میرنشینە کوردییەکانیان نووسیوە، لە ریزی پێشەوەی ئەوانەش: نامەکەی (حیسامەددین نەقشبەندی) لەسەر (ئازەربێجان)، کە تیایدا باسی لە مێژووی میرنشینی (روادی)ی کردووە، ئینجا نامەکەی (ئیسماعیل شوکر رەسول) لەسەر (الشداديون فى بلاد اران)، دوا بەدوای ئەمانەشی لێکۆڵینەوەکەی (مەحمود یاسین ئەلتکریتی) بەناونیشانی (الامارة المروانية في ديار بكر).

هەروەها کتێبەکانی تایبەت بەمێژووی تورک، زانیاری گرنگیان پێ بەخشیوین، لە بارەی بنەچەو هاتنە نێو ئیسلام و، وڵاتی تورکان و، چۆنیەتی گەیشتنیان بەجیهانی ئیسلامی، لەو دانراوانەش، (تاريخ الترك في اسيا الوسطى)و (تركستان)ی (بارتۆلد) لە بۆ گەڕاوە گرنگەکانن، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە پێیانەوە دەوڵەمەند بووە.

گرنگی کتێبە ئینگلیزییەکانیش لە بۆ گەڕاوەکانی دیکە کەمتر نییە، دەشتوانین بڵێین هەندێکیان یارمەتیدەری سەرەکی بەشەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوونە، کە زۆربەی لاپەڕەکانیان دەوڵەمەند کردووە، بەزانیاری و گێڕانەوەکانیان و، لە پێشەوەی ئەم بۆ گەڕاوانەش:

(The Cambridge history of Iran)

ئەمەش دانراوێکی پڕ لە گێڕانەوەیە، چەند بەشێک لە خۆ دەگرێت، یەک لەو بەشانە تایبەتە بە (مێژووی سەلجوقییەکان).

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودی لە بەشە ماوەکەی کتێبی (تاريخ الباب



والابواب)ی نووسەرێکی نەناسراو وەرگرتووە، کە (مینورسکی لە ژێر ناونیشانی (Studies in Caucasian history)دا بڵاویکردۆتەوە.

لەمەشدا زانیاری کەم وێنەو دەگمەن لە بارەی میرنشینی (شەدادی)ی کوردی لە (ئاران)و، گرنگترین میرەکانیان و، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەلجوقییەکانەوە، رووخانی میرنشینەکەش هاتووە.

هەروەها ئەم کتێبەشم بەکارهێناوە:

The Ency of Islam

Ficher: The Middle East History.

زیاد لە مانەش، لە بۆ گەڕاوەکانی نووسراو بەزمانەکانی (عەرەبی)و (ئینگلیزی) و (کوردی) و (تورکی / لاتینی)ش سوود وەرگیراوە، کە لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەموویان تۆمارکراون.

لە کۆتاییدا، تکا خوازم سەرکەوتوو بووبم، ئەگەر بەکەمیش بێت، لەوەی کەوا هەوڵم بۆی داوە، لە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە، سەرکەوتنیش هەر لە خوداوەیە.

نیشتمان بەشیر محەمەد

هەولێر (١/٩/٢٠٠٠ز)

**پەراوێزەکانی: پێشەکی و چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکە:**

١- لە بارەی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەسەلجوقییەکان، بڕوانە لاپەڕە (١١)ی دەقە عەرەبییەکەی ئەم کتێبە.

# بەشی یەکەم

## دەرکەوتنی (غەز) و (سەلجوقییەکان) لە رۆژهەلاتی ئیسلامی و، گەیشتنیان بە ولاتی کورد

**یەکەم: ١گەیشتنی غەز (تورک) بە هەرێمە کوردییەکان:**

آ- هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمی ئازەربێجان.

ب- هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر شارەکانی هەرێمی چیاکان.

جـ- هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمی جەزیرەی فوراتی.

**دووەم: دەرکەوتنی سەلجوقییەکان:**

أ- بنچینەو هاتنە نێو ئیسلامیان

ب- ململانێیان لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەوی و، دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی.

جـ- هەوڵەکانی (تەغرول بەگ) لە چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتی سەلجوقی.

**سێیەم: گەیشتنی سەلجوقییەکان بە هەرێمە کوردییەکان:**

أ- گەیشتنی سەلجوقییەکان بە هەرێمی چیاکان.

ب- گەیشتنی سەلجوقییەکان بە هەرێمی ئەرمینیا.

جـ- راگەیاندنی (ناسرلدەولە)، بە گوێڕایەڵیکردنی بۆ سەلجوقییەکان.

د- گەیشتنی سەلجوقییەکان بە ئازەربێجان و ئاران.

دەرکەوتنی (غەز) و (سەلجوقییەکان) لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و، گەیشتنیان بە وڵاتی کورد.

خەلافەتی عەبباسی لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، بە قۆناغێکی مێژوویی نالەباردا تێدەپەڕی، فەوزاو، شڵەژان و، نائارامی سیاسی باڵیان بەسەر ناوەخۆی دادەکێشا، ئەمەش بەهۆی لاوازی خەلیفەو، لەبەر ئەو کێبڕکێیە توندەی میرە بووەیهییەکان بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات لەگەڵ یەکتریان دەکرد، جا لەو بارەدا هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی خەلافەتیش ڕووبەڕووی هێرشی هۆزەکانی (غەز) تورک بوویەوە[١].

(غەز) ئەو ناوەیە، کە مێژوونووسان و شارناسە موسڵمانەکان بڕیبیانە سەر ئەو هۆزە شوانکارە تورکانەی، بەناوچە بیابانییە فراوانەکەی نێوان سنوورەکانی چینی ڕۆژئاواو، تا کەنارەکانی دەریای خەزەر (قەزوین)، بەدوای لەوەڕدا دەهاتن و دەچوون، جا وشەی (غەز)یان (تەوقوز) واتە (نۆ)، لە ژمارەی هۆز، یان بنەماڵە پەرشوبڵاوەکانیان وەرگیراوە، لەسەرچاوە ئیسلامییەکانیش ناوی ژمارەیەک لەو هۆزانە هاتوونە، لەوانە (غەز)، (قەرغەز)، (خەرخەز)، (خەرلوخ)، (خەزەر)، (بەجناکی)و بێجگەی ئەمانەش، بەڵام دەکرێت (غەز) بەگەورەترینی ئەو هۆزە تورکانە بژمێرین، کە سەلجوقییەکان لەوانەوە دروستبوون[٢].

وەکو زانراوە، تورک یەک لەو میللەتە کۆنانەیە، کە لە (ئاسیای ناوەڕاست) ژیاوە[٣]، لە ماوە زەمەنییە جۆراوجۆرەکان و، بە تایبەتیش لە ماوەی مێژووی ئیسلامی، ڕۆڵی گرنگی یاریکردووە، وەکو لە ئاماژەی سەرچاوە ئیسلامییەکان دەردەکەوێت، هەرێمی (خوراسان) لە پێشینەی ئەو هەرێمە ئیسلامییانە بووە، کەوتۆتە ژێر هێرش و، کۆچی ئەو هۆزانە، ئەمەش لەبەرئەوەی کە (خوراسان)، بە بەراورد لەگەڵ هەرێمە ئیسلامییەکانی دیکە، لە هەموویان نزیکتر بووە، لە وڵاتی بنجی ئەو هۆزانە[٤].

شارناس و گەڕیدە موسڵمانە یەکەمەکان، ئەم هۆزە تورکە لێکجیایانەیان ناسیون، لە ژیان و گوزەرانیان کۆڵیونەتەوە، بۆ وێنە (ئیبنوفەزلان)ی گەڕیدە، سەردانی وڵاتەکەیانی کردووەو، هەندێ زانیاریی لە بارەیانەوە تۆمارکردووە، ئەمەش لەکاتی گەشتەکەی بۆ تورکستان و، هەرێمەکانی ئەو دیوی زێ، ساڵەکانی (٣٠٩-٣١٠ک/ ٩٢٢-٩٢٣ز)[٥]، لەگەڵ نێردەیەکی زانستی، شایانی باسە پیاوانی ئەو نێردەیەش، بە یەکەمینی ئەوانە دەژمێردرێن، کە گەیشتبنە ئەو ناوچانە.

(ئیبنو فەزلان) لە نامەکەیدا، ئاماژە بۆ باری هەژاری و ژیانی خراپی ئەو هۆزانە دەکات، هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوەش کردووە، کە پێشەواکەیان نازناوی (بەبغو)ی هەیە.. فەرماندەی سەربازی لەلایان بە(باشی)، واتە: خاوەنی سوپا. دەناسرێت [٦]، لە خوار ئەویش ، فەرماندەیەکی سەربازی بچووکتر دێت، پێی دەگوترێت، (یەناڵ)[٧].

خاوەنی کتێبی (حدودالعالم)- کە ساڵی (٣٧٢ک/ ٩٨٢ز) داینراوە- بەم شێوە وەسفی وڵاتی (غەز) دەکات: (وڵاتی چین دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی غەز، هەندێ بەشی – تبت –یش دەکەونە باشووری.. ئەم ناوچانەش، فراوانترین دەڤەرەکانی وڵاتی تورکن، (غەز)یش لەڕووی ژمارەوە، لەسەرجەم هۆزە تورکەکان زیاتر بوون، هەیانبووە لە ڕۆژانی بۆرین پاشای هەموو تورکستان بووە، پیاوی شەڕ بوونە، چەکێکی زۆریان هەبووە، لە هاوین و زستاندا، بەدوای لەوەڕو ئاووهەوای گونجاودا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جێگۆڕکێیان دەکرد)[٨].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە هۆزەکانی (غەز)ی تورکی، بەدوای لەوەڕەوە لە جێگۆڕیندابوونە، دوای هاتنە نێو ئیسلامیشیان، وەکو لەمەولا بۆمان دەردەکەوێت، دەبینین دەستیان کردووە، بەهێرش کردنە سەر هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات و، بۆ ژیانیان پشتیان بەتاڵان و ڕاووڕوتی بەستووە.

لە پاڵ ناوی (غەز)، مێژوونووس و شارناسە موسڵمانەکان، هەروەها ناوی (تورکمانەکان)[9]یشیان بەسەر ئەو هۆزە شوانکارانەدا بڕیوە.. (کاشغری) کە (کتێبەکەی لە ساڵی - ٤٦٦ک / ١٠٧٣ز- داناوە) دەڵێت: (ئەوغوز- هۆزێکن لە تورک و، ئەوان تورکمانەکانن)..

لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی (چواری کۆچی/ دەی زایینی)ش، مێژوونووسە موسڵمانەکان ئەو ناوەی دواییان بەزۆری بەکارهێناوە، ئەوەش وەکو زاراوەییەکی هاوواتای وشەی (غەز)[10].

ئەوەی پەیوەندی بەو ناوەی دوایینیش هەیە، (ئەبولفیداء)ی (مردوو لە ٧٣٢ک/ ١٣٣٢ز)، شتێکی خۆشمان بۆ دەگێڕێتەوە، ناواخنەکەی ئەوەیە: ئەو ناوە، دوای موسڵمانبوونی تورکەکانی خوراسان و، وڵاتی ئەودیوی زێ، هاتە ئارا، بەهەریەکە لەو موسڵمانە تورکە تازانەیان دەگوت: (بووە تەرجومان) چونکە دەبووە وەرگێڕی عەرەبە فاتمیەکان، لە نێوان ئەوان و، ئەو تورکانەی کە نەبووبوونە موسڵمان، کاری وەرگێڕانیی دەکرد، ئەمەش چونکە ئەو موسڵمانە تورکە تازانە لەگەڵ موسڵمانە عەرەبەکان تێکەڵ دەبوون وفێری زمانەکەیان دەبوون، دوا بەدوای ئەوەش (تەرجومان) بووە (تورکومان)[11]، بەشێوەیەکی وردیش نازانرێت، ئەو هۆزە (غەز)ە تورکانە، کەی هاتوونەتە ناو وڵاتی موسڵمانان، (تاجارا رایس) لەو بڕوایە دایە: ئەو هۆزانە بۆ یەکەمجار لە ساڵی (٧٠ک/ ٦٨٩ز) هاتوونەتە نێو وڵاتی ئەودیوی زێ[12] بەڵام دەرکەوتنی بەکارەکی ئەو هۆزانەو، هاتنیان بۆ نێو هەرێمە ئیسلامییەکان بۆ سەدەی (چواری کۆچی/ دەی زایینی)[13] دەگەڕێتەوە.

## یەکەم: گەیشتنی غەز(تورک) بەهەرێمە کوردییەکان:

### ا- هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمی ئازەربێجان

هۆزەکانی غەزی تورکی، وەک ملکەچ بۆ دەوڵەتی غەزنەوی، تا کۆتاییەکانی سەدەی (چواری کۆچی/ دەی زایینی) لە (خوراسان)دا قەراریان گرت[14]، سوڵتان (مەحمودی غەزنەوی)ش (٣٨٨-٤٢١ک/٩٩٨-١٠٣٠ز) وەکو چۆن کۆمەکی لە تایەفەکانی دیکە وەردەگرت، بەهەمان شێوە داوای کۆمەکی لە ئەوانیش دەکردو، وەکو سەرباز لە ریزەکانی



سوپاکەی دەخستن، ئەوەتا لە هێرشەکانی بۆ سەر (هیند) و (عیراقی عەجەمی) تیپێکی تورکمانەکان لە چوارچێوەی سوپاکەی بوون، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەوانە سەربازی بەکرێگیراو بووینە، کێ کرێی پێدابن، لە پاڵ ئەودا شەڕیان کردووە، لە هەموو سەربازە مورتەزەقەکانی تریش، بە بوێری و ئازایی و رقی گەورە لە شەڕکردنەکانیاندا جیاکراونەتەوە، وەکو سەرجەم هۆزە شوانکارە کۆچەرەکانی تریش، ئارەزووی تاڵان و راووڕووتی یان هەبووە، بۆیە زاڵبوون بەسەریاندا، کارێکی ئەستەم بووە[15].

گەورەبوونی دەسەڵاتی هۆزەکانی (غەز) لە (خوراسان)، بووە هۆی شڵەژانی ئاسایشی ناوچەکە، بۆیە سوڵتانی غەزنەوی، کاری لەسەر دوورخستنەوەیان کرد لە وڵاتەکەی و، ژمارەیەکی لێکوشتن[16].. (ئیبنولئەثیر) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەو (غەز)انەی وایان بەسەرهات، پیاوی (ئەرسەلانی کوڕی سەلجوقی کوڕی دەقاق) بوون[17]، بۆیە سوڵتان بەدوای ئەو پێشەوایەی (غەز)انیدا هەناردو، هێمنی کردەوە، بەڵام دەشیەویست بەهەر شێوەیەک بێت، خۆی لێ رزگار بکات، بۆیە کاتێک لە لایدا ئامادەبوو، سوڵتان فەرمانی بە گرتنی(ئەرسەلان) دەرکردو، خستییە بەندیخانەیەکی یەک لە قەڵاکانی هیند[18]، بۆیە شوێنکەوتووانی (ئەرسەلان) ناچاربوون، (خوراسان)یان جێهێشت و، لە ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز) بە ئاراستەی رۆژئاوا، بەرەو هەرێمەکانی فارس (ئێرانی ئێستا) هاتن، هەندێکیان بەرەو دەورووبەری (رەی)و، ناوچەی شاخاوی (واتە: عیراقی عەجەمی) هاتن، کە نزیکەی (٢٠٠٠) خێوەت دەبوون (خرکاة)[19]، هەندێکیشیان بەرەو ئازەربێجان رۆیشتن[20].

هاتنیشیان بۆ نێو جیهانی ئیسلامی، لە رووداوە گرنگ و ترسناکەکان دەژمێردرێت، لەبەر ئەو شوێنەوارە گەورەیەی، کە لەسەر گۆڕینی واقیعی سیاسی ناوچەکەدا، جێیان هێڵا، هەروەها هێرشەکانیان بۆسەر هەرێمە گشتییەکان بەشێوەیەکی گشتی و، هەرێمە کوردییەکانیش بەشێوەیەکی تایبەتی، بووە هۆی خاپوورو، وێرانکردنیان، زیاد لەمانەش دەرکەوتنیان لە هەرێمە کوردییەکان، یەکەم بەیەکگەیشتنی، چوارچێوەی پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان کوردو سەلجوقییەکان بوو.

ئەم تایەفە دەرچووە لە (خوراسان) بوونە پێشەنگی هێزەکانی، هۆزانی (غەز)ی سەلجوقی، هەروەها ئەوانە یەکەم کۆمەڵەی تورکن دەگەنە وڵاتی کورد، تەنانەت بەر لە

گەیشتنی سوڵتان (تەغرول بەگ)یش بەو هەرێمانە، بەنزیکەی بیست و پێنج ساڵ، جا ئەوانەی هاتنە هەرێمەکانی (چیاکان و ئازەربێجان) بە (غەزی عیراقی) ناسران[٢١].

بەهۆی کشانی ئەو هۆزانە، هەرێمە ئیسلامییەکانی رۆژهەڵات، رووبەرووی بارێکی خراپ بوونەوە، شارەکانی (ئازەربێجان) و (چیاکان) و (ئەرمینیا) و (جەزیرەی فوراتی)، هەراو وێرانەیی جۆراوجۆریان رووبەڕوو بووەوە.

(ئیبنو لئەثیر)، کە لە تۆمارکردنی زانیاری تێروتەسەل، لەمەڕ هێرشەکانی (غەز) بۆ هەرێمە کوردییەکان، بە تەنیا دەمێنێت، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: یەکەم هاتنیان بۆ نێو ئازەربێجان، لە ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز) بوو[٢٢]، بەڵام (ئەحمەد کەسرەوی) -کە لە زانیارییەکانیدا، پشتی بە نووسراوی مێژوونووسە رۆم و ئەرمەنەکان بەستاوە- دەڵێت: گەیشتنیان بە هەرێمەکە بەر لە ساڵی (٤١٠ک/١٠١٩ز) بووە[٢٣].

هەرێمی (ئازەربێجان)یش ئەو کاتەو، هەر لە ناوەڕاستەکانی سەدەی (چواری کۆچی/ دەی زایینی)ش، لەلایەن میرنشینی (رووادی) فەرمانڕەوایی دەکرا، ئەو میرنشینە کوردییەی، میر (محەممەدی کوڕی حوسێنی روادی هەزبانی) دایمەزراند.

میر (وەهسوزانی کوڕی مەملانی رووادی)ش بەدیارترین و، بەهێزو بەتواناترین میرەکانی ئەو میرنشینە دادەنرێت، چونکە لە سەردەمی (وەهسوزان)دا، میرنشینەکە فراوانبوونێکی سیاسی گەورەو، بووژانەوەیەکی ئابووری باشی بەخۆوە بینی، لە بووەیهییەکان جیابوویەوەو، میری ناوبراو لەسەر مینبەرەکانی (تەبرێز)دا، خوتبەی بەناوی خۆی دەخوێندەوە..

(ناسر خەسرۆ)ی گەڕیدەی فارسی، کە لە ساڵی (٤٨١ک/١٠٨٨ز)دا مردووە، دەڵێت: خوتبە لە وڵاتی (ئازەربێجان)دا، بەناوی (میری بەڕێز: شمشێری دەوڵەت و، ئابڕووی میللەت.. ئەبو مەنسور، وەهسوزانی کوڕی محەممەدی مەولای ئەمیری ئیمانداران)[٢٤]، دەخوێنرایەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا، ئەو میرە کوردە ناچار بووە، بێتە پێشوازی ئەو پۆلە یەکەمەی هۆزەکانی (غەز)، کە بەرەو وڵاتەکەی هاتبوون، دەرگای (تەبرێز)یشی بۆ کردنەوە، بوو بەزاواشیان، بۆ ئەوەش وڵات و میللەتەکەی لە مەترسییەکانیان رزگار بکات و، لە شەڕیان خۆ بەدوور بگرێت، هات کچی یەک لە میرەکانیانی مارەکرد[٢٥].



پۆلی یەکەمی (غەز)ەکان لەلایەن ئەو میرە رووادییەوە، هیچ بەرگرییەکیان لێنەکرا، بەڵکو میر کاری بۆ ئەوەکرد رەزامەندییان بەدەست بێنێت و، بۆیە بە ئاشتی هاتنە نێو (تەبرێز)، هەندێ کۆمەڵێشیان لە (ئازەربێجان) نیشتەجێ بوون، وەکو دابی خۆشیان، شارەکانی هەرێمەکەیان تالانکرد، ئا لێرەشدا بەو هەڵس و کەوتانەیان، دڵی ئەو میرە کوردەیان تەنگ کرد، بۆیە دەبینین، لە پاشتردا، (میر بە هێزەکانی) بەرەنگاری ئەو کۆمەڵانەی دیکەیان دەکات، (کە بەرەو هەرێمەکەی دێن)[٢٦].

(نەقشەبەندی) هەندێ پاساو، بۆ ئەو پاڵنەرانە دێنێتەوە، کە وایان لە میر (وەهسوزان) کرد لە (ئازەربێجان)دا پێشوازییان لێبکات، لەپێشەوەی هەموو ئەو هۆیانەش، هێزە سەربازییەکەیان بوو، کە میر بینی و، تێگەیشت، توانای بەرەنگاری کردنیانی نییە[٢٧].. هەروەها (وەهسوزان) بەو ئاواتەوە بوو، یارمەتی (غەز)ەکانی دەستبکەوێت، بۆ رووبەڕووبوونەوەی دوژمنە زۆرەکانی دەوروبەری، لە (رۆم)و (ئەرمەن) و (کەرەج)کان، کە لە باکوورو، لە رۆژئاواوە دەوری (ئازەربێجان)یان دەدا، بۆ سەپاندنی رایەکەشی، لێکۆڵەر پشتی بەهۆنراوەیەکی شاعیر (قەترانی تەبریزی)[٢٨] (مردوو لە ٤٦٥ک/١٠٧٢ز) بەستووە، کە لە هۆنراوەکانیدا، بە میر (وەهسوزان) و هێزەکەیدا هەڵیداوە، ئەو هێزەی، کە خۆی کە بەپشت بەستن بەو (غەز)انە خۆی دەپاراست.. شایانی باسە (قەترانی ئوزدی) شاعیرێکی بیلاتی روادی بووە، لە شیعر و هۆنراوەکانیدا، هەواڵی وردی لە بارەی میر (وەهسوزان)و منداڵەکانی تۆمار کردووە، کە لە راستیدا مێژوونووسان ئەو هەواڵانەیان فەرامۆشکردووە، خۆیشی لە رووداوەکان نزیک بووەوەو، بە چاوی خۆی بینویەتی، بەڵام رووداو و پێشهاتەکانی دوایی، سەلماندیان، کە ئەو میرە کوردە چەند بە هەڵەدا چووبوو، لەوەی کەوا لە پیاوانی (غەز)ی چاوەڕوان دەکرد، ئەوان بەشداری میریان نەکرد لە رووبەڕووبوونەوەکانی لەگەڵ (رۆم) و (کەرەج)و (ئەرمەن)، بەڵکو بوونە سەرچاوەی مەترسییەکی لە مەترسی هەموو ئەو دوژمنانەی گەورەتر، بەمەش میر لە بۆی دەرکەوت، کە هودنە و زاوایەتی کردن لەگەڵ (غەز)ەکان سوودێک ناگەینێت، ئیتر لەوە بەدوا، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی تفاق، تا بەهۆی سوپاوە رووبەڕوویان ببێتەوەو، لە (ئازەربێجان)دا وەدەریان بنێت[٢٩].

لەلایێکی دیکەوە لە(خوراسان)یش میرە غەزنەوییەکان درێژەیان بە کۆششەکانیان دا،

بۆ خستنی (غەز)ەکان و، نەهێڵانی بوونیان لە وڵاتەکەیاندا، ئەوەتا سوڵتان (مەسعودی غەزنەوی) (٤٢١-٤٣٢ک/ ١٠٣٠-١٠٤٣ز) دەرکی بە چەندێتی ئەو مەترسییە کردبوو، کە هێرشەکانیان بۆ سەر وڵاتەکەی دروستی دەکرد، بۆیە داوای لە (تاج فیراش)ی رازگری کرد، لەگەڵیاندا بەشەڕ بێت[٣٠]، بۆیە دوای ئەوەی رازگری سوڵتان (مەسعود) لەلای (نەیسابور)[٣١] شکستێکی گەورەی پێگەیاندن، کۆمەڵەیەکی دیکەیان بەناچاری (خوراسان)یان جێهێڵاو، بەرەو (رەی) هاتن، ئەمەش دوای ئەوەی فەرماندە سەربازیەکەی سوڵتان (مەسعود) لای (نەیسابور)[٣٢] زیانێکی گەورەی لێدان. لە دیارترین میرەکانی ئەو کۆمەڵەیەش (کوکتاش) و (بوقا) و (قزل) و (یەغمر) و (ناسغلی) بوون[٣٣].

(تاج فیراشی) بە دوای (غەز)ە هەڵاتووەکانی بەرەو (رەی)دا رۆشت، بەو مەبەستەی بەتەواوی لەناویان بەرێت، بەڵام ئەمجارەیان کە ئەمە لە ساڵی (٤٢٧ک/ ١٠٣٥ز) بوو، (غەز)ەکان رووبەڕووی بوونەوەو، شکستێکی گەورەیان پێگەیاندو، خۆی و ژمارەیەکیش لەسەرکردە خوراسانییەکانیان کوشتن[٣٤]، هەروەها فەرماندە کوردەکانی سوپاکەشیان بەدیل گرت، ئینجا لە ترسی تۆڵەکردنەوەی غەزنەوییەکان لێیان، ئەم کۆمەڵەیان، کە ئەمە دەستەی دووەمیان بوون، بەرەو (ئازەربێجان) هاتن، بۆ گەیشتن بەو (غەز)انەی لەپێشە خۆیان هاتبوونە ئەو هەرێمە، ئیتر جارێکی دیکە شارو شارۆچکەکانی هەردوو هەرێمەکانی چیاکان و ئازەربێجان، لەنێوانیشیاندا شارە کوردییەکان، لەوانەی دەکەوتنە سەر رێگەیان، دووچاری تاڵان و دزی و دەستدرێژی جۆراوجۆر هاتن و، خاپوور بوون[٣٥].

دوای گەیشتنیان بە هەرێمەکە میر (وەهسوزان) جارێکی تر، شەڕی لەگەڵدا نەکردن و، کاری لەسەر لێ نزیکبوونەوەیان کرد، بەڵام ئەوەی ئەو میرە کوردە بە ئومێدی بوو، لە وەدەست هاتن بەدوور بوو، چونکە ئەوان وازیان لە شەڕو گەندەڵییەکانیان نەهێنابوو[٣٦]، ئەوەتا لە ساڵی (٤٢٩ک/١٠٣٨ز) هێرشیان بردە سەر شاری (مەراغە)، چوونە ناوی و، مزگەوتە گەورەکەیان سووتاند، خەڵکێکی زۆریشیان لە دانیشتوانەکەی و لە کوردە هەزبانییەکانی کوشت، بەمەش (مەسەلەکە گەورەو، بەڵاکە توند بوو)[٣٧].

لە هەمان کاتدا تایەفەیەکی دیکەیان لە ئورمییە (ورمێ) بەرەو وڵاتی (ئەرمەن)



هاتن، کوشتوبڕێکیان تیاکرد و، گەڕانەوە ئورمییە، کە سەر بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میر (ئەبی هیجائی کوڕی رەبیبولدەولەی هەزبانی)بوو- کە ئەم میرە خوشکەزای میر وەهسوزانی رووادیشە-، ئیتر ئەمجارەیان شەڕی گەورە لە نێوان کوردە هەزبانییەکان و، ئەو (غەز)انە بەرپابوو، ژمارەیەکی زۆر لە هەزبانییەکان لەو شەڕانەدا کوژران و، (غەز)ەکانیش زۆرینەی وڵاتیان بە تاڵانبرد و (زۆریان لە کوردان کوشت)[٣٨].

جا کاتێک کوردە هەزبانییەکان، بینییان، چ وێرانە و رووخانێک لەسەر دەستی (غەز)ەکان، بەسەر خۆیان و، وڵاتەکەیاندا هات، ناکۆکییە ناوەخۆییەکانیان خستە لایێک، هاتن ئاشتەوایی و، رێککەوتنێکیان لە نێوان خۆیاندا بەرجەستەکرد، میر (وەهسوزان) لەگەڵ (ئیبنو هیجائی هەزبانی) پێشەوای هۆزەکانی هەزبانی و، خاوەنی ئورمییە، کە وەکو گوتمان خوشکەزایشی بوو، ئاشتبوونەوەو، کوردەکانی ناوچەکەش هاتنە پاڵپشتیان، بۆ رووبەڕووبوونەوەی (غەز)ەکان، کاتێکیش (غەز)ەکان بەرێککەوتنی خەڵکی وڵاتەکەیان بیست بۆ بەکۆدا هاتنەوەیان، تازە مانەوەیان لە ئازەربێجان بە نالەبار زانی، بۆیە بە ناچاری لە ساڵی (٤٣٠ک/١٠٣٩ز) جێیانهێشت و، بوونە دوو بەش، تایەفەیەکیان کە (بوقا) پێشڕەوی دەکردن بەرەو (رەی) هاتن[٣٩]، کۆمەڵەی دووەمیشیان کە (مەنسور) و (کوکتاش) پێشڕەوییان دەکردن، بەرەو (هەمەدان) هاتن[٤٠].

وەکو دەردەکەوێت، ژمارەیەکی زۆری (غەز)ەکان، لە (ئازەربێجان)، مانەوەو، تیایدا قەراریان گرت، بەردەوامیش بوون لەسەر دژایەتیکردنیان بۆ میر (وەهسوزان) ئەگەرچیش، زاواو خەزوورایەتیان لەگەڵ یەک هەبوو، ئەم غەزانە لەسەر تاڵان و دزی و گەندەڵییەکانیان بەردەوام بوون، بۆیە میر (وەهسوزان) هات کاری بۆ ئەوەکرد، بە یەکجارەکی لە وڵاتەکەیان وەدەرنێت، بۆ ئەو مەبەستەش خوانێکی گەورەی بۆ ئامادەکردن لە ساڵی (٤٣٢ک/ ١٠٤٠ز)، بۆ ئەو خوانە داوەتی کردن و، کە کەوتنە بەردەستی سی لە فەرماندە و میرەکانیانی گرت[٤١].

(ئیبنو لئەثیر) ئاماژە بە پێکدادانی میرە هەزبانییەکان و (غەز)ەکان ناکات، بەرلەوەی (غەز)ەکان ئازەربێجان بەجێبێڵن[٤٢]، بەڵام (ئەحمەد کەسرەوی) دەڵێت: دەرچوونی (غەز)ەکان لە هەرێمەکە، لەدوای ئەو شەڕە توندە هات کە لەنێوان خۆیان و میر (وەهسوزان) دروستبوو، کە تیایدا ئەو میرە رووادی یە، بەبێ ژمار خەڵکی

لێکوشتن[٤٣]، رای زیاتریش لەسەرئەوەیە، ئەم شەڕو پێکدادانانە کە لەنێوان هەردوولا روویاندا، وای لە (غەز)ەکان کرد، (ئازەربێجان) بەجێبێڵن.

لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەی لەلایەن میر (وەهسوزان)یش درا، ئازەربێجان لە هێرشی ئەو (غەز)انە پارێزراو نەبوو و، ئەو دەستانە بوونە پێشەنگ بۆ تەوژمی (غەز)ە سەلجوقییەکان، ئەوەبوو لە ساڵی (٤٣٣ک/١٠٤١ز) (ئیبراهیم یەناڵ)[٤٤] لە (رەی) هاتەدەر، بەمەش (غەز)ەکان ناچاربوون ئەو شوێنە جێ بێڵن و، بەرەو (ئازەربێجان) هاتن، دواتریش بەرەو جەزیرەی ئیبن و عومەر و دیاربەکر چوون[٤٥]، لەبارەی هەڵوێستی میر (وەهسوزان)یش ئەمجارەیان، هیچ زانیارییەکی ئەوتۆمان بۆ نەماوەتەوە، بێجگە لەو ئاماژانەی (ئەحمەد کەسرەوی)، کە ئەویش پشتی بەهۆنراوەکانی (قەتران)ی شاعیر بەستووە، چونکە شاعیری ناوبراو لە چەند دێڕێکیدا، ئاماژە بەهەڵگیرسانی شەڕێک لە نێوان میر (وەهسوزان) و (غەز)ەکان دەکات، لە دەشتی (سراو)، کە لەو شەڕەدا، وەکو دەریدەخات (غەز) تیایدا دەشکێن و، ژمارەیەکی زۆریان لێدەکوژرێت[٤٦]، ئیتر ناتوانن لە هەرێمەکەدا بمێننەوە، بۆیە لێیەوەیان بارکرد[٤٧].

بەم شێوەیە دەبینین، میر (وەهسوزان) و کوردە رووادییەکان، لە بەرەنگاریکردنی (غەز)و، بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانیان، رۆڵێکی گرنگیان بینیوەو، لە هەندێ لەو هەوڵانەیان سەرکەوتوونە، بەڵام لەوکاتەشدا، واتە لە ساڵی (٤٣٤ک/١٠٤٣ز)دا، شاری (تەبرێز)ی پایتەختی میرنشینەکە (میرنشینی رووادی)، رووبەرووی زەوی لەرزەیێکی بەهێز بووەوەو، بەهۆیەوە شورەی شارەکەو قەڵاکەی رووخان[٤٨]، بۆیە (وەهسوزان) لەترسی ئەوەی نەبادا (غەز)ەکان بەهەلی بزانن و هێرشێکی بکەنە سەر، بەرەو یەک لە قەڵا قایمەکانی هەرێمەکەی هات.. وەکو دەریش دەکەوێت، میر (وەهسوزان) بەخێرایی شارو قەڵا وێرانبووەکەی بیناکردۆتەوە، چونکە مەترسی ئەوەی هەبووە، هۆزە تورکییەکان هێرشێکی لەناکاو بکەن، بەکارەکیش، دووبارە شارەکە تەواو بیناکرایەوە، بۆیە کاتێک (ناسر خەسرۆ)ی گەڕیدە سەردانی کرد، لە ساڵی (٤٣٨ک/١٠٤٦ز)دا، لەبارەیەوە گوتی: (شارێکی ئاوەدانە)[٤٩].



**ب- هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر شارەکانی هەرێمی چیاکان:**

هەرێمی چیاکان بەشوێنە جوگرافی و ستراتیژییەکەی جیادەکرێتەوە[٥٠]، بۆیە بۆ گەیشتن بە سەنتەری خەلافەت و، گەیشتن بە هەرێمە کوردییەکانی دیکە، پێویستە ئەو رێگایانە بگرێنەبەر، کە لەوێوە سەرچاوە دەگرن، بۆیە شارەکانی ئەو هەرێمەش دووچاری هێرشەکانی (غەز) هاتن، سەرەتا شاری (رەی) و، لەدوای ئەویشدا، شاری (ئەسفەهان) رووبەڕووی مەترسی (غەز)ەکان بۆتەوە.. بۆیە لە ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز)، (غەز)ەکان لەگەڵ خاوەنی هەرێمەکە (عەلا ئولدەولەی کوڕی کاکەویە) چوونە ناو شەڕو، ئەو میرە توانی شکستێکی گەورەیان بەسەر بێنێت، بۆیە وەکو لە پێشتریش ئاماژەمان بۆیکرد، (غەز)ەکان ئەو هەرێمە جێدێڵن و، بەرەو (ئازەربێجان) دەگەڕێنەوە[٥١].

پیاوانی هەزبانی لە شاری (مەراغە) و دەوروبەری، شەڕی (غەز)ەکانیان کردو، بەشێکیان ناچارکردن (ئازەربێجان) جێبێڵن و، بە ئاراستەی (رەی)دا بگەڕێنەوە، بەڵام تایەفەیەکی دیکەیان بەرەو (هەمەدان) رۆشتن، هەرزوو دەستیان بەگەندەڵی و وێرانکردن کردو، ئابڵۆقەیاندا، لەناویشیان (ئەبو کالیجاری کوڕی عەلا ئولدەولەی کوڕی کاکەویە)ی جێگری باوکی بەسەر شارەکەدا، فەرمانڕەوایی دەکرد، بۆیە (ئەبو کالیجار) لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە، لەسەر ئەوە رێک دەکەون، بەرگری لە شارەکەیان بکەن و، لەگەڵ ئەو هێرشهێنە داگیرکەرانە بەشەڕ بێن، بۆیە هەردوولا رووبەڕووبوونەوەو، لە ریزەکانی هەردوولا، ژمارەییێکی زۆر کوژران[٥٢]، ئینجا (غەز)ەکان هاتنە نێو (هەمەدان)، جا کە (ئەبو کالیجار) لاوازی هەڵوێستی خۆیانی بینی و، زانی توانای ئەوەیان نییە، بەرەنگارییان بکەن، کەوتە وتووێژ لەگەڵ (کوکتاش)ی پێشەوای (غەز)ەکان و، ئاشتەوایی لەگەڵدا کرد، تەنانەت هەر بەوەندە نەوەستا، بەڵکو هات کچێکی لێ خواستن و، بووە زاوایان، بۆ ئەوەی لە سەختی هێرشەکانیان کەم بکاتەوە[٥٣].

(ئیبنو لئەثیر) دێت وەسفی باری (رەی)مان بۆ دەکات، لە دوای ئەوەی (غەز)ەکان دێنە ناوی، شارەکە زۆر بە خراپی تاڵان دەکەن و، سوکایەتی بە ژنان دەکەن، ئیتر خەڵکەکە لەو شارە جیادەبنەوەو، دڵخۆش ئەو کەسە دەبێت، کە گیانی خۆی دەرباز کردووە[٥٤]، دوای ئەوە بەرەو (کەرەج)[٥٥] دێن و، تیایدا کارە خراپ و دزێوەکانیان ئەنجامدا[٥٦].

(هەمـــەدان) رووبەڕووی هێـــرشـــێکی دووەم بووەوە، ئەوەبوو دوای ئەوەی (ئەبو کالیجار)ی جێگر بەسەر شارەکە، ئاشتەوایی لەگەڵدا کردن و، شارەکەی لە شەڕیان رزگار کرد، (غەز)ەکان کەوتنەوە بیری ئەنجامدانی هێرشێکی نوێ، ئیتر (هەمەدان)یان گەمارۆ داوە، تایەفە (غەز)ەکانی دیکەی ناوچەکەش بەگەڵیان کەوتن، کاتێکیش (ئەبو کالیجار) بەو هێرشە نوێیەی زانی، بینی بێدەسەڵاتە لەوەی بەرەنگارییان بکات، بۆیە شارەکەی جێهێڵا، بە چارەنووسی خۆی بگات و، لەگەڵ بازرگانان و، ریش سپیانی شارەکە بەرەو شاری (کەنگور) هاتن و، لەوێدا خۆیان قایم کرد[٥٧]، ئیتر لە ساڵی (٤٣٠ک/١٠٣٩ز)(غەز)ەکان کە لەژێر فەرمانڕەوایی (کوکتاش) و (بوقا) و (قزل) بوون، (فەنا خەسرۆی کوڕی مەجدی دەولەی بوویەهی)ش، لەگەڵ ژمارەیەک لە (دەیلەم)ەکان یاوەرییان بوون و هاتنە ناو شارەکە[٥٨].

ئیتر بەشێوەیەکی وەها بەتاڵانیان برد، هیچ شارێکی دیکەی هەرێمەکە بەو شێوە تاڵان نەکراوە – هەروەکو (ئیبنو لئەثیر) دەڵێت: (کاتێک هاتنە ناوی، بەشێوەیەکی وەها خراپ تاڵانیان کرد، شتی وایان لە درەهەق هیچ وڵاتێکی دیکەدا نەکردووە)[٥٩]، ئەمەش وەکو تۆڵەسەندنەوەیەک لەو خەڵکانەی کە بەشێوەیەکی توند بەرەنگاری ئابڵوقەکەیان کردبوو، بۆیە زۆریان کوشتن و، ژنیان بردن[٦٠]، ئینجا لەوێوە، بەرەو (ئەسەد ئاباد)[٦١]و دینەوەر هاتن، ئیتر ئەو شارانە ئازاری زۆریان چەشت، وایلێهات نیشانەکانی نارەزایی و شۆڕش لەلایەن کوردان و لە دژیان وەدەردەکەوت، ئەوەبوو (ئەبولفەتحی کوڕی ئەبی شەوکی فارسی کوردی)[٦٢] –خاوەنی دینەوەر– کە یەک لە میرە عەننازییەکان بوو، سوپایەکی نموونەیی پێکهێنا، هات رووبەڕوویان بوویەوەو ژمارەیەکی زۆری لێ کوشتن و، زۆریشی لێ بەدیل گرتن، (غەز) کە ئەمەیان بینی، کەوتنە وتووێژ لەگەڵ (ئەبولفەتح)و، داوایان لێکرد دیلەکانیان بۆ ئازاد بکات، بەڵام ناوبراو رازی نەبوو، بەو مەرجە نەبێ، ئاشتەوایی لەنێوان هەردوولادا بکرێت، بۆ ئەوەی ئەوان لە نوێوە، چیدیکە هێرش نەهێنینە سەر (دینەوەر)و شارەکانی دیکەی هەرێمی چیاکان، بۆیە پێشەواکانیان هاتنە ژێر مەرجەکەی میر (ئەبو لفەتح)، بەمەش ڕێککەوتن لەنێوان هەردوولادا گەیشتە ئاکام و، دیلەکان ئازاد کران[٦٣].

بەڵام میر (ئەبو لفەتح) پێشبینی ئەوەی دەکرد، جارێکی دیکەش مولکەکانی



بکەونەوە ژێر هێرشی (غەز)ە دڕندەکان، بۆیە دەستی کرد، بە قایمکردنی دینەوەرو قەڵاکانی[٦٤]، ئەم هەوڵانەشی لە بەرگریکردنیان بەرهەمدار بوو، ئیتر (غەز)ەکان نەیانتوانی بێنەوە ناو شارەکانی (هەمەدان) و (دینەوەر) و (کەرەج) و (ئەسەد ئاباد)ی سەر بە هەرێمی چیاکان و، جارێکی دیکە تیایان نیشتەجێ بن، بۆیە ناچاربوون ئاراستەی پێشڕەوییەکانیان بگۆڕن و، ئەمجارەیان بەرەو ناوچەکانی جەزیرەی فوراتی و، وڵاتی هەکاری هاتن[٦٥].

یەک لە لێکۆڵەران وای دەبینێت، ئەو دەڤەرەی چاڵاکی (غەز)ەکانی لەسەر کورت دەبووەوە، سێگۆشەیەک بووە کەوتۆتە نێوان (رەی)و (هەمەدان) و دەریاچەی (ئورمییە) لە ئەرمینیا، ئیتر ئەو وڵاتە دەڕووخێنن و، وێرانی دەکەن و، بەتاڵانی دەبەن[٦٦]، ئینجا ئەو هۆزانە ڕێگەی نێو چیاکان لە (ئازەربێجان) دەگرنەبەرو، هەندێکیان دەچنە نێو ئەرمینیا و، زیان بە هەموو ئەوانەی تیا دانیشتووی لە ئەرمەن و کوردو هەزبانی دەگەیێنن، هەندەکەی تریشیان، بە ئاراستەی وڵاتی (هەکاری) و (مووسڵ) دێن[٦٧].

### ج– هێرشەکانی غەز بۆ سەر هەرێمی جەزیرەی فوراتی:

لە ساڵی (٤٣٢ک/١٠٤١ز)، تایەفەیەکی (غەز)، دوای ئەوەی هەواڵی نزیکبوونەوەی (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای سوڵتان(تەغرول بەگ)ی سەلجوقییان[٦٨] پێگەیشتبوو، (ئازەربێجان)یان جێهێڵاو، بەرەو (جەزیرە) هاتن، لێرەدا وەکو دەردەکەوێت، (غەز)ەکان لە پێشەوا سەلجوقییەکان ترساون، چونکە لە بنجدا هاووڵاتی ئەوان بوونە و، لە گوێڕایەڵەتیکردنیان دەرچوونە..

ئەم تایەفە ئاماژە بۆکراوەی (غەز)ە، هەندێ کوردی ناوچەکەشیان لەگەڵ خۆیان برد، بۆ ئەوەی دەلیلی ئەو ڕێگایانەیان بۆ بکەن، کە لەسەریانە بیگرنەبەر، بۆ گەیشتن بە (جەزیرە)[٦٩]، ئەوانیش ڕێگەیان نیشاندان و، بە کێوی سەختدا تێیانپەڕاندن، تا گەیشتنە (زۆزان)[٧٠].

جێی ئاماژە پێدانە، کە (سەبتی ئیبنو لجۆزی) لە بارەی ئەو پاڵنەرانەی، کەوایان لە (غەز) کرد، بەرەو (جەزیرە) بێت، رای بەپێچەوانەی راکانی (ئیبنو لئەثیر)ەو، دەڵێت: ئەمە لەسەر داوای (ئیبراهیم یەناڵ) بووە، چونکە دوای ئەوەی ژمارەیەک لە هەرێمەکانی

رۆژهەڵاتی ئیسلامییان وێرانکرد، چیدیکە ئەو ناوچانە سوودی بۆیان نەدەگەیاند[٧١]، بەڵام هەرچی (جەزیرە)یە، خێراتی زۆری تێدابوو، پێشتریش نەکەوتبووە بەر هێرشەکانیان، وەکو تێبینیش دەکرێت، (غەز) لەکاتی کشانیان بەرەو (جەزیرە)، بە وڵاتی رۆمدا تێپەڕبوون و هەڵساون، بە کوشتنی دانیشتوانی ئەو ناوچانە، ئینجا گەیشتوونەتە وڵاتی (دیاربەکر)، -وڵاتی مەروانییەکان-[٧٢].

دەکرێت ئێمە، راکەی (ئیبنو لئەثیر) پەسندتر بکەین، چونکە ئەوەی لەبارەی (غەز)و هێرشەکانیان نووسیویەتی، بەباشترینی هەموو ئەوشتانە دەژمێردرێت، کە لەبارەیانەوە تۆمار کرابێت[٧٣]، وەکو ئاشکراشە، لە سەرەتادا (غەز) لە شوێنێکەوتوانی (تەغرول بەگ)ی سەلجوقی و، (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای بوونە، بەڵام دواتر لێیان جیابوونەتەوەو، وەکو سەرچاوەیەکی سەرەکی ژیانیان، پشتیان بە تاڵان و راووڕووتی بەستووە، (بەیهەقی)ش جەختی لەسەر ئەو مەسەلەیە کردۆتەوە[٧٤].. جابە پشت بەستن لەسەر ئەوە، دەکرێ بگوترێت: ئەوان ناچاربوونە هەرێمی چیاکان و ئازەربێجان بەجێبهێڵن و، لەترسی سەلجوقییەکان بەرەو هەرێمێکی دیکە برۆن، ئیتر راشیان دەکەوێتە سەر ناوچەی (جەزیرە)، کە سەر بە زەوییەکانی میرنشینی مەروانی کوردی بوو[٧٥].

بەم هێرشانە، کە هۆزە تورکەکان(غەز) پێی هەڵسان، زۆربەی هەرێمە کوردییەکان لەوێرانبووندا پشکی شێریان بەرکەوت، گەیشتە ئەو رادەیەی یەک لە لێکۆڵەران بڵێت: هێرشەکانی تورک لە رووداوە مێژووییە تاڵەکانن، سەبارەت بە کوردو وڵاتەکەیان کە رووبەڕووی بوونەوە[٧٦].

کاتێک (غەز)ەکانی (ئورمییە) ئەوەیان بیست، کە میر (وەهسوزان) بە تورکەکانی کردبوو، ناوچەکەیان جێهێڵا و، بەرەو وڵاتە شاخاوییەکەی (هەکاری) هاتن، لە رۆژهەڵاتی (مووسڵ)، لەوێش کوردە هەکارییەکان بەرەنگاریان بوونەوە، ئیتر بە ناوچەکانی (جەزیرە) و (مووسڵ)دا بڵاوبوونەوە[٧٧] (غەز) لە سەرەتای ساڵی (٤٣٢ک/١٠٤٠ز) هاتنە نێو وڵاتی هەکاری، بۆیە کوردەکان بەرپەرچییان دانەوەو، شەڕێکی توند لەنێوان هەردوولادا روویدا، (ئیبنو لئەثیر) دەڵێت، لەم شەڕەدا: (کورد شکان، غەز بوونە خاوەنی گەوهەر و ماڵ و ژن و منداڵەکانیان، کوردەکانیش خۆیان بە شاخ و تەنگەبەرەکان گرتەوە)[٧٨]، بەڵام (غەز) شوێن پێیان هەڵگرتن، بەدوایاندا چوونە



نێو شاخ و دۆڵەکان، کەچی ئەمجارە کورد لە تەنگەبەرو پەناگەکاندا خۆیان بۆ لە بۆسەخستن و، زیانی مرۆیی گەورەیان لێدان، کە بەپێی خەمڵاندنی (ئیبنولئەثیر) نزیکەی هەزارو پێنج سەد کەسیان لێکوشتن، هەروەها دەستەیەکیان لێ بەدیل گرتن، لەنێویاندا حەوتیان لە میرەکان بوون، سەدیش لە ریش سپی و کەسایەتیەکانیان بوون، هەروەها کورد وڵاغ و کەل و پەلەکانیان لێگرتن و، هەموو ئەو شتانەیان لێ سەندنەوە، کە لە پێشتردا ئەوان بەتاڵان و دزی لێیان بردبوون، ئیتر ئەو (غەز)انەی رزگاریشیان بوو، لەنێو کێوو دۆڵ و دەشتاییەکان خۆیان ونکرد[٧٩].

ئینجا هێزەکانیان بەرەو (زۆزان) و، رووەو شاری (جەزیرەی ئیبنو عومەر) هاتن، لە ساڵی (٤٣٢ک/١٠٤١ز)دا یەک لە فەرمانداکانیان، کە (مەنسووری کوڕی غەزغەلی)یان پێدەگوت، ئابڵوقەی شارەکەی دا، بەڵام سوپایەکی دیکەیان کە (بوقا) و (ناسغلی) فەرماندەییان دەکرد، رووەو (دیاربەکر) هاتن و، گەمارۆیان خستە سەر هەردوو شاری (میافارقین)و (ئامەد)[٨٠]، وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆشیان، (غەز) کەوتنە بەتاڵانبردنی شارەکانی ناوچەکە، لەوانە شارەکانی (قردی) و (بازبدی) و (حەسەنی) و (فیشابور)[٨١].

میرە کوردە مەروانییەکان هەوڵیاندا بەرپەرچی ئەو هێرشانە بدەنەوە، ئەوەبوو (ئەبو حەرب سلێمان کوڕی نەسرولدەولەی کوڕی مەروان)، کە جێگری باوکی بوو بەسەر (جەزیرەی ئیبنو عومەر) وەڵامی بۆ (مەنسور)ی فەرماندەی (غەز)ەکان هەنارد، تا دابنیشن و، رێککەوتنی ئاشتی لەنێوان هەردوولادا ببەستن، وەکو دەریش دەکەوێت، هەردوولا رێککەوتوون، ئەگەرچی یەک لە لێکۆڵەران دەڵێت بەندەکانی رێککەوتنەکەی نێوانیان زۆر روون نین[٨٢]، بەڵام ئەوەی ئاگاداری کتێبی (الکامل) بێت، دەرک بەوە دەکات، کە ئەو خاڵە سەرەکییەی میرە کوردەکان لەگەڵ فەرماندەی (غەز) لەسەری رێککەوتوون، بریتی بووە، لە: دەرچوونی هەموو تایەفەکانیان لەسەرجەم ناوچەکانی جەزیرە، کە مەرج وابووە دوای تەواوبوونی وەرزی زستان ئەو هەرێمە جێبێڵن و، بەرەو (شام) برۆن، واتە بەشێوەیەکی کاتی رێگەیان بدەن لە ناوچەکەدا بمێننەوەو، دواتر لێی باربکەن[٨٣].

هەروەها میرە کوردەکان جڵەوی هێزو دەستپێشەرییان بەدەستەوەبوو، بۆ

ڕووبەڕووبوونەوەیان، سەرکەوتن لە وەدەرنانیان لە ناوچەکە، چونکە میر (سلێمان) ڕێککەوتنی لەگەڵ (غەز)ەکانی کردە هۆکارێک بۆ خۆ ڕزگارکردن لێیان، دوای ئەوەش کە بۆ خوانێکی نان خواردن، (مەنسور) و چەند میرێکیانی بانگهێشتی (جەزیرەی ئیبن و عومەر) کرد، سەربازەکانی میر دەورەیان گرتن، قۆڵ بەستیان کردن و لەگەڵ خودی (مەنسور)یش فڕێیان دانە بەندیخانە، ئەم هەواڵەش گەیشتە شوێنکەوتوانی دیکەیان، ئەوانیش بەمە ترسیان لێنیشت، (جەزیرە)یان جێهێڵا و بەرەو دەوروبەری (مووسڵ) هاتن(٨٤).

لەوێش میر (قرواشی عەقیلی)، کە کوردە بەشنەوییەکانی قەڵای (فێنک)یش(٨٥) لەگەڵیدا هاوپەیمان بوون، ئەویش بە ڕۆڵی خۆی سوپایەکی گەورەی بۆ بەرپەرچدانەوەیان ڕەوانکرد، هەر لەوکاتەدا هێزەکانی (نەسرولدەولەی مەروانی)ش هاتنە پاڵ هێزەکانی (قەرواش عەقیلی)، ئیتر گەیشتنە (غەز)ەکان و لەگەڵیاندا کەوتنە شەڕ، تا بەکشانەوەی هێزەکانی (غەز) بەرەو (دیاربەکر) کۆتایی بەو شەڕەی نێوان هەردوولادا هات، لەو هەرێمەش، لەبەر ترسناکی هێرشەکانیان بۆ سەر ولاتی کوردە مەروانییەکان، میر (نەسرولدەولە) ناچاربوو لەگەڵیان بکەوێتە نامە گۆڕینەوەو، وادەی ئەوەی پێدان هەوڵەکانی بخاتە گەڕ بۆ ئازادکردنی (مەنسور)ی میریان، بەڵام بەو مەرجەی لە بەرامبەردا هێرشەکانیان بۆ سەر ولاتەکەی بوەستێنن، ئەوانیش لەسەرئەوە ڕازی بوون(٨٦).. ئیتر (مەنسور) ئازادکراو، ماڵ و سامانیشیان بۆ ڕەوانکرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (غەز) هێرشەکانیان نەوەستاند، دەستدرێژییەکانیان بۆ سەر شارەکانی (جەزیرە) بەردەوامبوو، دوای ئەوەش هەندێکیان بەرەو شارەکانی (نەسێبین)(٨٧)و، (سنجار) و (خابوور) هاتن(٨٨).

پەیوەندی مەروانییەکان لەگەڵ (غەز)ەکاندا لەسەردەمی میر (نەسرولدەولە) لەسەر بنەمای نەشەڕ نە ئاشتی دامەزرا، ئەمەش لەبەر مەترسی ئەو میرە کوردە لە شەڕو لە هێزە سەربازییەکەیان و لە زۆری ژمارەکەیان، لەگەڵ مەترسیشی لەوەی مەبادا شارەکانی (جەزیرە)ش تێکبدەن(٨٩)، جا لەبەر مەترسییەکانی لەسەر ولاتەکەی و لەپێناو پارێزگاری لێکردنی، لەدەستپێشخەریەکیدا نامەیەکی بۆ سوڵتان (تەغرول بەگ) ڕەوانکرد، تیایدا سکالای خۆی لەدەستیانەوە بۆ نووسی، سوڵتانیش بەم گوتەیەی وەڵامی دایەوە: (پێم گەیشتووە، کە کۆیلەکانمان هاتوونەتە ولاتەکەت، تۆش بەشداریت کردوون بە ماڵ و



سامانێک کە بۆت خەرج کردوون، تۆ خاوەنی سنووری (ثغر) لەگەڵ غەیرە دینان، بۆیە پێویستە ببەخشیە ئەوەی، داوای یارمەتیی لێدەکەیت بۆ شەڕی کافران)(٩٠) وادەی ئەوەشی پێدا، کە لەدواتردا هەواڵیان بۆ دەنێرێت، بۆ ئەوەی لە ولاتەکەیدا دەرچن(٩١).

پەیوەندیکردنی میری مەڕوانی بە سوڵتانی سەلجوقی، ڕاڤەی چەندێتی ترسناکی ئەو بارە دەکات، کە میرنشینی مەڕوانی پێیدا تێپەڕیوە، چونکە میرنشینەکە لە هەموو مێژووەکەیدا ڕووبەڕووی هێرشێکی بەو شێوەیە نەبوو بووەوە، (فارقی) قسە لەسەر مەترسییەکانی (غەز) لەسەر ئەو میرە مەڕوانییە دەکات و، دەڵێت: (ئیبن و مەڕوان لە هەموو ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا، تاوەکو مردیش، کەس لێی نەدا، ئەوانە نەبن، بەڵام خودا شەڕیانی لێ دوورخستەوە(٩٢).

هەروەها ئەم پەیوەندییەی نێوان سوڵتانی سەلجوقی و، میری کوردی، دەکرێت بەیەکەم پەیوەندی ڕەسمی نێوان هەردوولادا بژمێردرێت، چونکە مێژووی ئەو نامەیەی کە (تەغرول بەگ) بۆ (نەسرولدەولە)ی ڕەوانکردووە، ساڵی (٤٣٥ک/١٠٤٣ز)(٩٣)بوو، ئەمەش مێژوویێکی زووە، لەکاتێکدایە، هێشتا دەسەڵاتی سەلجوقی نەگەیشتۆتە هەرێمە کوردییەکان.

لەگەڵ ئاگادارکردنەوەکانی سوڵتان (تەغرول بەگ)یش، (غەز) درێژەیان بە پێشڕەوییەکەی خۆیانداو، ئەمجارەیان ڕوویانکردە شاری (مووسڵ)ی بنکەی هەرێمی (جەزیرە)، یەکەمجار میر (قەرواشی عەقیلی)و بەیارمەتی کوردەکان، توانی بە شێوەیێکی کاتی مەترسییان لەسەر شارەکەدا دووربخاتەوە، بەڵام ئەوان سەرلەنوێ بۆ هەرەشەلێکردنی هاتنەوە، چونکە شاری (مووسڵ) گەورەترین سەنتەری ژیاری بوو لەپێشیان(٩٤)، میر (قەرواش)یش بە بەرەوپێش هاتنەکەیانی بیست، بۆیە کەسانێکی نارد، هەواڵ و ژمارەکەیانی بۆ بێنێت، جا کاتێک زانی لە توانایدا نییە بەرپەرچیان بداتەوە، وادەی سێ هەزار دیناری پێدان، کەچی لەکاتێکدا خەڵکی شارەکە بە کۆکردنەوەی ئەو پارەیە خەریک بوون، (غەز)ەکان بەرەو (مووسڵ) خشین، ئیتر (قەرواش)و خەڵکەکە بەرپەرچیان دانەوە، بەڵام نەیانتوانی تا سەر بەرەنگارییان لێبکەن، بۆیە میری(عەقیلی)ش، شارەکەی جێهێڵا، تا وەکو شارەکانی دیکەی جەزیرە، ڕووبەڕووی چارەنووسەکەی خۆی ببێتەوە(٩٥).

(قەرواش) بەرەو ناوچەی (سن) هەڵهات[٩٦]، لەوێوە کەوتە داوای یارمەتیکردن لە میرەکان و، کۆکردنەوەی سوپا بۆ بەگژداهاتنەوەیان، نامەی بۆ خاوەن ناوچەکانی دەوروبەر هەنارد و، داوای یارمەتی لێکردن، یەک لەو میرانەی کە داوای یارمەتی لێکردن میری بووەیهی(جەلالولدەولە) و (دبیسی کوڕی مەزید)ی میری (بەنی مەزید) بوو لە (حیللە)، لەگەڵ میرانی کوردیش[٩٧].. بۆیە (ئەبولشەوک فارسی کوڕی محەمەد)ی میری عەننازی (٤٠١-٤٣٧ک/ ١٠١٠-١٠٤٥ز)و، میر (ئەبو لفەتح کوڕی و رامی جاوانی)(٤٠٣-٤٥٥ک/١٠١٢-١٠٦٣ز)[٩٨]، هەریەکە و لەلایەن خۆیانەوە، یارمەتی سەربازییان بۆ (قەرواش) هەنارد، بەڵام ئەو هێزە کوردانەی بۆ یارمەتی (قەرواش) هاتن، نەگەیشتنە شەڕەکە، چونکە (قەرواشی) میری عەقیلی چاوەڕوانی گەیشتنی هەموو هێزە یارمەتییەکانی نەکرد، زووتر بەرەو (مووسڵ) هات بۆ شەڕ لەگەڵ کردنیان[٩٩] دەکرێ بڵێین: وەڵامدانەوەی کورد بۆ داواکەی (قەرواش)و، ناردنی هێزو یارمەتی سەربازییان لە بۆی، لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، چونکە دەرکیان بە چەندێتی ئەو ترسناکییە کردبوو، کە (غەز) بەشێوەیەکی گشتی لەسەر جیهانی ئیسلامی و، بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر وڵاتەکەیان دروستی دەکرد، هەروەها میری عەننازی (ئەبولشەوک) زووتر وڵاتەکەی رووبەڕووی هێرشەکانی (غەز) بوو بۆوەو، بەرپەرچی دابوونەوەو، شارەکانی هەرێمی چیاکانی لە هێرشەکانیان رزگارکردبوو، بۆیە دەبینین بەخێرایی یارمەتیەکانی بۆ (قەرواش) رەوان دەکات، چونکە دەیزانی مەترسییەکە ئێستاکەش لێی نزیک بوو.

بە بەراورد لەگەڵ هەرێمەکانی دیکە، (غەز) زۆر لە (مووسڵ) مانەوە، چونکە میرە کوردەکانی هەرێمەکانی ئازەربێجان و چیاکان و جەزیرە، ماوەی ئەوەیان بەو هێزانە نەدا لە هەرێمەکانیان بمێننەوەو، نیشتەجێ بن، بەڵام میر (قەرواش)ی عەقیلی دەبینین هەڵدێت، (غەز)یش ئەم هەلە دەقۆزنەوەو، دێنە ناو شارەکە، مانەوەشیان تیایدا درێژەی کێشا، ئەمجارەیان لێرەوە درێژەیان دا بەهێرشەکانیان بۆ سەر لایەکانی تر[١٠٠]، جا کاتێک میر (جەلالولدەولە)ی بووەیهی، بینی، ئەوە خەریکە هێرشەکانیان زیان بە موڵکەکانی دەگەیەنێت، نامەیەکی بۆ سوڵتان (تەغرول بەگ) نووسی، تیایدا سکاڵای خۆی لە دەست (غەز)و، ئەو کارو کردەوانەیان دەربڕی، کە بوونەهۆی وێرانکردنی هەرێمی (جەزیرە)، دوای ئەوە نامەیەکی وەڵام لە سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە، گەیشتە میری



بووەیهی و، تیایدا داوای لێبووردنی کرد، نووسیبووی: (ئەم تورکمانانە کۆیلەو خەڵک و شوێنکەوتەی ئێمە بوون، فەرمانیان بەجێ دینایین و، خزمەتی کۆشکیان دەکردین، بەڵام کاتێک هەڵسایین، بەمشور خواردن لە خوتبەکانی (ئال مەحمودی کوڕی سبکتکین) - مەحمودی غەزنەوی-و، هەنگاومان نا بۆ کۆتاهێنان بە مەسەلەی خەواریزم، ئەوان بەرەو (رەی) رۆشتن، دەستیان کرد بە گەندەڵی کردن تیای، بۆیە ئێمەش سەربازەکانمان لە (خوراسان)ەوە بەرەو روویان نارد، وای بۆ دەچووین، ئەوان بەرەو ئارامی (أمان) هەنگاو دەنێن و، داوای لێبووردن و لێخۆشبوون دەکەن، چونکە هەیبەت بەدەستەوەی داون و، ترس هەژاندونی، بەڵام وا دەرنەچوون، بەڵام هەر دەشبێت بە ملکەچی بۆ ژێر ئاڵاکەمانیان بێنینەوەو، سزای خۆمان بگەیەنینە یاخییەکان، جا نزیک بن، یان دوور.. هێرش بەر بن، یان داوای یارمەتی کەر)[١٠١].

میر (قەرواش)ی عەقیلی لەگەڵ هێزەکانی بەرەو (مووسڵ) هات، ئەم هەواڵەش گەیشتە (غەز)، ئەوانیش کەوتنە ئامادە باشی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو هێزەی وا بەرێوەیە، نامەشیان بۆ تایەفەکانی دیکەیان و، لەپێشینەی هەموویان (ناسفلی) و (بوقا) لە دیاربەکر، هەناردو، داوایان لێکردن، بە هانایانەوە بێن[١٠٢]، ئەوانیش بۆ یارمەتی ئەو رۆڵانەی لە خوێن و گۆشتیان بوون، بەرەو شارەکەیان هاتن، کاتێکیش هێزەکانی (قەرواش) نزیکبوونەوە، هەردوو هێزەکان بەیەکیانداداو، شەڕێکی گەورەیان لەنێواندا کەوتەوە، سەرەنجام بە سەرکەوتنی میری عەقیلی بەکۆتا هات، (غەز)ەکانیش شکان، ژمارەیەکی گەورەیان لێ کوژراو، لە (مووسڵ) وەدەرنران، (قەرواش) سەری لەدوو نان تا گەیاند نییە (نەسێبین)، دوای ئەوە بەرەو (دیاربەکر) هاتن و تاڵانیان کرد[١٠٣]، ئینجا کە هێزەکەیان لاوازبوو، مەسەلەکەیان شلی تێکەوت، وایان لێهات نەیاندەزانی بۆ کوێ بڕۆن، روویان کردە وڵاتی (رۆم)، دوای ئەوەش جارێکی تر بەرەو (ئازەربێجان) هاتنەوە، لەولاوە (قەرواش)یش نامەی بۆ میرەکانی دەوروبەر نووسی مژدەی سەرکەوتنی بەسەر (غەز)ەکانی پێدان[١٠٤].

وایلێهات تیاچوون و توانەوە هەڕەشەیان لەچارەنووسی تایەفەکانی (غەز) دەکرد، چونکە لەو ناوچەیەی لێی گیرسابوونەوە، یارمەتییان پێنە دەگەیشت، نەشیاندەتوانی بۆ ئەو شوێنە بگەڕێنەوە، کە لێیەوەی هاتوون، چونکە لەوێوە سزای سەلجوقییەکان

چاوەڕێیان بوو، ئەو سەلجوقیانەی کە پێشەواکەیان ببووە، سەرۆکی دەوڵەتێکی خاوەن یاسا[١٠٥]، نەک هەر پێشەوایەکی خێڵەکی و بەس، لەلایێکی دیکەشەوە هاوپەیمانێتی میرە کوردو عەرەبەکان لە جەزیرەی فوراتی، بووە هۆی تیاچوونی هەرە زۆریان و، ئەوانەی دەربازیشیان ببوو، بە وڵاتەکاندا پەرش و بڵاوببوون، سێ لە پێشەواکانیان و، ژمارەیەکی دیکەشیان لێکوژرابوو، کە وەکو دەڵێن: میر قەرواش پاپۆڕێکی پڕ لە سەری کوژراوانی (غەز)ی بەرەو بەغداد هەنارد[١٠٦].

هەروەها (قەرواش) لە نامەیێکی دا، بۆ (ئەبیلهیجائی کوڕی ڕەبیبولدەولە)ی هەزبانی میری (ئورمیە)دا، بۆی نووسیبوو، کە: (ئەو سێ هەزار کەسی لێکوشتوون).. (ئەبولهیجاء) بەنێردراوی (قەرواش)ی گوتبوو: –(ئەمە سەیرە! کاتێک ئەم نەتەوەیە وڵاتەکەی منیان بڕی، لەسەر پردێکدا کە چاریان نەبوو دەبوو بەسەریدا بپەڕنەوە، یەکێکم دانا بیانژمێرێت، دەرچوون لەگەڵ شوێنکەوتووکانیان سی هەزارو چەند کەسانێک بوون، بەڵام کە لەدوای شکستەکەیان گەڕانەوە، نەدەگەیشتنە پێنج هەزار، دەی ئەوانەی تریان یان کوژراون و، یان مردوون)[١٠٧]، ئەمەش گەورەیی ژمارەی (غەز)ەکانمان بۆ ڕووندەکاتەوە، لەوکاتەی کە لە (ئازەربێجان)ەوە کەوتوونەتە پێشڕەوی، بەپێی سەرژمێرییەکەی (ڕەبیبولدەولەی هەزبانی)ش لە (ئورمییە)، ژمارەیان سی هەزار کەس بووە، هەر ئەو(ئەبولهیجا)یەش شانازی بەوە دەکرد، کە ئەو لە ساڵی (٤٣٢ک/١٠٤٠ز)دا، لەو سی هەزار کەسە کە دەیانویست بەرەو وڵاتەکەی بپەڕنەوە، لە نزیک پردێکدا لێیان دەدات و، دوو هەزارو پێنج سەد پیاویان لێدەکوژێت[١٠٨]، ئەو ژمارەش کە لێیان دەمێنێتەوە، هێرش بۆ (جەزیرەی فوراتی و مووسڵ) دەبەن، (قەرواش)یش جەختی لەسەر ئەوەکردەوە، کە ئەویش سێ هەزار کەسی لێکوشتوون[١٠٩]، (ئەبولهیجاء)یش ئاماژەی بۆ ئەوەکرد، کە ژمارەی ئەوانەی بەوڵاتەکەیدا گەڕانەوە، بە تەنیا پێنج هەزار کەس بوون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بە هەزارانیان لە (جەزیرە) تیاچوونە، چونکە لە کۆی زیاتر لە سی هەزار پیاوی (غەز)، ئەوانەی هاتنە نێو شارو هەرێمەکانی کوردستان و، ئازەربێجان و، هەکاری و زۆزان و، شارو ناوچەکانی سەر بە دیاربەکرو مووسڵ و، ناوچەکانی دیکە، بەتەنها و کەمتر لە پێنج هەزار شەڕکەریان دەربازی بوو[١١٠].



دەرکەوتنی (غەز) لە جیهانی ئیسلامی و، هێرشەکانیان بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان، وەکو پێشەکییەک بۆ دەرکەوتنی سەلجوقییەکان دەژمێردرێت، چونکە وەکو ئاشکرایە، سەلجوقییەکان لکێکی هۆزە سەرەکییەکانی (غەز) بوون، ئەو پەیوەندییانەش کە لەنێوان پێشەواکانی کوردو (غەز) ئەنجامدران، یەکەمین پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لایەنی کوردی و تورکی بوو، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا، کە (ئیبنو لئەثیر) ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت: (دەوڵەتەکەیان زۆر تەمەن درێژ نەبوو)[١١١]، بەڵام دەبینین هێرشەکانیان لە واقیعدا بێ شوێنەوار نەبوون، ئەوە بوو ئەو پەیوەندییە زووەی نێوان کوردو غەز، کاریگەریەکی گەورەی هەبوو، لە دەستنیشانکردنی هەڵوێستی سەرکردایەتیە کوردییەکان و، مامەڵەیان لە دواییدا، لەگەڵ دەسەڵاتی سەلجوقی، چونکە لەلای ئەو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سوڵتانەکانی ئال سەلجوق، ئاشکرا بوو.

مەسەلەیێکی دیکە، کە شوێنەواری هێرشەکانیان بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان، بەجێی هێڵاو، هیچ گومانی تیانییە، نیشتەجێبوونی هەندێک لەو هۆزە داگیرکەرانە بوو لە ناوچەکە، ئەوەتا وەکو یەک لە ڕۆژهەڵاتناسان ئاماژەی بۆ دەکات: ئەو هۆزانە لە لاپاڵەکانی دامێنی کێوە کوردییەکان نیشتەجێ بوون[١١٢]، جگە لەمانەش، یەک لەو شوێنەوارە گرنگانەی کە پەیوەندی نێوان هەردوولا، لەدوای خۆی بەجێی هێشت، هاتنە ناو وڵاتی کوردی ڕەگەزێکی نوێی سیاسی بوو، ئەویش ڕەگەزی تورکی ناسراو بەسەلجوقییەکان بوو، کە لە دواتردا ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسی وڵاتی کورددا، یاری کرد، هێشتاش گرنگترین کاریگەری دەمێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە، کە هێرشی (غەز)، سوڵتان (تەغرول بەگ)ی سەلجوقی هێنایە نێو ئاسۆیەکی نوێی زۆر ئیغراکەر، لەڕاستیشدا ئەو بەرگریەی کە (غەز)ەکانی عێراقی ڕامالی، نەبووە ڕێگر لەبەردەم دووبارەگەڕانەوەی سەرلەنوێی کاروانی تورکمانی بەرەو هەرێمە کوردییەکان، چونکە سەلجوقییەکان هێندەی نەخایاند، لەژێر فشاری زۆربوونی دانیشتوان و، کەوتنەژێر کاریگەری دەستکەوت (الغنائم)، هاتن هەمان ئەو ڕێگەیەیان گرتەبەر، کە پێشتر (غەز) گرتبوویانەبەر[١١٣].

ئەوەی لە هێرشی (غەز) بۆسەر وڵاتی کورد سەرنج ڕاکێش بێت، ئەو کۆششە گەورەو بەرەنگارییە نەپساوەی کوردە، کە لەدژی ئەو هۆزانە تۆماریان کرد، بۆیە هەر لەگەڵ

دەستپێکردنی هێرشەکەیان، لە ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز)، هەوڵەکانیان خستەگەڕ بۆ دوورخستنەوەی شەڕو گەندەڵییەکانیان لەسەر وڵاتەکەیان، میرە کوردەکانیش لەم رووەوە، رۆڵی هەرە گەورەیان بینی هاتن لە پێناو مانەوەی سەربەخۆیی میرنشینەکانیان ناکۆکییەکانیان پشت گوێ خست و، هەوڵەکانیان یەک خست، بۆیە لەم رووەوە هەمان رۆژهەڵاتناس دەڵێت: جگە لەو بەرەنگارییە کوردییەی دانیشتوانی هەرێمەکانی ئازەربێجان و جەزیرە پێی هەڵسان، ئیتر هیچ بەڵگەیەکی دیکەی پێکدادانێکمان نەگەشتۆتە دەست لە نێوان هۆزەکانی (غەز)و، کۆمەڵێ خێڵەکیەکانی دیکەی بێجگەی ئەوان رووی دابێت، مەگەر زۆر بەکەمی نەبێت[١١٤].

## دووەم: دەرکەوتنی سەلجوقییەکان:

پێویستی زانستی لێرەدا وا دەخوازێت، کە ئاماژە بە دەرکەوتنی سەلجوقییەکان و، هەموو ئەو هۆکارانە بدرێت، کە لەرووی سیاسییەوە یارمەتی دەرکەوتنیانی دا، تا ئەو کاتەی توانییان قەوارەییەکی تایبەت بەخۆیان دامەزرێنن، لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ ئەو شتانەش کە دوابەدوای دامەزراندنی قەوارەکەیان هات، بەتایبەت لە تێڕوانینیان بۆ بیناکردنی پەیوەندی لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی ناوچەکەو، لە نێویشیان میرنشینە کوردییەکان، بەڵام بەشێوەییێکی کورت و، دوور لە درێژدادڕی و دووبارەکردنەوە[١١٥].

لە سەرەتاکانی سەدەی (پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی) سەلجوقییەکان لە رۆژهەڵاتی ئیسلامی دەرکەوتن، خەلافەتی عەبباسیش ئەو رۆژە تووشی لەبەریەک هەڵوەشانەوەو توانەوە هاتبوو، چونکە لە عیراقدا بەهۆی ململانێی نێوان میرو فەرماندەکان لەسەر خەلافەت، بارێکی شڵەژاو هاتبووە پێش[١١٦].

لاوازی خەلافەی عەبباسی، بووە هۆی دروستکردنی بارێکی شڵەژاو و فەوزا لە رۆژهەڵاتی ئیسلامی، کە لە دەرەنجامی ئەمە، خەلافەت دەسەڵاتی بەسەر ئەو ویلایەتانەی نەما، کە سەر بە بەغدای پایتەختی بوون، بووەیهییەکانیش دوای باڵکێشانیان بەسەر عیراق، هەموو دەسەڵاتەکانی خەلیفەیان بۆ خۆیان قۆرخ کرد، بەمەش پایەو هەیبەتی خەلافەت نەما، بۆیە ژمارەیەک لە مێژوونووسان لەمەڕ ئەو بارە خراپەیان نووسیوە،



(بەیرونی) مردوو لە (٤٤٠ک/ ١٠٤٨ز) دەڵێت: (ئەوەی لە دەست عەبباسییەکان مایەوە، شتێکی ئایینی بیروباوەڕی بوو، نەک شایی دونیایی)[١١٧]، (قەلقشندی)ش جەخت لەسەرهەمان شت دەکاتەوەو، دەڵێت: (بیزانە کە مەسەلەی خەلافەت لاوازو بێهێز کەوت)[١١٨].

بەهۆی ئەو ململانێیەی لە نێوان تاکەکانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا، لەسەر دەسەڵات هاتە پێشیان و، بەهۆی هەڵوێستی دژایەتی خەلیفەش لە بۆیان، دوای ماوەیەک بووەیهییەکانیش تووشی لاوازی هاتن، ئەمەش لەکاتێکدا، کە هێزێکی وەکو سەلجوقییەکان لەسەر شانۆی رووداوەکان خەریک بوو زەق دەبۆوە[١١٩].

سەلجوقییەکان لە گەشەکردنێکی بەرچاو دابوون و، لە خۆسەپاندنیان بەسەر هەرێمانێکی زۆردا سەرکەوتن، وەکو دەریش دەکەوێت، هۆکارگەلێکی زۆر بوونە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی بووەیهی و لە دواتردا رووخاندنی، کە دەکرێت دەرکەوتنی سەلجوقییەکان، بەپێشینەی هەموو ئەو هۆیانە بژمێرین، کە بوونە هۆی تیاچوونی دەسەڵاتەکەیان.

### ا- بنچینە و هاتنیان بۆ نێو ئیسلام

لە مێژووی ئیسلامیدا و لەماوەیەکی مێژوویی نزیک لە سەدەو نیوێک، سەلجوقییەکان بە رۆڵێکی ترسناک هەڵسان، چونکە دەوڵەتی سەلجوقی لە گرنگترین دەوڵەتە ئیسلامییەکانی هەردوو رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست بوو و، رۆڵێکی گەورەی لە ئاراستەکردنی رووداوەکان بینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستاش تەمومژ باڵ بەسەر بنچینەو دروستبوونی سەرەتایان دەکێشی و، مێژوونووسانی سەلجوقی و چەرخی سەلجوقیش وەکو پێویست لەو باسانە نەدواون.

ئەوەی مێژوونووسان و لێکۆڵەران لەسەری رێکبن، سەلجوقییەکان لە لقەکانی هۆزانی (غەز)ی تورکی و، وەکو درانە پاڵێک بۆ باپیرەیان (سەلجوقی کوڕی دەقاق) بە سەلجوقی ناسراون، ئەم (سەلجوق)ەش یەک لەسەرۆک هۆزەکانی تورک بووە، تاکەکانی ئەو هۆزەش لە سەرەتایاندا لە هەرێمی تورکستان ژیاون، دواتر جێیان هێلاوەو بەرەو وڵاتانی ئیسلامی هاتوون[١٢٠].

هەرچی تایبەت بە کۆچپێشیانە بۆ نێو جیهانی ئیسلامی، (راوندی) مردوو لە (٦٠٢ک/١٢٠٥ز) کە یەکێکە لە مێژوونووسە سەلجوقییەکان دەڵێت: ئەوان کە لە وڵاتی بنجی خۆیان لە هەرێمی تورکستان هاتنەدەرو، رووەو رۆژئاوا، بەرەو وڵاتی ئەودیوی زێ هاتن بەهۆی (قەرەباڵغی ناوچەکەیان و، تەسکی لەوەڕگاکانیان)ەوە بوو[١٢١]، (عەبدولنەعیم محەمەد حەسەنێن)یش وای دەبینێت، کە دەشێت کۆمەڵێک هۆ لە دوای ئەو کۆچەیان بووبێ، لەوانە: ئەوان لەژێر فشاری بارێکی لەناوبەر، وەکو سەرکەوتنی هۆزانێکی لەخۆیان بەهێزتر، بەسەریاندا لە ناوچەکەیاندا کۆچیان کردبێ، یان دەشێ لەبەر خراپی باری ئابووری هەرێمەکانیان، کۆچیان کردبێت، بەتایبەت دوای ئەوەی ژمارەی تاکەکانیان زۆر دەبێت و، سەرچاوەکانی رۆزی ئیتر بەشیان ناکات، بۆیە ئەو هۆزە تورکانە، روویان لە رۆژئاوا دەکەن و، هەوڵ دەدەن، لە ئەودیوی زێ و، لە (خوراسان)دا نیشتەجێ بن[١٢٢]، لەراستیشدا وڵاتی ئەودیوی زێ یەکەم هەواربوو، کە سەلجوقییەکان کۆچیان لە بۆی کرد[١٢٣].

هەرچی تایبەت بە ئایینیشیانە، ئەوا بەر لە هاتنیان بۆ جیهانی ئیسلامی، تاکەکانی ئەو هۆزانە لەسەر هەندێک ئایین بوون، لەلایەن لێکۆڵەرانیش لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە، بیروڕا لەیەک جیان، (تامارا رایس) بە بەڵگەی ئەوەی کە دوو لە کوڕانی (سەلجوق) کە ئەوانیش (موسا) و (ئیسرائیل) بوون ناوەکانیان هی جوولەکان بووە، وای دەبینێت جوولەکە بووبن، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە ئامێزگرتنی ئایینی جوولەکە لەلایەن ئەو هۆزانەوە، شتێکی ئاسایی بووە، چونکە (سەلجوق) و هەندێک لە پیاوەکانی، لە پاشای (خەزەر) نزیک بوونە، کە ئەویش لەسەر ئایینی جوولەکان بووە[١٢٤].

(کلود کاهین)یش بەلای ئەوەدا دەشکێنێ، کە ئەو ناوانەی سەلجوقییەکان پێی ناسراون بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو خەڵکانە مەسیحی بوو بن، نەک جوولەکە، چونکە (ئیسرائیل) و (میکائیل) ناوانێکن لە کتێبی پیرۆزدا هاتوون[١٢٥]، لەراستیشدا گەیشتنە ئەنجامی کۆتایی لە بابەتی ئاوادا، لە مەسەلە ئەستەم و قورسەکانە، چونکە ئەو ناوچانە جێی ئامانجی موژدەدەرو بانگخوازانی زۆربەی ئایینەکان بوونە.

لێکۆڵەرێکی دیکە لەو بڕوایە دایە، کە نەتەوەو میللەتە تورکەکانی دانیشتووی دەشتەکانی تورکستان شوێنکەوتەی ئایینی هێزە سروشتییەکان بوونە[١٢٦]، چونکە وەکو دەزانرێت، هۆزە شوانکارەکانی ئاسیای ناوەڕاستی، ئایینەکەیان بریتی بوو، لە پەرستنی دیاردە سروشتییەکان، چونکە ژیانی ئەو کۆچەرانە سادەو ساکاربووەو، بەستراوبووە بە ژیانی رۆژانەیان، ئەمەش ئەوە ناگەینێت ئایینەکانی دیکەی وەکو جوولەکە و مەسیحی و بوزی لەنێو تاکەکانی ئەو خەڵکانە بڵاو نەبووبێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین، زۆرینەیان لە پەیڕەوانی ئایینە نائاسمانییەکان بوونە.

(سەلجوقی کوڕی دەقاق) رۆڵێکی پێشەنگی دیت، لە دەرکردنی تاکەکانی هۆزەکەی لەو گۆشەگیرییەی تێی کەوتبوون و، ئاسۆیەکی فراوانی لەبەردەمدا کردنەوە، سەرکردایەتی کردن و، گوتاری رۆڵەکانی هۆزەکەی یەکخست، بۆیە هۆزەکە بەناوی ئەوەوە ناسرا، کاتێکیش سامانییەکان داوای بەهاناوە هاتنیان لە (سەلجوق) کرد، بۆ بەر پەرچ دانەوەی، دوای ئەوەش شاری (جوند)[١٢٩]یان، کردە بنکەی خۆیان[١٣٠].

### ئەودیوی زێ نیشتەجێ

ڕووداوەکان و، بووە هۆیەک بۆ دەرکەوتنیان لەرووی سیاسییەوە، بەڵام یەک لە لێکۆڵەران دوور ڕۆییوە، کاتێک وای ژماردووە هۆی هاتنیان بەرەو وڵاتی موسڵمانان، لە ئەنجامی زانیارییان بووە، بە بارەکانی دەوڵەتی عەبباسی، ئیتر چاویان تێ بڕیوەو، لەپێناو دەستەبەرکردنی ئامانجێکی سیاسییان هاتوونەتە نێو ئایینی ئیسلام[١٣٧]، ئەوەی ئەو لێکۆڵەرە ئاماژەی بۆ دەکات، لەگەڵ ئەو ڕووداوانە ڕێک ناکەوێت، کە دواتر ڕوو دەدەن، چونکە سەلجوقییەکان کە بوونە ئیسلام، بە یاسا و ڕێساکانی پابەندبوون و، دڵسۆزانە لە بۆی کۆشان، ئینجا هەر بەوەش وازیان نەهێنا، بەڵکو لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئیسلام چوونە نێو چەندین شەڕ.

دوای نیشتەجێ بوونیان لە (جوند) سەلجوقییەکان کاریان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی سەربەخۆ، بۆ خۆیان کرد، پێشەواکەیان (سەلجوق) چوار کوڕی هەبوو، ئەوانیش (ئیسرائیل) و (موسا)و (یونس) و (میکائیل) بوون[١٣٨]، ئەمەش هاوکاتبوو لەگەڵ تیاچوونی دەوڵەتی سامانی لە ساڵی (٣٨٩ک/٩٩٨ز)، وەکو دەریش دەکەوێت، دوای ئەوە ئەو ناوچەیە ئیتر بۆیان تەسک دەبێت، بۆیە دەست دەکەن بەگوێزانەوە لەنێوان شارەکانی ئەودیوی زێ و، بۆ ئەم مەبەستەیان، باری سیاسی دوای تیاچوونی سامانییەکان وەکو هەلێک بۆ خۆیان دەقۆزنەوە[١٣٩].

ئەم جێگۆڕکێ کردنانە لە مەسەلە سروشتییەکانی ژیانی ئەو هۆزانە بوو، چونکە ئەوانە لەو نەتەوانە بوون، کە بە بۆیەییەکی خێڵەکی بۆیەکرابوون، بەدوای ڕۆزییەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەسەر جێگۆڕکێ ڕاهاتبوون[١٤٠].

ئەو هەوڵە یەکەمانەیان، کە بۆ چەسپاندنی بوونیان لە جیهانی ئیسلامی پێی هەڵسان، کاریگەرییەکی باشی هەبوو لەسەر دەرکەوتنیان وەکو هێزێکی سیاسی نوێ لە ناوچەکە، دوای مردنی (سەلجوق)یش منداڵەکانی ئەرکەکەیان گرتە ئەستۆ، لەماوە مێژووییەکەیان، دوو لە کوڕەکانی میکائیل زەقبوونەوە، ئەوانیش (جەغری بەگ)[١٤١]و (تەغرول بەگ محەمەد) بوون[١٤٢]، کە ئەمەی دووەمیان سەرکەوت لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ سەلجوقییەکان.



**ب- ململانێیان لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەوی و، دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی:**

هێزی سەلجوقییەکان وردە وردە ڕووی لە زیادبوون کرد، وایان لێهات بوونە خاوەن بڕێکی گەورە لە هێزو تواناو، بەتێپەڕینی کات ژمارەشیان زۆر بوو و تۆیشووشیان تەواوبوو، ئیتر وایان لێهات لە توانایان بێت هەرەشە لە دەوڵەتەکانی ناوچەکەو، لە نێویشیان دەوڵەتی غەزنەوی بکەن، بەمەش هەستکردنی غەزنەوییەکان بە مەترسییەکانیان زیادی کرد، بەتایبەت دوای ئەو هێرشانەیان، کە هۆزەکانی (غەز)ی تورکی پێی هەڵسان و، (ئەرسەلان)ی کوڕی (سەلجوق) فەرماندەیی دەکردن، ئەو کۆمەڵانە-وەکو لە پێشتردا ئاماژەیان بۆ کرا - لە ساڵی (٤٢٠ک/١٠٢٩ز)[١٤٣] لە وڵاتی ئەودیوی (زێ)وە هاتن، هێرشیان هێنایە سەر هەرێمەکانی ناوەوەی ئێران، بۆیە سوڵتان(مەحمودی غەزنەوی) هەڵسا بە گرتنی (ئەرسەلان) و ژمارەیێکی زۆری شوێنکەوتووانی لێ کوشت، ئەوانەی دەربازیش بوون بە هەرێمە کوردییەکانی ئازەربێجان و چیاکان و جەزیرە بڵاوبوونەوە، ئەوەی سەرنج ڕاکێش بێت، ئەم بەشە سەلجوقیانە، کە بە (غەزی عیراقی) ناسرابوون، سەرنەکەوتن لە دروستکردنی قەوارەیێکی تایبەت بە خۆیان، چونکە میرە کوردەکان لەو هەرێمە ئاماژە بۆ کراوانەدا بەخێرایی هێرشەکانیان تێکشکاندن و، ئەو پڕۆژەیەیان پوچەڵ کردەوە، کە دەیانویست شوێن پێیەک بۆ خۆیان لەو هەرێمانەدا بدۆزنەوە.

پێشەواکانی سەلجوقییان ئەو بارە سیاسیەی وڵاتی ئەودیوی زێ و(خوراسان)یان بۆ بەرژەوەندی خۆیان قۆزتەوەو، هاتن دەستیان بەسەر کۆمەڵێک شاری هەرێمەکە داگرت، لەوانە: (بەلخ)و (نەیسابور)و (توس)و (جورجان)، هێشتا ساڵی (٤٢٩ک/١٠٣٧ز)یش نەهاتبووە پێش، کە دەستیان بەسەر زۆربەی شارەکانی (خوراسان) داگرتبوو و، شاری (مەرو)یان کردبووە پایتەختی خۆیان[١٤٤]، لەوەش زیاتر توانییان سۆزی خەڵکەکەش بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن، چونکە بە باشی لەگەڵ خەڵکەکەدا جووڵابوونەوە، هەر ئەوانیش توانیان پشتگیرییان بکەن و، ببنەهۆی چەسپاندنیان، لە یەکەم هەوڵەکانیاندا بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی سەربەخۆ بۆ خۆیان[١٤٥].

(بەیهەقی) کە هاوچەرخێتی ئەو ڕووداوانەی کردووە، بە هێزەکەیدا هەڵگوتوونەو، بەدرێژی باسی لە ململانێکانیانی کردووە لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەوی، لەم بارەیەوە

نووسیویەتی: (سەلجوقییەکان زۆر سووک بوون، بارە قورسەکانیان نەدەبووە هۆی پەک خستنیان و، زۆریش بەو بارانەیان پابەند نەدەبوون، هەروەها گوێرایەڵیش بوون بۆ سێ سەرکردەکانیان تەغرول و بیغۆ و داود)[١٤٦].

لە زستانی ساڵی (٤٢٩ک/١٠٣٧ز) سەلجوقییەکان کەمێک هێمن بوونەوە، بەڵام دوای ئەوە گەڕانەوە سەر هێرشەکانیان و، بەشێوەیێکی فراوانتریش لە جاران، سوڵتان (مەسعود)یش لەلایەن خۆیەوە هەوڵیدا بەرپەرچیان بداتەوەو، هێرشەکانیان بوەستێنێت، بەڵام لەوەدا فەشەلی هێنا، بۆیە (جەغری بەگ) دەستی بەسەر شاری (مەرو) داگرت و، بووە فەرمانڕەوای بەراستی لەسەر هەموو باکووری (خوراسان)، کە دانیشتوانی (مەرو)ش دەرکیان بەو لاوازییە کرد، کە غەزنەوییەکان دووچاری هاتوون، هەڵسان دەرگای شارەکەیان بۆ ئەو هێرشهێنە نوێیانە کردەوە، بەمەش (تەغرول و جەغری) لە ڕێوڕەسمێکی گەورەدا هاتنە نێو پایتەختی هەرێمەکە[١٤٧].

کاتێک مەسەلەی سەلجوقییەکان لە (خوراسان)دا توند بوو و، ترسناکییان لەسەر دەوڵەتی غەزنەوی گەورە بوو، سوڵتان (مەسعود) وەزیرەکانی و کەسانی خاوەن راو تەدبیری دەوڵەتەکەی کۆکردنەوە، ئەوانیش جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، کە (کەمی گرنگیدان بە خوراسان، لە گەورەترین هۆکانی ئاسوودەیی سەلجوقییانەو، بە ئەوەش دەبنە خاوەنی وڵات)[١٤٨]، خۆ ئەگەر هات و، هەر ئەوەهاش سەلجوقییەکان پشتگوێ خران، ئەوا ئەوان دەست بەسەر تەواوی (خوراسان)دا دەگرن.. لەبەرئەوە سوڵتان بە پەلە کەوتە کۆکردنەوەی سوپایەکی مەزن و[١٤٩]، لە (غەزنە)وە بەرەو روویان هات، لە شەعبانی ساڵی (٤٢٩ک/مایسی ١٠٣٧ز) لە نزیک شاری (سەرخەس)، لە گەڵیان پێکی دادا، بەڵام سەرەنجام، کۆتایی ئەو شەڕەش بەسەرکەوتنی سەلجوقییەکان هات و، وای لێهات هەڵوێستی سەربازی زۆر لە جاران زیاتر بکەوێتە بەرژەوەندی ئەوان[١٥٠].

شەڕ ماوەی سێ ساڵان لەنێوان هەردوو لادا بەردەوامبوو، تا شەڕی جیاکەرەوەی نێوانیان لە ساڵی (٤٣١ک/١٠٣٩-١٠٤٠ز) لە نزیک (دەندانقان)[١٥١] روویدا، ئەمە شەڕێکی زۆر بەهێزبوو، بە شکانی غەزنەوییەکان و سەرکەوتنی گەورەی سەلجوقییەکان بەکۆتا هات، بەمەش سەلجوقییەکان دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی (خوراسان)دا گرت[١٥٢].. لەم بارەیەوە (بەیهەقی) دەڵێت، دوای ئەمە: (تەغرول لەسەر



تەخت دانیشت و، میرەکان پیرۆزبایی سەرکەوتنیان پێشکەشکرد)[١٥٣]، بەمەش غەزنەوییەکان چەند بەشێکی گرنگی دەوڵەتەکەیان لەدەستداو[١٥٤]، دەرگاکانی جیهانی ئیسلامی لە پێش پێشەواکانی سەلجوقییان کەوتنە سەرپشت.

(دەندانقان) شەڕێکی جیاکەرەوە بوو، بووە هۆی لاچوونی دەسەڵاتی غەزنەوییەکان بەسەر وڵاتی ئەودیوی (زێ)و، لە شوێنیاندا سەلجوقییەکان باڵی دەسەڵاتیان بەسەر ئەو وڵاتەدا کێشاو، تیایدا نیشتەجێ بوون.

ئەوەی شایانی تێبینیش بێت، لێکۆڵەران ڕێک نەکەوتوون، لەسەر دەستنیشانکردنی ئەو ساڵەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی، بۆیە لە کاتێکدا هەندێکیان جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوە، کە هاتنیان بۆ ناو شاری (مرۆ) لە ساڵی (٤٢٩ک/١٠٣٧ز)دا، بە مێژووی رەسمی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان دادەنرێت، چونکە لەوەوە ئیتر لەسەر مینبەرەکانی شاردا، خوتبە بەناوی ئەوان دەخوێنرایەوە[١٥٥]، یەکێکی دیکە جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە (دەندانقان) شەڕێکی جیاکەرەوە بوو، شکانی غەزنەوییەکانیش لەو شەڕە، بەواتای راگەیاندنی کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی غەزنەوییەکان بوو، لەسەر وڵاتی ئەودیوی (زێ)و (خوراسان)و، هەروەهاش واتای سەرەتایەک بوو، بۆ نیشتەجێبوونی سەلجوقییەکان لەو وڵاتانە[١٥٦]:

لەگەڵ جیاوازی بیروڕاکانیش لەبارەی دەستنیشانکردنی مێژووی دروست بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجوقی، بەڵام دەکرێت هاتنیان بۆ ناو شاری (مرۆ) لە ساڵی (٤٢٩ک) بە سەرەتایەک بۆ دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان بژمێرین، ئینجا بە سەرکەوتنیشیان لەشەڕی (دەندانقان) دەسەڵاتەکەیان بەهێزترو چەسپاوتر دەبێت، چونکە بەم شەڕە کۆتایی بە باڵکێشانی سیاسی و سەربازی غەزنەوییەکان هات لەسەر (خوراسان) و (وڵاتی ئەودیوی زێ).

### ج- هەوڵەکانی (تەغرول بەگ) لە چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتی سەلجوقی:

(تەغرول بەگی کوڕی میکائیل کوڕی سەلجوق)ی پێشەوای سەلجوقییان، کاری لەسەر فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی کرد، بەسەر ناوچەکانی دەوروبەر، بۆیە هێندەی نەکێشا، باڵی کێشان بەسەر هەرێمەکانی (جورجان)[١٥٧]و، (تەبرستان)[١٥٨]و، (خەوارزم)[١٥٩]،

ئیتر ناوبانگیان لە زۆربەی هەرێمەکاندا بڵاوبوویەوە، بەتایبەتیش دوای ئەوەی بەرەو رۆژئاوا هاتن و، لە چەندین شوێنی فراواندا بڵاوبوونەوە، گومانی تیانییە کە لەو شوێنانەی پێی گەیشتن، بەهەندێ کاری تێکدەریش هەڵسان، بۆیە هاوارو سکاڵایان بەرەوودا بەرزبوویەوەو، گەیشتە گوێی خەلیفە (قائیم بی ئەمریڵڵا) (٤٢٢-٤٦٧ک/ ١٠٣٠-١٠٧٤ز)[١٦٠]، ئەو دەنگانە داوایان لە (خەلیفە) دەکرد، خۆی مشور لەو مەسەلەیە بخوات، بۆیە ئەویش لە ساڵی (٤٣٥ک/١٠٤٣ز) چەند نێردراوێکی ناردە لای سەلجوقییەکان، داوای لێکردن واز لەو کوشتن وتاڵانەیان بێنن و، ئەو نێردراوانەی گەیشتنە (نەیسابور) کە (تەغرول بەگ) لەوێدا فەرمانڕەوایی دەکرد، بەم کارانەش (خەلیفە) دەیەویست جۆرێک لە دەسەڵاتی خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت و، بۆیان روون بکاتەوە، کە ئەو تا ئێستاش هەر پێشەوای رۆحی جیهانی ئیسلامییە، ئەگەرچیش خەلافەی عەبباسی بۆ بووەیهییەکان ملکەچ بووبێ.

کاریگەری ئەم نێردراوانە لە بۆ (تەغرول بەگ) گرنگ بوو و، بە هۆیەوەی بەشێک لە حەزە زۆرەکانی بەدەست هێنا، بەتایبەت لەوەی کە مەبەستی بوو، خەلیفەی عەبباسی دانی پیابنێت، کە فەرمانڕەوایە بەسەر هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی، چونکە نامەکانی خەلیفە لە خۆیاندا دانانی خەلیفە بوون بە (تەغرول بەگ)، ئەوەی پشتگیری ئەو راستییەش دەکات، ئەوەیە کە، (تەغرول بەگ) نامەیەکی وەڵامیی بۆ (خەلیفە) نووسی و، تیایدا بە (بەندەو گوێڕایەڵتان) تەغرول بەگی کوڕی میکائیل[١٦٢]، وەسفی خۆی بۆ خەلیفە کرد.

بەڵام ئەوەی ئەو نێردراوانە بۆ دەوڵەتی (عەبباسی)یان مسۆگەر کرد، ئەوا خەلیفە زۆر دڵخۆشبوو، کاتێک کەبینی پێشەوای سەلجوقی ئەو هەموو رێزەی بۆ نێردراوەکانی دەربڕی، گەیشتە ئەو رایەی، کە توانیویەتی بۆلای خۆی رایانکێشێت و، تەنانەت لەوەش زیاتر هاتە سەر ئەو رایەی کە ئەم (سەلجوقی)یانە، لەمەولا بۆ ئەو رەسیدێکی سەربازینەو، لە کاتی پێویستدا دەتوانێت پشتیان پێ ببەستێت[١٦٣]، بەتایبەت لەو کاتەدا کە سەنتەری خەلافەت بەهۆی دەست وەردانی بووەیهییەکان لەکاروبارەکانی خەلافەت، لەبارێکی زۆر ناخۆشدا کەوتبوو، بۆیە خەلیفە چەند نێردراوێکی بەرەو (تەغرول بەگ) رەوانکرد، بۆ ئەوەی پێی رابگەیەنێت، کە بێت لە (بەغداد)



ئامادەبێ[١٦٤]، بەڵام پێشەوای سەلجوقی، لەم داوایەی خەلیفە داوای لێبووردنی کرد، چونکە بە فەتح کردنی هەرێم و ویلایەتەکانی وڵاتی فارس خەریک بوو و، دەرفەتی ئەوەی نەبوو، سەردانی (بەغداد)بکات، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی نێوان هەردوولا، هەر تەنیا لە گۆڕینەوەی نێردراو و نامە تێپەڕی نەکرد، چونکە (تەغرول بەگ) بەکاری زۆر و جۆراوجۆر خەریک بوو، پایەکانی دەوڵەتە لاوەکەی بەهێز دەکرد، بۆیە ویلایەتەکانی ژێر دەستی بەسەر شوێنکەوتووانی دابەشکرد و، بەسەر هەر ناوچەیەکدا یەک لە پێشەواکانی سەلجوقیانی دامەزراند[١٦٥].

دوای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان و، دابەشکردنی هەرێمەکانی ئەو دەوڵەتە بەسەر گەورە میرو فەرماندە سەربازییەکان، لە سییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، سەلجوقییەکان لەبارەی قەوارەکەیان لە (خوراسان)دا، ئیتر دڵنیابوون، چونکە هەستیان بە ئارامی کردو، وایان لێهات خۆیان بۆ فراوانخوازی زیاتر ئامادە بکەن، بەوەش لە چەند ساڵێکی کەمی دواتردا، توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر چەندین ناوچەی گرنگی جیهانی ئیسلامیدا توند بکەن[١٦٦]، کە هەرێمە کوردییەکانیش لە چوارچێوەی ئەو هەرێم و ناوچانە بوون.

لەو کاتەداو، لەبارێکدا کە سەلجوقییەکان لە فراوانخوازی بەردەوام دابوون، لەبەرەو رۆژئاوا، (بەغداد) لە بارێکی خراپ دەژیا، چونکە خەلیفە عەبباسییەکان بوو بوونە ملکەچی بووەیهییەکان و، خەلافەت هیچ هێز و دەسەڵاتێکی نەمابوو، (مەسەلەی خەلافەت و سەڵتەنەت لە بەغداد دا بەتەواوی تێکچووبوو)[١٦٧]، بۆیە ئەو شارە ململانێیەکی تاڵی لە نێوان میرە بووەیهییەکان بەخۆوە بینی، ئەم بارەش بۆ (تەغرول بەگ) بوو بە هەلێکی گونجاو، بۆیە دەستی بەسەر زۆربەی هەرێمەکانی رۆژهەڵاتدا گرت و، تیایاندا خوتبە بۆ ئەو خوێنرایەوە[١٦٨].

(تەغرول بەگ) لەمەوقعی هێزیدا، هەوڵیدا بە هەموو هۆکارێک خۆی لەبەرچاوی خەلیفە وەکو پارێزەری میللەت پیشان بدات، بۆیە لە ساڵی (٤٣٥ک/١٠٤٣ز)دا نامەیێکی بۆ میر (جەلالولدەولەی بووەیهی) رەوانەکرد، تیایدا فەرمانی پێکرد: بە چاکەو بە نەرم و نیانی لەگەڵ میللەتدا بجووڵێتەوە، بەر لەوەی ئەوەی بەسەردا بێنێت، کە پێی ناخۆشە[١٦٩].. ئەو نامەیەش، ئەو ئامانجەی روونەکاتەوە، کە مەبەستی وەدەستهێنانی

بوو، چونکە وەکو لە ناواخنی نامەکەی دەردەکەوێت، ئەو فەرمانی بە میری بووەیهی کردووە، کە سیاسەتی خۆی لەگەڵ میللەتدا باش بکات، ئەم هەنگاوەش هەوڵێکی (تەغرول بەگ) بوو، بۆ بەلای خۆدا راکێشانی خەلیفەی عەبباسی و، رای گشتی ئیسلامی.

**سێیەم: گەیشتنی سەلجوقییەکان بە هەرێمە کوردییەکان:**

کاتی هاتنی سەلجوقییان بەرەو هەرێمە کوردییەکان، دەسەڵات تێیاندا لە دەست میرنشینە کوردییەکان بوو، لە رۆژئاوای هەرێمی چیاکان دەسەڵاتی سیاسی لە دەست میرە عەننازییە شازنجانییەکان بوو، هەروەکو لە پێشتریشدا لە پێشدەستییە مێژووییەکە ئاماژەمان پێدا- شارەکانی سەر بەو میرنشینەش، بۆ دەست بەسەرداگیرانیان، رووبەڕووی ململانێیەکی توندی نێوان بووەیهییەکان و کاکەوەیهییەکان دەبووەوە، بۆیە باری ناوەخۆیان تا ئەوپەڕی خراپ بوو.

بەڵام لە ئازەربێجاندا، میرنشینی رووادی لەوێ بوو، ئەو میرنشینەی کە تازە لە مەترسی هێرشی غەزەکاندا دەربازی ببوو، میرەکەشی (وەهسوزانی کوڕی مەملان)، توانیبووی سەرکەوێت لە کۆتاهێنان بە مەترسی غەزەکان و، بەتەواویش لەناوی بردبوون.

میرەکانی میرنشینی (شەدادی)ش لە هەرێمی (ئاران)دا فەرمانڕەواییان دەکرد، ئەو هەرێمە تا رادەیەک دووربوو لە رووداوەکانی هەرێمەکانی چیاکان و ئازەربێجان و جەزیرە، بۆیە لەسەر دەستی (غەز)ەکاندا دووچاری تێکچوون و وێرانەیی نەهاتبوو.

لە جەزیرەی فوراتیش (دیاربەکر)، هێشتا میرنشینی مەڕوانی دەسەڵاتدار بوو، ئەو هەرێمەش وەکو ئەوانی دیکە رووبەڕووی هێرش و پەلاماری (غەز)ەکان بووبۆوە، بەڵام میرەکانیان بەهۆی ئەو سیاسەتە زیرەکەی پیادەیانکرد، توانیبوویان کۆتایی بە بوونی (غەز) لە ناوچەکەیاندا بێنن..

بە کورتی دەکرێ بگوترێت، هەرێمە کوردییەکان لە کاتی گەیشتنی سەلجوقییەکان، لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی کوردی بەرجەستە بوو لە میرنشینە کوردییەکاندا، فەرمانڕەوایی دەکران[١٧٠].



**ا- گەیشتنی سەلجوقییەکان بەهەرێمی چیاکان:**

لە کاتێکدا کە هێزە سەلجوقییەکان لە پێشڕەویەکی بەردەوام دابوون، بەرەو رۆژئاوا، بە ئاراستەی هەرێمەکانی ناوەخۆی ئێران، میرنشینی عەننازی فەرمانڕەوا بەسەر رۆژئاوای هەرێمی چیاکان، بەهۆی هێرشەکانی (غەز) بۆ سەری لە بارێکی زۆر خراپدا دەژیا، نەک هەر ئەوەش بەڵکو ململانێی نێوان میرەکانی ئەو میرنشینە لە نێوان خۆشیان بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات، باری هەرێمەکەی شپرزەتر دەکرد[١٧١].

(تەغرول بەگ) دوای سەرکەوتنی لە دروستکردنی دەوڵەتێکی گەورە، دەستی کرد بە فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی، هەرێمە کوردییەکانیش لە چوارچێوەی پلانە فراوانیخوازەکانی بوون، چونکە ئەم هەرێمانە شوێنە جوگرافییە (ستراتیژی)یەکەیان، وای لێدەکردن، ببنە جێی چاو تێبڕینی زۆربەی هێزە سیاسییەکانی ناوچەکە.

هێرشی سەلجوقییەکان بەرەو هەرێمی چیاکان هات و، (تەغرول بەگ)ی پێشەوای سەلجوقی، (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای ئاراستەی ئەو ناوچانە کرد، بۆ ئەوەی دەستیان بەسەردا بگرێت، ئەوەبوو لە ساڵی (٤٣٤ک/١٠٤٢ز) (یەناڵ) توانی شاری (رەی)[١٧٢] داگیربکات، ئینجا دوای ئەوە، بەرەو شارەکانی بەشی رۆژئاوای هەرێمەکە هات، سەرەتا هاتە نێو (بەرجرود)و، دواتر بەرەو (هەمەدان) هات، کە (ئەبو کالیجار کەرشاسفی کوڕی عەلا ئولدەولە) فەرمانڕەوایەتی تیادەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی توانای رووبەڕووبوونەوەیانی نەبوو، (ئەبو کالیجار) شارەکەی جێهێڵا و، هات خۆی لە (شاپور خواست) قایم کرد، ئەو کوردانەی دانیشتووی شارەکەش هەوڵیاندا بەرەنگاری هێرشی سەلجوقییەکان ببنەوە، بەڵام نەیانتوانی خۆڕاگرن، بۆیە سەلجوقییەکان دەستیان بەسەر ئەو شارەش داگرت و، هێزەکانیان بەهەندێ کاری خراپی لەوێنەی تالانکردنی ماڵ و سامانی دانیشتوانی شارەکە و، پێشێلکردنی پیرۆزییەکانیان هەڵسان[١٧٣].

(ئیبنولئەثیر) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە (تەغرول بەگ) بڕیاریدا، خۆی بەرەو هەرێمی چیاکان بێتەدەر، جا کاتێک کە گەیشتە (رەی)، (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای پێشوازی لێکردو، ئەو شارەو هەموو شارەکانی دیکەی هەرێمەکەی پێشکەشکرد، کە دەستی بەسەردا گرتبوون[١٧٤]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، (ئیبراهیم) لە هەوڵە یەکەمەکانیدا بۆ توندکردنی دەسەڵاتەکەی بەسەر ناوچەکەدا سەرنەکەوت، چونکە ئاسان نەبوو کورد بێنە ژێر

رکێفی، بۆیە لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٦ز) درێژەی بە هێرشەکانی دایەوەو[١٧٥]، لەوەدا سەرکەوت کە بۆ جاری دووەم بێتەوە نێو (هەمەدان)و لەدەست (کەرشاسف)ی دەربکات، ئیتر ئەمجارەش (کەرشاسف) هاتە نێو کوردە جورقان (گوران)ە کانی، دانیشتووی ناوچەکانی (حەلوان)[١٧٦].

میر (ئەبی شەوکی کوردی) میری عەننازییەکان، دوای ئەوەی هێرشی سەلجوقییەکان بۆ سەر شارەکانی هەرێمەکە زۆر دووبارە بوونەوەو، مەترسییەکانیان گەورەتر بوو، ئیتر ئەویش نەیتوانی چیدیکە بەرووریاندا بوەستێتەوە، بۆیە (دینەوەر)ی جێهێڵاو لە ترسی (یەناڵ)، بەرەو (قرێمسین) هات[١٧٧]، بەڵام چاو برینەکانی (یەناڵ) زیاتربوون، بۆیە ئەو هەلە زێرینەی بۆ خۆی قۆزتەوە، تاوەکو ناوچەکە داگیربکات، بەکارەکیش سەرکەوت لە داگیرکردنی شارۆچکەکانی سەر بە دینەوەرو، دوای ئەو هێرشی بردە سەر (قرێمسین)، بەوەش میر (ئەبولشۆک) هیچی لە پێشدا نەمایەوە، ئەوە نەبێت، بەرەو (حەلوان) بکشێتەوە، بۆیە خۆی کشایەوەو، سەربازەکانیشی کە لە کوردە شازنجانییەکان و دەیلەمەکان پێک دەهاتن، ئەوانی لە (قرێمسین) جێهێڵا بۆ ئەوەی بەرگری لێبکەن[١٧٨].

ئەوەی تەماشای رای مێژوونووسان بکات، تێبینی ئەوە دەکات، کە شارە کوردییەکان بەربەرەکانی هێرشی سەلجوقییان کردووەو، بەدەستییانەوە زیانی باش بەهێزەکانی (ئیبراهیم یەناڵ) کەوتووە، (قرێمسین)یش سەرەتا لەبەردەم هێرشە بەربڵاوەکەیدا دەوەستێتەوە، بەڵام ناتوانێت درێژە بەو بەرگرییەی بدات، بۆیە لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٦ز) دەکەوێتە دەست هێزە سەلجوقییەکان[١٧٩].

دەگێڕنەوە سوپای سەلجوقی لەوشارەدا بەکردەوەی زۆر دزێو هەڵسان[١٨٠]، کە (یەناڵ) بۆ سوپاکەی حەڵاڵ کردبوو، ژمارەیەکی گەورەشیان لە سوپای میرنشینی عەننازی کوشت، بۆیە هەندێ لە دانیشتوانەکەی شارەکەیان جێهێڵاو، بەرەو (حەلوان) هاتن، بۆ پەیوەندیکردن بە (ئەبولشەوک)، هەواڵی ئەو هێرشانەو دەرەنجامەکانیان پێدا، ئەویش لە ترسی ئەوەی مەبادا زیانی گەورەتر بە خەڵک و موڵکەکانی بکەوێت، ئەو خەڵکەی بەرەو قەڵای (سیروان)ی پارێزراو[١٨١] هەناردن و، خۆیشی لەگەڵ سوپاکەی لە (حەلوان) مانەوە[١٨٢].

(ئیبراهیم یەناڵ) درێژەی بەهێرشە وێرانکاریەکەی بۆ سەر هەرێمی چیاکانی کوردی و



شارەکانی داو، دەسەڵاتی خۆی بەسەر شاری (سەیمەرە)دا توند کرد، بەمەش ئەو شارەش وەکو شارەکانی دیکەی هەرێمەکە لەلایەن سەلجوقییەکانەوە بەتاڵان برا، ئەو کوردە (جورقان)یانەی لەنێو شارەکەش بوون بەربەرەکانی (یەناڵ)یان کردەوە، بەڵام ئەوەبوو لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتوو نەبوون[١٨٣].

سەلجوقییەکان لە پێشرەوییاندا بەرەو (حەلوان) بەردەوام بوون، کە وەکو ئاماژەمان پێدا ئەو شارە بووبووە لانەی میر (ئەبولشەوک)ی کوڕی و سەربازەکانی، جا کە خەڵکی شارەکە بەم هەواڵەیان بیست، کە ئەوەتا هێزەکانی (یەناڵ) نزیکبوونەتەوە، لە ترسی خۆیان کە نەبادا سوپاکەی بە رەقی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، شارەکەی خۆیان جێهێڵاو بەرەو شارەکانی دەوروبەر هاتن، ئەمەش لە کاری سەلجوقییەکانی ئاسانتر کرد، بۆ توندکردنی دەسەڵاتیان بەسەر شارەکانی هەرێمەکەو، ئەو هێزانەیان هاتنە نێو (حەلوان)، لەراستیشدا ترسی دانیشتوانی شارەکە لەجێی خۆی بوو، چونکە سەلجوقییەکان کەوتنە تاڵانکردنی شارەکەو، ئاگریان لە ماڵەکانی بەردا[١٨٤]، بە خانووی میر (ئەبولشەوک)یش، بەمەش (حەلوان) بووە وێرانە[١٨٥]، بەڵام ئەو بارە درێژبی نەخایاندو، دوای ئەوەی هێزە سەلجوقییەکان تێیدا کشانەوە، میر (ئەبولشەوک)ی عەننازی بەخێرایی بینای کردەوە[١٨٦].

بەم شێوەیە دەبینین هێرشەکانی سەلجوقییان، شارە کوردییەکانی هەرێمی چیاکانیان وێران کردو، دانیشتوانەکەیان کوشتن و، ماڵەکانیان بەتاڵان بردن، ئەم سیاسەتە پڕ لە دڵڕەقییەش کە بەریان گرت، شێوازی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لایەنی لەدواتردا دەستنیشانکرد، چونکە ئەم هێرشانە بۆچوونێکی تایبەتی لە لای کورد لەسەرئەوان دروستکرد، بۆیە بیریان لە رێگەیەکی باشترکردەوە، بۆ کەمکردنەوەی مەترسییەکانیان، ئەمەش لەرێگەی خۆلێ نزیککردنەوەیان و راکێشانی خۆشەویستییان لە بۆ خۆیان و، دروستکردنی پەیوەندی سروشتی لەگەڵیان.

هەروەها هێرشی سەلجوقییەکان بۆ سەر هەرێمی چیاکان، بووە ئەزموونێکی سەرەتایی بۆ ئەو کوردانەی تری هەرێمەکانی دیکە، جا کاتێک میرەکانی ئەو ناوچانەی تر دەرکیان بە چەندێتی ئەو هێرشانەیان کرد، کاریان لەسەر خۆلێ نزیککردنەوەیان کرد، بۆ پاراستنی شارەکانیان لە وێران بوون، بەکارەکیش میری میرنشینەکانی روادی و شەدادی و

مەڕوانی، هەوڵیاندا بەرلەوەی مەترسییەکانی سوڵتان (تەغرول بەگ)یان لێ نزیک بێتەوە، زووتر بێن سۆزی سوڵتان لە بۆ خۆیان ڕاکێشن[١٨٧].

هەرچی تایبەتە بە هەڵوێستی ئەو شارانەی تری هەرێمەکە، کە سەر بەمیرنشینی عەننازی بوون، وەکو دەردەکەوێت، میر (ئیبنو ئەبی شەوک) دەرک بەوە دەکات، کە توانای بەرگری کردنی لەو موڵکانەی نییە، لەبەرامبەر سەلجوقییەکان، لەولاشەوە، ئەو خۆی لەگەڵ (موهەلهیل)ی برای لە جۆرە ململانێیەک دان، بۆیە کاری لەسەر ئاشتبوونەوە لەگەڵیدا کردو، هاتوچوون لەنێوانیاندا دەستی پێکرد[١٨٨]، بەڵام ئەم ئاشتبوونەوەیە کەمێک درەنگ کەوت، چونکە مەترسی سەلجوقییەکان گەورەتر بوو و، سەرکەوتن لە توندکردنی دەسەڵاتەکەیان بەسەر زۆرینەی شارەکانی هەرێمەکە، کە سەر بەو میرنشینە کوردییە، بەسەر کێشەی خۆدا کەوتووە بوو.

کۆمەڵێ هۆکار مەسەلەی زاڵبوونی سەلجوقییەکانیان بەسەر شارەکانی میرنشینی عەننازی ئاسانکرد، لە پێشینەی هەموو ئەو هۆکارانەش، ململانێی نێوان میرەکانی بوو لەسەرگرتنە دەستی دەسەڵات، چونکە لە جەرگەی هێرشەکانیان، (ئەبوشەوک) لەگەڵ (موهەلهیل)ی برای لە ململانێ بوو[١٨٩]، خەریک بوونی میر (ئەبوشەوک)یش بە شەڕە ناوخۆییەکانی، هەلی زێڕینی هێنایە پێش (ئیبراهیم یەناڵ) بۆ توندکردنی دەسەڵاتی بەسەر هەرێمەکە، سەرچاوەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە (ئەبوشەوک) دوای ئەوەی (حەلوان)ی جێهێڵاو بەرەو قەڵای (سیروان) هات، نەخۆش کەوت بۆیە لە قەڵای ناوبراودا مایەوە تا لە ساڵی (٤٣٧ک/١٠٤٦ز)دا لەوێدا مرد[١٩٠].

دوای مردنی میر (ئەبو شەوک)، (موهەلهیل)ی برای بووە میری میرنشینەکەو، کوردانی دانیشتووی هەرێمەکە پەیوەندییان پێوەکرد، هەرچی (سەعدی)ی کوڕی میری مردووش بوو، کە لەو بڕوایەدابوو، لە مامی لە پێشتر بوو، بۆ جێگرتنەوەی باوکی، خەڵکەکە پشتیان تێکرد، بۆیە ناوبراو لە ساڵی (٤٣٨ک/١٠٤٦ز)دا[١٩١] هاتە لای (ئیبراهیم یەناڵ)و، بە مەبەستی دەستخستنی پشتگیری ناوبراو، بۆ کودەتاکردن بەسەر(موهەلهیل)ی مامی، سۆزی خۆی بۆ (یەناڵ) پێشکەشکرد.

(ئیبنولئەثیر) بۆ وەرگرتنی ئەم هەڵوێستەی (سەعدی) باس لە چەند هۆیەکی دیکە دەکات، ئەوانیش یەکەم: (موهەلهیل)ی مامی دایکی (سەعدی) بۆ خۆی مارە



دەکاتەوەو، (سەعدی) پشتگوێ دەخات، دووەم: لەچاوەدێریکردنی کوردە شازنجانییەکان[١٩٢]، (موهەلهیل)ی مامی کەمتەرخەم دەبێت.. جا لەگەڵ ڕێ تێچوون و ماقولی ئەو هۆیانەش، بەڵام لەراستیدا ئەوانە پاڵنەری ڕاستەقینە نەبوونە، بەڵکو لەو بڕوایە داین، چاو لە تەخت بوونی (سەعدی)، ئەوە هۆی ڕاستەوخۆ بووبێت، بۆ گرتنی ئەم هەڵوێستەی، (ئیبراهیم یەناڵ)یش بۆ گەڕاندنەوەی فەرمانڕەوایی لەبۆی، وادەی پێشکەشکردنی یارمەتی سەربازی پێدا، ئامانجی (یەناڵ) لەم کارەی، توندکردنی ڕادەی ناکۆکی و ململانێی نێوان میرە عەننازییەکان بوو، چونکە ئەمە دەبووە هۆی لاوازبوونیان و، لەم ڕێگەشەوە سەرەنجام (یەناڵ) دەیتوانی بە ئاسانی خۆی بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنێت، بەکارەکیش چەندین شەڕ لە نێوان (موهەلهیل) و (سەعدی) برازای ڕوویانداو، بۆ ئەو شەڕانەش (یەناڵ) بەسەربازە (غەز)ە تورکەکان کۆمەکی و پشتگیری (سەعدی) کرد، لە ئەنجامی ئەم شەڕانەشدا، هەندێ شاری ناوچەکەو، بەتایبەتیش (حەلوان) وێران بوون، چونکە جارێکیان (موهەلهیل) دەیخستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و، هەندێ ماوەی تریش (سەعدی)ی برازای داگیری دەکرد، هەروەها (سەعدی) بڕیاری دا بەکارەکی لەو شارەدا خوتبە بەناوی سەلجوقییەکان، بخوێنرێتەوە[١٩٣].

ئەوەی لە سیاسەتی سەلجوقی ئەو قۆناغەدا تێبینی دەکرێت، ئەوان دەیانویست هەرێمە کوردییەکان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، میرنشینە کوردییە سەربەخۆکانیش وەکو خۆیان بهێڵنەوە، بەڵام کار لەسەر لاوازکردنیان بکەن، ئەم سیاسەت و پەیوەندییەی نێوان هەردوولاش لەو قۆناغەدا، ئاسۆکانی ڕوونبووەو، لە ساڵانی دواتردا چۆتە ناو چوارچێوەی نوێترەوە.

**ب- گەیشتنی سەلجوقییەکان بە هەرێمی ئەرمینیا:**

سەلجوقییەکان هەر بە باڵکێشانیان بەسەر هەرێمە کوردییەکان وازیان نەهێنا، بەڵکو دوای سەرکەوتنی لە ئەرکە یەکەمەکانی، ئەمجارەیان (ئیبراهیم یەناڵ) کۆششەکانی بۆ سەر هەرێمی ئەرمینیا خستنەگەڕ، ئەوەبوو لە ساڵی (٤٤٠ک/١٠٤٨ز) لەگەڵ کۆمەڵێک لە (غەز)ەکان ڕووەو ئەو هەرێمە هاتن، کۆمەڵێکی زۆریش لە وڵاتی ئەودیوی (زێ) بەرەو لای هاتن، (یەناڵ) پێی گوتن (وڵاتەکەم تەسک دەبێت لە بەخۆوەگرتنتان و،

هەڵسان بەوەی پێویستتان پێیەتی، بۆیە را ئەوەیە بەرەو داگیرکردنی رۆم برۆن)[١٩٤]، ئیتر ئەم کۆمەڵانە کەوتنەڕێ و، (یەناڵ)یش بەدوایاندا هات، لە ڕێگایدا پەلاماری زۆرێک لەو شارە کوردییانەی هەرێمەکەی دا، کە کەوتنە سەر رێگای[١٩٥].

یەک لە گرنگترین ئەو شارانە کە دووچاری ئەو پەلامارانە هات و، لەو ماوە زەمەنییەدا، لەژێر دەستی رۆمەکان بوو، شاری (ملازگەرد) بوو، (یەناڵ) ئابڵوقەی داو، هێزێکی گەورەی رۆم و ئەبخازەکان بەرپەرچیان دایەوە[١٩٦]، سەربازەکانی (یەناڵ) ناوچەکانی دەوروبەری ئەو شارەیان تالانکردو، لەدواتردا شەڕی نێوان هەردوو لایەن توندبوو، تا سەرەنجام (یەناڵ) توانی لە شەڕەکە سەربکەوێت بەمەش دەستی بەسەر ئەو شارە داگرت، دیسانەوە لەوەش سەرکەوت، کە (قاریت)ی پاشای ئەبخازەکان بەدیل بگرێت و، هەر بەدیلیش بەرەو ئەسفەهانی گوازتەوە[١٩٧].

هەرچی (حوسەینی)یە شتێکی لەمە جیا دەگێڕێتەوە، ناواخنەکەی ئەوەیە، کە: سوڵتان (تەغرول بەگ) سەرەتا (قەتلمشی کوڕی ئیسرائیلی کوڕی سەلجوقی) مامی بەرەو چیاکانی ئەرمینیاو ئازەربێجان دەنێرێت ناوبراو سەرکەوتوو دەبێت لە داگیرگردنیان[١٩٨]، ئینجا هەر (قەتلمش) لە ساڵی (٤٣٨ک/١٠٤٦ز)دا بە مەبەستی دەست گرتن بەسەریدا، ئابڵوقە دەخاتە سەر شاری جەنزە (کەنجە)[١٩٩].

(مینۆرسکی)ش لەسەرچاوە ئەرمەنییەکانەوە شتێکی تر دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئیمپراتۆری بێزەنتی و پاشای ئەرمینیا (باغراتی ئەرمەنی) هەوڵی هێرشکردنیان بۆ سەر ئەو هێزە سەلجوقیانەدا، کە لە نزیک شاری (کەنجە)[٢٠٠]، لایاندا بوو، کە وەکو ئاماژەمان پێدا ئابڵوقەی ئەو شارەیان دەدا، بەڵام ئەو هێزە هاوپەیمانەی بێزەنتی و ئەرمەنی لە هەوڵەکانیان سەرنەکەوتن، بۆیە پاشای ئەرمەنی ناچاربوو، بەرەو ئیمپراتۆر هات و، داوای لێکرد یارمەتی زیاتری پێبدات، بۆ ئەوەی بتوانێت بە رووی هێرشەکانی سەلجوقییان بوەستێتەوە[٢٠١].

لە کتێبی (زبدة التواریخ) ئەوە هاتووە، کە سوڵتان لە ساڵی (٤٣٩ک/١٠٤٧ز) (یەناڵ)ی برای بۆ ئەرمینیا رەوانکرد، لەوێ سوپای سەلجوقی لەگەڵ هێزەکانی (لیباری ئەبخازی) هاوپەیمان لەگەڵ رۆمەکان بەیەکیان دادا، لە ئاکامدا سوپای هاوپەیمان شکاو، ژمارەیەک لە ئەبخازییەکانیان بەدیلی بۆ (تەغرول بەگ) گرت، هەندێ لە شارەکانی



هەرێمەکەشیان داگیرکرد[٢٠٢].

(ئورفایتس)ی مێژوونووسی ئەرمەنیش دەگێڕێتەوە، دەڵێت: بە فەرمانی (تەغرول بەگ) سوپایەکی گەورەی سەلجوقییان بە سەرۆکایەتی (یەناڵ و قەتلمش) لە وڵاتی (ئاران)ەوە بەرەو (ئەرمینیا) هاتن و، توانییان دەست بەسەر ژمارەیەک لە شارەکانیدا بگرن[٢٠٣].

جا لەگەڵ جیاوازی گێڕانەوەکانیش، لەبارەی هێرشی سەلجوق بۆ سەر ئەرمینیا، بەڵام ئەو راستییەی لەو مەسەلەیەدا روونە، ئەوەیە، کە ئەو هەرێمەی (ئەرمینیا)ش دووچاری هێرش و پەلامار هات و شارەکانی وێران و کاول بوون.

بەڵام لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە گەورانەش، کە سەلجوقییەکان لەبەرەی ئەرمینیا بەدەستیان هێنا، هەندێ کێشەی ناوەخۆیان بوونە کۆسپ لەبەردەم سیاسەتە فراوانیخوازەکەیان، ئەوەتا لە ساڵی (٤٤١ک/١٠٤٩ز) ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوو برا (طە غرول بەگ) و (یەناڵ)، ئەمەش چونکە سوڵتان داوای لە براکەی کرد شاری (هەمەدان) و هەموو ئەو قەڵایانەی لەژێر دەستی دان لە وڵاتی چیاکان[٢٠٤] بە ئەویان بدات، بەڵام (یەناڵ) ئەوەی رەتکردەوە، کە ئەو شارو قەڵایانەی پێبدات، ئەمەش بووە سەرەتای ململانێیەکی درێژ لە نێوانیان، بەکارەکیش شەڕ لە نێوان هەردوولادا بەرپابوو، (یەناڵ) تیایدا شکاو، (تەغرول بەگ) دەستی بەسەر (هەموو قەڵاکان و وڵاتەکەیدا)[٢٠٥] گرت. هەرچی (یەناڵ)یشە لەگەڵ هێزەکانی کشایەوە قەڵای (سەرماج)[٢٠٦]و لەوێدا خۆی قایم کرد، کە (سەرماج) یەک لە قەڵا ماوەکانی سەر بە میرنشینی حەسنەوەیهی کوردی بوو.

سوڵتان بڕیاری رووبەڕووبوونەوەی براکەی داو، ئابڵوقەی خستە سەر (سەرماج)، کە وەکو (ئیبنولئەثیر)[٢٠٧] دەیڵێت: سوڵتان خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد، کە ژمارەیان دەگەیشتە سەد هەزار سەرباز، لە هەموو جۆرەکانی سوپا.. ئیتر شەڕ دامەزراو دوای چوار رۆژی بەردەوام، سوڵتان توانی دەست بەسەر قەڵاکەدا بگرێت، کە لەراستیدا (سەرماج) لە پارێزراوترین و، سەختترین قەڵاکانی هەرێمی چیاکان بوو، هەرچی (یەناڵ)یشە بە شکاوی لە قەڵاکە هاتەدەر[٢٠٨]، بەم شێوەیەش وڵاتی کورد بوویە شانۆیەکی ململانێی نێوان ئەم دوو برایانە.

دوای ئەوەی سوڵتان (تەغرول بەگ) لەکێشەکانی لەگەڵ براکەیدا تەواو بوو، جارێکی

دیکە رووی کۆششەکانی کردەوە بەرەی (ئەرمینیا)و، لە ساڵی (٤٤٦ک/١٠٥٤ز)[٢٠٩] هێرشێکی تازەی هێنایەوە سەر ئەو هەرێمە، کە خۆی لە پێشەنگی سوپاکەی دابوو و، بەرەو شارەکانی ئەو هەرێمە هاتن، پەلاماری (مەلازگەرد)یان دا، ئابلۆقەیان خستە سەرو، شارەکانی دەوروبەریان تالانکرد، بەمەش ناوچەکە رووبەڕووی خاپوور بوون هات، بەڵام لەبەر سەختی ئەو شارەو، هاتنی وەرزی زستان، بۆیە سوڵتان لەگەڵ هێزەکانی بەرەو شارەکانی دیکەی ئەو هەرێمە کشانەوە، جا ئەگەرچیش لە دەستگرتن بەسەر (مەلازگەرد)دا، سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام توانی هێرش بۆ سەر چەندین شاری دیکە بکات[٢١٠].

(شترک) باس لەوە دەکات، کە شارەکانی ئەرمینیا لەسەر دەستی سوڵتان (تەغرول بەگ) و سەربازەکانی دووچاری بارێکی ناخۆش هاتن، لە پەلامارەکەی ساڵی (٤٤٦ک/١٠٥٤ز) سەلجوقییەکان شاری (ئەرزن)یان تالانکردو[٢١١]، بەهۆی ئەو کوشتارەی کە لەو شارەدا کردیان، دانیشتوانەکەی ناچاربوون بەجێی بهێڵن[٢١٢]، ئیتر بەرەو شاری (قالیقلا) رایان کردو، بە ناوی شارە جێهێشتراوەکەیان، ناویان نا (ئەرزن)، بەڵام دواتر بە (ئەرزنی رۆم) ناسرا، بۆ ئەوەی لە شارە بنجییەکە جیابیبێتەوە[٢١٣].

سوڵتان بەردەوامبوو لە هێرشەکانی بۆ سەر شارەکانی ئەرمینیاو، تێیاندا دەستکەوتی گەورەی بەدەست هێنا، (ئیبنولئەثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت: (سوڵتان تەغرول بەگ کاریگەرییەکی گەورەی لە داگیرکردنی رۆمدا جێهێلاو، لە تالان و کوشتن و بەدیل گرتنیاندا، شتێکی زۆری لێیان دەستکەوت)[٢١٤]، ئینجا سوڵتان بڕیاری کشانەوە بەرەو (ئازەربێجان)ی دا، بەو مەبەستەی ئەو (مەلازگەرد)ەی جاری یەکەم خۆی بۆ بەدەستەوەنەدا، ئێستا دیسانەوە هێرشی بۆ بێنێ و، بیخاتە ژێر دەستی، بەڵام لەگەڵ هاتنی ساڵی (٤٤٧ک/١٠٥٥ز) (تەغرول بەگ) پلانەکانی خۆی گۆڕی و، بڕیاری دا بەرەو (بەغداد)ی سەنتەری خەلافەی عەبباسی بێت[٢١٥].

### ج- راگەیاندنی (نەسرولدەولە) بە گوێڕایەڵیکردنی بۆ سەلجوقییەکان:

دوای توندکردنی دەسەڵاتی خۆی، بەسەر شارو قەڵا کوردییەکانی هەرێمی چیاکان، سوڵتان (تەغرول بەگ) بە هەنگاوێکی لە ئەوپەڕی گرنگیدا هەڵسا، ئەوەبوو لە ساڵی



(٤٤١ک/١٠٤٩ز)[٢١٦] نامەیەکی بۆ نەسرولدەولە (ئەحمەدی کوڕی مەڕوان) هەناردو، تیایدا داوای لێدەکرد لە ولاتەکەیدا خوتبە بە ناوی ئەو بخوێنرێتەوە، دیارە کۆمەڵە مەسەلەیەکیش هەبوون کە پاڵیان بە سوڵتانی سەلجوقی نا، بۆ ئەوەی نامە بۆ (نەسرولدەولە) بنووسێ، لەوانە دەشێت لە پێش هەموویان حەزی سوڵتان بووبێ لە ملکەچ پێکردنی میرنشینی مەڕوانی بۆ دەسەڵاتەکەی خۆی، چونکە ئەو میرنشینە توانایەکی ئابووری گەورەی هەبوو و، شوێنەکەی زۆر ستراتیژی بوو، ئەمەش بەهۆی نزیکیی لە هەردوو دەوڵەتی بێزەنتی و فاتمی[٢١٧]، ئینجا ئەگەر ئەوەش بۆ سوڵتان وەدی بهاتبا، دەیتوانی بە کەمترین زیان دەست بەسەر جەزیرەی فوراتیدا بگرێت.

یەک لە لێکۆڵەران دەڵێت: ئامانجی سوڵتان تەسککردنەوەی ئابلۆقەی سەر دەوڵەتی بووەیهی بوو، لەگەڵ هەرەشەکردن لە دەوڵەتی بێزەنتی نزیک لە رووداوەکان، لەدواییشدا ئەم دەوڵەتە بەکارەکی کەوتە بەر چەندین پەلاماری سەلجوقییەکان، هەر لەم هەنگاوەیدا زیاد لەوانەی ئاماژەمان بۆ کردن، دیسانەوە سوڵتان مەبەستی هەرەشەکردن لە دەسەڵاتی فاتمی بوو لە ولاتی شام[٢١٨].

دەتوانین زیاد لەوانەش ئەوە بڵێین، کە سیاسەتی (نەسرولدەولە) هەر لە ساڵی هاتنە سەرتەختی لە (٤٠١ک/١٠١٠ز)و، تا مردنی لە ساڵی (٤٥٣ک/ ١٠٦١ز)، بریتی بوو لەوەی قەت لەگەڵ دوژمنەکانیدا نەچێتە ناو شەڕ، ئەگەر بێت و لە ڕێگەی ماڵ و دیاری بەخشیندا بتوانێت مەترسییەکانیان لەسەر هەرێمەکەی دووربخاتەوە، هەر ئەم سیاسەتەی لەگەڵ سەلجوقییەکانیش پەیڕەوکرد، بۆیە دەبینین رازی بوو لەسەر ئەوەی لە هەموو لایەکی ولاتەکەیدا خوتبە بە ناوی سوڵتانی سەلجوقی بخوێنرێتەوەو[٢١٩]، چووە ژێر بڕیاریان، بەم سیاسەتەشی توانی هاوڕەوتی سەلجوقییەکان دەرچێت و، لە سای ئەواندا پارێزگاری لە میرنشینەکەیشی و، ئارامی هەرێمەکەیشی بکات، ئەمەش بەهۆی ئەقڵ و داناییەکەی و، بەهۆی ئەو دیارییە بە نرخ و، بڕە پارە گەورانەی، کە ماوە ماوە بۆ سوڵتانی دەنارد، هەر بۆ ئەوەی مەترسی ئەوەیان دووربخاتەوە، کە بێن بەکارەکی ولاتەکەی داگیر بکەن[٢٢٠].

لێکۆڵەری ناوبراو، هەروەها لە ئاماژەیێکی تریدا دەڵێت: نەسرولدەولە ناچاربوو ئەم داوایەی سوڵتان (تەغرول بەگ) جێبەجێ بکات، چونکە ئەگەرچیش زۆری رق لە

سەلجوقییەکان بوو، بەڵام توانای ڕەتکردنەوەی ئەوەی نەبوو.. ئینجا لێکۆڵەر بە درێژی لەم بابەتە دەدوێت و، لەو بڕوایەدا دەبێت: کە ئەگەر بهاتبوایە ئەم دەوڵەتە (واتە دەوڵەتی مەڕوانی)، لەگەڵ حکومەتی ڕووادی لە ئازەربێجان و، شەدادی لە ئاران و عەننازی لە هەرێمی چیاکان یەکیان بگرتبوایە، دەیانتوانی بەرووی باڵکێشانی سەلجوقی دا بووەستنەوە، بەڵام بەهۆی پەرتەوازەییان، هەموو ئەو حکومەتانە بوونە نێچیری ئاسان بۆ ئەو هێزە تورکییە[٢٢١].

وا دەردەکەوێت(تەغرول بەگ) سیاسەکی لێزان بووبێ، چونکە توانی (نەسرولدەولە) بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، دوای ڕاگەیاندی ئەوەی دووەمیش بە گوێڕایەڵێکردنی لە بۆی، هاتەلای سوڵتان میانەگیری کرد، بۆ ئەوەی پاشای ئەبخازەکان لە دیلیەتی رزگار بکات، چونکە پاشای ڕۆم نامەیەکی بۆ میر (نەسرولدەولە)ی کورد، رەوانکرد، تیایدا داوای ئەوەی لێکرد لەلای (تەغرول بەگ) میانەگیری بۆ بەردانی پاشای بەدیل گیراو بکات، جا بەهەر نرخێک بێت، کە سوڵتان دەیەوێت، وەکو تێبینیش دەکرێت: هەوڵەکانی میری مەڕوانی بەری خۆی دەدات و، (تەغرول بەگ) بێ هیچ بەرامبەرییەک پاشای ناوبراوی بۆ بەردەدات[٢٢٢].

دەکرێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە سوڵتان بە دەربڕینی ڕەزامەندیی، لەسەر میانەگیرییەکەی ئەو میرە کوردە، سەرکەوت لەوەی متمانە لەنێو کورداندا دروستبکات، هەروەها وایکرد (نەسرولدەولە) هەست بە پایەو مەقامێکی تایبەتیی خۆی بکات، لەلای سوڵتانی سەلجوقی، بە هۆی ئەو ڕۆڵە باشەش کە ئەو میرە مەڕوانییە گێڕای، پاشای ڕۆم سوپاسی کردو، دیاری زۆری لە بۆ هەنارد، هەروەها بڕیاری دووبارە نوێکردنەوەی مزگەوتی (قوستەنتینییە)شی دا، (ئیبنو لئەثیر)یش وا دادەنێت، کە بەلای خۆڕاکێشانی (نەسرولدەولە) سەرکەوتنێکی گەورەبوو، سوڵتانی سەلجوقی بەدەستی هێنا[٢٢٣].

هەمان لێکۆڵەر لە هەڵەیەکی گەورە دەکەوێت، کاتێک کە دەڵێت: (نەسرولدەولە) بەر لە ڕاگەیاندنی گوێڕایەلی کردنەکەی، میانەگیرییەکەی لای سوڵتانی سەلجوقی کرد، (تەغرول بەگ)یش مەبەستداربوو لە قەبوڵکردنی ئەو میانەگیرییەی، چونکە ئارەزووی ئەوەی هەبوو نەسرولدەولە بەرەو ئەوبێت و پەیوەندی پێوەبکات.. ئینجا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: ئاواتەکانی (تەغرول بەگ) وەدیهاتن، چونکە لە هەمان ساڵدا، واتە لە



ساڵی (٤٤١ک/١٠٤٩ز) ئەو میرە کوردە بە ڕەسمی گوێڕایەڵیکردنی خۆی لە بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند[٢٢٤]، هەڵەی ئەم گێڕانەوەیەش ئاشکرایە، چونکە هەندێ لە سەرچاوەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە (نەسرولدەولە) سەرەتا شوێنکەوتەیی خۆی بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند، ئینجا میانەگیرییەکەی خستەڕوو[٢٢٥]، ئێمەش زیاتر لەگەڵ ئەو ڕایەین، چونکە ناچێتە ئەقڵ، ئەو میرە کوردە بێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی سیاسی پێشین لەنێوان هەردوولا هەبێ، بێت بەمیانە گیرییەکەی خۆی هەڵبستێت، هەروەها (تەغرول بەگ)یش ڕەزامەندی لەسەر داواکەی (نەسرولدەولە) دەرنەدەبڕی، ئەگەر بهاتبا (نەسرولدەولە) گوێڕایەڵی خۆی بۆ ڕانەگەیاندبا.

بەڵام هەرچی ئەو هۆیانەن، کەوایان لەو میرە مەڕوانییە کرد، ئەو هەنگاوە زوویینە بگرێتە بەر، کە ئەو لەنێو میرە کوردەکان یەکەم میربوو، گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان پێشکەشکرد، هاتە ژێر داوای (تەغرول بەگ)و، بەرلەوەی ئەو سوڵتانە بگاتە(دیاربەکر)، ئەو لە هەموو وڵاتەکەی خوتبەی بەناوی ئەو خوێندەوە[٢٢٦]..

(عەبدولرەقیب یوسف) لەم بارەیەوە دەڵێت: لەبارەی پاڵنەرەکانی ئەو میرە (بۆ هەڵسان بەوکارەی)، هۆکارەکان نادیارن، چونکە ئەو میرە، بەوکارەی هەڵسا، دەسەڵاتی سەلجوقی زۆر لە میرنشینەکەی دووربوو، تا ئەوکاتە چیاکانی (زاگرۆس)یان نەبڕی بوو و، نە گەیشتبوونە ئازەربێجان و عیراق[٢٢٧].. لە درێژەی قسەکانیشیدا، ئەم لێکۆڵەرە وای دەخاتەڕوو، کە هیچ هۆیێکی پەسند نابینێت، بەهۆیەوەی پاساو بۆ ئەو هەڵوێستەی میری کوردی بێنێتەوە، چونکە ئەوساکە هیچ هەرەشەیەکی دەرەکی لەسەر میرنشینی مەڕوانی نەبووە، وا بەسەر (نەسرولدەولە)دا بسەپێنێت، دان بەدەسەڵاتی سەلجوقیدا بنێت[٢٢٨].

بەڵام لەگەڵ ئەوەش کە لێکۆڵەری ناوبراو لەبۆی چووە، دەکرێ هەندێ هۆکار زەقبکەینەوە، چونکە بە وردبوونەوە لەوەی کە بانگخوازی فاتمی موئەید فی دین (هیبەتوڵڵای شیرازی)ی مردوو لە (٤٧٠ک/١٠٦٢ز)، تۆماری کردووە، دەکرێت بەلای ئەوەدا بچین، کە ئەو بۆ خۆ دوورخستنەوە لە شەڕی تورکە سەلجوقییەکان و، بۆ پاراستنی وڵاتەکەی لە گەندەڵییەکانیان، گوێڕایەڵی خۆی ڕاگەیاند، چونکە ئەو وەکو (موئەییەد)[٢٢٩]. دەڵێت: یەکەم کەس بوو، وەڵامی دایەوە (لە ناوچەکەو، گوێڕاڵی بۆ کردن)[٢٣٠].

یان، خێراکردنی میری مەڕوانی لە دەرخستنی گوێڕایەڵیکردنی خۆی لە بۆیان، بەهۆی دووربینی و، پێشبینی خۆی بووە بۆ ئایندەییێکی نزیک، کەوا بۆ سەلجوقییەکان چووە، بینە خاوەن دەسەڵاتێکی رەها لە جیهانی ئیسلامی، ئەمەش دیارە لە دوای رووخانی دەوڵەتی بوویهی، یان ویستوویەتی بەم هۆیەوە خۆی لە بەرامبەر دەوڵەتی بێزەنتی و دەوڵەتەکانی دیکەی ناوچەکە بەهێز بکات، دوا راش، کە بە بۆچوونی ئێمە لە هەمووانی دیکە زیاتر لەراستی نزیکە، ئەوەیە، کە: ئەو میرە هەوڵیدا وڵات و میللەتەکەی لە وێرانبوون و بە کوشت چووندا دووربخاتەوە، چونکە وەکو بینیمان، شارە کوردییەکانی هەرێمەکانی چیاکان و ئەرمینیا، لەدەرەنجامی هێرشی سەلجوقییەکاندا، دووچاری باری زۆرخراپ و نالەبار هاتن، کە ئەمە وایکرد (نەسرولدەولە) لەپێناو پاراستنی وڵاتەکەی گوێڕایەڵبوونی خۆی بۆ سەلجوقییان رابگەینێت.

### د- گەیشتنی سەلجوقییەکان بە ئازەربێجان و ئاران:

سوڵتان (تەغرول بەگ) درێژەی بە فراوانبوون و هێرشەکانی دا، لەو هەرێمانەی کە وڵاتی کوردیان پێکدێنا، ئەوەبوو دوای ملکەچ بوونی ئازەربێجان و، گوێڕایەڵی مەڕوانییەکان لەبۆی لە جەزیرەی فوراتی، ئەوەی لەسەرما پلانەکەی تەواو جێبەجێ بکات، کە ئەو بەشەی لە پلانەکەیدا ماوە، باڵکێشانە بەسەر کوردی هەرێمەکانی ئازەربێجان و ئاران، وەکو دەشزانرێت دوو میرنشینی کوردی سەربەخۆ فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمانەیان دەکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە (رووادی)یەکان لە ئازەربێجان و، (شەدادی)یەکان لە ئاران، بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەش، لە ساڵی (٤٤٦ک/١٠٥٤-١٠٥٥ز)، سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرەو ئازەربێجان هات و، چاوی بڕییە (تەبریز)ی پایتەختی میرنشینی رووادی[٢٣١].

لەو ماوەیەدا میر (وەهسوزانی کوڕی مەملانی رووادی) فەرمانڕەوای ئەو میرنشینەی دەکرد، کە لەپێشتردا لەماوەی قسەکردن لەسەر هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر ئازەربێجان، ئاماژەمان پێیکرد، کە گوتمان رۆڵێکی گەورەی بینی لە بەرگری کردن لە میرنشینەکەی و، سەرکەوت لە پاککردنەوەی وڵاتەکەی لەو (غەز)انە، بەڵام بۆ بەدبەختی هەر لەو رۆژەی کە (غەز)ەکان دەردەکات و، تا ئەو رۆژەی سوڵتان (تەغرول بەگ) هێرشی دێنێ لە ساڵی



(٤٤٦ک/١٠٥٤-١٠٥٥ز)[٢٣٢]، هەواڵ دەپچڕێت، ئەوەتا لە بارەی سەردەمی ئەو میرە کوردەو، هەواڵ و رووداوەکانی هەرێمەکە، هیچ زانیاریێکمان لە دەستدا نییە، (نەقشەبەندی)ش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەلجوقییەکان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر هەرێمەکانی دەوروبەری ئازەربێجاندا توندکرد، کەچی لە هەمان کاتدا، هەتا ساڵی (٤٤٦ک) ئەو هەرێمەیان هەروەکو خۆی هێڵایەوە[٢٣٣].

هەروەها پەیوەندی نێوان میر (وەهسوزان)و سوڵتان (تەغرول بەگ)یش لەو ماوە زەمەنییەدا، هیچی لە بارەوە نازانرێت، چونکە بە بێجگەی بوومەلەرزەکەی (تەبریز)ی ساڵی (٤٣٤ک/١٠٤٢ز) ئیتر سەرچاوەکان باس لە هیچی دیکە ناکەن[٢٣٤].

مەسەلەکە هەر چۆنێک بێت، سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرەو (ئازەربێجان) هات و، چاوی بڕیە (ئەبا مەنسور وەهسوزان رووادی)ی خاوەنی (تەبریز)و ئەویش گوێڕایەڵی بۆ نواندو، خوتبەی بۆ خوێندەوە[٢٣٥]، دیاری و ماڵیشی پێشکەش کرد بۆ رازیکردنی، تەنانەت یەک لە کوڕەکانی وەکو بارمتە (رهینە) لە بۆ رەوانکرد[٢٣٦]، بەمەش (تەغرول بەگ) لە (وەهسوزان) رازی بوو، لەسەر میرنشینەکەی خۆیدا هێشتییەوە، بەڵام بەو مەرجەی ئەویش لەسەر گوێڕایەڵی کردنەکەی لە بۆی بمێنێتەوە[٢٣٧]، بەمەش میرنشینی رووادی کەوتە ژێر رکێفی سەلجوقییەکان و، بەشێوەیەک لە شێوەکان سەربەخۆیی خۆی لەدەستدا.

ماوە لەسەر (سوڵتان) ئەمجارەیان میرەکانی میرنشینی شەدادی لە ئاران، بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە بەرەو (ئەبو ئەسوار شاور)ی خاوەنی جەنزە (کەنجە) هات، ئەمەش هەر لە هەمان ساڵی (٤٤٦ک)دا، ئەو میرە کوردەش بەهەمان شێوە گوێڕایەڵ بوونی خۆی لە بۆیان راگەیاند[٢٣٨]، یەک لە لێکۆڵەران لە ئاماژەدانی بۆ ئەو پاڵنەرانەی وایان لە (ئەبی ئەسوار) کرد، گوێڕایەڵی خۆی رابگەینێت، دەڵێت: بەهۆی ئەو هێزە بوو، کە لەلای سەلجوقییەکانی بینی و، دەرکی بەوەکرد، کە لە توانایدا نییە بە بەرەنگاری و رووبەڕووبوونەوەیان هەڵسێت، ئەوەتا (تەغرول بەگ) ژمارەیەک میرو، چەندین هەرێمی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئیتر لەبەرئەوە ناچێتە ئەقڵەوە ئەو میرە بتوانێت، بەرپەرچیان بداتەوە[٢٣٩].

ناکۆکیشمان لە نێواندا نییە، لەسەر ئەو رایە پێشووەی، کە لێکۆڵەر ئاماژەی بۆ کرد،

بەڵام لە خستنەڕووی هۆکارەکاندا درێژی دەکاتەوە، بەوەی کە دەڵێت: میر (شاور) لەبەرئەوە گوێڕایەڵ بوونی خۆی بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند، چونکە یارمەتی لە ئەوان وەردەگرت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنە زۆرەکانی، لە هەمـوو ئەو ڕۆم و کەرەج و ئەرمەنەی، لە باکوور و لە ڕۆژئاواوە دەوری وڵاتەکەیان دەدا[٢٤٠].

بەڵام وەکو بۆمان دەردەکەوێت، لێکۆڵەر ئەوەی بە بەرچاو نەگرتووە، کە لەڕاستیدا تا شەدادییەکان گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان ڕانەگەیاند، ئەوانیش هیچ یارمەتییەکیان لەم ڕووەوە پێ نەدابوون، چونکە ئاقڵایەتی نییە، لە کاتێکدا هێشتان گوێڕایەڵ بوونی خۆیان لە بۆ ڕانەگەیاندبێ، سوڵتان (تەغرول بەگ) بێت یارمەتی ئەو کوردانەی میرنشینی شەدادی لە ئاران بدات، بەڵام دەکرێ بگوترێت، دوورنییە دوای ئەوەی شەدادییەکان گوێڕایەڵبوونی خۆیان بۆ ڕادەگەیەنن، ئەوانیش یارمەتییان دابن.

بەم شێوەیە دەبینین، وڵاتی کورد، لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە سیاسییە سەربەخۆیەی تیای بوو، گوێڕایەڵبوونی خۆی بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند، ئەو سەلجوقییانەی کە لەو ماوە مێژووییەدا لە لوتکەی بەهێزی خۆیان بوون، ڕاگەیاندی گوێڕایەڵیش لەلایەن کورد، جۆری ئەو پەیوەندییە سیاسییە دەستنیشان دەکات، کە لە دواتر لەنێوان هەردوولادا، دروست دەبێت.



**پەراوێزەکان**

١- بەر لەوەی بەدرێژی بچینە ناو، پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان کوردو سەلجوقییەکان، بە باشمان بینی، سەرەتا بیرۆکەیەکی کورت لەبارەی (غەز)و هێرشەکانیان بۆ سەر وڵاتی کوردو، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەرکردایەتییە کوردییەکان بخەینە بەردەست، بەو پێیەی (غەز) لە تورکانن، سەلجوقییەکانیش لکێکن لەو هۆزە تورکانە، بەر لە گەیشتنی سەلجوقییەکانیش بە جیهانی ئیسلامی، ناوچەکە بەدەستی ئەو هۆزە غەزانەی لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتن، تووشی وێرانەیی هات.

٢- مەسعودی: التنبیە والاشراف، لاپەڕە (٨٨)؛ کەردیزی: زین الاخبار (بەفارسی)، (تەهران، ١٣٦٣ک)، هەردوو لاپەڕەکانی (٥٤٤-٥٩٨)؛ کاشغری: دیوان لغات الترک، (ئەستەنبۆل، ١٣٣٣، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٦)؛ قلقشندی: نهایە الدرب فی معرفە انساب العرب، ساغکردنەوەی: ئیبراهیمی ئەبیاری، (بەیروت، ١٩٨٠ز)، لاپەڕەکانی (٢٥-٢٦).

٣- زەکەریا کتابچی: الترک فی مؤلفات الجاحظ، (بەیروت، ١٩٧٢ز)، لاپەڕە (١٩)؛ بۆ زانیاری زیاتریش لەبارەی (غەز)و وڵاتەکەیان، بڕوانە: بارتۆلد: ترکستان، وەرگێڕانی: سلاحەددین عوسمان هاشم، (کوێت، ١٩٨١ز)، هەردوو لاپەڕەکانی (١١٤-٢٣٨).

٤- ئیبن و حەسول: کتاب تفضیل الاتراك علی سائر الاجناد، (بەغداد، ١٩٤٠ز)، لاپەڕە (٤٠)؛ زوبەیدە عەتا: الترک فی العصور الوسطیٰ، قاهیرە، ١٩٤٦ز، لاپەڕە (٩).

٥- رسالە ابن فضلان: ساغکردنەوەی: سامی دەهان، (دیمەشق، ١٩٧٧ز)، لاپەڕە (١٢٢).

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەروەها بڕوانە: بارتۆلد: تاریخ الترك في اسیا الوسطی، وەرگێڕانی: ئەحمەد سەعید سلێمان، (قاهیرە، ١٩٥٨ز)، لاپەڕە (١٠٠).

٧- رسالە ابن فضلان: لاپەڕە (١٢٢)؛ خەوارزمی: مفاتیح العلوم، میسر، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٧٣).

٨- Hadud -al- ALam, p,44.

٩- مەقدسی: احسن التقاسیم، لاپەڕە (٢٧٤)؛ تاریخ البیهقی، وەرگێڕانی: یەحیا خەشاب و صادق نەشئەت، (بەیروت، ١٩٨٢ز)، لاپەڕە (٢٧٥)؛ کاشغری: دیوان لغات الترک، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥١).

١٠- ديوان لغات الترك، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (٢٧-٢٨).

١١- شیرازی: سیرە المؤید فی الدین، ساغکردنەوەی: محەمەد کامل حوسێن، (قاهیرە، ١٩٤٩ز)، لاپەڕەکانی ١٤٩، ١٧٤، ١٧٨، ١٨٠؛ ئیبن و لئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی ٣٧٧-٣٧٨؛ تأریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٥١-٤٥٢).

١٢- المختصر: بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٨).

١٣- السلاجقة تأریخهم و حضارتهم، وەرگێڕانی: لوتفی ئەلخوری و ئیبراهیم داقوقی، بەغداد، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٤).

١٤- گەردیزی: زین الاخبار، لاپەڕەکانی (٨٤-٨٥)؛ تأریخ البیهقی، لاپەڕە (٦٨).

١٥- دەوڵەتی غەزنەوی لە (٣٥١-٥٨٢ک/٩٦٢-١١٨٦ز) حوکمڕانیی کرد.. تاریخ البیهقی، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٢-٤٥)؛ (دەهام فازل خەتاب: علاقات الدولة الغزنویة بالبویهیین والخلافة العباسیة، نامەیەکی ماجستێری بڵاونەکراوەیە، (موصل، ١٩٨٤ز)، هەردوو لاپەڕەکانی (١٦-٩٥).

١٦- تاریخ البیهقی، لاپەڕە (٣٤).

١٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٧٧، ٣٧٨)؛ (سلێمان ئەلسائغ): تأریخ الموصل، (میسر، ١٩٢٣ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٣٧).

١٨- ئەرسەلان وشەیەکی تورکییە بەواتای (شێر) دێت؛ محەمەد تونجی: المعجم الذهبی، (بەیروت، ١٩٦٩ز)، لاپەڕە (٦١)؛ بەڵام هەرچی وشەی (سەلجوق)ە، (فامبری) لەو بڕوایە دایە، ڕێزمانی زمانی تورکی وێنەی ئەو وشەیەی بەو شێوە لێکردووە، وشەکە لە بنجدا (سیلجیق) یان (سالجوق)ە؛ تاریخ بخاری، وەرگێڕانی: ئەحمەد مەحمود ساداتی، (قاهیرە، ١٩٦٥ز)، لاپەڕە (١٢٧)؛ (بارتۆلد)یش دەڵێت: کۆکردنی دروستی وشەکە، (سالجوک)ە؛ تاریخ الترک، لاپەڕە (١٠٠)، بەڵام (دەقاق) یان (تەقاق)، ماناکەی بە تورکی واتە (کەوانی ئاسن).. ئیبنولئەثیر، الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٤٧٣)؛ فاروق عومەر فەوزی: تاریخ العراق، (بەغداد، ١٩٨٨ز)، لاپەڕە (١٦٢).

١٩- حوسەینی: زبدە التواریخ، ساغکردنەوەی (محەمەد نورەدین)، (بەیروت، ١٩٨٦ز)، لاپەڕە (٢٨)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٧٧)؛ محەمەد خەضری بەگ: محاضرات في تأریخ الامم الاسلامیة، بەیروت، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٤١٣).



٢٠- (خرکاة): وشەیەکی فارسییە، عەرەبییەکەی (خرقامة)یە، مەبەست لێی، ژمارەیەک خێمە یە.. حافظ ئەبرو: زبدە التواریخ (بە فارسی)، (تەهران، ١٣٧٢ کۆچی هەتاوی)، لاپەڕە (٨٢)؛ بوطرس بوستانی: محیط المحیط، (بەیروت، ١٩٧٧ز)، لاپەڕە (٢٢٨).

٢١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٧٨).

٢٢- (ئیبنولئەثیر) زاراوەی (غەز)ی عیراقی، بۆ ئەو تایەفە (غەز)ە بەکاردێنێت، کە لە شاری (ڕەی)ەوە بەرەو شارەکانی هەرێمی چیاکان هاتن و ژمارەیەکیان لەو شارانە نیشتەجێ بوون، بەڵام زیاتریش وشەی (عیراقییە)ی بۆ بەکارهێنراوە، چونکە هەرێمەکە بە (عیراقی عەجەمی) ناسراوبوو؛ الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٧٩).

٢٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧٩).

٢٤- شهریاران گمنام، بەشی دووەم، هەردوو لاپەڕەکانی (١٧٨-١٨٠).

٢٥- سفرنامە، لاپەڕە (٥).

٢٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨١)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیە، لاپەڕە (٤٥).

٢٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٧٩).

٢٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٩- قەطرانی تەبریزی: (٤٢٥-٤٦٥ک/١٠٣٤-١٠٧٢ز) حەکیمی ناسراوی (شەرەفو لزەمان) (ئەبو مەنصور قەطرانی تەبریزی ئوزدی)یە، یەکێکە لە شاعیرانی بیلاطی ڕووادی، زۆری بە میرەکانی ئەو میرنشینەو بەتایبەت میر (وەهسوذان)و منداڵەکانیدا، هەڵگوتووە.. ذەبیحوڵڵا صەفا: تاریخ ادبیات در ایران، (تەهران)، (بەبێ ساڵی چاپ)، بەشی دووەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٤٢١-٤٣٠).

٣٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢).

٣١- تاریخ البیهقی، لاپەڕەکانی (٣٨٣-٤١٥)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٧٩-٣٨٠)؛ Ency of Islam, vol 6, P 1138.

٣٢- نەیسابور: یەکێکە لە شارەکانی خوراسان، لە کۆندا (نوشابور)ی پێدەگوترا، ئەمەش وەکو درانەپاڵێک بۆ دامەزرێنەرەکەی (شابوری یەکەمی کوڕی ئەردەشێر).. بنیامین تەطیلی: رحلة بنیامین، لاپەڕە (١٦٠)؛ ئەبولفیداء: تقویم البلدان، لاپەڕە (٤٥١).

٣٣- ئیبنو خەلدون بەشێوازێکی دیکە، ناوی میرەکانی (غەز) دەبات، لەوانە (کوکاش)، (مەرقا)، (کول)، (یەغمر)، (باصعکی).. تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١).

٣٤- تاریخ البیهقی، لاپەڕە (٥٣٥)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢)؛ مزەفەر زەنگەنە: دودمان ئاریاتی (کرد و کردستان)، ئێران (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (١٠١)؛ Ency of Islam, vol 6, P 1138.

٣٥- تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم: هەردوو لاپەڕەکانی (٤٥١-٤٥٢).

٣٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٥١-٤٥٢)؛ مەحمود: الهذبانیون فی ازربیجان، لاپەڕەکانی (٩٨-٩٩).

٣٧- ئینولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢)؛ ئیبنولعیبری: تاریخ مختصر الدول، (بەیروت، ١٩٥٨ز)، لاپەڕەکانی (٨٠-٨١).

٣٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٣)؛ نەقشەبەندی: ازربیجان، لاپەڕە (١٥٩)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیة، لاپەڕە (٤٦).

٣٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢)؛ بارتۆلد: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی (بوقا)، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (٤٣٠-٤٣١)؛ سیروان کاویان پور: تاریخ عمومی ازربیجان، (تەهران-١٣٤٦ کۆچی هەتاوی)، لاپەڕە (١٠٠).

٤٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢)؛ نەقشەبەندی: ازربیجان، لاپەڕە (١٥٩).

٤١- الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢).

٤٢- شهریاران گمنام، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٣).

٤٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٨٤-٣٨٥)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیة، لاپەڕە (٤٧)؛ مینورسکی: تاریخ تبریز، (بەفارسی)، وەرگێڕانی: عەبدولعەلی کارنک، (تەهران، ١٣٣٧ کۆچی هەتاوی)، لاپەڕە (١٢)؛

Ency of Islam, vol 6, P 1138.

٤٤- ئیبراهیمی کوڕی یەنال، دایک برای سوڵتان (تەغرول بەگ) بوو. صەفەدی: الوافی بالوفیات، (١٩٦٢ز)، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٥٢).

٤٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٨٥-٣٨٦)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ IB ID, P 1139.



٤٦- شهریاران گمنام، بەشی دووەم، هەردوو لاپەڕەکانی (١٩٦-١٩٨).

٤٧- بۆ زانیاری زیاتر لەمەر هێرشەکانی(غەز) بۆ سەر ئازەربێجان، بگەڕێوە بۆ: ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٧٧-٣٩١)؛ اذربیجان، هەردوو لاپەڕەکانی (١٥٦-١٦٣).

٤٨- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١١٤)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥١٣)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزەم، لاپەڕە (٥٠)؛ مینۆرسکی: تاریخ تبریز، لاپەڕە (١٢).

٤٩- سفرنامە، لاپەڕە (٥).

٥٠- محەمەد مەردۆخ: مێژووی کوردو کوردستان(تاریخ مردوخ)، وەرگێڕانی: عەبدولکەریم محەمەد سەعید، (بەغداد،١٩٩١ز)، لاپەڕە (٩٥).

٥١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٧٨)؛ تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٠)؛ صائیغ: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٣٧).

٥٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٢).

٥٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨٣).

٥٥- کەرەج یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی چیاکان، دەکەوێتە نێوان هەمەدان و ئەسفەهان.. ئیبنو حەوقەل: صورە الارض، لاپەڕە (٣١٣)؛ یاقوت: المشترک وضعا، لاپەڕە (٣٦٨)؛ ئەم شارە تا ئێستاش لە ئێراندا ماوە، بەناوی (کەرەرود) دەناسرێت و، دەکەوێتە رۆژئاوای (ئاراک).. ستانلی لین بول: طبقات سلاطین الاسلام، وەرگێڕانی: مەکی طاهیر کەعبی، (بەغداد، ١٩٦٨ز)، لاپەڕە (١٢٢).

٥٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٣).

٥٧- کەنگور: یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی چیاکان، دەکەوێتە نێوان هەمەذان و قەرمێسین.. قەزوینی: آثار البلاد، لاپەڕە (٤٤٨)؛ ئەم شارە تا ئێستاش ماوەو ئەمڕۆکە بە (کەنگاور) دەناسرێت دەکەوێتە نێوان هەمەذان و کرمانشاهی ئێستا لە وڵاتی ئێران.

٥٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٤).

٥٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦١- ئەسعد ئاباد: شارۆچکەیەکە دەکەوێتە دووری (٨) فەرسخ/ (٤٨) کیلۆمەتر لە هەمەذان.. ئیبنو حەوقەل: صوره الارض، لاپەڕە (٣٠٦)؛ ئیبنولئەثیر: اللباب، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٢٤).

٦٢- (ئەبو لفەتح): ئەمە میر ئەبولشەوک (فارسی کوڕی محەمەد)ە، (٤٠١-٤٣٧ک)، میری میرنشینی عەننازی فەرمانڕەوا، لە هەندێ لە شارەکانی هەرێمی چیاکان بوو، هەر ناوبراو، جێگری باوکیشی بوو، بەسەر (دینەوەر)، ئیبنولئەثیر، بەرێزەوە نرخاندویەتی و گوتویەتی: (شوێنەکەی گەورە بووەو چەندین قەڵای کردۆتەوە، ناوچەکانی خۆی لە (غەز)ەکان پاراستووەو زۆری لێ کوشتون...). الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٤٧٠)؛ محەمەد ئەمین زەکی: مشاهیر الکرد وکردستان، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: کچە خاتونەکەی، (میسر، ١٩٤٧ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٧٦).

٦٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٤)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیه، لاپەڕەکانی (١٢٧-١٢٨)؛ موکریانی: ئاوڕێکی پاشەوە، (رواندوز، ١٩٣١ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩).

٦٤- موکریانی: ئاوڕێکی پاشەوە، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩).

٦٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦).

٦٦- شاکر مستەفا: دخول الترك الغز الی الشام، (عەممان، ١٩٧٤ز)، لاپەڕە (٣١٩).

٦٧- ئەنوەر مائی: الاکراد فی بهدینان، (دهۆک، ١٩٩٩ز)، لاپەڕە (١٠٥).

٦٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ تکریتي: الامارة المروانية في دياربكر، لاپەڕەکانی (١٢٦-١٢٧).

٦٩- ئینولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦).

٧٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧١- مرآة الزمان، لاپەڕە (٥١٤).

٧٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥١٤).

٧٣- مێژوونوسان بێجگەلە (ئیبنولئەثیر) هیچ یەکێکیان ئاماژە بە هەواڵەکانی تایەفەی (غەز) لە هۆزی (ئەرسەلان سەلجوق)دا ناکەن، تەنانەت (بەیهەقی)ش کە هاوچەرخی ڕووداوەکانی ئەو تایەفەیە بووە، ئاماژەی پێنەداون، تەنیا لە چەند برگەیەکی کورت نەبێت، لەوانەشە ئەو پشت گوێ خرانەیان لە ئەنجامی ئەوەوە بووبێ، کە بەلایانەوە پێویست نەبووبێ، هەواڵە تایبەتەکانیان بنووسرێنەوە، هەروەها دەوڵەتەکەیان وەکو (ئیبنولئەثیر) دەڵێت: زۆر تەمەن درێژ نەبووە، بەڵکو



هەروەکو هەوری هاوینە وابووە، هەر لە نزیکەوە کاڵ بۆتەوەو نەماوە.. الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩١).

٧٤- تاریخ البیهقي، لاپەڕە (٣٤).

٧٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٨٥-٣٩١).

٧٦- تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٥١-٤٥٢)؛ فوئاد حەمە خورشید: الاکراد والغزو السلجوقي، رۆژنامەی (التآخي)، ١٩٧١ز، ژمارە(٧٢١)، لاپەڕە (٢).

٧٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٥)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ کاویان پور: تاریخ عمومی آذربیجان، لاپەڕە (١٠٠)؛
Ency of Islam, Vol, P 1138.

٧٨- الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٥)؛ مائی: الاکراد فی بهدینان، لاپەڕە (١٠٥).

٧٩- الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٥).

٨٠- (ئیبنولئەثیر): الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦)؛ تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ یوسف: الدوله الدوستکیه، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (٢١٣-٢١٤).

٨١- ئەو شارانە دەکەونە جەزیرەی فوراتی، (عەبدولرەقیب یوسف)یش ئاماژە بەناوە نوێکانی ئەو شارانە لەکاتی ئێستادا دەکات، بۆ وێنە شاری (بازبدی)، ئێستاکە (بازفتی) پێدەگوترێت، شاری (حەسەنی)ش ئێستاکە (زاخۆ)و شاری (فیشابور) ئێستاکە بە (فیشخابور) (بیش-خابور) دەناسرێت.. الدولة الدوستكية، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢١٣).

٨٢- تکریتي: الامارة المروانية، لاپەڕە (١٢٧).

٨٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦).

٨٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٦٨)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ صائغ: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٣٨).

٨٥- فێنک: قەڵایەکی سەربازی لە دووری دوو فەرسەخ، نزیکەی دوانزە کیلۆمەترە لە (جەزیرەی ئیبنوعومەر)، هی کوردە بەشنەوییەکانە.. قەزوینی: آثار البلاد، لاپەڕە (٤٣١).

٨٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦).

٨٧- نەصیبین: لە شارەکانی هەرێمی جەزیرەیە، دەکەوێتە نێوان (دیجلە)و (فورات)، بە شورا سەربازییەکەیەوەی دەناسرێتەوە.. حەمیدی: الروض المعطار، ساغکردنەوەی: ئیحسان عەباس،

(بەیروت،١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٥٧٧).

٨٨- خابور: ناوچەیەکی سەر بە (موصل)ە، لە ڕۆژهەڵاتی (دیجلە)..
یاقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (٣٣٥).

٨٩- تکریتی: الاماره المروانیه، لاپەڕە (١٢٨)؛ مزەفەر زەنگەنە: دودمان ئاریانی (کردو کردستان)، لاپەڕە (١٠٤).

٩٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٩)؛ وەکو تێبینی دەکرێت، (ئیبنو خەلدون) ئاماژە بۆ دەقی ئەو نامەیە دەکات، کە (تەغرول بەگ) بۆ (نەصرولدەولە)ی نووسیوە، بەڵام بەشێوازێکی دیکە، کە تیایدا دەڵێت: (ئەم غەزانە لە خزمەتمان دابوون لە دەوروبەرەکانی خوراسان، بەڵام سنورەکانی گوێڕایەڵییان بەزاندولە خۆبایی بوون، بۆیە هەر دەبێت سزایەکیان بۆ دابەزێنرێت)..
تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٢).

٩١- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٩)؛ تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٢)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٥١).

٩٢- تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (١٦١).

٩٣- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٩).

٩٤- مستەفا: دخول الغز الى الشام، لاپەڕە (٣٢٠).

٩٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٧)؛ کەسرەوی: شهریاران گمنام، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٨)؛ سەعید دیوەچی: تاریخ الموصل، (موصل،١٩٨٢ز)، لاپەڕە (١٧٣)؛ Ency of Islam, Vol 6, P1139.

٩٦- (سن) شارۆچکەیەکی لەسەر دیجلەو، لە سەرووی تکریتە.. ئەبو لفیداء: تقویم البلدان، لاپەڕە (٢٨٩).

٩٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩٠).

٩٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، جەواد: جاوان، لاپەڕە (١٩).

٩٩- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩٠).

١٠٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨٩).

١٠١- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩٠)؛ صائغ: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٤٠).



١٠٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩٠).

١٠٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٩١)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢١٥).

١٠٤- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩١)؛ دیوەچی: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٦٢).

١٠٥- مستەفا: دخول الغز الى الشام، لاپەڕە (٣٢٠)؛ ئان لمبتن: تداوم وتحول در تاریخ میانه ایران (بە فارسی)، وەرگێڕانی: یەعقوب ئاژند، (تەهران، ١٣٧٢ک)، لاپەڕە (١٣).

١٠٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩٠)؛ تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١)؛ دخول الغز الى الشام، لاپەڕە (٣٢٠).

١٠٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩١).

١٠٨- مینۆرسکی: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی (ئورمییە)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٢).

١٠٩- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٣٨٥-٣٩١).

١١٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩١)؛ مستەفا: دخول الغز الى الشام، لاپەڕە (٣٢٠).

١١١- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٩١).

١١٢- لامبتۆن: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی(ئیلات)، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٣٢٢).

١١٣- مستەفا: دخول الغز الى الشام، لاپەڕە (٣٢١).

١١٤- لامبتۆن: مادەی ئیلات، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٣٢٢).

١١٥- ژمارەیەک لە لێکۆڵەرەوان باسیان لە مێژووی سەلجوقییەکان کردووە، لەوانە: (تامار ئار ئایس): السلاجقه تاریخهم وحضارتهم؛ ئەحمەد کەمالوددین حلمی: السلاجقة في التاريخ والحضارة، (کوێت، ١٩٧٥ز) عەبدولنەعیم محەمەد حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، (قاهیرة، ١٩٧٠ز)؛ حوسێن ئەمین: تاريخ العراق في العصر السلجوقي، (بەغداد، ١٩٦٥ز).

١١٦- فارقی: تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (١٥٤)؛ تستر شتین: دائره المعارف الاسلامیه، (مادەی بووەیە)، بەشی چوارەم، لاپەڕەکانی (٣٥٦-٣٥٧).

١١٧- الاثار الباقیه من القرون الخالیه، (١٩٢٣ز)، لاپەڕە (١٣٢).

١١٨- صبح الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤١٦).

١١٩- سەعيد عەبدولفەتاح عاشور: تاريخ العلاقات بين الشرق والغرب في العصور الوسطى، (بەيروت، ١٩٧٦ز)، لاپەڕە (٣٤)؛ راغب حامد عەبدوڵلا: الحروب الصليبيه، نامەيەكی ماجستێری بڵاونەكراوەيە، (زانكۆی موصل، ١٩٨٣ز)، لاپەڕەكانی (٥٠-٥١).

١٢٠- حوسەينی: زبده التواريخ، لاپەڕەكانی (٢٣-٢٤)؛ بارتۆلد: تاريخ الترك في آسيا الوسطى، لاپەڕە (١٠٠)؛ Ency of Islam or IIV, P 208.

١٢١- راحه الصدور، (وەرگێڕدراوە عەرەبييەكەی)، (قاهيره، ١٩٦٠ز)، لاپەڕە (٤٥).

١٢٢- سلاجقه ايران والعراق، لاپەڕە (١٦).

١٢٣- ئيبنوخەلەكان: وفيات الاعيان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٦٤)؛ صەفەدی: الوافي بالوفيات، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٠٢).

١٢٤- السلاجقه، لاپەڕەكانی (١٢١-١٢٢).

١٢٥- دائره المعارف الاسلاميه، مادەی (ئەرسەلانی كوڕی سەلجوق)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٩٦).

١٢٦- فوئاد حەمە خورشيد: الاكراد والغزو السلجوقي، لاپەڕە (٢).

١٢٧- هارونی كوڕی ئيلك خان يەكێكبووە لە پاشاكانی تورك، لە وڵاتی ئەوديو زێ.. ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕە (٤٧٤).

١٢٨- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕە (٤٧٤)؛ بارتۆلد: تركستان، لاپەڕە (١٤٥).

١٢٩- جوند: يەكێكە لە شارەكانی وڵاتی ئەوديو زێ، دەكەوێتە نزيك رووباری (سيحون)، نێوان ئەو شارەو، نێوان (خەوارزم) لە كۆندا، دە رۆژە رێ بووە.. ياقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨٦)؛ ئەبولفيداء: تقويم البلدان، لاپەڕە (٤٨٩).

١٣٠- گەرديزی: زين الأخبار، لاپەڕە (٣٧٦)؛ مريزن سەعيد: الحياة العلمية في العراق في العصر السلجوقي، (مەككەی پيرۆز، ١٩٨٧ز)، لاپەڕە (٨٧).

١٣١- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٤٧).

١٣٢- زبده التواريخ، لاپەڕە (٢٣).

١٣٣- حەسەنێن: سلاجقه ايران والعراق، لاپەڕە (٤٥).

١٣٤- حوسەينی: زبده التواريخ، لاپەڕە (٢٤)؛ ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕە (٤٧٤)؛ ئيبنو طەبا طەبا: الفخري في الاداب السلطانية، (قاهيرة، ١٩٦٢ز)، لاپەڕە (٢٣٤)؛ هارت: دائره المعارف الاسلاميه، مادەی (السلاجقة)، بەشی دوانزەيەم، لاپەڕە (٤٥).



١٣٥- حلمی: السلاجقه فی التاريخ والحضاره، لاپەڕە (٢١).

١٣٦- گەرديزی: زين الاخبار، لاپەڕەكانی (٤١٥-٤١٦)؛ ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕە (٤٧٤).

١٣٧- جورجی زێدان: تاريخ التمدن الاسلامی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤٧١).

١٣٨- راوندی: راحه الصدور، لاپەڕەكانی (١٤٥-١٤٦)؛ يەزدی: العراضه فی الحكايه السلجوقيه، وەرگێڕانی: عەبدولنەعيم محەمەد حەسەنێن و، حوسێن ئەمين، (بەغداد، ١٩٧٩ز)، لاپەڕە (٢٠)، تاريخ بخاری، لاپەڕە (١٢٨).

١٣٩- حوسەينی: زبده التواريخ، لاپەڕە (٢٥)؛ حەسەن حەمەد مەحمودو، ئەحمەد ئيبراهيمی شەريف: العالم الاسلامی فی العصر العباسی، (قاهيره، ١٩٤٩ز)، لاپەڕە (٣٢)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، (بەيروت، ١٩٨٠ز)، لاپەڕە (٧).

١٤٠- رساله ابن فضلان، لاپەڕە (١٢٢)؛ سەمەرقەندی: چهارمقاله (چوار وتارەكان)، وەرگێڕانی: عەبدولوەهاب عەزام و يەحيا خەشاب، (قاهيره، ١٩٤٩ز)، لاپەڕە (٣٢)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، (بەيروت، ١٩٨٠ز)، لاپەڕە (٧).

١٤١- جەغری بەگی كوڕی ميكائيلی سەلجوقی، بە (داود)يش دەناسرێت، لە سەرۆكەكانی هۆزە سەلجوقيەكان بووە، لەگەڵ (تەغرول)ی برايدا رۆڵێكی گرنگی بينی، لە دامەزراندنی دەوڵەتەكەيان لە (خوراسان)، لەنێو كورەكانيشيدا (ئەلب ئەرسەلان) دەركەوت(٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٣-١٠٧٢ز)، كە بەگرنگترين سوڵتانەكانی دەوڵەتی سەلجوقی دەژمێردرێت.. بەڵام هەرچی زاراوەی (جەغری)يە، (فاصبری) لەبارەيەوەی دەڵێت: وشەيەكی توركييە، بەواتای (بريسكەدار)يان (خۆهەڵواسێنەر) دێت.. تاريخ بخاری، لاپەڕە (١٢٩).

١٤٢- تەغرول بەگ: ناوێكی لێكدراوە لە (تەغرول)، كە ئەمە ناوی باڵدارێكی ناسراوە لەلای توركان، لەگەڵ (بەگ) كە بەواتای (مير) دێت.. ئيبنو خەلەكان: وفيات الاعيان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٦٨)؛ Fisher: The Middle East history, P 94.

١٤٣- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕە (٣٧٧).

١٤٤- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی نۆيەم، لاپەڕەكانی (٤٧٨-٤٧٩)؛ بەنداری: تاريخ دوله آل سلجوق، لاپەڕە (٨).

١٤٥- عەباس ئيقبال: الوزاره فی عهد السلاجقه، وەرگێڕانی: ئەحمەد كەمالوددين حلمی، (كوەيت،

١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٣٢).

١٤٦- تاريخ البيهقي، لاپەڕە (٣٥)و ئەوانەی دوای.

١٤٧- میر خوتد: تاریخ روضه الصفا (بەفارسی)، (تەهران، ١٣٣٩ک،ھ)، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٧).

١٤٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٤٧٩).

١٤٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ حەسەن ئیبراهیم حەسەن: تاریخ الاسلام، (بەیروت، ١٩٦٥ز)، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٥).

١٥٠- تاريخ البيهقي: هەردوو لاپەڕەکانی (٥٩٠-٥٩٣)؛ حوسەینی: زبده التواریخ، لاپەڕە (٤١).

١٥١- دندانقان: شارۆچکەیەکە دەکەوێتە دووری (دە) فەرسەخ، نزیکەی شەست کیلۆمەتر لە (مرو شاهجان).. یاقوت، معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (٤٧٧).

١٥٢- تاريخ البيهقي: لاپەڕە (٦٤٩)و بەدواوەی؛ راوندی: راحه الصدور، هەردوو لاپەڕەکانی (١٦٢-١٦٧)؛ یەزدی: العراضە فی الحکایە السلجوقیە، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٤-٣٦)؛ مۆریس کرۆزیە: تاریخ الحضارات العام، وەرگێڕانی: یوسف ئەسعەد داغر، (بەیروت، ١٩٦٦ز)، بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٣٧٧-٣٧٨)؛

Fisher: The M iddle East History, P. 94.

١٥٣- تاريخ البيهقي، لاپەڕە (٦٩٤).

١٥٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ فیلیب حەتی: تاریخ العرب (درێژ)، (بەیروت، ١٩٦١ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٦٩).

١٥٥- ستانلی لین پۆل: الدول الاسلامیە، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: محەمەد صوبحی فرزالت، (دیمەشق، ١٩٧٣ز)، پاری یەکەم، لاپەڕە (٣١٩)؛ خودبەخش: الحضارە الاسلامیە، لاپەڕە (٦٧)؛ فازل مەهدی بەیات: علاقه السلاجقه بالخلافه العباسیه، گۆڤاری (اداب المستنصریه)، ژمارەی نۆیەم، ساڵی (١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٢٥٧).

١٥٦- ئیقبال: الوزاره فی عهد السلاجقه، لاپەڕە (٣٢).

١٥٧- جورجان: هەرێمێکە کەوتۆتە نێوان (تەبرستان) و (خوراسان).. بەکری: معجم ما استعجم، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٧٥)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١١٩).

١٥٨- طەبرستان: هەرێمێکی فراوانی زۆرینە شاخاوییە، دەکەوێتە نێوان دەریای (خەزەر) و وڵاتی



(دەیلەم) و (جیل).. یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٣).

١٥٩- خەوارزم: هەرێمێکی لە تەک (خوراسان)ە، شارۆچکەکەی پێی دەگوترێت (جورجانییە).. یاقوت: معجم البلدان، بەشی دووەم، لاپەڕە (٣٩٥)؛ لسترنج: بلدان الخلافه الشرقیه، لاپەڕە (٤٨٩).

١٦٠- ئیبنولعومرانی: الانباء فی تاریخ الخلفاء، ساغکردنەوەی: سامی سامەڕائی، (لایدن، ١٩٧٣ز)، لاپەڕە (١٨٨).

١٦١- بەنداری: تاریخ دوله آل سلجوق، لاپەڕەکانی (٨-٩).

١٦٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٢)؛ سەبطی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، بەشی تایبەت بە مێژووی سەلجوقییەکان (٤٤٨-٤٨٠ک)، (عەلی سوێم) پێیداچۆتەوەو بڵاویکردۆتەوە، (قاهیرە، ١٩٦٨ز)، لاپەڕە (٢).

١٦٣- بەیات: علاقه السلاجقه بالخلافه العباسیه، لاپەڕەکانی (٢٥٨-٢٥٩).

١٦٤- راوندی: راحه الصدور، لاپەڕە (١٦٨)-(١٦٩)؛ حەمدوڵلا مستەوفی قەزوینی: تاریخ گزیده (بە فارسی)، (لەندەن، ١٩١٠ز)، لاپەڕە (٣٥٤)؛ بەیات: علاقه السلاجقه بالخلافه العباسیه، لاپەڕەکانی (٢٥٨-٢٥٩).

١٦٥- نەیسابوری: سلجوقنامە (تەهران، ١٣٣٢ ک،ھ)، لاپەڕە (١٨)؛ راوندی: راحە الصدور، لاپەڕە (١٦٧)؛ بەنداری: تاریخ دوله آل سلجوق، لاپەڕە (١٠)؛ مستەوفی قەزوینی: تاریخ گزیده، لاپەڕە (٤٣٧)؛

The cambridge history of Iran, Vol 5, P 22.

١٦٦- حەسەنێن: سلاجقه ایران والعراق، لاپەڕە (٢١).

١٦٧- ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٥٩).

١٦٨- ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی دوانزەم، لاپەڕەکانی (٥٠-٥١).

١٦٩-ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٢)؛ ئیبنوکەثیر: البدایه والنهایه، بەشی دوانزەم، لاپەڕەکانی (٥٠-٥١).

١٧٠- بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی سیستمی فەرمانڕەوایی تایبەت بە میرنشینە کوردییەکانی پێشوو، بڕوانە: نەقشبەندی: الکرد فی الدینور، هەردوو لاپەڕەکانی (١٩٦-٢٥٠)؛ آذربیجان، هەردوو لاپەڕەکانی (١٥٠-١٦٣)؛ رەسول: الشدادیون فی بلاد آران، هەردوو لاپەڕەکانی (٩٨-١٠٨)؛

تکریتی: الاماره المروانیه، لاپەڕە (٣٦)و بەدواوەی.

١٧١- بۆ درێژەی زانیارییەکانی لەبارەی ململانێی میرە عەننازییەکان لەسەر دەسەڵات، بڕوانە: ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣١)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕەکانی (٤٠-٤١).

١٧٢- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١١٤)؛ یەزدی: العراضە فی الحکایە السلجوقیە، لاپەڕە (٣٨)؛ ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٥٤).

١٧٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٠٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ یەزدی: العراضە فی الحکایە السلجوقیە، لاپەڕە (٣٨)؛ الوزارە فی عهد السلاجقە، لاپەڕە (٣٣)؛ Ency of I slam, Vol 6, P 1139.

١٧٤- الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٠٧).

١٧٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٢٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٥٤).

١٧٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکوردیە، لاپەڕە (١٢٩).

١٧٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨)؛ بەنداری: تاریخ دولە آل سلجوق، لاپەڕە (١٠).

١٧٨- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٨)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨)؛ بەنداری: تاریخ دولە آل سلجوق، لاپەڕە (١٠).

١٧٩- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٨)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ بەنداری: تاریخ دولە آل سلجوق، لاپەڕە (١٠).

١٨٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨).

١٨١- سیروان: یەکێکە لە شارە کۆنەکانی هەرێمی چیاکان، دەکەوێتە نزیک شاری (ماسبذان) لە ئەوپەری باشوری ڕۆژئاوای هەرێمەکەو هەر ئەم شارە سەنتەری هەرێمەکەش بوو، لەماوە زەمەنیەکەی ئەم لێکۆڵینەوەیەش کرابووە قەڵایەکی پارێزراو بە قوڵغەو شورای سەربازی.. یەعقوبی: البلدان، لاپەڕە (٢٤٩)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٦٩).

١٨٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٩)؛ ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی



دوانزەهەم، لاپەڕە (٥٤)؛ نەقشەبەندی: الکرد فی الدینور، لاپەڕەکانی (٢٢٢-٢٢٣).

١٨٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٩)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨).

١٨٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٩)؛ ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٥٤).

١٨٥- جۆنز: دائرە المعارف الاسلامیە، مادەی (حەلوان، بەشی پانزەهەم، لاپەڕە (٣٨٣).

١٨٦- المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٨).

١٨٧- لە بارەی هەڵوێستی میرە رووادی و شەدادی و مەروانییەکان، لە لاپەڕەکانی دواتری ئەم بەشەدا، بەدرێژی دەدوێین، بڕوانە لاپەڕەکانی (٨٨-٩٤)ی دەقە عەرەبییەکە.

١٨٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٠)؛ نەقشەبەندی: الکرد فی الدینور، لاپەڕە (٢٢٥)؛ موکریانی: ئاوڕێکی پاشەوە، لاپەڕەکانی (٢٤-٢٥).

١٨٩- لە بارەی ململانێی نێوان هەردوو میر، (ئەبولشەوک) و (موهەلهیل)ی برای، بگەڕێوە بۆ: الکرد فی الدینور وشهرزور، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٢١-٢٢٥).

١٩٠- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ الشرفنامە، لاپەڕە (٤٠)؛ Ency of Islam, Vol 6, P 1139.

١٩١- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٣٠)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٢)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕەکانی (٤٠-٤١).

١٩٢- الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٣).

١٩٣- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (١٣٠-١٣١)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٥٣٣-٥٣٤)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕە (٤١).

١٩٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٧)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٤٦).

١٩٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٥٤٦)؛ ئیبنوکەثیر: البدایە والنهایە، بەشی دوانزەم، لاپەڕە (٥٨).

١٩٦- ئەبخازەكان: نەتەوەیەكی نەصرانین، لەگەڵ (قەرەچ) و (لان)و بێجگەی ئەوانیش لە چیاكانی (قەوقاز) دەژیان، وڵاتەكەشیان، بە وڵاتی ئەبخازەكان دەناسرا، .. ئوصطەخری، مسالک الممالک، لاپەڕە (١٩١)؛ لسترنج: بلدان الخلافه الشرقیه، لاپەڕە (٢١٦)؛ ئێستاكەش وڵاتی ئەبخازەكان كۆمارێكی سەربەخۆی خودییە، بەشێک لە كۆماری جۆرجیای شورەوی جاران پێكدێنێت.. نەقشەبەندی:آذربیجان، لاپەڕە (١٤٢)، پەراوێزی ژمارە(١).

١٩٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕ(٥٤٦)؛ بەسام عەلی: فن الحرب الاسلامی فی العصر العباسی، (بەیروت، ١٩٨٨ز، لاپەڕە (٣٤٢)؛

Studies in Caucasian history, P 44.

١٩٨- زبده التواریخ، لاپەڕەكانی (٥٦-٥٧)؛ هەروەها بڕوانە: ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (٥٤٦-٥٤٧) لە بارەی هەمان گێڕانەوە.

١٩٩- حوسەینی: زبده التواریخ، لاپەڕە (٥٧)، پەراوێزی ژمارە (٢).

200- Studies in Caucasian history, P 44.

201- Ibid, P 44.

٢٠٢- حوسەینی: لاپەڕەكانی (٥٦-٥٧).

203- Studies in Caucasian history, P 45.

٢٠٤- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ رایس: السلاجقه، لاپەڕە (٢٧)؛ حلمی: السلاجقه، لاپەڕەكانی (٢٧-٢٨).

٢٠٥- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦).

٢٠٦- قەڵای (سەرماج) لەلایەن میر حەسنەوەیهی بەرزیكانی بیناكراو، كردییە پایتەختێک بۆ میرنشینەكەی؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢١٥)؛ سەبارەت بە شوێنەكەشی لە كاتی ئێستادا، (لسترنج) دەڵێت: تائێستا شوێنەكەی نەزانراوە، بەڵام لەوانەیە لە نزیک دینەوەر بووبێت.. بلدان الخلافه الشرقیه، لاپەڕە (٢٢٤).

٢٠٧- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦).

٢٠٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٠٩- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٠)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ ئیبنوكەثیر: البدایه والنهایه، بەشی



دوانزەهەم، لاپەڕە (٦٥)؛ عەسلی: فن الحرب الاسلامی، لاپەڕە (٣٤٢).

٢١٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (٥٩٨-٥٩٩)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ فن الحرب الاسلامی، لاپەڕە (٣٤٢).

٢١١- دائره المعارف الاسلامیه، مادەی (ئارزن)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٧٦).

٢١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢١٣- ئەرزنی رۆم: شارۆچكەیەكی ناسراوی ئەرمینیایە، دانیشتوانەكەی ئەرمەنن، لەبەر ناوی (ئەرزن)ی بنجی، بەوناوە ناونراوە، كە ئەرزنە بنجییەكە دەكەوێتە نێوان (سەعەرت) و (میافارقین).. یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەكەم، لاپەڕە (١٥٠)؛ المشترک وضعا، لاپەڕە (١٩)؛ هەروەها ئەم شارۆچكەیە ئێستاكە بە شاری (ئەرزرۆم)، دەناسرێت.. شترک: مادەی (ئەرزن)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٧٦).

٢١٤- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)؛ هەروەها بڕوانە: ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ ئیبنوكەثیر: البدایه والنهایه، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٦٥).

٢١٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)؛ ئیبنول كازرۆنی: مختصر التأریخ، ساغكردنەوەی: مستەفا جەواد، (بەغداد، ١٩٧٠ز)، لاپەڕە (٢٠٤-٢٠٥)؛ ئیبنوكەثیر: البدایه والنهایه، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٦٥)؛ حلمی: السلاجقه، لاپەڕە (٢٨)؛

Lapidus: A history of Islamic Socaties, (New Yourk, 1988), p.144.

٢١٦- ئیبنولئەثیر ئاماژە بۆ ئەوە دەكات، كە سوڵتان (تەغرول بەگ) نامەیەكی بۆ (نەصرولدەولە) نارد، لەبارەی گوێڕایەڵییەكەی لە بۆیان، ئەمەش لە چوارچێوەی ڕووداوەكانی ساڵی (٤٤١ک/١٠٤٩ز)دا، ئەمە دەڵێت.. كەچی لەچوارچێوەی ڕووداوەكانی، ساڵی(٤٣٩ک/١٠٤٧ز)دا دەڵێت: (ئەبا كەلبیجار)ی میری بووەیهی بەرەو (دیاربەكر) هات بۆ دەركردنی سەلجوقییەكانی شوێنكەوتەی سوڵتان (تەغرول بەگ)، ئیتر ژمارەیەكی لێ كوشتن و ژمارەیەكی تری لێ بەدیل گرتن، جا كاتێک سوڵتان بەمەی زانی، دەستی كرد بە هەڕەشە كردن لەو میرە بووەیهییە بەشەڕكردن لەگەڵی، ئەمەش لە تۆڵەی ئەوەی ئەو لەگەڵ پیاوەكانیدا كردوویەتی.. بەڵام وەكو دەردەكەوێت، ئەم دوو گێڕانەوانە، كەمێک لەگەڵ یەكتردا دژ دەوەستن، چونكە ئەگەر دووەم ڕاست بێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، كە میرنشینەكە شوێنكەوتەیی خۆی بۆ سەلجوقیەكان بەر لە ساڵی (٤٤١ک) ڕاگەیاند بێ، چونكە مەسەلەیەكی ئاسایی و ڕوونە، ئەگەر ئەو میرنشینە كوردییە رازی نەبووبێ، سوڵتان (تەغرول بەگ) نەیتوانیوە هێزەكانی بۆ ئەو ناوچانە بنێرێت، بەڵام ئێمە

زیاتر بەلای رای یەکەم دادەشکێنین، واتە میرنشینەکە بەر لە ساڵی (٤٤١ک/١٠٤٩ز)دا گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان راگەیاندووە؛.. بڕوانە: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٤٢)- (رووداوەکانی ساڵی ٤٣٩ک)و لاپەڕە (٥٥٦) (رووداوەکانی ساڵی ٤٤١ک).

٢١٧- یوسف: الدوله الدوستکیه، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢١٩).

٢١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٠).

٢١٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕە (٣٢)؛ سوهێل زەکار: فی التاریخ العباسی والاندلسی السیاسی والحضاری، (دیمەشق، ١٩٩٢ز)، لاپەڕە (١٧٤).

٢٢٠- یوسف: الدوله الدوستکیه، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٢٠).

٢٢١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٢٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ تکریتی: الاماره المروانیه، لاپەڕەکانی (١٢٩-١٣٠)؛ یوسف: الدوله الدوستکیه، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٢١).

٢٢٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٧).

٢٢٤- حضاره الدوله الدوستکیه، (بەغداد، ١٩٧٥ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٧١).

٢٢٥- سیره المؤید فی الدین، لاپەڕە (١٣٧)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦).

٢٢٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦).

٢٢٧- حضاره الدوله الدوستکیه، بەشی دووەم، لاپەڕە (٧٢).

٢٢٨- یوسف: حضاره الدوله الدوستکیه، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٧٢).

٢٢٩- سیره المؤید فی الدین، لاپەڕە (١٣٧).

٢٣٠- (موئەیەد) لە سیرەکەی خۆیدا جەختی لەسەر ئەوەکردۆتەوە، کە (نەصرولدەولە) ڕێگەی داوە بە دەسەڵاتی سەلجوقی بێنە ناو وڵاتەکەی، بەڵام دواتر لەم بڕیارەی پەشیمان دەبێتەوە، ئەمەش چونکە بۆی دەردەکەوێت، ئەوان چاوی چڵێسیان بڕیوەتە میرنشینەکەی و دەیانەوێت لێی داگیربکەن، هەندێ لەم راستیانەش لە نامە گۆڕدراوەکانی نێوان (نەصرولدەولە)و گەورە بانگخوازی فاطمییەکان لەماوەی بزوتنەوەی (بەساسیری)، بەرجەستە دەبن.. درێژەی ئەمە لە بەشی دووەمدا دەخەینە بەرباس.. بڕوانە: سیره المؤید فی الدین، لاپەڕە (١٣٧).

٢٣١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ ئیبنولوەردی: تتمە المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٤٣)؛ کاویان پور: تاریخ عمومی



آذربیجان، لاپەڕە (١٠٠)؛ دائره المعارف الاسلامیه الکبری، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٢٠)؛ نەقشەبەندی: ئازەربێجان، لاپەڕە (١٧٠).

٢٣٢- تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٤)؛ تاریخ عمومی آذربیجان، لاپەڕە (١٠٠).

٢٣٣- آذربیجان، لاپەڕەکانی (١٦٩-١٧٠).

٢٣٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١١٤)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥١٣)؛ ئیبنوکەثیر: البدایه والنهایه، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٥٠).

٢٣٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ ئیبنو وەردی: تتمە المختصر: بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٤٣)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ ئیقبال: الوزاره فی عهد السلاجقه، لاپەڕە (٣٣).

٢٣٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر: بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥).. ئەم سەرچاوە ناوبراوانە ناوی ئەو منداڵە ناهێنن، کە سوڵتان (تەغرول بەگ) وەکو بارمتە (رهینه) بردییە لای خۆی، بەڵام (نەقشەبەندی) لەو بڕوایە دایە، کە ئەو کوڕە (ئەبولهیجائی منوجهەر) بووبێ، چونکە (وەهسوذان)ی باوکی ئەوی لەناو کوڕەکانی دیکەی هەڵبژارد، بۆئەوەی وەکو بارمتەیەک لەلای سەلجوقیەکان بمێنێتەوە، چونکە وەکو شاعیر (قەترانی تەبریزی) دەیڵێت: ئەو (منوجهەر)ە، چەند ساڵێک لە ئازەربێجان ون دەبێت.. ، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەوباسە، بڕوانە: آذربیجان، لاپەڕە (١٧٤).

٢٣٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥).

٢٣٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ زوبێر بیلال ئیسماعیل، اکراد روسیا القیصریه والاتحاد السوفیتی، ماضیهم وحاضرهم، گۆڤاری (القافله)، (هەولێر، ١٩٩٣ز)، ژمارە(٢)، لاپەڕە (٢٤٢)؛

Minorsky: A history of Shrvan and Darband, P 74-75.

٢٣٩- رەسول: الشدادیون فی بلاد آران، لاپەڕە (٦٥).

٢٤٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی دووەم

## هەڵوێستی کورد لە ڕووداوەکانی سەرەتای چەرخی سەلجوقی و، کارگێڕییەتی سەلجوقی، لە وڵاتی کورد، دوای سۆز نواندنی میرنشینەکان

**یەکەم: هەڵوێستی کورد لە ڕووداوەکانی سەرەتای چەرخی سەلجوقی:**

أ- هەڵوێستی کورد لە هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان، لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز).

ب- هەڵوێستی کورد لە بزووتنەوەی بەساسیری و ململانێی فاتمی- عەباسی (سەلجوقی)(٤٧٧-٤٥١ک/ ١٠٥٥- ١٠٥٩ز).

ج- کورد و بزووتنەوە یاخیبووەکەی (ئیبراهیم یەناڵ).

**دووەم: سیستمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی سەلجوقی لە وڵاتی کورد، دوای سۆز نواندنی میرنشینەکان.**

**یەکەم: هەڵوێستی کورد لە ڕووداوەکانی سەرەتای چەرخی سەلجوقی:**

پێویستی زانستی ئەم لێکۆڵینەوەیە، وا دەخوازێ، ئەگەر بە شێوەیەکی کورتیش بێت، بەڵام ئاماژە بە هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان بکەین، ئەمەش لەبەر گرنگی ئەم ڕووداوە، سەبارەت بە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لە نێویشیاندا هەرێمەکانی وڵاتی کورد، چونکە کاتێک پایتەختی خەلافەت دەکەوێتە دەست سەلجوقییەکان و، خەلیفە دان بە دەسەڵاتیان دادەنێت بەسەر ئەو هەرێمانەی کەوتوونەتە ژێر دەستیان، ئەم دوو خاڵە کاریگەری گەورە دەکەنە سەر پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان کورد و سەلجوقییەکان.

هەروەها داننانی خەلیفەی عەباسی بە دەسەڵاتیان، کوردی بەرەو ئەوە پاڵنا، زیاتر لە دەسەڵاتدارێتی سەلجوقی نزیک ببنەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەوا موسڵمانن، ئەمەش لە پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەردوولا، لە دواییدا دەبینین.. وەکو زانراوە، کورد ڕێزی تایبەتییان بۆ خەلیفەی عەباسی هەبوو، چونکە بە سەرۆکی ڕوحی موسلمانان دادەنرا، لەبەر ئەوە، داننانی خەلیفە بە دەسەڵاتی سەلجوقی بووە هۆکارێکی هاندەر و گەورە بۆ کورد، بۆ ئەوەی ئەوانیش دان بەو دەسەڵاتەدا بنێن، ئەمە بێجگە لەوە کە سوڵتان(تەغرول بەگ) پێش هاتنە نێو بەغدایش، گوێڕایەڵی هەندێ لە میرەکانی وەدەست خستبوو[1].. بەڵام ئەو گوێڕایەڵییە وەکو دەرکەوت سەرەتا لە ترسی هێزی سەلجوقییەکان بوو، بەڵام دوای هاتنە نێو بەغدایان هەڵوێست گۆڕا، چونکە شەرعییەتیان لە خەلیفەوە وەرگرت.

ئامانج لە گێڕانەوەی هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان، ئەو ڕووداوە ترسناکانەن، کە



دوای ئەوە، جیهانی ئیسلامی بەخۆیەوەی بینی، بە تایبەتیش دروستبوونی بزووتنەوەی (بەساسیری) و، یاخیبوونی (ئیبراهیم یەناڵ) و، ڕۆلی کورد لەو دوو بزاڤانە.. چونکە یەکەمیان، واتە بزووتنەوەی (بەساسیری) ئامانجی ڕووخاندن و گۆڕینی سیستەمی فەرمانڕەوایی عەباسی سوننی بوو، بە سیستەمێکی فاتمی شیعی، وەکو چۆن لە هەمان کاتیشدا، کاری دەکرد لەسەر لێدانی دەسەڵاتی سەلجوقی لە عیراق.. بەڵام بزووتنەوەکەی دووەم، بە واتە یاخیبوونەکەی (ئیبراهیم یەناڵ) ئاراستەکرابوو لە دژی فەرمانڕەوایی سوڵتان(تەغرول بەگ)، کوردیش بەو پێیەی یەک لە ڕەگەزەکانی دانیشتوانی نێو دەوڵەتی عەباسی بوو، ڕۆڵێکی زەقی لە هەردوو بزووتنەوەکان بینی و بە تایبەت هەندێ لە ڕووداوەکانیان، هەر لە هەرێمە کوردییەکان ڕوویاندا.

**أ- هەڵوێستی کورد لە هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان ساڵی(٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز):**

دوای ژێر ڕکێف کەوتنی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و لە نێویشیان هەرێمە کوردییەکانی نزیک (بەغدا)ی پایتەختی خەلافەتی عەباسی-وایلێهات ڕێگە لەبەردەم سەلجوقییەکان واڵا بوو، بۆ هاتنە ناو (بەغدا)، ئەمەش بە تایبەت لەو کاتەی کە زۆربەی دەوڵەت و میرنشینە ناوخۆییەکانی ئەو کاتە- بە کوردو بێجگەی کوردانیش- لە هەرێمەکانی چیاکان و ئازەربێجان و ئەرمینیا و جەزیرەی فوراتی، هاتبوونە گوێڕایەڵی کردن بۆ سەلجوقییەکان و، سۆز و پشتگیرییان لە بۆ نواندبوون.

سوڵتان(تەغرول بەگ)یش ئارەزووی ئەوەی دەکرد، خەلیفەی عەباسی دان بە دەسەڵاتە سیاسی و عەسکەرییەکەیدا بێنێت، لەسەر هەموو ئەو هەرێمانەی باڵی بەسەردا کێشاون، ئەمەش بۆ ئەوەی شەرعیەت بۆ دەسەڵاتەکەی وەدەست بخات، چونکە (خەلیفە) پێشەوای ڕۆحی جیهانی ئیسلامییە و هێمای حوکمی شەرعییە.. بۆیەلە نووسراوێکی ڕەسمی لە بۆ خەلیفە(قائیم بی ئەمریڵلا)(٤٢٢- ٤٦٧ک/ ١٠٣٠- ١٠٧٤ز) سۆز و گوێڕایەڵی خۆی بۆ ئەو خەلیفە سوننییە دەربڕی[2].. کاتێکیش ئەم نامەیەی (تەغرول بەگ) گەیشتە بەغدا، خەلیفە پێی دڵخۆشبوو و بە شێوەیەکی باش قەبووڵی کرد، بە شێوەیەکی ناسکیش وەڵامی دایەوەو نێردراوێکی خۆیشی بۆ سوڵتان ڕەوان کردە (ڕەی)[3].

لە ڕاستیشدا هیچ ڕێگەیەکی دیکە لە پێش خەلیفەدا نەبوو، بێجگە لە ڕەزامەندی نواندنی، چونکە خەلافەت بە قەیرانێکی سیاسی ناخۆشدا تێدەپەڕی، لە بەغدایشدا

کەژێکی دوو دڵی و نیگەرانی باڵی کێشا، دەسەڵاتی بووەیهییەکان بە هۆی ململانێی نێوان میر و فەرماندە سەربازییەکان و ناکۆکی نێوان پیاوانی دەوڵەت کەوتە لاوازی، هەروەها ناکۆکی کەوتبووە نێوان تورک و دەیلەمەکانیش کە ئەمانە گرنگترین دوو رەگەزی نێوان سوپای بووەیهی بوون، جگە لەوەی یاخیبوونی (بەساسیری)ش دەستی پێکردبوو[٤]، جا لە بەرامبەر ئەم بارەدا، خەلیفە (قائیم بی ئەمریلّلا) ناچار بوو، دەعوەتی هاتنە بەغدا بۆ سوڵتان(تەغرول بەگ) بنێریت[٥]... ئەمەش بۆ ئەوەی رزگاری بکات، لە دەست پاشماوەی دەسەڵاتدارانی بووەیهی، ئەوانەی دەستەوەستان بوون لەوەی کۆتایی بەهۆکارەکانی بێ یاسایی و نائارامیی بێنن[٦]، ئینجا لەولاشەوە ئەو بارە بە رۆڵی خۆی هاندەر بوو بۆ هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان، کە ئەمەش لە مانگی رەمەزانی ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) بە ئەنجام گەیشت، ئیتر هۆزە تورکمانییەکان بە فەرماندەیی سوڵتان(تەغرول بەگ) لەسەر دەروازەکانی (بەغدا)دا وەستان[٧].

رای مێژوونووسان لە بارەی ژمارەی ئەو هێزە سەلجوقییانەی بەرەو پایتەختی خەلافەت هاتن لێک جیایە، (ئیبنولعومرانی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ژمارەی ئەوانەی لەگەڵ سوڵتان(تەغرول بەگ) بوون لە کاتی هاتنە نێو بەغدای پەنجا هەزار سوار بوون[٨]، بەڵام لەولاوە (ئیبنولعەدیم) دەڵێت: ژمارەکە سەدو بیست هەزار سوار بوون[٩]، مێژوونووسانی دیکەش بەوەندە واز دێنن، کە دەڵێن: ژمارەی سەربازەکانی زۆر بوون[١٠]، جا وەکو لەو رایانەی سەروو دەردەکەوێت، ئەوا ژمارەی ئەو تورکانەی هاتوونەتە نێو بەغدا، کەم نەبوونە.

ئەوەی سەرنجیش رابکێشێت، ئەو هێزانە رێگەی چیاکانیان گرتە بەر، هەندێکیان چوونە نێو شارە کوردییەکانی هەرێمەکە، چونکە لە مانگی (موحەررەم)ی ئەو ساڵە سوڵتان خۆی و هێزەکانی گەیشتنە شاری (هەمەدان)[١١]، (راوندی) شتێکی زۆر گرنگ لە بارەی ئەو دیدارە دەگێڕێتەوە، کە لە نێوان سوڵتانی سەلجوقی و شاعیری ناسراوی کورد(بابا تاهیری هەمەدانی)[١٢] لەو شارەدا دروستبوو، چونکە ئەوەی لە نێوان ئەم دوو کەسانەدا گوترابوو، گرنگ بوو، بۆیە(راوندی) دەقی قسەکانی نێوان سوڵتان و شاعیرمان بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (بابا تاهیر) بە (تەغرول بەگ)ی گوت: (ئەی تورکییەکە.. دەتەوێت چی بکەیت، بە خەڵکی خودا)؟[١٣] سوڵتان وەڵامی دایەوە: (ئەوەی تۆ



فەرمانم پێ دەکەیت)، (بابا تاهیر) پێی گوت: (کار بەو فەرمانەی خودا بکە، کە فەرمووی – ان الله یامر بالعدل والاحسان– بە واتەی– خودا فەرمان بە دادگری و چاکەکاری دەکات)[١٤]، بەمە سوڵتان گریا و ، گوتی: (ئەوە دەکەم).. لێرەشدا (باباتاهیر) ئەنگوستیلەیەکی لە پەنجەی خۆی دەرهێنا و خستیە پەنجەی (سوڵتان) و موژدەی ئەوەی پێدا کە ئیتر دەبێتە خاوەنی چاکە[١٥].

ئەم رووداوەی پێشوو، واتایەکی گەورەی هەیە، چونکە ئامۆژگارییەکانی (بابا تاهیر) بۆ (سوڵتان) زۆر ئاشکرابووە، داوای لێکردووە، بە دادگری لە نێوان میللەتدا هەڵسوکەوت بکات، چونکە لەو رێگەیەوە دەتوانێت دڵی خەڵکانی دیکەش بۆ خۆی رابکێشێت، وەکو دەریش دەکەوێت، (سوڵتان) بە ئامۆژگارییەکانی ئەو شاعیرە کوردە پابەند بووە، چونکە وەکو زۆربەی سەرچاوەکان شایەدی بۆ دەدەن، (تەغرول بەگ) سوڵتانێکی (باش و نەرمو نیان و زۆر خێرکەر بووە)[١٦]، جگە لەوەش، کە وەکو (ئیبنول حەسول) دەیگێڕێتەوە (موتتەقی و لە خودا ترسیش بووە)[١٧] هەروەها بە بەراورد لەگەڵ سوڵتانە سەلجوقییەکانی دیکە، لە هەمووان دادگر و نەرم ونیان و لێبووردەتر بووە، لەبەر ئەوە پەیوەندی نێوان خۆی و نێوان رەگەز و مرۆییەکانی دیکەش کە لە جیهانی ئیسلامیدا دەژیان و لە نێوانیشیاندا کورد، لە ماوەی دەسەڵاتدارییەکەیدا، پەیوەندییەکی سروشتی و باش بووە، چونکە هەمیشە هەوڵی ئەوەبوو، ئەوانە بۆ لای خۆی رابکێشێ.

سوڵتان(تەغرول بەگ) لەگەڵ هێزەکانی لە شاری (هەمەدان) هاتەدەرو بەرەو شارەکانی دیکەی هەرێمی (چیاکان)، (دینەوەر) و (قرمیسین) و (حەلوان) هات و سوپاکەی تیایاندا جێگیر کرد، بەو کارانە هەڵسا کە بۆ خشینی سوپاکەی بەرەو بەغدا پێویست بوون، سوپاکەی پرچەک کرد، ریزەکانی رێکخست، فەرمانیشی بە جێگر و ئیشکەرانی خۆی بەسەر شارە کوردییەکاندا کرد، قوت و ماڵ و یارمەتی پێویست بۆ سوپا ئامادە بکەن[١٨]، گومانی تیا نییە، کە دانیشتووانی ئەو شارە کوردییانە، ئەو ئەرکانەیان لە ئەستۆگرت، وەکو دەریش دەکەوێت، ژمارەیەک لە پیاوانی هۆزە کوردییەکانی دانیشتوانی هەرێمی (چیاکان) هاتبوونە نێو ریزەکانی سوپای سەلجوقی و بەشدارییان لە هێرشەکەی بۆ سەر بەغدا کردبوو، چونکە ئەو هێزەی بەرەو پایتەختی خەلافەت هات، چەند رەگەزێکی لێکجیای لە خۆ دەگرت، بریتیبوون لە تورک و عەجەم و

دەیلەم و کورد و چەند ڕەگەزێکی دیکەی بێجگەی ئەوانەش[١٩]، (ئیبنولعەدیم) لەم بارەیەوە دەڵێت: سەدو بیست هەزار (سەرباز)ی تورک و غەزو و عەجەم و کورد و دەیلەم و ڕەگەزی دیکەی بێجگەی ئەوانەش، بەرەو پایتەختی خەلافەت هاتن[٢٠].

هێزی سەلجوقییەکان لە ڕێگەی (حەلوان)ەوە هاتنە نێو زەوییەکانی عێراق ، بە واتە لە ڕێگەی (خوراسان)ەوە، ئەویش ئەو ڕێگەیەیە کە بازرگانەکان لە عێراقەوە بەرەو وڵاتی فارس و بە پێچەوانەوەش هەر لە کۆنترین چاخەوە، تا ئەمڕۆش پێیدا دێن و دەڕۆن، واش دەردەکەوێت، کە ئەو ڕێگەیەی گیرایە بەر بۆ داگیرکردنی ئێران، یان عیراق، ڕێگەیەکی ئاسان بوو بێت و بە شێوەیەکی خێرا خەڵکی گەیاندبێتە دڵی ئێران، یان دڵی عێراق[٢١].

سوڵتان(تەغرول بەگ) لە ڕەمەزانی ساڵی(٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) گەیشتە بەغداو[٢٢]، لەسەر مینبەرەکانی عێراقدا، خوتبەی بۆ خوێندرایەوە و نازناوی سوڵتان(ڕوکنولدەولە ئەبی تالب تەغرول بەگ محەمەدی کوڕی میکائیل) یان پێدا، بەمەش دەسەلاتی بووەیهی لە پایتەختی خەلافەت بەسەر چوو، بە تایبەتیش دوای ئەوەی دوا ئەمیریان گیرا، کە ئەویش (مەلیکی ڕەحیم) بوو، (٤٤٠-٤٤٧ک/ ١٠٤٨- ١٠٥٥ز) هەروەها بە قۆڵبەستکراوی بۆ قەڵای (سیروان)ی پارێزراو لە هەرێمی (چیاکان) گوێزرایەوە[٢٣].

هەرچی تایبەت بە هەڵوێستی کوردیشە سەبارەت بە هاتنە نێو بەغدای سەلجوقییەکان، ئەوا وەکو تێبینی دەکرێت، زانیارییە تۆمارکراوەکانی لەو بارەیە کەمن و پەرش و بڵاون، بەڵام دەکرێت بە وردبوونەوە لە درێژەی ڕووداوە مێژووییەکان، هەندێ دەرکێشراو (استنتاج)ی تایبەتیمان لە لا دروست بێت.. دەشێت هەڵوێستی کورد لەو مەلەسەیە باش بووبێت، لەم بارەیەوەش بەڵگەکان زۆرن، لە پێشینەی هەموویان بەشداریکردنی کوردە لە نێو ریزەکانی ئەو سوپا سەلجوقییەی کە بەرەو بەغدا هات، هەروەها دانیشتووانی هەرێمی چیاکان هەڵسان بە یارمەتیدانی سوپاکەی سەلجوقییان بە ئامادەکردنی قوت و خۆراک بۆ سوپاکە و وڵاغەکانیان، زیاد لەمانەش لە ماوەی باڵکێشانی سەلجوقییەکان بەسەر (بەغدا)دا، یەک لە کەسایەتییە سەربازییەکانی کورد، کە ئەویش (میر هەزار ئەسپی کوڕی بەنکسیری کوڕی عەیازی کوردی) بوو[٢٤] ڕۆڵێکی زۆر زەق و بەرچاوی بینی، لە نێوان ریزەکانی سوپای سەلجوقی.



**ب- هەڵوێستی کورد لە بزووتنەوەی بەساسیری و[٢٥] ململانێی فاتمی عەباسی(سەلجوقی)(٤٤٧- ٤٥١ک/ ١٠٥٥- ١٠٥٩ز):**

سەرچاوە مێژووییەکان لەسەر ئەوە کۆبوونەتەوە، کە هۆی سەرەکی داواکەی خەلیفە (قائیم بێ ئەمریڵڵا) بۆ سوڵتان(تەغرول بەگ) کە بێتە نێو بەغدا، بۆ ئەو بارە دەگەڕێتەوە کە لە پایتەختی خەلافەتدا دروست بووبوو، ئەمەش دوای مەسەلەی (بەساسیری)[٢٦]، ئیتر خەلیفە سوڵتانی سەلجوقیی بە ڕزگارکەری خەلافەت دەدیت، چونکە دەیتوانی سنوورێک بۆ مەترسییەکانی (بەساسیری) دابنێت و هەروەها هیواو ئاواتی فاتمییەکانیش زیندەبەچاڵ بکات، لێرەدا ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆ کردن بێت، دەسەلاتی ئەو فەرماندە تورکە لە عێراقدا زیادی کرد، بە تایبەتیش لەو کاتەی کە خەلیفە (قائیم)ی عەباسی کردی بە سەرۆکی تورکەکان، ئیتر هێندەی نەخایاند، تا وای لێهات خەلیفە هیچ بڕیارێکی بەبێ ئەو دەرنەدەکرد[٢٧].

بە ساسیری دەرکی بەو بارە لاوازییە کرد، کە لە سای بووەیهییەکاندا خەلافەتی عەباسی تیایدا دەژیا، ئیتر وردە وردە مەیلی بە لای فاتمییەکاندا هات، لە ساڵی(٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز)یش لەبەر هاتنی سوڵتان(تەغرول بەگ) بۆ بەغدا، ناچار بوو بەغدا جێبێڵێ، ئیتر دەستی کرد بە هەناردنی نامە بۆ خەلیفەی فاتمی(موستەنسیر بیللا)(٤٢٧-٤٨٦ک/ ١٠٣٥- ١٠٩٣ز) لە میسر و داوای یارمەتیی لێکرد، بۆ ئاسانکردنی مەسەلەی باڵکێشانی بەسەر پایتەختی خەلافەتی عەباسی و بۆ ڕووخاندنی خەلافەتە (سوننی)یەکەی، فاتمییەکانیش وەڵامیان دایەوە (هیبەتوڵڵا شیرازی)ی[٢٨] بانگخوازیان بۆ ڕەوانەی ناوچەکە کرد، تا ببێتە یارمەتیدەری ئەو سەرۆکە تورکە[٢٩]، کە لە ڕاستیدا ئەم یارمەتییەی فاتمییەکان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە بەهێزبوونی، چونکە بەهۆی کۆششەکانی (موئەییەد)، بزووتنەوەکە توانی مەیلی هەندێ لە میرە سەربەخۆکانی ناوچەکە و لە نێوانیشیان ژمارەیێک لە میرە کوردەکان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت.

(موئەییەد) لە پێناوی ڕاکێشانیان بەرەو بزووتنەوەکە[٣٠]، دەستی بە نامە گۆڕینەوە کرد، لەگەڵ (میر نەسرولدەولە ئەحمەدی کوڕی مەڕوانی کوردی) میری میرنشینی مەڕوانی لە (دیاربەکر) و لەگەڵ (ئەبیلفەتحی کوڕی ورامی جاوانی) میری جاوانییەکانی

کورد له (حلله)... (جاوانییەکان)- وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد- له هۆزه کوردییه ناسراوەکان بوون[٣١]، که له ماوەی سەدەی(پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی) له دەوروبەری نەهرەوان و حلله و سەر رووباری دیجله، واته باشووری رۆژهەلاتی بەغدا نیشتەجێ ببوون[٣٢]، هەروەها ئەم هۆزه هاوکاری و پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ (بەنی مەزید)ی خاوەنانی(حلله)و (فوراتی ناوەڕاست هەبوو، خزمایەتی سیاسیش له نێوان هەردوولا دروستببوو)[٣٣]، دوای دەرچوونی (بەساسیری)ش له (بەغدا)، بەرەو دەوروبەری (حلله) هات و توانی مەیلی میرەکانی(بەنی مەزید) بەلای خۆی رابکێشێت، بەو کارەشی سەرکەوت له دەستخستنی پشتگیرییەکانیان بۆ بانگەوازی فاتمی، ئیتر ئەوەبوو (دبیسی ئەسەدی) لەگەڵ هێزەکانی ئەودا بەشداریکرد، له(شەڕی سنجار)، له ساڵی(٤٤٨ك/ ١٠٥٦ز)[٣٤].

هەرچی میره کوردی جاوانی (میر ئەبولفەتحی کوڕی ورام)یشه، ئەویش به هەمان شێوه پشتگیری بزووتنەوەکەی (بەساسیری)ی کرد و هەر بەوەش وازی نەهێنا، بەڵکو هێزه جاوانییه کوردییەکانی وەکو یارمەتی بۆ بەشداریکردن له پاڵ هێزەکانی (بەساسیری) بۆ (شەڕی سنجار) رەوانکرد[٣٥]، وەکو دەریش دەکەوێت، بەشداری کورد لەو بزووتنەوەیه، هەر به تەنیا له چەند تاکێکی جاوانییەکان کورت نابێتەوە، بەڵکو مێژوونووس(سەبتی ئیبنولجۆزی) که باسی کردووە، زۆر لەوەی زیاتر گوتووەو وای دەربڕیوە که: کاروانی سوپای(بەساسیری)ی شەڕکەر له (سنجار) له کوردەکان پێکدەهات[٣٦].

دوای ئەوەی هەواڵی ئەو سەرکەوتنەی، که بزووتنەوەی ناوبراو له(سنجار)دا به دەستی هێنا (گەیشتەوە) به میسر، (موستەنسربیللا)ی خەلیفەی فاتمی، پۆشاکی میرینی تایبەتی بۆ میره بەشداربووەکانی وەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنه و له نێویشیان میری کورد(ئەبولفەتحی جاوانی) هەنارد[٣٧].

هەندێ له لێکۆڵەران، جەخت لەسەر ئەوه دەکەنەوە، که شێوازی ماڵ بەخشینه زۆرەکان، که سەرۆکی بزووتنەوەکه گرتبوویەبەر، رۆڵێکی گەورەی بینی له مەیل راکێشانی زۆران بۆ لای خۆی، چونکه پاره هەزارانی له دەیلەم وتورك و کوردی به دەوری (بەساسیری) کۆکردەوە، تا وایلێهات ئەو هێزه سەربازیەی کۆبوویەوە، به



گوتەی(عەزیمی)ی مێژوونووسی (حەلەب): گەیشته نزیکەی پەنجا هەزار[٣٨].

ئەم بانگخوازه فاتمییه له (سیره)کەی خۆیدا، ئاماژه به هەوڵه زۆرەکانی خۆی دەدات، له پێناو له بۆ خۆ راکێشانی سۆزی(نەسرولدەوله)ی مەڕوانی، که نامەی بۆ ناردووه و داوای لێکردووه، له ولاتەکەی خۆیدا، خوتبه به ناوی فاتمییەکانەوه بخوێندرێتەوه، ئەو میره کوردەش له نامەیەکی وەلامیدا، که بۆی هەناردووەتەوه، جەختی لەسەر ئەوه کردۆتەوه، که (یەک لەو میرانه بووه، وەلامی بانگەوازی تورکمانه تاغییەکانی داوەتەوه، ئەمەش بۆ پاراستنی خۆی و گونجان لەگەڵ وەختەکەی، چونکه گومانی وابووه، ئەوان لەو رەگەزه مرۆییانەن، که شتەپیرۆزەکانی بەهەند دەزانن و لەبەرچاو دەگرن، بەلام زەمەن ئەوەی بۆ دەرخست، که شەڕخوازو ستەمکارن و دەست درێژی دەکەنه سەر ماڵ و ژنان)[٣٩]... هەروەها جەخت لەسەر ئەوه دەکاتەوه، که (نەسرولدەوله) یەکەم میرێک بوو له ناوچەکەدا سۆز و گوێڕایەڵی بۆ سەلجوقییەکان پیشاندابێت و رێگەی دابێت دەسەلاتەکەیان بگاته نێو ولاتەکەی، بەلام دواتر که زانی ئەوان چاویان بڕیوەته داگیرکردنی ولاتەکەی، ئیتر پەشیمان بووەوه[٤٠].

بەلام لەگەڵ دەرک کردنی میر (نەسرولدەوله) به نیازه خراپەکانی سەلجوقییەکان بەرامبەر بەو میرشینه کوردییەی، هێشتا هەڵوێستی خۆی له بەرامبەر ململانێی (فاتمی- سەلجوقی)دا ئاشکرا نەکرد... بۆیه یەک له لێکۆڵەران بەمه وەسفی هەڵوێستی (نەسرولدەوله)ی مەڕوانی دەکات، که ئەو میره کورده سیاسەتێکی دانایانەی گرتەبەر، که بێ لایەن وەستاو نەیویست خۆی و میرنشینەکەشی بخاته نێو کێشه دەرەکییەکان و ئەو ململانێیه، بەمەش ببێته هۆیەک بۆ هێنانی کارەسات بەسەر گەل و ولاتەکەی[٤١].

بەلام میرنشینەکه رووبەڕووی واقیعێکی تاڵ بووەوه، که بریتی بوو له پاڵەپەستۆی فاتمییەکان لەسەری، بۆ ئەوەی بۆ لای خۆیانی راکێشن، ئیتر ئەوەبوو، داوایان لێدەکرد هەڵوێستێکی روون و ئاشکرای هەبێت، له ململانێکانیان لەگەڵ سەلجوقییەکان، جا له بەرامبەر ئەو پاڵەپەستۆیه بەردەوامه، (نەسرول دەوله)ی مەڕوانی سیاسەتی بێنەوبەردەو دانووستانی لەگەڵ دەوڵەتی فاتمی پەیڕەو کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی خەریکی بکات و له توندی پاڵەپەستۆکەی کەم بکاتەوه، هەتا ئەو کاتەی ململانێکەی بەسەرکەوتنی یەک له لایەنەکان تەواو دەبێت[٤٢].

شایانی باسە ئەم بانگخوازە فاتمییە، (واتە- موئەییەد-) لە (سیرە)کەی خۆیدا، هەڵوێستی (نەسرول دەولە)ی لە ململانێکان روونکردۆتەوە، هەروەها دەقی سێ نامەی تیا هێناوە، کە ئەوساکە بۆ ئەو میرە مەروانییەی هەناردووە[٤٣].. جا گوتەکەی (موئەییەد) ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە، کە (نەسرولدەولە) دوای ئەوەی هەستی بەوە کرد، کە سەلجوقییەکان چاویان بڕیوەتە وڵاتەکەی، لێیان پەست بوو، ئەگەر چیش یەکەم کەسی ناوچەکە بوو، کە سۆز و گوێڕایەڵی خۆی بۆ پێشان دابوون، کاتێکیش بینی ئەوا فاتمییەکان بەراستی بەرەنگاری سەلجوقییەکان دەبنەوە، ئارەزووی کرد، بێتە نێو بزووتنەوەکەیان، بەڵام لەسەر مەسەلەکە وەستا[٤٤].

وەکو روونە ئەو سیاسەتەی میر (نەسرولدەولە) لە بەرامبەر بزووتنەوەی (بەساسیری) و ئەو رووداوانەدا پیادەی کرد، کە لە نزیک وڵاتەکەیدا روویاندا، هەنگاوێکی لە ئەوپەڕی زیرەکی بووە، ئەوەتا لەگەڵ دەرککردنیشی بە نیازە شەڕانگێزییەکانی سەلجوقییەکان، بەڵام لە توانایدا نەبووە خۆی لە شەڕەکانیان رزگار بکات (بەوەی کەوا شەڕیان لە دژدا رابگەیەنێ)، ئەمەش بە هۆی مەترسییەکانی لە هێز و لە تۆڵەکردنەوەیان، هەروەها لەولاشەوە دڵنیا نەبووە لە سەرکەوتنی (بەساسیری) لە بزووتنەوەکەیدا، بۆیە لە کاتێکدا(ئەبی حەسەن کوڕی بشر)ی نوێنەری بۆ میسر هەناردو[٤٥]، درێژەی بە پەیوەندی دانووستانەکانی لەگەڵ دەوڵەتی فاتمی و بانگخوازەکەیان لە ناوچەکەدا، دا... لە هەمان کاتیشدا بە هیچ شێوەیەک پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی سەلجوقیدا نەبڕی، بەڵکو لەسەر مینبەرەکانی میرنشینەکەیدا خوتبە هەر بە ناوی سوڵتان(تەغرول بەگ) دەخوێنرایەوە، هەروەها لەوەش زیاتر وەکو (ئیبنولئەثیر) دەڵێت:

(رۆژانە ماڵ و سامانی بۆ دەناردن)[٤٦]، ئەمەشی بۆ خۆی کردە رێگەیەکی گەڕانەوە، لە بارێکدا ئەگەر سەلجوقییەکان سەرکەوتن[٤٧].

سوڵتان(تەغرول بەگ) بەوەی زانی بوو، کە (نەسرولدەولە) لەگەڵ (بەساسیری) و (فاتمی)یەکاندا شتێکی لە نێواندا هەیە و هاتوچۆیان لەگەڵدا دەکات، هەروەها لە شەڕی (سنجار)دا یارمەتی سەربازی بۆ هەناردوون، بۆیە هاتە سەر ئەو رایە هێرشێکی سەربازی بکاتە سەر، ئیتر هەر ئەوە بوو، کە لە نزیک موسڵ لە ساڵی(٤٤٨ک/ ١٠٥٦ز) شکستێکی گەورەی بەسەر (بەساسیری) و هاوپەیمانەکانیدا هێنا، ئیتر یەکسەر رووەو



باکوور، بەرەو وڵاتەکەی (نەسرولدەولەی مەروانی) هات، بۆ ئەوەی سنوورێک بۆ پەیوەندییەکانی لەگەڵ فاتمییەکان، سۆز و گوێڕایەڵیەتەکەی لە بۆیان دابنێت[٤٨]، یان وەکو (موئەییەد) گوتەنی: (بۆ ئەوەی کوشینێک کوڕی مەڕوان بکوشێت، بەهۆیەوەی چی رۆنییەتی لێی بگرێت)[٤٩].

هێزەکانی (سوڵتان) گەمارۆی شاری(جەزیرەی ئیبنو عومەر)یاندا، ئیتر (نەسرولدەولە) هیچ رێگە چارەیەکی دیکەی لە پێشدا نەمایەوە، ئەوە نەبێت، بە بارەکە رازی بێت، بە تایبەتیش دوای ئەوەی چارەنووسی بزووتنەوەی (بەساسیری)ی بینی، کە لە دوای شکستەکە چی بەسەر هات، بۆیە بە خێرایی بۆخۆپاراستن و خۆ دوورخستنەوە لە شەڕی (سوڵتان) و بچووککردنەوەی رقەکەی لێی[٥٠] ماڵ و سامانی بە دیاری بۆ رەوانکرد، لە هەمان کاتیشدا لەولاوە بە نهێنی نامەی بۆ بانگخوازی فاتمی(موئەییەد فی دین) نووسی و داوای یارمەتیی لێکرد، بەو رستەیەی کە نووسیبووی: (بەر لەوەی لە بەریەک هەڵوەشێتەوە پێم بگەن و لەو تەنگانەییەم رزگار بکەن)[٥١]، جا (موئەییەد) وەکو پاداشتدانەوەیەکی چاکەکانی، بەرەو (رقە) هات، بانگکردنی گشتی بە نێو میر و سەربازەکاندا بڵاوکردەوەو دەستە و کۆمەڵی زۆر بە دەوری بانگەکەیدا کۆبوونەوە، را لەسەر ئەوە جەم بوو، کە (بەساسیری) لەگەڵ (تورکەکان و عەرەبەکان و کوردەکان)ی[٥٢] سوپاکەی جووڵە بکات و لە رووباری (فورات) بپەڕێتەوە، هەروەها هەموو لەسەر ئەوە رێککەوتن، کە لە شوێنێکی زانراودا کۆببنەوە، ئەمەش وەکو ئامادەباشییەک بۆ بە فریاچوونی (نەسرولدەولە) کاتێکیش هەنگاوە پێویستەکان تەواو بە ئەنجام گەیەندران، (موئەییەد) پەیوەندی بە (نەسرولدەولە) کرد و هەواڵی ئەوەی پێگەیاند، کە چ هێزێکی گەورەی کۆکردۆتەوە، بۆ ئەوەی بێنە پشتیوانی، بەڵام بەر لە گەیشتنی ئەو پشتیوانییەی (موئەییەد) بە (نەسرولدەولە)، ئەو (میرە مەروانی)یە بڕوای بە سوڵتانی سەلجوقی هێنا، کە واز لە هێرشکردنی بۆ سەر زەوییەکانی میرنشینەکەیدا بێنێ، ئیتر ئەوە بوو (سوڵتان) گەمارۆی سەر شاری (جەزیرەی ئیبنوعومەر)ی هەڵگرت و جێیهێشت[٥٣]، کە لەم بارەیەوە (سەبتی ئیبنولجەوزی) دەڵێت: (دوای کۆشش و ماندووبوونێکی زۆر، کوڕی مەڕوان ئاشتەوایی لەگەڵ سوڵتاندا لەسەر سەد هەزار دینار داکرد)[٥٤].

بێنە و بەردەی (نەسرولدەولە) لەگەڵ بانگخوازی فاتمی ناوبراو و قسەی خۆشی لەگەڵ سەلجوقییەکان، لە راستیدا لە بڕوایەکی تەواوی، یان لە ئارەزووی سیاسیی سەرچاوەی

نەگرتبوو، هەروەها لە دایکبوونی خۆشەویستی بۆ خەلیفەی فاتمی، یان سوڵتانی سەلجوقیش نەبوو، بەڵکو ئەم کارانەی لە دایکبووی بارێکی سیاسی لە ناکاو دروستبووبوو، بارە سیاسییە ناجێگیرە بەرجەستە بووەکەی لە ئەنجامی باڵکێشانی شیعە فاتمییەکان و لەگەڵ داگیرکاری سەربازی سەلجوقی و توندبوونی ململانێی نێوانیان لەسەر زەوییەکانی عێراق و جەزیرە، بەسەریدا سەپاندبوو، بۆیە ئەو هەڵوێستە دوو سەرەی (نەسرولدەولە)، دەکرێت بەوە راڤە بکرێت، کە هەوڵێکی خۆی بووە، بۆ هێنانە دی جۆرە یەکخستنێک لە نێوان داوا زۆرەکانی فاتمییەکان و پاڵەپەستۆیە بەردەوامەکانی سەلجوقییەکان[٥٥].

بانگخوزای فاتمی(موئەییەد) لە نامەکەیدا بە تێروتەسەلی ئاماژە بۆ ئەم رووداوانەی دوایی دەکات و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە (خۆی و بەساسیری) کاتێک زانیویانە ناکۆکییەکانی نێوان ئەو میرە کوردە و سوڵتان بە کۆتا هاتووە، ئیتر ئەوان کشاونەتەوە[٥٦]، بەڵام سوپای سەلجوقی گەندەڵییان لە ناوچەکەدا کرد، چوونە نێو هەندێ شاری جەزیرەو، تاڵانیان کردن[٥٧]، ئینجا پاش ئەوەی سوڵتان موسڵ و ناوچەکانی دەوروبەری بە (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای بەخشی و بارەکەش لە هەرێمی (جەزیرە) بەرەو هێمنی هاتبۆوە، لە ساڵی (٤٤٩ک/ ١٠٥٧ز) خۆی بەرەو(بەغدا) هاتەوە، لەوێش بە بەرچاوگرتنی ئەو کۆششە گەورەیەی سوڵتان (تەغرول بەگ) بۆ پاراستنی خەلافەت و بەرپەرچدانەوەی(بەساسیری)، خەلیفە(قائیم) نازناوی (پاشای رۆژهەڵات و رۆژئاوا)ی، بە سوڵتانی ناوبراو بەخشی[٥٨]، لەگەڵ باری ئەو ئارامییە سیاسییەش، کە هەموو ناوچەکانی خەلافەتی عەباسی، بە شێوەیەکی کاتی بە خۆیەوەیان بینی، بەڵام هێندەی نەخایاند سوڵتان رووبەرووی مەترسییەکی دیکە هاتەوە، کە ئەویش خۆی لە یاخیبوونی (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای دەنواند.

دەتوانین بڵێین: هەڵوێستی کورد لە بزووتنەوەی (بەساسیری) هەڵوێستێکی لێکجیابوو، هەندێکیان پشتگیری خەلیفەی عەباسییان کرد، لە کاتێکدا هەندێکی تریان لاگیری سەرۆکی ئەو بزووتنەوەیان کرد، گومانیشی تیا نییە ئەم دوو دڵییە لە هەڵوێستی کورد لە ئەنجامی ئەو فشارەبوو، کە لە لایەن سەرجەم هێزە سیاسییەکانی نێو جیهانی ئیسلامی دەخرایە سەری.



## ج- کورد و بزووتنەوە یاخیبووەکەی (ئیبراهیم یەناڵ):

لەگەڵ ئەوەشدا کە (تەغرول بەگ) توانی کۆتایی بە توندترین دوژمنی دەوڵەتەکەی بێنێت، کە ئەویش (بەساسیری) بوو و هەروەها خەلافەتی عەباسیش دانی پێدانا، بەڵام ماوەیەکی زۆر بەسەر هاتنە نێو بەغدایدا تێنەپەڕی، کاتێک رووبەڕووی بزووتنەوەیەکی یاخیبووی توند بووەوە، کە ئەویش (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای سەرکردایەتی دەکرد لە ساڵی(٤٥٠ک١٠٥٨/ز)[٥٩].

هەندێ کەس ریشەی ناکۆکییەکانی نێوان ئەو دوو برایە، بۆ ماوەی فراوانبوونە سەلجوقییەکان لە هەرێمی (چیاکان) دەگەڕێننەوە، ئەو رۆژانە(یەناڵ) سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا، لە چەسپاندنی دەسەڵاتەکەی بەسەر هەرێمی ناوبراو، زیاد لە مانەش، دیسانەوە لە هێرشەکانی بەرەو(ئەرمینیا)ش کە هەر سەرکەوتنی بە دەست هێنا[٦٠].

وەکو دەریش دەکەوێت، (ئیبراهیم یەناڵ) بەو سەرکەوتنە سەربازییانەی، وای کرد گومان لە لای سوڵتانی برای لەسەر خۆی دروست بکات، بۆیە سوڵتان لەوە ترسا (یەناڵ) لێی جیا ببێتەوە و ئەو ناوچانەی داگیریکردوون، بە تەنیا خۆی فەرمانڕەواییان تێدا بکات، کە زیاد لەمانەش (ئیبراهیم یەناڵ) پیاوێکی عەسکەری بوو و لەم رووەوە لە هەردوو براکانی(تەغرول بەگ) و (جەغری بەگ)یش بە تواناتر بوو، لەبەر ئەوانە سوڵتان داوای لە (یەناڵ) کرد، کە هەموو ئەو شار و قەڵایانەی پێبدات، کە لە هەرێمی (چیاکان)دا لە ژێر دەسەڵاتی تایبەتی ئەودا کەوتوون[٦١]، سەرەنجامیش دوای چەندین بەیەکدادانی نێوانیان(یەناڵ) ناچاربوو لە ترسی ژیانی خۆی، لەبەردەم داوا زۆرەکانی براکەی ملکەچی بکات[٦٢].

(یەناڵ) درێژەی بە یاخیبوونەکەی لە دژی براکەیدا، ئەوەبوو دوای سەرکەوتنی سوڵتان(تەغرول بەگ) لە لابردنی مەترسی (بەساسیری) لە ساڵی(٤٤٨ک/ ١٠٩٦ز) لە هەرێمەکانی (موسڵ)و (جەزیرە)، دوای ئەوەش کە فەرمانڕەوایی (موسڵ)ی بە (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای بەخشی، بڕیاری کشانەوە لە (موسڵ)ی دا[٦٣]، بەڵام ئەم چاکەیەی (تەغرول بەگ) لەگەڵ براکەی، تاڵییەکانی پێشتری لە زەینی(یەناڵ)دا نەسڕیەوە، بۆیە لە ساڵی (٤٥٠ک/ ١٠٥٨ز) بەرەو هەرێمی (چیاکان) هات، کە ئەو

هەرێمەش مولکی خۆی بوو، بەڵام سوڵتان ئەم هەڵسوکەوتەی براکەی، بە راگەیاندنی یاخیبوون ژمارد، بۆیە هەوڵیدا بەر لەوەی کار لە کار بترازێ، دەست بەسەر کاروبارەکاندا بگرێتەوە، بۆیە نامەیەکی بۆ نارد، تێیدا داوای لێکرد بگەڕێتەوە(بەغدا)، بەمەش (یەناڵ) لە هەڵوێستەکەی پاشگەز بوویەوە و جارێکی تر گەڕێندرایەوە پایتەختی خەلافەت[٦٤].

(بەساسیری) هەلی چۆڵیەتی (موسڵ)ی لە فەرمانڕەواکەی قۆزتەوەو لەگەڵ سوپاکەی بەرەو ئەو شارە هات و ئابلوقەیدا[٦٥]، کە ئەمە چوار مانگی خایاند، لە سایەیدا خەڵکی شارەکە باری زۆر خراپیان بە خۆوە بینی، ئەمەش پاڵی بە یەک لە میرە کوردە هەزبانییەکانەوە نا، کە ئەویش میر (ئیبنو مەوسەک)ی خاوەنی (ئەربل) بوو، بۆ ئەوەی دەست بخاتە نێو مەسەلەکە، ئیتر هات داوای لە میر عەقیلی (قورەیش کوڕی بەدران)ی هاوکار لەگەڵ (بەساسیری) کرد، بەزەیی بە خەڵکی ئەو شارەدا بێتەوە و کۆتایی بە گەمارۆکەی سەری بێنێت، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەم هەوڵەی میرە کوردی ناوبراو، بەرداربووە، چونکە (بەساسیری) و (قورەیش) لەسەر داواکەی، رازی دەبن ئاسایش بە دانیشتوانی (موسڵ) بدەن[٦٦].

هەواڵی ئەم گەمارۆیە گەیشتە گوێکانی سوڵتانی سەلجوقی لە (بەغدا)، بۆیە بڕیاریدا لەگەڵ هێزەکانی بێتە دەر، کاتێکیش(سوڵتان) لەگەڵ هێزەکانی بۆ شەڕکردن لە دژی (بەساسیری)، بەرەو(موسڵ) بە رێکەوتن، (یەناڵ) لێی جیابۆویە و بەرەو لانەی خۆی لە هەرێمی (چیاکان) گەڕایەوە[٦٧].

(یەناڵ) حەزەکانی زۆربوون، دەیویست هەرێمە کوردییەکان بکاتە مولکی خۆی، لە براکەی جیا ببێتەوە، سەربەخۆیی هەرێمی (چیاکان) رابگەینێ و (هەمەدان) بکاتە پایتەختی خۆی، بۆ ئەمانەش باری شڵەژاوی ئاسایشی دەوڵەتی سەلجوقی بەهەلزانی، کە لە ئەنجامی مەترسی(بەساسیری) و گەشەی دەسەڵاتی (فاتمی) لە هەرێمەکانی دەوڵەتی عەباسی دروستبووبوو.

بەڵکو زیاد لە مانەش هەوڵیدا یارمەتی و کۆمەکی لە (بەساسیری) دەستبکەوێت، بۆ شەڕی دوژمنە هاوبەشەکەیان[٦٨].

(موئەییەد فی دین) پەردە لە رووی نهێنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو کەسە



یاخییە هەڵدەماڵێت و دەڵێت: (یەناڵ نوێنەرێکی نارده لای (بەساسیری)، بۆ داوای یارمەتی سەربازی و پشتگیری کردنی، لە بەرامبەریشدا لە بۆی، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە لە بارێکدا گەر بزووتنەوەکەی سەرکەوت و بە ئامانجەکانی گەیشت، ئەوا خوتبە بۆ خەلیفەی فاتمی دەخوێنێتەوە)[٦٩].

ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەبێت لە بزووتنەوەی (ئیبراهیم یەناڵ)، ئەوەیە کە لە هەرێمی (چیاکان)و هەندێ لە شارەکانی هەرێمە کوردییەکانی دیکەدا دروستبوو، ئەوەی سەرنجیش رابکێشێت مەترسی سوڵتان(تەغرول بەگ)ە، لەوەی کەوا بزووتنەوەکە فراوان بێ و کار لە کاربترازێت، بە تایبەتیش لەبەر ئەوەی (هەمەدان) و، شارەکانی دیکەی (چیاکان) بە سەختی و قایمی جیا دەکرێنەوە، چونکە لە ناوچەیەکی شاخاوی دان، بۆیە زەحمەتە سوپا بە ئاسانی پێیان بگات، جا ئەگەر (یەناڵ) توانی بەسەریاندا زاڵ بێت، ئەوا ئەوسا زەحمەت دەبێت زەفەری پێ ببرێ و لە ناو ببرێت.

(سەبتی ئیبنولجۆزی) دەڵێت: سوڵتان بۆ شەڕی براکەی، بە خێرایی بەرەو هەرێمی (چیاکان) هات، زۆر بە لێبراوی هەوڵیدا بەر لە (یەناڵ)ی برای بگاتە (هەمەدان)، چونکە گەوهەرەکانی تورکمان و خەزێنەکانی سوڵتان و ماڵ و چەکەکانی هەمووی لەوێدا پارێزرابوون[٧٠]، بۆیە ترسا(یەناڵ) دەستیان بەسەردا بگرێت، بە کارەکیش (تەغرول بەگ) بەر لە براکەی گەیشتە شاری ئاماژە بۆ کراو و:(شەڕی خەڵکەکەی کرد)[٧١].

(ئیبنولعومرانی) کۆچکردو لە (٥٨٠ک/ ١١٨٤ز) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: هەواڵ گەیشتە (یەناڵ) کە (خاتوون)ی ژنی سوڵتانی سەلجوقی و (عەمید و مەلیک کەندری) وەزیری سوڵتان[٧٢] لە رێگادان بەرەو (هەمەدان)، بۆ ئەوەی یارمەتی سەربازی بگەیننە(تەغرول بەگ)، بۆیە (ئیبراهیم یەناڵ) بە خێرایی هەندێ لە هێزەکانی نارده سەر رێیان، بۆ ئەوەی رێگایان لێبگرن، لەوەی کەوا بە سوڵتان بگەن، لەو کاتەشدا باری سوپایی (ئیبراهیم یەناڵ) لاواز بوو، چونکە هەندێ لە هێزەکانی لێی جیابوونەوەو، کۆمەڵەکەی بچووک ببووەوە[٧٣]، لەبەر ئەوە(تەغرول بەگ) هەلەکەی قۆزتەوە و لەگەڵ سوپاکەی و بە یاوەری کۆمەڵێک لە لاوانی (هەمەدان)[٧٤] هێرشی هێنایە سەر براکەی... جا دەشێت قسەی ئەو مێژوونووسە، ئاماژە بێت، بۆ بەشداری هەندێ لە کوردانی خەڵکی (هەمەدان) لە پاڵ (سوڵتان)دا لە شەڕەکەی.

ئەم مێژوونووسە درێژە بە باسەکەی دەدات و دەڵێت: سولتان هێرشی هێنایە سەر براکەی و، شەڕێکی گەورە لە نێوانیان روویدا، (یەناڵ) تێیدا شکاو[٧٥] ناچار بوو دەوروبەری (هەمەدان) بەجێ بهێڵێت، ئەمەش هەمووی بە نەخشەی بەڕێز (ئەبی هاشم عەلەوی) دەکرا، چونکە ناوبراو، یەک لە کەسایەتییە ناودارەکانی(هەمەدان) بوو، هاوکارییەکی زۆری سولتانی کرد لە شەڕەکەیدا لەگەڵ (یەناڵ)ی برای، بۆیە لە دواییدا (تەغرول بەگ)یش پاداشتی دایەوە و لە بەرامبەر ئەو چاکانەی سەرۆکایەتیکردنی شارەکەی بە ناوبراو بەخشی[٧٦].

ئەوەی تایبەت بێت بە هەڵوێستی باشی خەڵکی (هەمەدان)، لە بەرامبەر سولتان(تەغرول بەگ)دا، لە راستیدا بە پلەیێک، ئەم هەڵوێستە باشەیان لە دەرەنجامی سیفەتە باشەکانی سولتاندا لەلا دروستبووبوو، کە پیاوێک بوو، بە دادگەری و لە خوا ترسی و رەوشتی باشی ناسرابوو، هەروەها کوردەکان لە سەردەمی ئەو سولتانەدا پەیوەندی باش و چاکیان لەگەڵ سەلجوقییەکاندا هەبوو، بەم هۆیەوە زۆربەی میرنشینە کوردییەکان سۆز و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سولتانی ناوبراو دەربڕیبووە، هەروەها سولتان (تەغرول بەگ) پەیڕەوی دەسەڵاتی ناوەندیی نەکردبوو لە فەرمانڕەواییدا، بۆیە هەوڵی نەدەدا میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان بڕوخێنێت، لەبەر ئەوە هەندێ لە کوردانی (هەمەدان) لەگەڵیدا وەستان، بەمەش سولتان(تەغرول بەگ) سەرکەوت لە دامرکاندنەوەی یاخیبوونی براکەی، ئەوە بوو گرتی و ئینجا فەرمانی دەرکرد بە کوشتنی[٧٧]، ئیتر لەسەر دابی تورکان، هەر بە تیرەی کەوانەکەی خۆی خنکێندرا[٧٨].

لەو کاتەدا سولتان خەریکی دامرکاندنەوەی یاخیبوونی براکەی بوو، لە هەرێمی (چیاکان)، (بەساسیری) بارەکەی قۆزتەوە و، هێرشی کردە سەر (بەغدا)، خەلیفە(قائیم بی ئەمرڵلا)ی گرت و بۆ (مەهارشی عەقیلی)[٧٩]، میری (عانە)ی رەوانکرد[٨٠]، بەمەش (بەغدا) کەوتە دەست ئەو سەرۆکە تورکە و تیایدا خوتبەی بۆ فاتمییەکان خوێندەوە[٨١].

دوای دەرچوونی (قائیم بی ئەمرڵلا) لە بەغدا خێزانەکەی و (ئەبولعەباسی محەممەد کوڕی قائیم)ی کوڕیشی، ئەوانیش ناچاربوون، (بەغدا)یان جێهێڵاو بەرەو (میافارقین)ی پایتەختی میرنشینی مەڕوانی کوردی- هاتن، وەکو دەریش دەکەوێت،



خێزانی خەلیفە لە بێجگەی ولاتی مەروانییەکان، شوێنێکی دیکەی بە ئاسایشی نەدۆزییەوە، لەم بڕیار وەرگرتنەشی راستی پێکا، ئەوەبوو میر(نەسرولدەولە ئەحمەدی کوڕی مەڕوان)(٤٠١-٤٥٣ک/ ١٠١٠- ١٠٦١ز) لە شار هاتەدەر بۆ پێشوازییان و لە شاری (ئامەد) لە کۆشکێکی تایبەت نیشتەجێی کردن و، هەموو ئەو خزمەتگوزارییانەی بۆ دابینکردن، کە پێویستیان بوو[٨٢]، ئیتر تا کۆتایی و نەمانی مەترسی (بەساسیری) لەوپەڕی ئارامی و ئاسایشدا، لە میوانداری ئەو میرە کوردەدا مانەوە، ئەم کارەی (نەسرولدەولە)ش سەبارەت بە کوردان شتێکی سەیر نەبوو، چونکە زۆر جاری دیکە لێقەوماوان هانایان وەبەر ولاتی(مەڕوانی)یان هێنابوو و تێیدا دوور لە مەترسییەکانی سەریان ژیابوون، ئەوەتا بە ئاماژەیەکی مێژوونووس (ئیبنول فوتی)، جەختمان بۆ لەسەر ئەوە دەکرێتەوە، کە لەو بارەیەدا دەڵێت: (دیاربەکر لانەی لێقەومانی پاشایان بوو)[٨٣].

هەرچی خەلیفە (قائیم)یش بوو، لە میوانداری میری عەقیلی مایەوە، کە ناوبراو زۆر لە مانەوەی خەلیفە بە سەلامەتی دڵنیانەبوو، بۆیە پێشنیاری بۆ کرد، بەرەو ولاتی میر (بەدری کوڕی موهەلهیل) بڕوات[٨٤]، بە واتە: بەرەو زەوییەکانی میرنشینی عەننازی کوردی بچێت، چونکە ئەوێ لەبۆی زۆر لە شاری(عانە) بە ئاسایش ترە.. ئەم گێڕانەوەیەش واتایەکی قوڵ لە ناواخنیدا هەڵدەگرێت، کە ئەویش ئەوەیە: ولاتی کورد ببووە لانەی لێقەوماوان، چونکە ولاتێکی قایم و سەخت بوو، بەڵام خەلیفە لەبەر ئەوەی زۆر لە خۆی دەترسا لەوەی کەوا (بەساسیری) شتێکی بەسەربێنێت، بۆیە ئەوەی هەڵبژارد کە هەر لە شوێنی خۆی، واتە لە (عانە) بمێنێتەوە لەو قۆناغەدا و، بەوەندە وازیهێنا، کە نامەی بۆ سولتانی سەلجوقی هەنارد و، داوای لێکرد خەلافەت رزگار بکات[٨٥].

نامەکەی(قائیم) گەیشتە دەست(ئەیتکینی سلێمانی)، (شەحنە)ی بەغدای نیشتەجێی (حەلوان)، چونکە ئەویش بە هەمان شێوە لە بەغدا هەلاتبوو، ئەویش گەیاندییە سولتان... سولتان(تەغرول بەگ)یش بە پەلە بەرەو بەغداد هاتەوە، بۆ ئەوەی خەلیفە بگەڕێنێتەوە سەرتەختی خۆی... هاتنەکەی (تەغرول بەگ) لەگەڵ هێزەکانی لە ڕێگەی (حەلوان)ەوە بوو و، پێشینەی سەربازەکانی گەیشتنە شاری (قەسر شیرین)، ئەو سەربازانەش کە لەگەڵ سولتان بوون هەروەکو (راوندی) دەیگێڕتەوە: (زەوی لە ژێر قاچیاندا دەلەرزی و چیاکان لەبەر زۆرییان دەشلەژان)[٨٦].

سوڵتان لەگەڵ سوپاکەی گەیشتنە نێو زەوییەکانی(بەغدا) و، (بەساسیری) لە ترسی ئەوەی مەبادا تۆڵەی لێ بسێنێتەوە، ئەو شارەی جێهێشت و بەرەو (کوفە) رایکرد، کە ئەوەش روویدا، ئینجا خەلیفە لەگەڵ (مەهارشی عەقیلی)، لە ساڵی (٤٥١ک/١٠٥٩ز)دا بڕیاری هاتنەوە بەرەو (بەغدا)یان دا[٨٧].

بەڵام خەلیفە (قائیم) دوای گەڕانەوەی لە (عانە) راستەوخۆ نەهاتەوە نێو (بەغدا)، بەڵکو بەرەو شارەکانی هەرێمی(چیاکان) هات، بۆ ئەوەی لە سوڵتانی سەلجوقی نزیک بێتەوە، ئەوە بوو گەیشتە وڵاتی میر(بەدر کوڕی موهەلهیل کوڕی ئەبی شەوکی کوردی)، کە میری ناوبراو زۆر بە هاتنی خەلیفە بۆ وڵاتەکەی دڵخۆش بوو و، هاتە دەر بۆ پێشوازی لێکردنی و، بە بۆنەی سەردانەکەی بۆ میرنشینەکەی دیارییەکی زۆری پێشکەش کرد[٨٨].

ئەو هەڵوێستەی میر (بەدری عەننازی) لە پێشوازی خەلیفەدا نواندی، چەندێتی رێز و خۆشەویستی کورد بۆ خەلیفە دەردەخات.

خەلیفە لە میوانداری ئەو میرە کوردە مایەوە و، (کەندری)ی وەزیری سوڵتان و کۆمەڵێک میر و پیاوانی یاوەریشی بەرەو وڵاتی (عەننازی) هاتن[٨٩]، جا لە کاتێکدا خەلیفە لە میوانداری میر (بەدر) دابوو، میر(بەدر) نامەیەکی بۆ (بەساسیری) رەوانکرد و، تیایدا نووسی: (سوڵتان ئەوا نزیک بووەوە زووتر داوای لێکردی خەلیفە بگەڕێنیەوە شوێنی خۆی و لەسەر دەرگاکەی بووەستی، نەهێیە ناو عێراق، بەڵام نەتکرد، ئێستاش من دێمە ناو ئەو مەسەلەیە و، لە زەمانەتدا کوڕەکەمت لە لا دادەنێم)[٩٠]، بەڵام (بەساسیری) وەڵامی نامەکەی نەدایەوە[٩١].

سوڵتان بە خەلیفە گەیشت و دوای ئەوەی بە بۆنەی بە سەلامەت گەڕانەوەی بۆ بارەگای فەرمانڕەواییەتی خۆی، کۆمەڵێ دیاری گرنگ و لە ناونیشیان ئەو (یاقوتە سوور)ەی[٩٢] پێشکەش بە خەلیفە کرد، کە لە پێشتردا میر(نەسرولدەولە ئەحمەد کوڕی مەڕوانی کوردی)، یاقوتی ناوبراوی پێشکەش بە سوڵتان (تەغرول بەگ)ی سەلجوقی کردبوو.... ئینجا بە یەکڕا خەلیفە و سوڵتان گەڕانەوە (بەغدا).

هەرچی چارەنووسی (بەساسیری)شە، ئەویش لەسەر دەستی فەرماندەی سەلجوقی (خومار تکینی تەغرائی) کوژرا[٩٣].

بەو سەرکەوتنەش کە سوڵتان(تەغرول بەگ) بە دەستی هێنا، بە شێوەیەکی فراوان



دەسەڵاتەکەی زیادی کرد و، خەلافەتی عەباسیش لە مەترسییەکی گەورە دەربازی بوو، کە پێشتر هەڕەشە بوو لە بۆی، دوای ئەوەش کە ئاسایش باڵی بەسەر(بەغدا)دا کێشایەوە، سوڵتان (عێراقی) جێهێڵا، بەرەو (ئازەربێجان) هات و، لە شاری (تەبرێز) دابەزی[٩٤]، شایانی باسە، هەندێ لە میرە کوردەکان دڵخۆشی و ئاسوودەیی خۆیان لە بەرامبەر گەڕانەوەی خەلیفە بە سەلامەتی بۆ (بەغدا) دەربڕی، یەک لەو بەڵگەنامانەی لەم رووەوە مابنەوە، ئەو نامە پیرۆزباییەی میر (هەزار ئەسپی کوڕی بەنکیری کوڕی عیازی کوردی)یە، کە بە بۆنەی گەڕانەوەی خەلیفەی عەباسی بۆ بارەگای سەروەری خۆی، بۆی رەوانکردبوو، ئەم نامەیەش وەکو مێژوونووس (ئیبنول فوتی) پەسنی دەدات، نامەیەکی چاک بووە[٩٥].

**دووەم: سیستمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی سەلجوقی لە وڵاتی کورد دوای سۆز نواندنی میرنشینەکان:**

لە پێشتردا ئاماژەمان بەوەدا، کە زۆرینەی ناوچە و هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی، بە هەرێمە کوردییەکانیش کەوتنە ژێر دەستی سەلجوقییەکان، سوڵتان(تەغرول بەگ)یش رۆڵێکی زۆر گەورەی لە دروستکردنی ئەو واقیعە بینی بوو، بەمەش لە چەسپاندنی پایەکانی دەوڵەتەکەی سەرکەوت و کاروبارەکانی رێکخستن، چونکە لە راستیدا سوڵتانێکی بە هێز و سەرکەوتووبوو، لە زۆربەی ئەو شەڕانەی فەرماندەیی دەکردن، سەرکەوتنی وەدەست هێنا ئەمەش یارمەتیدا لە بەدەستهێنانی مەبەستەکانی و، گەیشتن بە ئامانجەکانی[٩٦].

بەڵام ئەو سیاسەتەی کە سەربازەکانی لە عێراقدا پەیڕەوییان کرد، بەو پێیەی پایتەختی خەلافەتی عەباسییە، لە راستیدا زۆر لەو سیاسەتەیان جیاواز نەبوو، کە لە وڵاتانی دیکە پیادەیان دەکرد، یان لە پێشە خۆیاندا (بووەیهی)یەکان لە عێراقدا گرتبوویانە بەر[٩٧]، ئەوەبوو، بە تەواوەتی باڵیان بەسەر عێراقدا کێشاو سەربازەکانیان هەڵسان بە کاری دزی و تاڵان و راوڕووتی، کە تەنانەت (بەغدا)یش لە دەستیان دەربازنەبوو، بەڵکو (گەندەڵی و خراپەکارییەکانیان زیادی کرد)[٩٨]، بەمەش خەڵکەکە تێکڕا راپەڕین، ئیتر خەلیفە ناچار بوو، داوا لە سوڵتان بکات سنورێک بۆ ئەو بارە دابنێت[٩٩].

وەکو دەزانرێت سەلجوقییەکان گەلێکی کۆچەری هەمیشە جێگۆڕ بوون، هەڵسانیان بە تالآن و راوڕووتی شتێکی چاوەڕوانکراوبوو[١٠٠]، بۆیە هەوڵەکانیان بەردەوام بوو، بۆ مسۆگەرکردنی دەسەڵاتیان بەسەر هەرێمە ئیسلامییەکان، هەرچی تایبەت بە باری خەلیفە عەباسییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی سەلجوقیانیشە، ئەوا جیاوازیەکی گەورەی نەبوو لەگەڵ ئەو بارەیان، کە لە رۆژگاری دەسەڵاتی (بووەیهی)یەکان تێیدا دەژیان، ئەوەتا لە کاتێکدا (بووەیهی)یەکان لە (بەغدا) دادەنیشتن، هەموو دەسەڵاتەکانیان خستبووە دەستی خۆیان، دوای ئەوانیش کە سەلجوقییەکان هاتن، بە هەمان شێوە، نوێنەرە سەربازییە سەلجوقییەکان فەرمانڕەوایی عێراق و هەرێمەکانی دیکەی سەر بە خەلافەتیان دەکرد و، دەسەڵاتیان هەر تەنها لە بۆ خۆیان کورتدەکردەوە[١٠١].

بەڵام لەگەڵ ئەو زێدە ڕۆییانەش کە لە (بەغدا) و هەندێ شوێنی دیکەدا، لەسەر دەستی سەربازە سەلجوقییەکان روویاندا، کەچی هێشتا بۆچوونی گشتی ئەوان لە بۆ خەلیفە عەباسییەکان، زۆر لەو مامەڵەیە باشتر بوو، کە بووەیهییەکان لەگەڵ خەلیفە عەباسییەکان دەیانکرد[١٠٢]، ئەوەتا بە رێککەوتنی زۆرینەی مێژوونووسان، سوڵتان(تەغرول بەگ)و و سوڵتانەکانی دیکەی دوای ئەو، رێز و بەهەندزانێنیکی زۆریان بۆ خەلیفە هەبوو[١٠٣]، ئەوەی ئەو سیاسەتەشی لە لایان دەچەسپاند، بە پلەیەک ئەو هۆیە بوو، کە سەلجوقییەکان سوننی مەزهەب بوون[١٠٤]، کە ئەم (سوننی)یەتیە مەزهەبی خەلیفە عەباسییەکانیش بوو، وەکو دەریش دەکەوێت، سوڵتانەکان کە رێزیان لە خەلیفە دەگرت، لەبەر پایە سیاسیەکەی خەلیفە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو، کە ئەمە خەلیفەی خودایە[١٠٥].

(رواندی) لە بارەی سۆزی سەلجوقییەکان بۆ خەلیفە عەباسییەکان دەڵێت: کۆچەرێتییەکەیان وای لێکردن بە توندی دەمارگیر بن بۆ ئیسلام، هەروەها کاری کردە سەر ئەوەش کە مەیلی زۆریان بۆ (ئەهلی سوننە و جەماعەت) هەبێت، ئیتر هەڵسوکەوتیان بەرامبەر بە خەلیفەکان لێرەوە سەرچاوەی دەگرت، کە دەهاتن سۆز و رێزو گوێڕایەڵییان بۆ دەنواندن[١٠٦]. ئەوەی جێی سەرنج بێت، ئەوەیە کە سەلجوقییەکان پاش ئەوەی سەرکەوتن لە دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان و قایمکردنی باڵکێشان و دەسەڵاتیان بەسەر رۆژهەڵاتی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی و هەرێمە کوردییەکان بە شێوەیەکی تایبەتی،



سیستمێکی تایبەتیان بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانە پەیڕەو کرد، کە کەوتنە ژێر دەستیان، هەرچی تایبەت بە دەوڵەتەکەشیانە، هەڵسان بە دابەشکردنی بۆ سەر چەند هەرێمێک، لەسەر هەریەکەیان، یەک لە تاکەکانی بنەماڵەی سەلجوقییان کرد بە فەرمانڕەوا[١٠٧]، ئەوانیان بە (پاشا) ناونان و ئینجا سەرۆکێکی باڵاشیان بۆ هەمووان هەڵبژارد، ناویان نا (سوڵتان)[١٠٨]. فەرمانڕەوایانی سەرجەم هەرێمەکان لە ژێر دەسەڵاتی ئەم سوڵتانە بوون و، لە هەموو لایەکی وڵاتدا ئەو بڕیارەی جێبەجێ دەکرا هەر هی ئەوبوو.

شایانی باسە(تەغرول بەگ) یەکەم کەس بوو، کە ئەم ناونیشانەی(سوڵتان)ییەی وەرگرت، لەو رۆژەوەش کە ئیتر ئەو سیستمە لە دەوڵەتی سەلجوقیدا پەیڕەوکرا، بە واتەی سوڵتانێکی لەسەروو هەبێت و فەرمانڕەوایانی سەرجەم هەرێمەکانی دیکە، کە لە رووی پایەدا لە ئەو بچووکترن، سەر بە ئەو بن[١٠٩].

هەروەها لە پاڵ (سوڵتان)دا، ژمارەیەکی دیکەی فەرمانبەر هەبوون، هەریەکە و بە گوێرەی پۆستی خۆی بە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵاتدا هەڵدەستان، لە گرنگترینی ئەو پۆستانەش وەزارەت و پاسەوانی(حجابة)[١١٠] و نووسین و(طغراء)[١١١] و(استفياء)[١١٢] بوون... ئەم پۆستە کارگێڕییانەش تایبەت بە دەوڵەتی سەلجوقی بوون و، هەر لە سەردەمی سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە تا دوایین رۆژەکانی دەوڵەتەکەیان وەکو سیستمێکی تایبەت بە خۆیان بەم شێوە فەرمانڕەواییان کرد[١١٣].

هەرچی فەرمانڕەوایانی هەرێمەکانیش، بە تەنیا خۆی کاروبارە ناوخۆییەکانی هەرێمەکانیان بەڕێوەدەبرد، هەروەها مافی فراوانکردنی هەرێمەکەشیان هەبوو، لەسەر حسێبی ئەم هەرێمانەی تری دەوروبەر، کە لە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکاندا نەبوون. وەکو دەریش دەکەوێت لە رۆژانی بەهێزی دەوڵەتەکەیان، دەسەڵاتیان هەموو هەرێمە لێکجیاکانی گرتبۆوە، بەڵام کاتێک دەوڵەت لاواز بوو و پارچە پارچە بوو، سوڵتانەکان ئەم دەسەڵاتەیان لە دەست داو، فەرمانڕەوایانی هەرێمەکان وایان لێهات لە سەرجەم کاروبارەکانیان بە تەواوی سەربەخۆبوون[١١٤].

دەوڵەتی سەلجوقی لە رۆژانی بەهێزییدا، ئەم هەرێمانەی بەخۆوە دەگرت: (خۆراسان)، (عێراق)، (خوزستان)، (وڵاتی ئەودیوی زێ)، (کرمان)، (چیاکان)، (ئازەربێجان)، (ئەرمینیا)، (جەزیرە).

یەک لە لێکۆڵەران بۆ ئەو گوتەیە دێت، کە دەڵێت: جیهانی ئیسلامی بە گشتی و لە نێویشیدا–هەرێمە کوردییەکان– لە ماوەی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی بە تەواوەتی لە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان کەوتبوو، چونکە لە ماوەی بەهێزییان، سەلجوقییەکان توانییان بەسەر دیاردەی لێکجیابوونەوە و پارچە پارچە بوون سەربکەون و، تارادەیەکی گەورە توانییان هەرێمە ئیسلامییە فراوانەکان یەک بخەن، ئەگەرچیش بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانە سیستەمی (لامەرکەزی)یان پیادە دەکرد، دەشتوانین ئەو ئاراستەیەی بەرەو (لامەرکەزییەت) هاتن، بە یەک لە هێماکانی هێزی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان بژمێرین، لە ڕۆژانی بەهێزییان، بە تایبەت لەو کاتەوەی ئەو سیستەمە سروشتە سەربازی و کارگێڕییەکەی خۆی وەردەگرت[١١٥].

لە ڕاستیشدا ئەو سیستەمە لامەرکەزییەی سەلجوقییەکان لە سەرەتای ساڵانی یەکەمی دەوڵەتەکەیان پەیڕەوییان کرد، بووە هۆی ئەوەی بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایی هەرێمە کوردییەکان هەر بە دەست میرە سەربەخۆکانیان بمێنێتەوە، چونکە لەگەڵ فراوانبوونی سەلجوقیش لەو هەرێمانەدا، بەڵام (تەغرول بەگ) دەستکاری دەسەڵاتە خۆجێتییەکەی میرە کوردەکانی نەکرد، بەڵکو وەکو خۆیان هێڵایەوە، بە تایبەتیش دوای ئەوەی سێ گەورە میر، ئەوانیش میر (نەسرولدەولەی مەڕوانی) و میر (وەهسودانی کوڕی مەملانی ڕووادی) و میر(ئەبو ئەسواری شەدادی)، سۆز و گوێڕایەڵی خۆیانیان بۆ پێشکەشکرد و، پشتگیری تەواویان بۆ ڕاگەیاند، دانیشییان بە دەسەڵاتەکەی دانا، بەسەر وڵاتەکانیان[١١٦]، بە دووریش نازانرێت بوونی سەلجوقییەکان لە سەرەتای دروستبوونیاندا، یەک لە گرنگترینی ئەو هۆیە سیاسییانە بووبێت، بۆ ئەوەی ئەو سیاسەتە لە بەرامبەر میرنشینە کوردییەکان پەیڕەو بکەن، چونکە میرنشینە کوردییەکان دوای ئەوەی بڕوایان بۆ دروستبوو، کە بەرگریکردن سوودێکیان پێ ناگەینێت، هاتن سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند، بێگومان پاڵنەری زۆریش بە دوای ئەوەوە بوون ،یەک لەوانە: میرە کوردەکان وایان بینی، کە باشتر وایە گوێڕایەڵییان بۆ سەلجوقییە بەهێزەکان رابگەیەن، بۆ ئەوەی وڵاتەکەیان بە پارێزراوی بمێنێتەوەو، فەرمانڕەواییەکەیان سەلامەت دەربچێت لە دوژمنکارییەکانی ئەو هێزە لاوەدا، کە ژمارەیەکی زۆر هێز و لایەن لە پێشیدا رووخان، ئینجا یەک لە هۆیەکانی دیکەش، سەلجوقییەکان ئەگەر چیش تورک



بوون، بەڵام موسڵمان بوون و لە پەیڕەوانی مەزهەبی (سوننی) بوون، بە پێچەوانەی بووەیهییەکان کە (شیعە) بوون.

لەسەر ئەمەش دەتوانین بڵێین: ڕێکخستنە کارگێڕییە تایبەتەکان بە هەر میرنشینێک لەو میرنشینە کوردییانە، لە پێشینەی هەموو شتێکیش مانەوەی پۆستی (میر)، کە بەرامبەر بە پۆستی(سوڵتان) دەوەستا لە لای سەلجوقییەکان بەو پێیەی بەرزترین پۆستە، زیاد لەمەش بەردەوام مانەوەی پۆستەکانی وەزارەت و پاسەوانێتی و سیستەمی دارایی و دادوەری و بێجگەی ئەوانەش[١١٧].

بەڵام وەکو دەبینین ئەم سیاسەتەی سەلجوقییان، لە دوای مردنی سوڵتان(تەغرول بەگ) لە ساڵی(٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) گۆڕانی بەسەردا دێت، چونکە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) (٤٥٥- ٤٦٥ک/ ١٠٦٣- ١٠٧٢ز) گەرچی ئەویش لەسەر سیستەمی لامەرکەزیەت ڕۆیشت بۆ فەرمانڕەوایی، بەڵام هەڵوێست و پەیوەندییەکانی لەگەڵ کورد ئەوەیان دەرخست، کە ئەو ئارەزووی ئەوەی دەکرد، هەرێمەکان بە پایتەختی فەرمانڕەوایی سەلجوقی ببەستێتەوە، زیاترین ڕاش لەسەر ئەوەیە، کە ئەو سیاسەتەی (ئەلب ئەرسەلان) پەیڕەوی کرد، بووە سەرەتای جێبەجێکردنی سیستەمی ناوەندییەت (مەرکەزییەت) لە لای سەلجوقیەکان، کە ئەمەش بەشێوەیەکی زەق لای ئەوان لە سەردەمی سوڵتان(مەلەکشاه) (٤٦٥- ٤٨٥ک/ ١٠٧٢- ١٠٩٢ز) روون بۆوە، ئەمەش لەو کاتەدا کە سوڵتانی ناوبراو، کۆتایی بە فەرمانڕەوایی سەرجەم میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان هێنا.

بەڵام سەبارەت بە چۆنییەتی بەڕێوەبردنی سەلجوقییەکان بۆ هەرێمەکانی سەربەخۆیان، دەتوانین بڵێین: ئەوان ژمارەیەک پۆستیان داهێنا، وەکو فەرمانڕەوای هەرێمەکان، ئەوەبوو لە کاتی زاڵبوونیان بەسەر هەر هەرێمێک لە هەرێمەکان، لەسەر ئەوە سوور دەبوون کەیەک لە نزیکانی بنەماڵەی فەرمانڕەوای سەلجوقیی بۆ هەڵبژێرن و لە سەریدا بیکەنە فەرمانڕەوا[١١٨]، ئەمەش بۆ مسۆگەرکردنی باڵکێشانی تەواویان بەسەر ئەو ناوچانە[١١٩]، فەرمانڕەواش لە رووی کارگێڕییەوە گەورەترین دەسەڵاتی جێبەجێ کردن بوو لەو هەرێمانە و بەرپرس بوو، لە پاراستنی ئارامی و فەرمانڕەوایی کردنی سەربازان و بەرگری کردن لە هەرێمەکە، دەسەڵاتیش بە شێوەیەکی گشتی لە دەست ئەو فەرمانڕەوایە بوو و، دەسەڵاتی سوڵتان نەبووایە، هیچ شتێکی دیکە بە حکومەتی ناوەندیی

نەدەبەستایەوە، ئەویش لە سەرپەرشتکردنی کارەکانی دامەزراندن و لەسەر کار لابردن و پابەندبوون بە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی لەسەر هەرێمەکەی دەوەستا کە ئەو بەرپرسە لێی، بە تایبەت لە ئەرکە دارایی و سەربازییەکان[١٢٠].

یەکێکی دیکە لەو رێکخستنە کارگێڕییانەی دەسەڵاتی سەلجوقی بۆ فەرمانڕەواییکردنی هەرێمە زۆرەکانیان، داهێنانی پۆستی عەمید (راگر) بوو، کە وشەیەکە لە رووی زمانییەوە بە واتای ئەو کەسە دێت، کە لە کاروبارەکاندا پشتی پێ دەبەسترێت[١٢١]، ئەویش لە پۆستە گرنگەکان بوو، چونکە خاوەنەکەی راستەوخۆ لە لایەن سوڵتانەوە دادەمەزرێنراو بە نازناوی(میری راگر) بانگ دەکراو، بە نوێنەری سوڵتان دادەنرا لە فەرمانڕەواییکردنی ئەو هەرێمەی بۆی هەڵدەبژێردرا[١٢٢]، کە دەسەڵاتەکەی بە دەسەڵاتی (پارێزگار) دەچێت لە سەردەمی ئێستا[١٢٣]، چونکە ئەرکەکەی کارگێڕییەکی رووت بوو.

لە پاڵ (راگر)دا پۆستێکی دیکە هەبوو(شەحنە)ی پێدەگوترا[١٢٤]، ئەرکی خاوەنەکەی پاراستنی ئاسایشی شار بوو، راستەوخۆ لە لایەن سوڵتان دادەمەزرا و، دەسەڵاتی سەربازی و کارگێڕیی هەبوو، بەرپرس بوو لە بەڕێوەبردنی شار و پارێزگاری کردن لە ئارامی و ئاسایشەکەی، لەگەڵ گرتن و سزادانی هەموو ئەوانەی لە یاسا دەردەچن و خراپی دەکەن[١٢٥].

لە راستیدا (راگر) و (شەحنە) زۆرجار بە یەکەوە هاوکارییان دەکرد بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکەیان و پێکەوە سەرۆکایەتی هێزەکانیان دەکرد، لە رووی هەر هەرەشەیەک ئەگەر بۆ سەر ئاسایش دەرست ببوایە، (بەنداری) دەڵێت: لە ساڵی(٤٧٩ک/ ١٠٨٦ز) دیاربەکر هەڵگەڕایەوە، بۆیە سوڵتان(مەلەکشاه) داوای لە راگر (ئەبی عەلی بەلخی) کرد، بۆ ئەوەی هێمنی بۆ شارەکە بگەڕێنێتەوە[١٢٦].

هەرچەندەش (راگر) و (شەحنە) بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکەیان هاوکارییان دەکرد، بەڵام لە راستیدا دەسەڵاتی (راگر) فراوانتر بوو لە دەسەڵاتی (شەحنە)، چونکە (راگر) سەرپەرشتی هەموو کاروبارەکانی هەرێمەکەی دەکرد، بەڵام (شەحنە) بۆ سەرپەرشتیکردنی بە تەنیا شارێک دادەمەزرێنرا[١٢٧]، هەروەها ئەم پۆستەی (شەحنە)یە بەو بۆ پێیەی پۆستێکی سەربازی ئاسایشی بوو، بۆیە بە زۆری هەر بە کەسە تورکە سەلجوقییەکان



دەدرا، ئەمەش چونکە ئەو هۆزانەی سەلجوقی بە بێجگەی لایەنی سەربازی، ئیتر هیچ شارەزاییەکیان لە بواری کارگێڕی نەبوو، بۆیە ئەو پۆستەیان هەر لە خەڵکانی خۆیان کورتدەکردەوە، زۆر بە کەمی نەبووایە، بە خەڵکانی سەر بە رەگەزەکانی دیکەیان نەدەدا، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەم پۆستە تا سەردەمی دوای سەلجوقییەکانیش هەر پەیڕەوەی لێکراوە، چونکە هەروەها (مەغۆلەکانیش) کە ئەوانیش دیسانەوە هەر تورک بوون، ئەو پۆستەی (شەحنە)ی سەربازییان هەر بە تاکەکانی خۆیان دەسپارد[١٢٨].

ئەوەی شایانی ئاماژە بۆ کردن بێت، ئەوەیە کە هەرێمە کوردیەکانیش بە دەوری خۆیان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ هەرێمەکانی دیکە، ئەو هەرێمە کوردییانە بارێکی تایبەتیان هەبوو، چونکە سەلجوقییەکان لە ماوەی ئەو سەردەمەدا نەیانتوانی کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان بێنن، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەوان ئارەزووی ئەوەیان نەبووە، راستەوخۆ باڵ بەسەر ئەو قەوارە پتەوانەدا بکێشن، بۆیە سیاسەتی وتووێژ و هودنەیان لە بەرامبەریان گرتۆتەبەر و، بەوەندە رازی بوونە، کە سەرۆک هۆز و میرەکان سۆز و گوێڕایەڵیان بۆ دەربڕن.

لە پێشتریشدا ئاماژەمان بەوەدا، کە زۆرینەی میرنشینە کوردییەکان و لە نێویشیان (رووادی) و(شەدادی) و (مەڕوانی) و(عەننازی) سۆز و گوێڕایەڵبوونی خۆیان بۆ دەسەڵاتدارانی سەلجوقی راگەیاندبوو، چونکە میرەکانیان دەرکیان بەوە کردبوو، کە راوەستان بە رووی ئەو هێزە تازەیە، کە هاتۆتە نێو جیهانی ئیسلامی، هیچ سوودێکی لێناکەوێتەوە، بەڵام کە سەلجوقییەکانیش ئەو میرنشینانەیان هێشتەوە، ئەمە مانای ئەوە نییە کە میرنشینەکان هەمان سەربەخۆیی جارانیان لە سای سەلجوقیانیش بۆ مابێتەوە، بەڵکو زۆرجار سەلجوقییەکان دەستیان لە کاروباری ناوخۆیی ئەو میرنشینانە وەردەدا و بەشدارییان دەکرد لە خۆشکردنی ئاگری ململانێی نێوان براکان لەسەر دەسەڵات، میرنشینی (عەننازی) رۆژئاوای هەرێمی (چیاکان)یش باشترین بەڵگەیە، بۆ دەست تێوەردانی سەلجوقییەکان، چونکە ئەو میرنشینە لە ماوەی باڵکێشانی سەلجوقی بەسەریدا، ململانێیەکی تاڵی نێوان میرەکانی بە خۆوە بینی، ئەمەش لەبەر ئەوەی سەلجوقییەکان دەستیان لە کاروبارەکانی ناوخۆی ئەو میرنشینە وەردەدا و، هانی میرە عەننازییەکانیان لە دژی یەکدی بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات دەدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی

ململانێی نێوان براکان و تاکەکانی دیکەی هۆزی (شازنجانی) لەسەر دەسەڵات توند بێت و، شەڕیان لە نێواندا بەرپابێت[١٢٩].

لە بارەی کارگێڕییەتی سەلجوقییەکان لە هەرێمە کوردییەکان، هەندێ ئاماژە هاتوون، ئەوەتا لە ڕووداوەکانی ساڵی(٤٣٤ک/ ١٠٤٢ز) کە ئەمە ئەو ساڵەیە، کە تیایدا سەلجوقییەکان بەرەو هەرێمی چیاکان هاتن، ئاماژە بەوە کراوە، کە: سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرەو (رەی) گەڕایەوە و لە (هەمەدان) دا (ناسر عەلەوی) وەکو نوێنەری خۆی بەجێهێلا[١٣٠]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە سەلجوقییەکان ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی خۆیانیان دەخست، لە ڕێگەی ئەو نوێنەرانەوە بەڕێوەیان دەبردن، کە سوڵتان هەڵیدەبژاردن.

لە ساڵی(٤٣٦ک/ ١٠٤٤ز) میر (ئەبو کالیجار کەرشاسفی کوڕی عەلائولدەولە) لە (کەنکور)ەوە هاتە نێو (هەمەدان) و، نوێنەرانی سوڵتان(تەغرول بەگ)ی لەو شارەدا وەدەرنا[١٣١]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، کە (هەمەدان) و (هەرێمی چیاکان) هەر لە ساڵەکانی(٤٣٤ک/ ١٠٤٢ز)دا کەوتبوونە ژێر دەستی سەلجوقییەکان، کەچی بۆ زاڵبوون بەسەریان کێبرکێیەکی توند لە نێوان ئەوان و (کاکەوەیهی)یەکان دروستبوو[١٣٢].

هەروەها سەلجوقییەکان لە هەندێ باردا لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەتەکەیان، فەرمانڕەوایی هەندێ لە قەڵا کوردییەکانیان داوەتەوە دەست ئەو میرە کوردانەی خاوەنی بنجی قەڵاکە بوونە، یان وەکو (ئیبنولئەثیر) ئاماژەی بۆ دەکات (وڵاتەکانیان لەدەست خۆیاندا مایەوە)[١٣٣]، بۆ نموونە لە ساڵی (٤٣٨ک/ ١٠٤٦ز)دا (ئیبراهیم یەناڵ)، (بەدری کوڕی تاهیری کوڕی هیلال)ی بەسەر شاری قەرمیسین (کرمانشاها)دا کردە فەرمانڕەوا، کە شایانی باسە ناوبراو یەک لە پاشماوەی میرە حەسنەوییە بەرزیکانییەکان بوو، لە ساڵی (٤٣٩ک/ ١٠٤٧ز)یش (یەناڵ)یەک لە گەورە پێشەنگەکانی هاوەڵی کردە فەرمانڕەوای قەڵای سیروانی کوردی، کە بە (سوخت کەمان)ەوە ناودەبرا[١٣٤].

لە ساڵی(٤٤٠ک/ ١٠٤٧ز) لە شاری (هەمەدان)[١٣٥]، (ئاقسنقەر) لەسەر دەستی یەک لە پیاوە (باتنی)یەکان کوژرا[١٣٦]، وەکو دەریش دەکەوێت ناوبراو نوێنەری سەلجوقییەکان بووە بەسەر ئەو شارەدا.



دوای هاتنە ناو (بەغدا)ی (سەلجوقییەکان) لە ساڵی(٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز)، پایەکانی دەوڵەتەکەیان چەسپاند و وایان لێهات ببنە خاوەن سیستمێکی تایبەت بۆ فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردنی هەرێمەکان[١٣٧]، بۆیە کاریان لەسەر دانانی هەندێ بنەمای نوێ کرد، بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکانیان، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەو پۆستانەی دایان هێنا، زۆر ڕێکتر بوون لەوانەی پێشەخۆیان، چونکە لە ڕۆژانی فراوانبوونیان، بەڕێوەبردنی سەلجوقییەکان بۆ هەرێمەکان، هەر لەوەدا کورت دەبووەوە، کە هاتن فەرمانڕەوایەکی سەربازییان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری شارە داگیرکراوەکە هەڵدەبژارد و، تەواو.... بەڵام دوای ئەوەی هاتنە نێو بەغدا پۆستە کارگێڕییەکانی دیکەیان داهێنا.

ئەو دەقانەی لەبەر دەستیش دان، باس لە ڕووداوەکانی ئەو ساڵانە دەکەن، کە تیایاندا سەلجوقییەکان هاتنە ناو (بەغدا)، هەر جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکەنەوە، زۆرجار تێیاندا باسی (راگر) و (شەحنە)کانی هەندێ لە شارە کوردییەکان دەکرێت، بۆ وێنە لە ساڵی(٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) خەڵکی (هەمەدان) لە دژی (راگر)ی شارەکەیان ڕاپەڕین، خۆی و حەوت سەد لە پیاوانی سوپای سەلجوقی و هەروەها (شەحنە)ی ئەو شارەشیان کوشت[١٣٨].

لە پاڵ پۆستەکانی (راگر) و (شەحنە)دا پۆست و پایەی دیکەش بۆ فەرمانڕەوایتی سەلجوقی لە هەرێمە کوردییەکان داهێنرا، ئەوەتا لە ساڵی(٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) گرێبەستی زامنکردنی (بەغدا)ی لەگەڵ (ئەبی سەعیدی قاینی) بەست، بە (سەدو پەنجا هەزار دینار)، بەو پارەیە هەموو ئەو میرات و باجانەی گەڕاندەوە کە سەرۆکی هەردوو عێراقەکان خەرجی کردبوون[١٣٩] مەبەست لە هەردوو عێراقیەکان – عێراقی عەرەبی و عێراقی عەجەمی یە[١٤٠] –کاروبارەکانی ئەم دوو عێراقە کەسێک بەڕێوەی دەبرد، پێی دەگوترا سەرۆک، وەکو دەریش دەکەوێت ئەو پۆستە لە هەموو شارە ئیسلامییەکانی دیکەش هەبووە، جا وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، لە کاتی یاخیبوونی (ئیبراهیم یەناڵ)ی برای، سوڵتان(تەغرول بەگ) یارمەتی لە (ئەبی هاشمی عەلەوی) وەرگرت، ئینجا لە بەرامبەر ئەو چاکانەی لە دواییدا سەرۆکایەتی (هەمەدان)ی بەناوبراو بەخشی[١٤١].

دەتوانین بڵێین: هەردوو پۆستی(راگر) و (شەحنە) لە سەردەمەکانی دواتریشدا، بە

واتا له سەردەمی هەردوو سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) و (مەلەکشاه)دا هەرمانەوە، چونکە له (بەغدا)دا ئاماژە هەیە بۆیان[١٤٢]، مانەوەشیان له عێراقدا، بە واتای ئەوە دێت، کە له هەمان کاتدا له هەرێمە کوردییەکانیش ئەو پۆستانە هەرماونەتەوە.

ئەوەی شایانی تێبینیش بێت، سەلجوقییەکان، هاتن ئەو ناوچانەی له ژێر دەستیان بوو، دابەشیان کردە سەر چەندین هەرێم و پارچە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بەڕێوەیان ببەن، ئەوەتا (شترک) لەو بارەیەوە دەڵێت: هەرێمی (ئەرمینیا) وەکو (ئازەربێجان) و هەرێمەکانی دیکەش له سەردەمی فەرمانڕەوایی سەلجوقیدا، دابەشکرایە سەر چەندین پارچەی کارگێڕی رووبەر له یەک جیا، له هەر یەک لەو پارچانە(میر)ێک فەرمانڕەوایی دەکرد، ئەو(میرە)ش هەر له سەرەتاوە سەربەخۆییەکی زۆری هەبوو[١٤٣].

پایەی(میر)یش یەک لەو پایانەیە، کە له سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەکارهێنراوە، چونکە له ساڵی(٤٥٦ک/ ١٠٦٣ز) هەواڵی ئەوە بە سوڵتان گەیشت، کە: کۆمەڵێک له کورد له سنوورەکانی (حەلوان) خەریکی رێگرین، ئەویش سوپایەکی بۆ ناردن، (ژاریان دەرخواردی ئەو خەڵکانە داو، تەنها یەکێکیان لەو وڵاتەیان جێنەهێڵا)[١٤٤] ئینجا کە دز نەمان، میرایەتی ئەو ناوچانە درایە میر (ئەرسەلان بەگ)[١٤٥].

له ساڵی(٤٦٤ک/ ١٠٧١ز)یش (یەغما تورکی)ی خولامی سوڵتان(ئەلب ئەرسەلان) بەرەو ناوچە سنوورییەکەی (الباب)[١٤٦] هات و له لایەن سوڵتانەوە کرایە میر بەسەری[١٤٧]، بەمەش خەڵکی (الباب) و ناوچە سنوورییەکانی نزیکی بەرێزەوە پێشوازییان لێکرد و هێنایانە ناو شارەکەیان، ئەویش نووسراوەکەی سوڵتانی بەسەردا خوێندنەوە[١٤٨].

لەوەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە سەلجوقییەکان ئەگەر چیش دانیان نابوو، بە دەسەڵاتی سیاسی میرنشینە کوردییەکان، بەڵام له هەمان کاتیشدا سوور بوونە لەسەر ئەوەی فەرمانبەرانی خۆیان بۆ ئەو هەرێمانە بنێرن، ئەمەش بۆ زامنکردنی باڵکێشانیان بەسەریان.



## پەراوێزەکان

١- بگەڕێوە بۆ هەردوو لاپەڕەکانی (٧٩) و (٩٤) له دەقە عەرەبییەکە.

٢- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٢)؛ ئیبنو دەحیە: کتاب النبراس في تاریخ خلفاء بني عباس، ساغکردنەوەی: عەباس عەزاوی، (بەغداد، ١٩٤٦ز)، لاپەڕە (١٣٧)؛ حوسەینی: العراضة في الحكاية السلجوقية، لاپەڕە (٣٨).

٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٨٠)؛ حوسەینی: العراضة في الحكاية السلجوقية، لاپەڕە (٣٨).

٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٦٠١ - ٦٠٢)؛ ئیبنو کەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٦٦)؛ ئەحمەد کەمالوددین حلمی؛ السلاجقة، لاپەڕە (٢٨).

٥- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ زبده التواریخ؛ لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنو کازرۆنی: مختصر التاریخ، لاپەڕە (٢٠٤)؛ عەینی؛ السیف المهند في سيرة الملك المؤيد، ساغکردنەوەی: فەهیم محەمەد شەلتوت، (قاهیرە، ١٩٦٧ز)، لاپەڕە (٢١)؛ حلمي: السلاجقة، لاپەڕە (٢٨)؛ محەمەد حلمی محەمەد ئەحمەد: الخلافة والدولة في العصر العباسي، (قاهیرە، ١٩٥٩ز)، لاپەڕە (١٧٨).

6- The new Ency Britannica, vol l6, P.503

٧- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٠٩)؛ قەلقشندی: مآثر الاناقة في معالم الخلافة، ساغکردنەوەی؛ عەبدولستار ئەحمەد خیراج، (بەیروت، ١٩٨٠ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٣٦).

٨- الانباء في تاريخ الخلفاء، لاپەڕەکانی (١٨٨.١٨٩).

٩- بغية الطلب، لاپەڕە (٢).

١٠- ئیبنو کازرۆنی: مختصر التاریخ، لاپەڕە (٢٠٥)؛ عەبدولرەحمان سنبت ئەربلی: خلاصة الذهب المسبوك، سەرپەرشتیکردنی چاپ: مەکی سەید جاسم، (بەغداد)، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٢٦٥).

١١- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٦٠)، ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٠٩).

١٢- بابا تاهیری هەمەدانی: لە شاعیرە سۆفییە دیارەکانە؛ بە یەکەم شاعیر دادەنرێت، کە لە سەدەی (پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی) شیعری بە کوردی دانابێت، لە دوای خۆی (چوارینی) زۆری بە جێهێلاوە، تائێستاش مێژووی مردنی بە تەواوی دیار نەکراوە؛ خلاصة تاریخ الکرد وکردستان، لاپەڕە (٣٣٤)؛ براون: تاریخ الادب في ایران، وەرگێرانی: ئەحمەد کەمالوددین حلمی، (کوەیت، ١٩٨٤ز)، لاپەڕە (٧١)؛ بۆ زانیاری زیاتریش، بڕوانە؛ مەهدی قادر خضر: الحیاة الفکریة والعلمیة في غربي أقلیم الجبال، نامەیەکی ماجستێری بلاونەکراوەیە، (زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٤ز)، هەردوو لاپەڕەکانی (١٣٢) و (١٣٦).

١٣- راحة الصدور، لاپەڕە (١٦٠).

١٤- سوڕەتی (النمل)، ئایەتی (٩٢).

١٥- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕەکانی (١٦٠.١٦١)؛ مینۆرسکی: دائرة المعارف الاسلامیة، مادەی (بابا تاهیر)، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە ٥٢٣؛
Nevzat Kosoglu Turk: Dunyasi Tarihi ve Turk Medeniyeit Uzerine Dusnceler, P 66.

١٦- ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٦٦)، سەفەدی: الوافي بالوفیات، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٠٣)؛ قەرمانی: اخبار الدول وآثار الاول، بەیروت، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٢٧١).

١٧- کتێبی: تفضیل الاتراك علی سائر الاجناد، لاپەڕە (٥٠).

١٨- ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٠٩)؛ محەمەد خەزری بەگ: محاضرات الأمم الاسلامیة، لاپەڕە (٤١٧).

١٩- ئیبنو عەدیم: بغیة الطلب، سەرپەرشتی چاپ: عەلی سویم، (ئەنقەرە، ١٩٧٦ز)، لاپەڕە (٢)؛ مستەفا: دخول الغز الی الشام، لاپەڕە (٣٢٩).

٢٠- بغیة الطلب، لاپەڕە (٢).

٢١- ئەمین: تاریخ العراق في العصر السلجوقي: لاپەڕەکانی (٥٨-٥٩).

٢٢- خەتیبی بەغدادی: تاریخ بغداد، بەیروت (بەبێ ساڵی چاپ)، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٤٠٠)؛ ئیبنو قەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، چاپخانەی ئا بائولیەسوعیین، ١٩٠٨ز، لاپەڕە (٨٧)؛ ئیبنو عومرانی، الانباء في تاریخ الخلفاء، لاپەڕە (١٨٩)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢٠)؛ حەمەوی: تاریخ المنصوري، سەرپەرشتی چاپ: بوتروس غەریاز نویج، (مۆسکۆ، ١٩٦٠ز)، لاپەڕە (١٥٣)؛ ئیبنو عەبری: تاریخ مختصر الدول، لاپەڕە (١٨٤)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٣)؛ ئیبنو وەردی: تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٤٤)؛ تاریخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕەکانی (٥٨-٥٩).

٢٣- المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٤)؛ ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦١٢)؛ سبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٥)؛ تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٤٤)؛The new Ency. vol I6, P 50.

٢٤- لە بارەی میر (هەزار ئەسپ) و رۆڵەکەی لە سوپای سەلجوقی، بڕوانە هەردوو لاپەڕەکانی (١٧٣)و(١٧٥)ی دەقە عەرەبییەکە.

٢٥- بەساسیری: ناوی تەواوی (ئەرسەلانی کوڕی عەبدوڵڵای ئەبو حارسی بەساسیری)یە، وەکو درانە پاڵێک بۆ شارۆچکەی (بەسا)، یان وەکو عەرەبەکان پێی دەڵێن (فەسا) لە (فارس)ەوە، پێشەنگی تورکان بوو لە (بەغداد)، دەڵێن زووتر یەک لە مەملوکەکانی (بەهائولدەولەی بووەیهی) بووەو خزمەتی (قائیم)ی خەلیفەی عەباسیی کردووە، ئەویش بە پێش هەموو تورکەکانی بەغدادی خستووە، بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: سەمعانی: الانصاب، ساغکردنەوەی دەقەکانی و قسە لەسەرکردنی: شێخ عەبدولرەحمانی کوڕی یەحیای یەمانی، (بەیروت، ١٩٨٠ز)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٠٣)؛ ئیبنولئەثیر: اللباب في تهذیب الانساب، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (١٤٩، ١٥٠)؛ سەفەدی: الوافي بالوفیات، بەشی هەشتەم. لاپەڕە (٣٤٠).

٢٦- ئیبنو لقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٨٧)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٠٨)؛ ئیبنوتەبا تەبا: الفخري في الآداب السلتانیة، لاپەڕە (٢٣٤)؛ الذهبي: دول الاسلام، ساغکردنەوەی: فەهیم محەمەد شەلتوت و محەمەد مستەفا ئیبراهیم، (قاهیرە، ١٩٧٤ز) بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٦٣).

٢٧- خەتیبی بەغدادی: تاریخ بغداد، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٤٠٠) المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ محەمەد جەمالودین سرور: سیاسة الفاتمیین الخارجیة، (قاهیرە، ١٩٧٦ز)، لاپەڕە (١٨٥)؛ خاشع مەعازیدی: الحیاة السیاسیة في بلاد الشام خلال العصر الفاطمي، (بەغداد، ١٩٧٦ز)، لاپەڕە (٨٣).

٢٨- بە (شیرازی) ناسراوە، چونکە لە ساڵی (٣٩٠ک/٩٩٩ز) لە (شیراز) لە دایک بووە، زانستەکانی دەعوەی فاتمیی لەسەر دەستی باوکییەوە خوێندووە، کۆچی بەرەو (میسر) کردو لەوێدا بووە یەک لە بانگخوازە دیارەکانی فاتمییان، شایانی باسە (موئەیەد) چالاکیەکی گەورەی بە ئەنجامدا، لە پێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی فاتمییەکان و هەروەها هەوڵی زۆرشی دا بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی فاتمییەکان لە ماوەی بزووتنەوەی بەساسیری.

٢٩- ئیبنو سیرفی: الاشارة لمن نال الوزراة، ساغکردنەوەی: عەبدوڵڵا موخلیس، ١٩٢٦ز، لاپەڕە (١٨)؛ سیرة المؤید فی الدین ، لاپەڕە (١٠٠).

٣٠- لە بارەی نامە گۆڕینەوەکانی نێوان ئەم بانگخوازە فاتمییەو، میرەکانی کورد، بڕوانە، سیرة المؤید في الدین، هەردوو لاپەڕەکانی (١٠٩) و (١٦٤).

٣١- مەسعودی مروج الذهب، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣٥).

٣٢- ئەسفەهانی: فریدة القصر، بەرگی دووەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤٢١)؛ جەمیل رۆژبەیانی: وتاری (جاوان- این کانت تعیش هذه القبیلة)، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، (بەغداد ١٩٨٦ز)، ژمارە (١١١)، لاپەڕە (٣٩).

٣٣- ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٠٣)، عەبدولجەبار ناجی: الامارة المزیدیة، (بەغداد، ١٩٧٠ز)، لاپەڕە (١١٦).

٣٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٢٥)؛ سبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان لاپەڕە (١٢).

٣٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٢٦)؛ سبتی ئیبنولجۆزی مرآة الزمان، لاپەڕە (٤)؛ عەبدولرەقیب یوسف: نبذة وثائقیة عن تاریخ قبیلة جاوان الکردیة، گۆڤاری (رۆژی کوردستان)، (بەغداد، ١٩٧٩ز)، ژمارە (٥٥)، لاپەڕەکانی (١٥،١٤).

٣٦- مرآة و الزمان، لاپەڕە (١٢).

٣٧- ئیبنو لئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٢٦)؛ ئەمین: تاریخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕە (٦٤)؛ بۆ زانیاری زیاتریش لە بارەی شوێنی (سنجار)، بگەڕێوە بۆ: سیرة المؤید، لاپەڕەکانی (١٣١، ١٣٢)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕەکانی (١٤ و ١٥)؛ ئیبنو کەثیر: البدایة والنهایة، (٦٩٢).

٣٨- تاریخ العضیمي، (کلود کاهن) بڵاویکردۆتەوە، (باریس، ١٩٣٨)، لاپەڕە (٢٧٢)؛ مستەفا: دخول الغز الی الشام، لاپەڕە (٣٣٤).



٣٩- سیرة المؤید في الدین، لاپەڕەکانی (١٠٨ و ١٠٩).

٤٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤١- یوسف؛ حضارة الدولة الدوستکیة، بەشی دووەم، لاپەڕە (٤٢).

٤٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٣- بڕوانە: المؤید في الدین، هەردوو لاپەڕەکانی (١٠٩) و (١١٦)، لەگەڵ لاپەڕەکانی (١٣٨، ١٣٩).

٤٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤٥- ساغکەرەوەی کتێبی (سیرة المؤید في الدین) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەو هیچ زانیارییەکی بە دەست نەکەوتووە، لە بارەی ئەو وەفدەی (ئیبنو مەروان) بەرەو (قاهیرە)ی ناردووە، بۆ وتووێژکردن لەگەڵ فاتمییەکان، کەچی (عەبدولرەقیب یوسف) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات: کە دەشێت شێخ (ئەبی حەسەنی کوڕی بشر)، ئەوە (قازی ئەبو حەسەنی ئامەدی) بێت ... بڕوانە: سیرة المؤید في الدین، لاپەرە (١٣٨)؛ یوسف: حضارة الدولة الدوستکیة، بەشی دووەم، لاپەڕە (٤٢).

٤٦- الکامل: بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٦٢).

٤٧- یوسف: حضارة الدولة الدوستکیة، لاپەڕە (٧٤).

٤٨- سیرة المؤید في الدین، لاپەڕە (١٧٠)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠)؛ ئیبنو لعیبری: تاریخ الزمان، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: (ئەب ئیسحاق رەملە)، (بەیروت، ١٩٩١ز)، لاپەڕە (١٠١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٥)؛ یوسف: حضارة الدولة الدوستکیة، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٧٥،٧٤).

٤٩- سیرة المؤید، لاپەڕە (١٧٠).

٥٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠).

٥١- سیرة المؤید، لاپەڕە (١٧٠).

٥٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠).

٥٤- مرآة الزمان، لاپەڕە (٢٢)؛ ئیبنو لعیبری: تاریخ الزمان، لاپەڕە (١٠١).

٥٥- زرار سدیق تۆفیق: النفوذ الفاطمي فی بلاد الکرد، لاپەڕە (٤٥٨).

٥٦- سیرة المؤید، لاپەڕەکانی (١٧٠، ١٧١).

٥٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠-٦٣١)؛ تاریخ الرهاوي المجهول، لێدوانی: ئەب ئەلبیر ئەبونا، (بەغداد، ١٩٨٦ز)، لاپەڕە (٢٣)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٦٩).

٥٨- ڕاوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٧٠) ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٤)؛ سبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٢٦)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٧٢)؛ کلود کاهن: تاریخ العرب والشعوب الاسلامیة، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: بەدرەدین قاسم، (بەیروت ١٩٧٢ز)، لاپەڕە (٣٤٩)؛

Sir William Mair: The Cliphate,p 75.

٥٩- خەتیبی بەغدادی: تاریخ بغداد، بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٤٠٠)؛

ئیبنوقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕەکانی (٨٧-٨٨)؛

ئیبنولجۆزی: المنتظم. بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (١٩٠-١٩١)؛

ئیبنولئەثیر: الکامل: بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٩)؛ تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (١٧)سەبتی ئیبنولجۆزی:مرآة الزمان، لاپەڕە (٣١)؛ میرخواند: روضە الصفاء، بەشی چوارەم ،لاپەڕە (٦٧٢) بەشی دوانزە، لاپەڕە (٥٩)؛ تامار ئارئایس: السلاجقة، لاپەڕەکانی (٢٦-٢٧).

٦٠-ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة.

٦١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٦٢).

٦٢- بڕوانە لاپەڕەکانی (٨٦-٨٧)ی دەقە عەرەبییەکە.

٦٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دوانزەم، لاپەڕە (١٧٦)؛ البدایة والنهایة: بەشی دوانزەم، لاپەڕە (٦٩)؛ ئیقبال: الوزارة في عهد السلاجقة، لاپەڕە (٣٤)؛ ئەحمەد کەمالوددین حیلمی. السلاجقة، لاپەڕە (٣٠).

٦٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٩)؛ ئیبن و تەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٨).

٦٥- ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕەکانی (٨٧-٨٨)؛ ئیبنولجۆزی؛ المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (١٩٠-١٩١)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٩)؛ ئیبنولوەردی؛ تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (٣٥٢-٣٥٣).



٦٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٩).

٦٧- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕەکانی (٨٧-٨٨)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٩١)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٦٠)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٠)؛ بەنداری؛ تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (١٧)؛ ئەمین؛ تاریخ العراق في العصر السلجوقي؛ لاپەڕە (٦٦)؛ مەحمود عەرەفە مەحمود: الاحول السیاسیة والدینیة في بلاد العراق والمشرق الاسلامي، گۆڤاری (حولیات کلیة الآداب)، زانکۆی کوەیت، لاپەڕە (١٩).

٦٨- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (١٩٠-١٩١)؛ ئیبنولئەثیر؛ الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٠)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٣١)؛ زەهەبی؛ العبر، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٢٠)؛ ئیبنو تەغری: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٨).

٦٩- سیرة المؤید، لاپەڕەکانی (٧٤) و بەدواوەی.

٧٠- مرآة الزمان، لاپەڕە (٣١)؛ ئیبنولعیبری: تاریخ الزمان، لاپەڕە (١٠٤).

٧١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٠)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مراه الزمان لاپەڕە (٣٢).

٧٢- عەمیدولمەلیک: محەمەدی کوڕی مەنسوری کوڕی محەمەدی کەندرییە، خەڵکی گوندی (کەندر)ی سەر بە (نەیسابور)ە، وەزیری سوڵتان (تەغرول بەگ) بوو، لە بوارەکانی نووسین و ئازایەتی و جوامێری وسەخاوەتدا لە پیاوەکانی ڕۆژگار بووە، ... یەکەم وەزیری منداڵەکانی (سەلجوق)یش بووە، ساڵی (٤٥٦ک/١٠٦٣ز) کوژراوە: باخەرزی: دمیة القصر، (ساغکردنەوەی: محەمەد تونجی. (١٩٧١ز)، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٧٩٥،٧٩٦)؛ ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕەکانی (١٣٨-١٤٣)؛ ئیقبال: الوزارة في عهد السلاجقة، لاپەڕە (٣٤).

٧٣- الأنباء في تاریخ الخلفاء، لاپەڕە (١٩٥).

٧٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧٥- الأنباء، لاپەڕە (١٩٥)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (٢٠٢)؛ حوسەینی؛ زبدة التواریخ، لاپەڕە (٦١)؛ بەنداری: تاریخ دولة السلجوق، لاپەڕە (١٨)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٤٩-٥٠).

٧٦- الأنباء، لاپەڕە (١٩٥).

٧٧- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٨٩)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٦١)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٥)؛ ئیبنولعەدیم: بغیة الطلب، لاپەڕە (١٠)؛

ئیبنولعیبری: تاریخ الزمان، لاپەڕە (١٠٤)؛ روضة الصفاء، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٦٧٢).

٧٨- سەفەدی: نکت الهمیان، سەرپەرشتی چاپی: ئەحمەد زەکی بەگ، قاهیرە(١٩١١ز) لاپەڕە (١١٨).

٧٩- مەهارشی عەقیلی: (محیّ دین کوڕی ئەبوحارث کوڕی مەهارشی عەقیلی)یە، یەکێکە لە میرانی عەرەب، خاوەنی (حەدیثە) و (عانە) بووە، ساڵی(٤٩٩)کۆچی مردووە، ئیبنوخەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٧٣)؛ ئیبنو عیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەیروت(بەبێ ساڵی چاپ) بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٨٨).

٨٠- (عانە) شارۆچکەیەکی بە ناوبانگی نێوان (رقە) و (هیت)ە و بە شارۆچکەیەکی سەر بە (جەزیرە) دادەنرێت، دەکەوێتە سەر رووباری (فورات)، قەڵایەکی پارێزراو و سەختی تیا بووە؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٧٢).

٨١- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (١٩١-١٩٣)، ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤١)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕەکانی (٣٤-٣٥)؛ مەقریزی: تعارض الحنفا، ساغکردنەوەی: جەمالەدین شیبال، قاهیرە(١٩٤٨ز) لاپەڕە (٢٨٠)؛ ئیبنوعیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٨٧) دیاربەکری: تاریخ الخمیس، بەیروت، (بەبێ ساڵی چاپ) بەرگی دووەم، لاپەڕە (٣٥٩)؛ سەید ئەمیر عەلی: مختصر تاریخ العرب، وەرگێڕانی (عەفیف بەعلە بەگی)، (بەیروت، ١٩٦١ز) لاپەڕە (٢٧٢)؛
Sir William Muir: The cailphate, p 76.

٨٢- فارقي: تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (١٥٤).

٨٣- تلخیص مجمع الاداب، پاری یەکەم، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٤١١).

٨٤- ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٧)؛ بەنداری: تاریخ دولة ال سلجوق، لاپەڕە (١٩)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مراة الزمان، لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٨٢).

٨٥- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٧٢)، ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٧).

٨٦- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٧٥).

٨٧- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٨٩)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٠٥)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٦٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە



(٦٤٧)؛ بەنداری: تاریخ دولة ال سلجوق، لاپەڕە (١٩)؛ عەبدولرەحمان سەنبوتی ئەربلی: خلاصة الذهب المسبوك، لاپەڕە (٢٦٦).

٨٨- ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٧)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٨٢).

٨٩- ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٧)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕەکانی (٥٩-٦٠).

٩٠- مراة الزمان، لاپەڕە (٥٥).

٩١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩٢- پەتی یاقوتی سوور: یەک لە گەوهەرە گرانبەها تایبەتەکانی میر (ئەحمەد کوڕی مەڕوانی) کوردی بووە، کاتێک (پاشا عەزیز بووەیهی) هاتە وڵاتی مەڕوانییەکان لە ساڵی(٤٣٥ک/ ١٠٤٣ز) لە ئەوی کڕی، هەر ئەم گەوهەرە تا ساڵی(٤٤١ک/ ١٠٤٩ز) لە دەست (نەسرولدەولە) مایەوە، ئیتر ئەوەبوو لەو ساڵەدا بە دیاری پێشکەشی سوڵتان (تەغرول بەگ)ی کرد؛ فارقی: تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (١٤٤)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕە (٥٢).

٩٣- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٩٠)، ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٠٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٨)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٠)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٦٤)؛ ئیبنولکازرونی: مختصر التاریخ، لاپەڕە (٢٠٧)؛ ئیبنودەحیە: النبراس في تاریخ خلفاء بني العباس، لاپەڕە (١٤٠)؛ صائغ: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٤٩)؛ لە بارەی پێناسەی (تەغراء)یش بگەڕێوە بۆ لاپەڕە (١١٦)ی دەقە عەرەبییەکە.

٩٤- راوندی: راحه الصدور، لاپەڕە (١٧٦).

٩٥- تلخیص مجمع الاداب، بەشی یەکەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٣٧٩).

٩٦- حەسەنێن: سلاجقة ایران و العراق، لاپەڕەکانی (٤٣-٤٤).

٩٧- (ناجی) و کەسانی تر: الدولة العربیة في العصر العباسي، (بەسرا، ١٩٨٩ز) لاپەڕە (٣٩٩).

٩٨- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشت، لاپەڕە (١٦٦).

٩٩- ئیبنولئەثیر: الکامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦١٣).

١٠٠- تاریخ البیهقی، لاپەڕە (٥٠٦)؛ نیزامی عەروزی سەمەرقەندی: چهار مقاله(چوار وتار)، لاپەڕە

(٣٢)؛ ئیبنو تەبا تەبا: الفخري في الاداب السلطانية، لاپەڕە (٢٩٢)؛
Fisher: The Middle East History, p 94.

١٠١- حەسەن ئیبراهیم حەسەن و عەلی ئیبراهیم حەسەن: النظم الاسلامية، (قاهیره ١٩٣٩ز) لاپەڕەکانی (٩٢-٩٣).

١٠٢- النظم الاسلامية، لاپەڕەکانی (٩٢-٩٣)؛ عەلی حوسنی خەربوتلی: غروب الخلافة الاسلامية، قاهیره (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (١٣٠).

١٠٣- بەغدادی: تاریخ بغداد، بەرگی نۆ، لاپەڕە (٤٠٣)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشت، لاپەڕە (٢٠٧) ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٤٧).

١٠٤- حوسەینی: زبده التواريخ، لاپەڕە (٢٤)؛ ئارنۆلد: تاريخ الترك في اسيا الوسطى، لاپەڕە (١٠٨)؛ ئەحمەد شەلەبی: التاريخ الاسلامي و الحضارة الاسلامية، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٦٠).

١٠٥- تۆماس ئارنۆڵد: الخلافة، وەرگێرانی: حەسەن حەیدەر لوبنانی،(بەغداد، ١٩٦١ز)، لاپەڕە (٥٥).

١٠٦- راحة الصدور، لاپەڕە (١٦٠).

١٠٧- نیزامولمەلیک: سیستنامە، راستکردنەوەی عەباس ئیقبال، (١٣٢٠ هەتاوی/ کۆچی)، لاپەڕەکانی (٥٢-٥٣)؛ راحة الصدور، لاپەڕە (١٦٧)؛ حەسەنێن: سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕە (١٥٦).

١٠٨- بە درێژی ناچینە نێو قسە لە بارەی سوڵتان، بە باشمان زانی بیرۆکەیەکی کورتی لە بارەوە بخەینە بەردەست.

١٠٩- فەوزی ئەمین تاها: نظام السلطنة في الدولة العباسية، نامەیەکی ماجستێری بڵاونەکراوەیە (زانکۆی موسڵ، ١٩٨٤ز) لاپەڕە (٦٥).

١١٠- وشەی (حجابة) لە بنجدا بۆ (حجب الشيء) پەردە پۆشکردنی شتێک دەگەڕێتەوە، (حجبة) واتە شاردیەوە، وەکو زاراوەش واتە: شاردنەوەی سوڵتان لە رەعیەتەکەی... (حاجب)یش بە هەموو ئەو کەسانە دەگوترێت کە لە دەرگای (سوڵتان)دا دەوەستن و، ماوەی لێدەخوازن بۆ هاتنە ژوورەوەی رەعیەتەکەی، (حاجب) بە (دەرگاوان)ی ئەمڕۆ دەچێت، لە رووی ئیشەکانی؛ فەیروز ئابادی: القاموس المحيط، (بەیروت، ١٩٨٣ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٤)؛ سابی: رسوم دار الخلافة، ساغکردنەوەی: میخائیل عەواد(بەغداد، ١٩٦٤ز) لاپەڕە (١١)؛ قەلقشەندی: صبح الاعشى، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٤٤٩)؛ بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە ئیدریس سلێمان محەمەد: نظام الحجابة في الدولة العربية الاسلامية، نامەیەکی ماجستێرە، (زانکۆی موسڵ، ١٩٨٩ز) هەردوولاپەڕەکانی (١٥) و (٣١).



١١١- تەغراء: واتە خەتی پاشا و ئیمزاکەی؛ کاشغری: ديوان لغات الترک، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٥٥)؛ هەروەها ئەو دەستەواژەیە کە لە سەرووی نووسراو و لەسەر (بسم الله)ش بە خەتێکی پان دەنووسرێت، ناواخنەکەشی پەسنی ئەو پاشایەیە کە نووسراوەکەی لە لادا دەرکراوە؛ محەمەد تونجی: المعجم الذهبي: (بەیروت ١٩٦٩ز)، لاپەڕە (٣٩٨)؛ عەلی جەواد تاهر: لامية الطغرائي، (بەغداد، ١٩٦٢ز)، لاپەڕە (٢)؛ بەڵام (تەغرائی) سەرۆکی دیوانی مۆر(تەمغە)یە؛ ئیبنوخەلەکان: وفيات الاعيان، بەرگی دووەم، لاپەڕە (١٨٩).

١١٢- (ئستیفاء) بە بەڕێوەبەری ئەم پۆستە دەگوترێت(مستەوفی)، لە رووی گرنگیدا لە دوای وەزیر دێت، سەرپەرشتیاری کاروباری دارایی وڵات دەکات، ئەرکەکانی زۆر لە ئەرکەکانی وەزیری دارایی دەچێت لە رۆژی ئەمڕۆماندا؛ قەلقشەندی: صبح الاعشى، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٤٦٦)؛ ئەمین: العراق في العهد السلجوقي، لاپەڕە (١٩٨).

١١٣- حەسەنێن: سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕە (١٥٦).

١١٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٥٧).

١١٥- موحسین محەمەد حوسێن: اربيل في العهد الاتابكي، لاپەڕەکانی (٢١-٢٢).

١١٦- لە بارەی سۆزی میرە کوردەکان بۆ سوڵتان (تەغرول بەگ) بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی (٨٨-٩٤)ی دەقە عەرەبییەکە.

١١٧- ژمارەیەک لە لێکۆڵەرەوان باسیان لە سیستمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی میرنشینە کوردییەکان کردووە، لەم بارەیەوە بڕوانە: نەقشەبەندی: الكرد في الدينور وشهرزور، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٥٢) و(٢٥٦) و؛ اذربيجان، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٧٦) و (٤٠٤)؛ نامەکەی ئەحمەد عەبدولعەزیز: الهذبانيون، هەردوو لاپەڕەکانی (١٢٧)و(١٤٥)؛ نامەکەی مەحمود یاسینی تکریتی: الامارة المروانية، لاپەڕەکانی (١٣٦) و دواتری.

١١٨- نیزامولمەلیک: سیستنامە، لاپەڕە (٥٤)؛ حەسەنێن: سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕە (١٦٣).

١١٩- ناجی: الدولة العربية في العصر العباسي، لاپەڕە (٤٣٢).

١٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٢١- ئیبنو مەنزور: لسان العرب، (بەیروت، ١٩٨٦ز)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٠٥).

١٢٢- سیستمنامە: لاپەڕەکانی (٧٣-٧٤)؛ فاروق عومەر فەوزی: تاريخ العراق، لاپەڕە (٣٢٩).

١٢٣- الدولة العربية في العصر العباسي، لاپەڕە (٤٣٦).

١٢٤- (شەحنە): ئەو کەسەیە کە توانای ئەوەی هەبێت کاروبارەکانی وڵات ڕێکبخات؛ زوبەیدی: تاج العروس(میسر١٣٠٦ک) بەرگی نۆیەم، لاپەڕە (٣٥١)؛ لە لایەن سوڵتانەوە دادەمەزرێنراو وەکو بەرپرسی ئاسایشی شار وابوو؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٧٣).

١٢٥-ئەمین: تاريخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕە (٢٠١).

١٢٦- بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٧٦).

١٢٧- ناجی: الدولة العربية في العصر العباسي ، لاپەڕە (٤٣٦).

١٢٨- هەمەدانی: جامع التواريخ (تاريخ المغول)، لاپەڕە (٢٩٥).

١٢٩- لە بارەی درێژەی باسی ململانێی نێوان میرە عەننازییەکان، بڕوانە: ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨) و (٥٣٠) و(٥٣٢) و (٥٣٤)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور و شهرزور، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٣٠) و (٢٣٥).

١٣٠- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١١٤)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٠٩).

١٣١- ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٦)؛ ئەبولفیداء: المختصر: بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٧).

١٣٢- ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٥٠٧) و(٥٢٦)؛ ئەبو لفیداء: المختصر: بەشی دووەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٥٤).

١٣٣- ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)

١٣٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٣٢) و(٥٣٩)؛ بەدلیسی: الشرفنامە، لاپەڕە (٣٩).

١٣٥- ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٢)

١٣٦- باتنیە: یەک لەو زاراوانەیە، کە بزووتنەوەی ئیسماعیلی خراوەپاڵ (ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق)ی پێدەناسرێت، بۆیە بە (باتنیە) ناونراوە، چونکە گوایە لەسەر نادیار (باتن)ئیش دەکەن، ئەمەش بەرامبەر بە (دیار) (ظاهر)ە، چونکە ئەوان بۆ هەموو (ظاهر)ێک (باتن)ێک دادەنێن و بۆ هەموو ئایەتێکی دابەزیویش (تأویل)ێکیان هەیە:

مقالات الاسلاميين، ساغکردنەوەی(ریتەر)، (ئەستەمبۆل، ١٩٢٩ز)، بەشی یەکەم لاپەڕە (٢٦).

١٣٧-(نیزامولەلیک)ی وەزیر کتێبێکی بەهێزی لەسەر سیستەمی فەرمانڕەوایی داناوە، ناوی ناوە (سیستەمنامە)، ئەم کتێبەی بە فارسی نووسیوە، بە شێوەیەکی گشتی رای هەموو ئەوانەی تێدا



کورتکردۆتەوە، کە پێشەخۆی لە سیستەمی فەرمانڕەواییدا بەشدارییان کردووە، ئەمەشی لەسەر شێوەی کتێبەکەی(ماوەردی) داناوە(الاحكام السلطانية)، تیاشیدا کارگێڕیی لە دەوڵەتی سەلجوقیدا ئاشکرا کردووە؛ بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: سیستەمنامە، هەردوو لاپەڕەکانی (١٥) و(١٠٤)؛ ئەوەی شایانی باسیش بێت، نیزامولەلیک لەو کتێبەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دەوڵەتی سەلجوقی لە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت، پشتی بە نەتەوەکانی تری بێجگەی تورک دەبەست، وەکو کورد و دەیلەم و عەرەب و بێجگەی ئەوانەش، هەرچەندە ئەم رەگەزانەش وەکو دانەری کتێبەکە دەڵێت: شارەزایی پێویستیان نەبووە بۆ ئەو مەبەستە... لاپەڕە (١٢٦).

١٣٨- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣١)، ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزە، لاپەڕە (٨٨)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٧٣).

١٣٩- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢٥-٢٦)؛ تاريخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٦٧).

١٤٠- ئیبنولئەثیر: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٤١- ئیبنولعومرانی: الانباء في تاريخ الخلفاء، لاپەڕە (١٩٥).

١٤٢- ئیبنولئەثیر: الكامل ، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٠)، (١٠٠) ، (١٠٦) ، (١٢٥).

١٤٣- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی ئەرمینیا ، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٦).

١٤٤- زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٧).

١٤٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٤٦- (باب) شارێکە دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای دەریای (خەزەر)، وەکو وشە عەرەبییە و کوردیەکەی (دەربەند)ە، بە (دەربەندی شیروان)یش دەناسرێت.. یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٠٣)؛ قەزوینی: آثار البلاد، لاپەڕە (٥٠٦).

١٤٧- فصول من تاريخ الباب وشروان، مینۆرسکی بڵاویکردۆتەوە، لاپەڕە (١٥).

١٤٨-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# بەشی سێیەم

**یەکەم: هەڵوێستی سوڵتانە سەلجوقییەکان لە میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان:**

أ- هەڵوێستی سوڵتان تەغرول بەگ لە میرنشینە کوردییەکان.

ب- هەڵوێستی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان لە میرنشینە کوردییەکان.

**دووەم: پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان کوردو سەلجوقییەکان:**

أ- بالیۆزەکان لە سەردەمی هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ) و (ئەلب ئەرسەلان):

ب- دیارییەکان

ج- ژن لێکهێنانەکان

**سێیەم: رۆڵی کورد لە سوپای سەلجوقی:**

**چوارەم: شەڕی مەنازگەرد (مەلازگەرد) (٤٦٣ک/١٠٧١ز)و، شوێنەواری بەسەر پەیوەندییە کوردییە سەلجوقییەکان.**

**یەکەم: هەڵوێستی سوڵتانە سەلجوقییەکان لە میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان**

دوای سەرکەوتنیان بەسەر بزووتنەوەی (بەساسیری) و یاخیبوونەکەی (ئیبراهیم یەناڵ)دا، سەلجوقییەکان توانیان خۆیان بە باشی لە جیهانی ئیسلامیدا بسەپێنن، بە تایبەتیش دوای ئەوەی لە ساڵی (٤٤٧ک/١٠٥٥ز) (بەغداد)ی پایتەختی خەلافەتیان کەوتە ژێر دەست، ئەو سیاسەتە کە سوڵتانەکانیان بۆ فەرمانڕەوایێتی (بەغداد) گرتیانەبەر، هیچ جیاوازییەکی لەو سیاسەتەیان نەبوو کە لە هەرێمەکانی دیکەدا پیادەیان دەکرد، ئەوە نەبێت، پایەیێکی رۆحیان لە خەلیفەی عەبباسی دەبینی و لەوەوە مافی فەرمانڕەوایێتیکردن و شەرعییەتیان لە دەسەڵاتداریدا وەدەست دێنا[١].

هەرچەندەش سوڵتانەکانیان (بەغداد)یان جێدەهێڵا، بەڵام فەرمانڕەوایێکی سەربەخۆیان بەسەردا جێدەهێشتن، پێی دەگوترا، راگر (عەمید)، هەروەها بەرپرسێکی ئاسایشیشیان بۆ دادەنا، پێی دەگوترا (شەحنە)[٢]، هەروەها هێزێکی سەربازی گەورەیان دەخستە بەر دەستی ئەم دوو بەرپرسانە، بەمەش (خەلیفە) بۆ ویستی (سوڵتان) وەدەست دەهات و لە بێجگەی پایە ئایینیەکەی هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی نەدەما، تەنانەت سوڵتانی سەلجوقی ئەو برە پارەیەی بۆ زامندەکرد، کە بەشی هەموو پێویستییەکانی دەکات[٣]، بە تایبەت دوای ئەوەی هاتن بۆ هەر یەکە لە خەلیفە عەبباسییەکان هەرێمێکیان بریەوە، کاروباری ئەو هەرێمانە چەند کەسانێک بەرێوەیان دەبرد، لە سەروویانەوە وەزیرو نووسەری (الانشاء)، لە سای ئەو بارەشدا، لە بێجگەی ناوهێنانی لە خوتبەو هەڵکەنینی ناوەکەی بەسەر پارەو دراوەکانی دەوڵەتدا، ئیتر خەلیفە هیچی تری بۆ نەمایەوە[٤].

سیاسەتی سەلجوقییەکان لە وڵاتی کورداندا شێوازێکی تایبەتی وەرگرت و بە چەندین قۆناغی مێژوویی گرنگدا تێپەڕی، بە هۆی پەلکێشانی ئەو هێزە نوێیەوە کورد ئازارێکی زۆری چەشت، بە تایبەت دوای ئەوەی هێزەکانیان لەسەرەتاوە هەڵسان بەتاڵان و دزینی ماڵ و سامان و خێراتی ناوچە کوردییەکان.

سەلجوقییەکان ئەگەرچیش دەسەڵاتە سیاسییە کوردییەکانیان هێڵایەوە، بەڵام سیاسەتێکی بەوپەڕی زیرەکییان گرتەبەر، ئەوەبوو سوور بوون لەسەر ئەوەی نوێنەرو فەرمانبەر و هێزەکانیان بەسەر هەرێمە کوردییەکاندا بهێڵنەوە، لە هەمان کاتیشدا ئەو



سەرچاوە زۆرانەی خێروبێر کە هەر تەنیا لەو ناوچانەدا هەبوون، ئەوەشیان بۆ خۆیان بەکاردێنا.

هەندێ لە لێکۆڵینەوە نوێیەکان[٥] زێدەڕەوییان کردووەو گوتوویانە: لە ئەنجامی باڵکێشانی سەلجوقییەکان بەسەر ناوچە کوردییەکاندا و بەکاربردنی سەرچاوە ئابوورییەکانی ئەو ناوچانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان، هەرێمە کوردییەکان رووبەڕووی کاولی و وێرانەیی هاتن، بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە دەقە مێژووییەکان، هەست دەکەین لە دواتردا جۆرە لەیەک گەیشتنێک لە نێوان هەردوولادا دەبینرێت، چونکە هەردوو لایەنی کوردی و سەلجوقی لە چەندین بواری سیاسی و سەربازی و کۆمەڵایەتیدا، پەیوەندی بەهێزیان لە نێوان خۆیاندا دامەزراند[٦]، هەردوولا ویستیان خۆشەویستی ئەویتر بۆ خۆیان رابکێشن، کاریشیان لەسەر بەردەوامبوونی ئەو پەیوەندییە باشەی نێوانیان کرد، کەواشبێت مەسەلەکە بەو شێوە خراپییە نەبووە وەکو ئەو لێکۆڵەرانە بۆی دەچن.

سەلجوقییەکان وەکو هێزێکی داگیرکەر لەسەرەتادا لەو شوێنانەی دەستیان بەسەردا دەگرت، قەوارەی سیاسییان دانەدەمەزراند، بەڵکو هەر بەوە وازیان دەهێنا ،کە لە زۆربەی شارەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی و شارە کوردییەکانیش سەربازگەیەکی پڕ لە چەکداریان جێدەهێڵا، بۆ ئەوەی مانەوەی دەسەڵاتیان بەسەر ئەو ناوچانەدا زامن بێت، دەگونجێت هۆی ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ئەوان دابی کۆچەرییان بەسەردا زاڵبوو[٧].

ئەوەی شایانی تێبینی کردنیشە، سوڵتانە سەلجوقییەکان شارە کوردییەکانیان بەباش دەزانی، بۆ ئەوەی تیایاندا نیشتەجێ بن، بۆیە (بەغداد)یان جێهێشت و ناوچە کوردییەکانیان کردە شوێنی تیادانیشتنیان، دەشێت هۆی ئەمەش بۆ پێکهاتەی سروشتی شاخاوی وڵاتی کورد بگەڕێتەوە، کە ئەم وڵاتە بەوە جیادەکرێتەوە شوێنێکی جوگرافی گرنگی هەیە، یان لە ئەنجامی تێکەڵاوبوونی تورکە سەلجوقییەکان لەگەڵ کورد، سیاسەتێکی کۆمەڵایەتیی لە نێوانیاندا دروستبوو، یان هەستی (ئینتیماء) وای لێکردن، چونکە هەردوولا لە بنەچەی (ئاری)ن... جگە لەمەش، سروشتی پێکهاتەی جوگرافی وڵاتی هەردوولایان لە رووی تۆبۆگرافییەوە لە یەک نزیک بوو.

دەگێڕنەوە سوڵتان (تەغرول بەگ) زۆر دەهاتە وڵاتی کوردان، لە ساڵی (٤٥٥ک/١٠٦٣ز) بەر لەوەی بەرەو (بەغداد) بێت، بۆ رێککەوتن لەگەڵ خەلیفەی عەبباسی (قائیم بی ئەمریڵڵا) لەسەر چۆنیەتی مارەبڕینی کچەکەی، لە (ئورمییە)

دادەنیشت[٨]، هەروەها سوڵتان سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئاهەنگەکانی ئەو ژن گواستنەوەی لە دەرەوەی (بەغداد) بەڕێوە بچێت، بۆیە یەک لەشارەکانی ئازەربێجان بە ناوی (تەبریز)ی بۆ ئەو مەبەستە هەڵبژارد، شایانی باسە سوڵتان (تەغرول بەگ) ئەو کچەی خەلیفەی لە (شەعبان)ی (٤٥٤ک/١٠٦٣ز) مارەبڕیبوو[٩].

لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) لە پایتەختی خەلافەت هاتەدەر، رووەو وڵاتی شاخ هات، لە شارەکانیدا ماوەیەک دانیشت، دوای ئەوە نەخۆش کەوت و، هەر لە (رەمەزان)ی ئەو ساڵەدا لەو ناوچانەدا کۆچی دوایی کرد[١٠].

دیاردەی هەڵبژاردنی شارە کوردییەکان بۆ تیادانیشتن لەلایەن سوڵتانەکان، چونکە ئەو شارانەیان بۆ ئەو مەبەستەیان بە باشتر زانیوە، درێژەی هەبووە، ئەوەتا سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)یش هەندێ جار هەر شارەکانی وڵاتی کوردی هەڵدەبژارد بۆ تیادانیشتن، بۆیە کاتێک خەلیفە (قائیم بیئەمریڵلا) پۆشاک و نازناوەکانی بە سوڵتان بەخشی لە ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز)، (ئەلب ئەرسەلان) لە شاری (نەقجوان)[١١]ی کوردی بوو، هەروەها زۆربەی ئەو هێرشانەی سوڵتانی ناوبراو بۆ سەر وڵاتی (ڕۆم)دا فەرماندەیی دەکرد، خاڵی تیادەرچوونیان شارە کوردییەکان بوو[١٢]، وەکو تێبینیش دەکرێت ئەو دیاردەیە لەلای زۆربەی سوڵتانەکانی دەوڵەتی ئالی سەلجوق هەر مابوو، چونکە لە ماوە لێکجیاکانی دواتریشدا زۆربەی ململانێکانی نێوان سوڵتانەکانیان لە شارە کوردییەکان روویدەدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی ئەو شارانە لە رووە سیاسی و ستراتیژی و ئابوورییەکاندا. ئەو شارانە پارێزراو و سەخت بوون، چونکە زۆربەیان کەوتبوونە ناوچەی شاخاوی، یان دۆڵی بەرزو یان لە پاڵ لوتکەی شاخان، کە ئەمەش وای لێدەکردن، دەست بە سەر داگرتن و داگیرکردنیان زەحمەت بێت، بۆیەش سوڵتانەکان دەیانکردنە بارەگا بۆ خۆیان، لە مەودواش ئەم لێکۆڵینەوەیە، سیاسەتەکانیان لە بارەی کوردەوە دەخاتەڕوو.

## أ- هەڵوێستی سوڵتان (تەغرول بەگ) لە میرنشینە کوردییەکان:

سیاسەتی سەلجوقییەکان لەگەڵ کورد زۆر لە سیاسەتی بووەیهییەکان لەگەڵیاندا جیا نەبوو، ئەمەش چونکە ئەوانیش دیسانەوە لەو رەگەزە بێگانەییانە بوون، کە بۆ هەمان مەبەستی بووەیهییەکان هاتبوونە جیهانی ئیسلامی، بۆیە حەزی باڵکێشان و فراوانبوونیان



هەر لە سەرەتای هاتنیان بۆ ناوچەکە لێ دەخوێنرایەوەو ئاشکرا بوو، بۆشمان دەرکەوت کە کورد چۆن هاتنە ژێر ڕکێف و، گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سوڵتان (تەغرول بەگ) ڕاگەیاند، هەروەها چۆن ناوچە کوردییەکان رووبەڕووی هەندێ وێرانەیی بوونەوە، سیاسەتی سەلجوقیش وابوو، ئەو قەوارانە بهێڵێتەوە کە دان بە بوون و دەسەڵاتەکەی دادەنێن، بەڵام ئەگەر بارێکدا هەر بەرەنگارییەکی لە یەکێک لەو قەوارانە رووبەڕوو ببوایەوە، ئەوا یەکسەر ئەو قەوارەیە، یان ئەو میرنشینەی لە سەر نەخشەی زەوی دەسڕیەوە.

ئەمەش بە کارەکی روویدا، سوڵتان (تەغرول بەگ) دەسەڵاتی ئەو میرنشینە کوردییانەی هێشتەوە، کە میرەکانیان دانیان بە دەسەڵاتەکەی دانا، وەکو میرەکانی ڕووادی و شەدادی و مەڕوانی، بۆیە ئەمانە پارێزگارییان لە سەربەخۆییان لە ناوەخۆی میرنشینەکانیان کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا هەر سوڵتان (تەغرول بەگ) بە توندی لەوانەی دا کە بە روویدا وەستان، وەکو میرنشینی عەننازی کە لە سەرەتای دەرکەوتنی سەلجوقییەکاندا لە دژیان وەستا، یەک لە لێکۆڵەرەوان دەڵێت: کاتێک سوپاکانی سەلجوقی هاتنە نێو هەرێمە کوردییەکان، هەندێ لە هۆزە کوردەکان بەرپەرچیان دانەوەو بە توندی بە روویاندا وەستان، بە تایبەتیش لە شارەکانی هەرێمی (چیاکان)[١٤]، کە هێزی سەلجوقییان لەو هەرێمەدا رووبەڕووی بەرگرییەکی توندبوونەوە[١٥]، بۆیە زاتی بەردەوامبوونیان نەکردو لە بەردەم ئەم هەڵوێستەو لەبەر قورسی تێپەڕین بە چیایە کوردییەکان، سوڵتان (تەغرول بەگ) سوپاکەی کردە دوو بەش، یەکەمیان رووی لە باکوور کرد بەرەو (تەبریز) مەبەستی (ئازەربێجان)و (ئەرمینیا) بوو، دووەمیش رووەو باشوور هات ئامانجی ئەوەبوو لە ڕێگەی وڵاتی کورداندا تێپەڕێت و بگاتە پایتەختی خەلافەت[١٦].

کاتێک هێزەکانیان دەستیانکرد بە تێپەڕین بە زەوییەکانی وڵاتی کورد لە هەرێمی (چیاکان)، هۆزە کوردییەکانی دانیشتووی ئەو هەرێمە رووبەڕوویان بوونەوە، ئەوەتا (ئیبنولئەثیر) لە بارەی بەرەنگاری میرەکانی (بەنی عەنناز)ی شازنجانی دەڵێت: (بەرگرییان لێکرد، بۆ ئەوەی بیپارێزن و نەیەڵن داگیر بکرێت - واتە لە وڵاتەکەی خۆیان/ وەرگێڕ -، بۆیە شەڕیان لەگەڵ کردن و لێیان دوورخستنەوە، ئیتر ئەوانیش وازیان لێهێنا)[١٧].

میر (ئەبولشەوک فارس محەمەدی کوڕی عەنناز) رۆڵێکی زۆر گرنگی لەو

بەرەنگاربوونەوەیان یاریکرد، بەڵام نەیتوانی بەردەوامی بە بەرەنگارییەکەی بدات، چونکە لە ساڵی (٤٣٧ک/ ١٠٤٥ز)دا مرد[١٨]، دوای ئەویش (موهەلهیل)ی برای دەسەڵاتی گرتە دەست، لێرەشدا (سەعدی)ی کوڕی میری مردو، دەستی لەگەڵ سەلجوقییەکان تێکەڵ کردو لە دژی (موهەلهیل)ی مامیدا رایکێشانە نێو زەوییەکانی میرنشینەکەیان، بەمەش سەلجوقییەکان دەستیان خستە نێو کاروباری میرنشینەکە، بۆیە ئیتر میرنشینەکە ململانێیەکی تاڵی نێوان میرەکانی بەخۆوە بینی و، بەمەش باری بەرگرییەکەی زۆر لە جاران سەختتر بوو[١٩].

لەوەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە کورد بە شێوەیەکی گشتی سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سەلجوقییەکان دەربڕیوە، بۆیە سوڵتان (تەغرول بەگ)یش بڕیاریداوە دەسەڵاتی میرەکانیان هەر بمێنێت و بەمەش دەسەڵاتی وڵاتەکەیان هەر لە دەست خۆیاندا ماوە[٢٠]، هەروەها سوڵتان سووربوو لە سەر ئەوەی، کە کورد گوێڕایەڵی بۆ بکەن، بۆیە لە ساڵی (٤٤١ک/ ١٠٤٩ز) میرنشینی مەڕوانی گوێڕایەڵی خۆی لە بۆ راگەیاند[٢١]، لە ساڵی (٤٤١ک/ ١٠٥٤ز)یش میر وەهسوزانی روادی دانی بە دەسەڵاتیان دانا[٢٢]، هەروەها میر (ئەبولئەسواری شەداد)ی خاوەنی (جەنزە)ش هاتنە ژێر رکێفی خۆی لە بۆیان راگەیاند[٢٣]، بەڵام میرەکانی میرنشینی عەننازی، دوای ململانێیەکی درێژو تاڵی نێوان خۆیان، ئینجا لە ساڵی (٤٤٢ک/ ١٠٥٠ز) میر (موهەلهیلی کوڕی محەمەدی کوڕی عەنناز) هاتە لای سوڵتان (تەغرول بەگ)و دانی بە دەسەڵاتەکەیان دانا، سوڵتانیش باشی لەگەڵدا کردو لە سەر موڵکەکانی و زەوییەکانی خۆیدا هێڵاییەوە[٢٤]، هەندێ لەو هەرێمانەی پێبیدایەوە (سیروان)و (داقوقا)[٢٥]و (شەهرەزوور)و (سامغان)بوون... هەروەها لە ئەنجامی شەفاعەتەکەیدا بۆ (سەرخاب)ی برای، کە لە لای سوڵتان بەندبوو، سوڵتان (سەرخاب)یشی بەرداو، ئەمەش بەرەو قەڵای (ماهکی)[٢٦] هات، کە یەک لە ناوچەکانی خۆیان بوو، هەروەها سوڵتان قەڵای (راوندین)[٢٧]ی دایە میر (سەعدی کوڕی ئەبی شەوک)[٢٨].

ئەم گێڕانەوەیە بەڵگەی ئاشکرایە لە سەر گوێڕایەڵبوونی میرە کوردەکان بۆ دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، چونکە سوڵتان (تەغرول بەگ) دانی بە میرەکانیان دادەناو لە دەسەڵاتدا دەیهێشتنەوە، میرێکیش وەکو پێویست بە دڵ نەبووایە، لە سەر کار لادەبرا، بەڵام لەگەڵ



ئەوەشدا کورد توانیان پارێزگاری لە قەوارە سەربەخۆکانیان بکەن، چونکە ئەو قەوارانەیان کۆنترین و پتەوترین قەوارە بوون لەو وڵاتانە، میرەکانیشیان سیاسەتێکی تایبەتیان پەیڕەوکرد بۆ پاراستنی ئەو قەوارانە، ئەوەبوو دیاری و پارەیان لەو پێناوەدا بۆ سەلجوقییەکان دەنارد، کە ئەمەش وەکو دەردەکەوێت بۆ ئەم مەبەستە کارێکی بەرهەمدار بووە.

لەم بارەیەوە (ئیبنولجۆزی) دەڵێت: میر (نەسرولدەولەی مەڕوانی) پەتێکی دوڕی سووری هەبوو، لەگەڵ شتانێکی زۆری دیکە، کە نرخەکەیان بە نزیکەی سەد هەزار دینار دەخەملێنرا بە دیاری بە سوڵتان (تەغرول بەگ)ی دا[٢٩]، هەروەها (ئیبنولعیبری)ش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دیارییەکانی ئەو میرە کوردە سی پارچە قوماشی زۆر باش و نایاب و پێنج سەد دینار و ژمارەیەک خێوەت و دە ئێسترو، ئەسپێکی عەرەبی و دیلێکیش لە (بەتریق)ە رۆمەکان بوو[٣٠].

سیاسەتی پارەو دیاری دان بە سەلجوقییەکان هەر بە تەنها لە سەر ئەو میرە مەڕوانییە کورت نابێتەوە، بەڵکو زۆربەی میرە کوردەکان پەیڕەوییان لەو سیاسەتە دەکرد، چونکە سیاسەتی بە پارە سۆز راکێشان یەک لەو سیاسەتە پەیڕەو لێکراو و باوانە بووە لە نێوان هێزە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامی لەو ماوە مێژووییەدا، ئەمە بەڵگە بووە لە سەر گوێڕایەڵی ئەم دەوڵەت و میرنشینە سەربەخۆیانە بۆ دەسەڵاتی ناوەندی، کوردو سەلجوقییەکانیش لە نێوان خۆیاندا رێککەوتنێکی تەواویان هەبووە، بۆیە سوڵتانی سەلجوقی سەربەخۆیی خودی داوەتە کوردەکان، بەو مەرجەی ئەوانیش لە بەرامبەردا بە پارە میزانییەی دەوڵەت بە بەردەوامی دەوڵەمەند بکەن، یان بە واتایەکی تر بەو مەرجەی لە بەرامبەردا ئەو باجانەی لە سەریان دەکەوێت، بۆ خەزێنەی دەوڵەتی ناوەندیی رەوانە بکەن.

ساڵی (٤٤٦ک/ ١٠٥٤ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرەو ئازەربێجان هات، لەوێدا میر (وەهسوزانی روادی) بە گەرمی پێشوازی لێکردو ماڵ و شتێکی زۆری بە دیاری پێدا[٣١]و گوێڕایەڵی خۆی بۆ راگەیاند، بەوەش سوڵتان لێی رازی بوو، هەروەها کە سوڵتان چووە (ئاران) لەوێش میر (ئەبولئەسواری شەدادی) پارەیەکی زۆری بە دیاری پێدا[٣٢].

لە ڕێگەی ئەم ماڵ و دیاری بەخشینە بە سوڵتانی سەلجوقی، میرە کوردەکان توانیان پارێزگاری لە میرنشین و دەسەلاتە سیاسییەکانی خۆیان بکەن، بەلام ئەم سیاسەتەیان لە دواییدا بووە هۆی ئەوەی باری سەر شانیان قورستر بێت، چونکە سەلجوقییەکان وایان لێهات چاویان بڕییە بەشێکی زۆرتری ماڵ و سامانەکانی میرنشینە کوردییەکان و بۆ زۆربەی پڕۆژەو نەخشە سیاسی و سەربازییەکانیان تا رادەیەکی گەورە پشتیان بەو ماڵ و سامانە دەبەست، کە میرە کوردەکان پێیان دەدان.

ئەوەتا لە ساڵی (٤٤٦ک/ ١٠٥٤ز) کاتێک سوڵتان هێرشی کردە سەر شارەکانی (ئەرمینیا)، میر (نەسرولدەولە) دیاری و یارمەتییەکی زۆری سەربازی لە بۆ هەنارد[٣٣]، وەکو دەریش دەکەوێت، پێشکەشکردنی یارمەتییە مادی و سەربازییەکان لە بۆیان، ببووە ئەرک لە سەر میرە کوردەکان، ئەوەتا لە ماوەی بزووتنەوەی (بەساسیری)و ئەو ململانێیەی لە نێوان هێزەکانی سەلجوقی و فاتمی پاڵپشت بۆ فەرماندەی بزووتنەوەی ناوبراو لە ناوچەی جەزیرەی فوراتی، ببووە ئەرک بەسەر شانی میری مەڕوانی، کە دەبێت بە پارە یارمەتی سوپای سەلجوقی بدات[٣٤].

لە ساڵی (٤٤٨ک/ ١٠٥٦ز) میر (نەسرولدەولە) دیاری بۆسوڵتان هەنارد[٣٥]، بەلام هەر هێندە کە سوڵتان (تەغرول بەگ) بە هەواڵی پەیوەندی نێوان فاتمییەکان و ئەو میرە کوردەی بیست، بۆ تۆڵە لێسەندنەوەی بە پەلە هێزی بۆ سەری ناردو جەزیرەی (ئیبنو عومەر)یان گەمارۆدا، هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێداو، هەڕەشەی هێرشی سەربازی لە بۆ سەر میرنشینەکەی کرد، لێرەشدا (نەسرولدەولە) بۆ باشکردنەوەی پەیوەندی نێوانی لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقی، ناچار بوو، بڕێکی دیکەی پارەی لە بۆ رەوان بکات[٣٦].

دوای ئەو پارە زۆرەی لە جاری دووەم (نەسرولدەولە) بە سوڵتانی سەلجوقیدا، وەکو هەوڵێک بۆ رازیکردنی، ئینجا سوڵتان (تەغرول بەگ) رەزامەندی نواند، کە گەمارۆی سەر شارەکانی سەر بە (جەزیرە)ی بشکێنێت، کە سەر بە مەڕوانییەکانن. یەک لە لێکۆڵەرەوان جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە، کە سیاسەتی مەڕوانییەکان هەمیشە ئەوەبوو، دەست وەرنەدەن لەو رووداوە سیاسی و سەربازییانەی کە ناوچەکانی جەزیرەو عیراقیان پێدا تێدەپەڕێت، بۆیە کەوتنە هودنە لەگەڵ سەلجوقییەکان و بەردەوامبوون لە سەر ئەم سیاسەتەیان، بۆیە پەیوەندی باشی نێوان هەردوولا قەت گرژی تێنەکەوت، بە تەنیا لە ماوەی رابوونی بزووتنەوەی (بەساسیری) نەبێت، بەلام میر (نەسرولدەولە) توانی ئەم



کێشەیەی نێوان خۆی و دەسەلاتی سەلجوقی و فاتمییەکانیش بە ئاشتی چارەسەر بکات[٣٧].

میرە کوردەکان بەردەوامبوون لە سەر پەیڕەویکردن لەو سیاسەتەیان لەگەڵ سەلجوقییەکان، بۆیە ساڵێک لە دوای راگەیاندنی میر (ئەبولئەسواری شەدادی) بە سۆزو گوێڕایەڵی خۆی لە بۆ سوڵتان، سوپاکەی لەگەڵ سوپای سوڵتان (تەغرول بەگ) بەشدارییان کردو بەرەو (ئەرمینیا) هاتن، ئیتر ئەوەبوو لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) شاری (ئانی) رووبەڕووی هێرشێکی گەورە بووەوە[٣٨]، ئەم بەشدارییەی سوپای میر (ئەبولئەسوار)یش لەگەڵ سوپای سوڵتان کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو و بووە هۆی ئەوەی بە ئاسانی سەلجوقییەکان دەست بە سەر ئەو شارەدا بگرن.

شایانی باسە سوڵتان (تەغرول بەگ) هەندێک جار میرە کوردەکانی بەکاردەهێنا بۆ وەدیهێنانی مەبەستە سەربازییەکانی، ئەمەش بێگومان لە چوارچێوەی ئەو سیاسەتە پڕ لە زیرەکییەی بوو، کە ئەو سوڵتانە بۆ بەکاربردنی ئەو میرانە پەیڕەوی لێدەکرد، ئەوەتا لە دوای شەڕو ململانێیەکی خوێناوی نێوان تاکەکانی هۆزی عەننازی، (موهەلهیل) ناچاربوو سۆزی خۆی بۆ سوڵتانی سەلجوقی پیشانبدات، سوڵتانیش هەوڵیدا میرەکانی ئەو میرنشینە لە خزمەت سیاسەتە فراوانخوازییەکەی خۆی بەکاربهێنێت، بۆیە لە ساڵی (٤٤٤ک/ ١٠٥٣ز) داوای لە (سەعدیی کوڕی ئەبی شەوک) کرد هێرش بباتە سەر هەندێ ناوچە لە عیراق، (سەعدی)ش بە فەرماندەیی هێزێکی گەورە بە رێکەوت تا گەیشتە (مایدەشت)[٣٩]، ئینجا بەرەو میر (ئەبی دەلفی جاوانی)- یەک لە میرەکانی هۆزی جاوانی – هات، بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵ دا بکات، بەلام میر (ئەبی دەلف) لەبەر مەترسییەکانی لەو هێزە گەورەیە، ناچار بوو لەو ناوچەیە کشایەوە، (سەعدی)ش بە دوای کەوت و ماڵ و سامانەکەی بە تالان برد[٤٠]، هەرچی (ئەبی دەلف) خۆیشی بوو، بە زەحمەتێکی زۆر توانی خۆی دەرباز بکات، بەلام لەگەڵ دەرچوونی ئەو میرە جاوانییەش، هێشتا کاردانەوەی ئەو (غەز)انەی لەگەڵ (سەعدی)دا بوون، زۆر خراپ بوو، لە بەرامبەر ئەو ناوچانەی هێرشیان کردە سەر، ئەوە بوو گەیشتنە (نەعمانییە)[٤١]، دەستیان بە دزین و تالانی ماڵ و سامانی خەڵکەکەی کردو وەکو (ئیبنولئەثیر) دەیگێڕێتەوە: هیچ شتێکیان بەجێ نەهێلا[٤٢]، ئینجا روویان کردە (بەندێنجین)[٤٣].

ئەو سەرچاوە مێژووییانەی لە بەر دەستمان دان، بە وێنەی (الکامل)و (العبر)و

ئەوەش کە ئەوەی سەرووی گێڕایەوە، ئاماژە بەو هۆیانە نادەن، کە پاڵیان بە سوڵتان نا، داوا لە (سەعدی) بکات، بۆ هێرشکردنە سەر شارەکانی ناوەڕاستی عیراق و شەڕکردن لەگەڵ ئەو میرە جاوانییە، ئەگەرچیش یەک لە لێکۆڵەران ئاماژەی بۆ ئەو گێڕانەوەیەش کردووە کە لە سەرووەدا خستمانەڕوو – بەڵام نەهاتووە شیکاری گونجاوی لە بۆ بکات[٤٤].

لە راستیدا سوڵتانی سەلجوقی لە لێدانی میری جاوانی و بەکارهێنانی میر(سەعدی) بۆ وەدیهێنانی مەرامەکانی، ژمارەیەک ئامانجی هەبوو.

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بەکارهێنانی (سەعدی) بۆ فەرماندەیی ئەو سوپایەی لە (غەز)ەکان پێک دەهات، یەکەم مەبەست لێی: بەکارهێنانی ئەو میرە بوو، زیاد لەوەش، سیاسەتی (تەغرول بەگ) لەو قۆناغەدا بە پلە (یەک) لە دەوری ئەوە دەسووڕایەوە، دەسەڵاتی میرە کوردەکان بهێڵێتەوە، بەڵام هەوڵبدات دەست لە کاروبارە ناوخۆییەکانیش وەربدات، هەروەها کێشەو ململانێش بخاتە نێو میرە کوردەکان، ئەمەش بۆ لاوازکردنی ئەو میرنشینانەی لەو قۆناغەدا هێزو دەسەڵاتیان هەبوو، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەم سیاسەتەی سەرکەوتوو بووە، چونکە زۆرجار دەستی خستۆتە نێو کاروباری میرنشینەکان و بەمەش ئاژاوە لە نێو خۆی میرنشینەکاندا بەرپا بووە.

هەرچی ئەو پاڵنەرانەشن کە وایان لە سوڵتان کرد هێرش بکاتە سەر میری جاوانی، ئەوا بە راشکاوی دەڵێین، ئەگەرچی سەرچاوە مێژووییەکانیش تیشکیان نەخستۆتە سەر، بەڵام دەتوانین بڵێین: ئەو میرە، یەک لە میرەکانی ئەو هۆزە کوردییە بووە، کە لە (حیللە)و دەوروبەری دادەنیشتن[٤٥]، دەگونجێت ناکۆکیشی لەگەڵ سوڵتان هەبووبێت، بۆیە سوڵتان هەوڵی دابێت لە رێگەی هێرشکردنێکی سەربازی لە بۆ سەری و تاڵانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاقڵی بکات، جا ئەمە دەشێت پاڵنەری یەکەم بێت بۆ هێرشەکەی سوڵتان، بەڵام هەرچی پاڵنەری دووەمە: ئەوا مەبەست لەم هێرشە ترساندن و ئاگادارکردنەوەی میرە بوویهییە دەسەڵاتدارەکانی (بەغدا) بوو، بۆ ئەوەی بەمە ئاگادار بینەوە، کە ئەوە سەلجوقییەکان لێیان نزیک بوونەوە، چونکە ئەو شوێنانەی هێرشەکەیان کرایە سەر لە دەوروبەری (بەغداد)ی پایتەخت بوون، ئەوەی بەڵگەش بێت لە سەر ئەمە، ئاماژەی مێژوونووسانە، کە دەڵێن: کاتێک هەواڵی ئەو هێرشە گەیشتە بەغدا ترس و



دڵەڕاوکێ کەوتە دڵی بوویهییەکان[٤٦]، (ئیبنولئەثیر)یش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات: کە پاشا (رەحیم)ی دوا میری بوویهییەکان بڕیاریدا بۆ شەڕکردن لە گەڵ (سەعدی) بەرەو (حەلوان) بێت[٤٧]، بەڵام لەم بڕیارەی پەشیمان بووەوە، چونکە دەرکی بەوەکرد، کە ئەو میرە کوردە لە لایەن سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە رەوانکراوە، هەروەها سوپایەکی گەورەی (غەز)ەکانیشی لە ژێر فەرمان دایە، بۆیە ناتوانێت، بەرەو روویان بووەستێتەوە[٤٨]، وەکو دەشزانرێت لەو قۆناغەدا دەسەڵاتی بوویهییەکان تووشی لاوازی هاتبوو، بۆیە هەوڵەکانیان بۆ وەستان بە رووی ئەو هێزە داگیرکەرە تازەیە سەرکەوتوو نەبوو، هەروەها سەرکەوتنی سەلجوقییەکان لەو ناوچانە بوویهییەکانی نیگەران کرد و هەستیان کرد مەترسی لێیان نزیک بۆتەوە.

جگە لە سیاسەتی یارمەتی وەرگرتن لە میرە کوردەکان، سەلجوقییەکان کاریان لە سەر دەست وەردان لە کاری ناوخۆی میرنشینە کوردەکانیش کرد، ئەمەش بووە هۆی ناسەقامگیری سەربەخۆیی کورد لە قەوارەکانیدا، وەکو تێبینیش دەکرێت، دەست تێوەردانی سەلجوقییەکان گەورەو راستەوخۆ ئاشکرا بووە، ئەوەتا هەر لە سەرەتای زاڵبوونیان بە سەر هەرێمی چیاکان (وڵاتی عەننازییەکان)، میرەکانی ئەم میرنشینە دابەشبوونە سەر دوو دەستە، دەستەیەک پشتگیری لە دەسەڵاتی سەلجوقییان دەکرد، کە ئەم دەستەیە خۆی لە میر (سەعدیی کوڕی ئەبی شەوک) دەبینیەوە[٤٩]، ئەو میرەی کە سەلجوقییەکان هەڵیان لەو رقەی وەرگرت کە لە (موهەلهیل)ی مامی هەیبوو، چونکە (موهەلهیل) دوای مردنی میر (ئەبو لشەوک)ی باوکی (سەعدی)[٥٠] لە ساڵی (٤٣٧ک/ ١٠٤٥ز) دەسەڵات و کاروباری میرنشینەکەی گرتبووە دەست، (سەعدی)یش وای هەست دەکرد، کە مامەی دەسەڵاتی بە زۆر لێ داگیرکردووە، بۆیە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو مافەی خۆی خزاندە باوەشی (ئیبراهیم یەناڵ)، کە ئەم (ئیبراهیم)ەش بە رۆڵێکی ترسناک هەڵسا، چونکە (سەعدی)ی لە (موهەلهیل)ی مامی هانداو لەوەش زیاتر هێزێکی لە (غەز)ەکان پێکهاتووی بە یارمەتی پێدا، (سەعدی) لەگەڵ ئەم هێزە هێرشیان هێنایە سەر (حەلوان)، ئەو شارەی کە رووبەڕووی چەندین هێرشی (موهەلهیل)و (سەعدی) بوویەوە[٥١].

دەستەی دووەمی میرەکانی نێو میرنشینی عەننازی خۆی لە میر (موهەلهیل) دەنواند،

که لە دژی دەسەڵاتی سەلجوقییەکاندا وەستاو، چەندین شەڕی لە دژدا کردن، بەڵام سەرەنجام دەرکی بەوە کرد، کە ناکرێت درێژە بەم دژایەتییەیان بدات، بۆیە هات سۆزو گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان راگەیاند(٥٢)، بەم شێوەیە کێشەی سەرەکی نێو میرنشینەکە، بریتی بوو لە ململانێی نێوان میرەکان و بە هاندانی سەلجوقییەکانیش ئەو ململانێیە توند دەبوو، (رۆژبەیانی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە میرە عەننازییەکان لە نێوان خۆیاندا لەگەڵ یەک نەدەگونجان، بۆیە ململانێی نێوانیان لە سەر دەسەڵات سەریهەڵدا(٥٣)، ئەوەش سەلجوقییەکان قۆزتیانەوەو کردیانە هۆیەک بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە دەستوەردەنە نێو کاروبارە ناوخۆییەکانی میرنشینەکە.

دانانی میر (موهەلهیل) بە دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، نەبووە هۆی کۆتایی هاتن بە دەست تێوەردانەکانی ئەوان لە کاروباری ناوخۆی میرنشینەکە، بەڵکو دەست تێوەردانەکانیان زیادی کردو سەر لە نوێ ململانێی نێوان میر (موهەلهیل)و کوڕە براکەی لە ئەنجامی دەستوەردانی سوڵتان لە کاروباری ناوخۆی میرنشینەکە، سەری هەڵدایەوە، چونکە سوڵتان (تەغرول بەگ) لە ساڵی (٤٤٥ک/ ١٠٥٣ز) دوو لە فەرماندەکانی خۆی بە ناوەکانی (ئیبراهیمی کوڕی ئیسحاق)و (سوخت کەمان) بۆ هێرش کردنە سەر میرنشینی عەننازی رەوانکردو توانیان دەست بە سەر (حەلوان)و چەندین شاری دیکەشدا بگرن(٥٤)، بەم شێوەیەش ئەو میرنشینە کوردییەو چەندین میرنشینی دیکەی بێجگەی ئەوەش بوونە قوربانی سیاسەتە فراوانیخوازەکانیان.

میرنشینی (مەڕوانی)ش بە هەمان شێوە لە خراپییەکانی سیاسەتی سەلجوقییەکان رزگاری نەبوو، هەرچەند میر (نەسرولدەولە) یەکەم کەس بوو، سۆزو گوێڕایەڵی و هاوکاری خۆی لەگەڵ سوڵتان راگەیاند، کە تەنانەت بە مردنیشی لە ساڵی (٤٥٣ک/ ١٠٦١ز)(٥٥)، هیچ شتێکی لە پەیوەندی ئەم میرنشینە بە سەلجوقییەکان نەگۆڕی، چونکە دوای مردنی ئەو میرە، میر (نیزامەدین)ی کوڕی جێگەی گرتەوە، ئەگەرچیش ئەمە کوڕە گەورەی (نەسرولدەولە) نەبوو، بەڵکو کوڕە گەورەکەی میر (ئەبو حەسەن سەعید)ی فەرمانڕەوایی ئامەد بوو، بەڵام لە سەر رای (فارقی): (نەسرولدەولە) بۆیە (نیزامەدین)ی لە دوای خۆی هەڵبژارد چونکە: (خاوەنی ئەقڵ و راوبیرو بڕیار بوو)(٥٦).

میر (نیزامەدین) لە ماوەی دەسەڵاتی خۆیدا، رووبەڕووی کێشەو ململانێیەکی زۆری



براکانی بووەوە، بە تایبەتی میر (سەعید)ی برای، کە پەنای بۆ سەلجوقییەکان برد، بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن تا دەسەڵات لە (نیزامەدین)ی برای بسێنێتەوە، ئەوە بوو لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) هاتە لای سوڵتان (تەغرول بەگ)و داوای لێکرد، یارمەتی بدات بۆ هێرشکردنە سەر براکەی، سوڵتانیش رەزامەندی لە سەر داواکەی نواندو یەک لە میرەکانی سوپاکەی و(٥٧)، پێنج هەزار سواری پێدا، تاوەکو هێرش بکەنە سەر میرنشینەکە، ئەو هێزانە هاتنە دەوروبەری (میافارقین)و گەمارۆیاندا، ئینجا دەستیان کرد بە هێرش کردنە سەر ئەو شارە، بەڵام لەبەر سەختی و پارێزراوی شوراکانی ئەو شارە نەیانتوانی بگەنە ناوی، هەروەها میریش لە رێگەی دانی پارەو دیاری تردا، هەوڵیدا سوپا سەلجوقییەکە دوور بخاتەوە(٥٨).

بەم شێوەیە بە دوای ئەوەی میر (نیزامەدین) پارەو هەرێمێکی زۆری بە سوپای سەلجوقی دا، کە (فارقی) ئەو بڕە پارەیە بە پەنجا هەزار دینار دەخەملێنێت(٥٩)، ئینجا سوپای سەلجوقی لە (میافارقین) کشایەوەو بەمەش ئەو مەترسییە بەسەرچوو، کە هەڕەشەی لە میرنشینەکە دەکرد.

لێرەدا ئەوەی جێی ئاماژە بێت (فارقی) ئاماژە بەوە دەدات، کە وەزیر (فەخرولدەولەی کوڕی جوهەیر)(٦٠) ئەو لە (میافارقین) هاتە دەرو قسەی لەگەڵ فەرماندەی سەلجوقی کرد، قەناعەتی پێکرد، کە کۆتایی بە گەمارۆکەی و هێرشکردنە سەر شارەکە بێنێت(٦١)، بەڵام لەمەدا (فارقی) کەوتۆتە هەڵەیەکی ئاشکراوە، چونکە لە راستیدا، لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٢ز) (ئیبنو جوهەیر) وەزیری میرنشینی مەڕوانی نەبووە، بەڵکو لە ساڵی (٤٥٤ک/ ١٠٦٢ز) (قائیم بی ئەمرولڵا)ی خەلیفەی عەبباسی بە دوای (فەخرولدەولە)ی دا نارد، بۆ ئەوەی لە بەغداد وەزارەت بگرێتە ئەستۆ(٦٢)، بەمەش کەواتە ئاشتەواییەکەی نێوان سەلجوقییەکان و مەڕوانییەکان لە رێگەی (فەخرول دەولە)وە بە ئەنجام نەگەیشتووە.

هەروەها (فارقی) جارێکی دیکەش دەکەوێتە هەڵە، کە دێت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، دەڵێت: لە ساڵی (٤٦٠ک/ ١٠٦٧ز)و لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)(٦٣)، میر (سەعید) جارێکی تر یاخی بووەوە لە (نیزامەدین)ی برای، بەڵام لە راستیدا میر (سەعید) لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز)دا مردووە، وەکو مێژوونووسان ئەوە

دەچەسپێنن[٦٤]، جا کەوابێت ئەگەرچیش (فارقی) لە مێژوونووسانی دیکە نزیکتر بووە، لە ڕووداوەکانی ئەو میرنشینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ژمارەیەک هەڵە کەوتووە.

یەکێکی دیکە لە سیماکانی سیاسەتی سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرامبەر کوردو میرنشینە سەربەخۆکانیان، پرەنسیپی دانانان بوو بە دەسەڵاتی سیاسی فەرمانڕەوای کورد، چونکە دەسەڵاتی سەلجوقی کاری گەورەی بەسەر وڵاتی کورددا جێهێڵا، چونکە پاش ئەوەی میرە کوردییەکان دانیان دەنا بە دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، ئەو کاتە سوڵتانیش دانی دەنا، بە دەسەڵاتی میرە کوردە سەربەخۆکان بە سەر هەرێمەکانیان، ئەمەش بۆ هەموو میرنشینەکان هەر وا بووە، میرنشینی عەننازیش لە ساڵی (٤٤٢ک/ ١٠٥٠ز)دا دانانی سەلجوقییەکانیان بۆ دەسەڵاتەکەیان بە دەست هێنا[٦٥].

بڕیاری دانانی سەلجوقی هەموو میرنشینەکانی گرتەوە، میر (وەهسوزانی ڕووادی)ش لە ساڵ (٤٤٦ک/ ١٠٥٤ز) گوێڕایەڵی خۆی بۆ دەسەڵاتی سەلجوقییەکان ڕاگەیاند، سوڵتان (تەغرول بەگ)یش هەر ئەو ساڵە دانی نا بە میرێتی میر (وەهسوزان) بە سەر میرنشینەکەی[٣٣]، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، هەواڵ و زانیاری لە بارەی ئەو میرەوە، هەر لەو ڕۆژەی گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاندووە، تا ساڵی (٤٥٠ک/ ١٠٥٨ز) کاتێک سوڵتان (تەغرول بەگ) دان بە دەسەڵاتی کوڕەکەی (مەملانی کوڕی وەهسوزان) لە شوێنی باوکی بە سەر (ئازەربێجان)دا دەنێت، بە شێوەیێکی زۆر کەم نەبێت، هەر نابینرێت[٦٧].

زانیاری لە بارەی ئەو هۆکارانە لەبەر دەستدا نین، کە وایان لە سوڵتان (تەغرول بەگ) کرد، دان بە دەسەڵاتی (مەملان)دا بنێت، بە سەر میرنشینەکە، چونکە سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ مردنی میر (وەهسوزان)ی باوکی نەکردووە، بۆیە بە دوور نازانرێت (وەهسوزان) هەر لە ژیاندا بووبێت، کاتێک سوڵتان لە دەسەڵاتی دوورخستبێتەوە.

خاوەنی (تاریخ الباب) مردنی میر (وەهسوزان) بۆ ساڵی (٤٥١ک/ ١٠٥٩ز) دەگێڕێتەوە، بە واتە ساڵێک دوای ئەوەی دانرا بە دەسەڵاتی میر (مەملان)ی کوڕی بۆ فەرمانڕەوایێتی میرنشینەکە، ئەمەش زیاتر ئەگەری ئەوە بەهێز دەکات، کە میر (وەهسوزان) لە لایەن سوڵتانەوە زووتر لە سەر کار لابردرابێت، دەشێت هۆی دوورخرانەوەکەشی دڵتەنگی ئەو میرە ڕووادییە بووبێت، لە کارە تێکدەرییەکانی



سەلجوقییەکان، چونکە (وەهسوزان) زۆر لە دەسەڵاتەکەیان بێزار بوو.

لە ڕاستیدا پێشکەشکردنی سۆزو گوێڕایەڵی لە لایەن میرە کوردییەکانەوە، بۆ سەلجوقییەکان، شتێکی ناچاری بوو و پەیوەست بوو بە مانەوەیان لە سەر دەسەڵات.

دوای ئەوەی سوڵتان (تەغرول بەگ) دانی نا بە فەرمانڕەوایێتی میر (مەملان) بە سەر میرنشینی ڕووداوی، دەبینین بە هێزەکانییەوەی دێت هێرش دەکاتە سەر میرنشینەکەو لە ساڵی (٤٥٢ک/ ١٠٦٠ز) سوڵتان شاری (تەبریز)ی پایتەختی میرنشینەکەی ئابلۆقە دەدات[٦٩].

سوڵتان لەو ڕۆژەی لە بەغدا دەرچوو بوو لە دەوروبەری (تەبریز) نیشتەجێ ببوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە مانگی (شەعبان)ی ئەو ساڵەدا وازی لە ئابلۆقەی (تەبریز) هێناو (بە هۆی تاڵان ئەو ناوچانە وێران بوون و خەڵکەکەی لە برسان مردن)[٧٠] بەڵام دوای هاتنی زستان کشایەوە، بۆیە هێزەکانی نەیانتوانی درێژە بە ئابلۆقەکەیان بدەن، هاتنەوە (ڕەی)و بڕیاریدا دوای نەمانی بەفر بگەڕێتەوە، (سەبتی ئیبنولجەوزی) دەڵێت: لە دوای کۆتایی هاتنی زستاندا نەیتوانی هێرشەکەی دووبارە بکاتەوە، چونکە سوپاکەی ماندوو بوون و کۆمەکی پێویستیشی نەبوو[٧١].

هێرشی سوڵتان بۆ سەر (تەبریز) بە هۆی ئەوەوە بوو، چونکە (مەملان) ڕەتیکردبۆوە باجی ساڵانەی بە سەر داسەپێنراوی بدات[٧٢]، جگە لەمەش هۆو پاڵنەری دیکە هەبوون پاڵیان بە سوڵتان وەنا، بۆ ئەوەی بێت هەڕەشە لەو میرنشینە بکات، چونکە بە دوور نازانرێت (مەملان) ویستبێتی سۆزو گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان تازە نەکاتەوەو هەوڵی دابێت خۆی لە پاشکۆیەتییان دەرباز بکات، لەبەر ئەمەش سوڵتان (تەغرول بەگ) لێی تووڕە بووبێت و ئیتر بەم شێوەیە لەو ساڵەدا ئەو هێرشەی کردبێتە سەر (تەبریز).

لە ساڵی (٤٥٤ک/ ١٠٦٢ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) جارێکی دیکە، هێرشی هێنایەوە سەر (تەبریز)و ئابلۆقەی دایەوە[٧٣]، بۆیە (مەملان) ناچار بوو، بەرەو (بەغداد) هات و لای خەلیفە (قائیم بی ئەمریڵڵا)ی عەبباسی سکاڵای خۆی لەم کارە خراپ و شەڕاوییانەی سوڵتان (تەغرول بەگ) لە دژی (ئازەربێجان) دەربڕی، خەلیفەش گوێی لە سکاڵاکەی ڕاگرت، هەر لەوێوە لە دیوانی خەلافەت چەند نامەیێکی بۆ سوڵتان

(تەغرول بەگ) ڕەوانکرد، تیایاندا داوای لێکرد، سنوورێک بۆ دەستدرێژییەکانی بۆ سەر ئەم میرنشینە دابنێت و زیان و وێرانەیی بەسەر هەرێمەکە نەهێنێت، بەڵام وەکو دەردەکەوێت، ئەم نامانە گوێیان لێناگیرێت، چونکە سوڵتان هەر لە سەر بەرنامەو دوژمنکارییەکەی مایەوە، جا کاتێک (مەملان) دەرکی بەوە کرد، بەرەنگاریکردنیان لە توانادا نییەو هیچ سوودێکی پێ ناگەیێنێت، هاتە لای سوڵتان، بە دەستەوەدانی خۆی بۆ ڕاگەیاند، بەمەش سوڵتان باجێکی زۆری لە سەر دانا، هەروەها (مەملان) کوڕەکەشی وەکو ڕەهینە دایە سوڵتان، ئینجا پاش ئەمە سوڵتان (تەبرێز)ی جێهێشت و بەرەو (نەقجوان) هات[٧٤].

لەوەی ڕابردوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەو سیاسەتەی سوڵتان (تەغرول بەگ) لە بەرامبەر کورددا پەیڕەوی لێکرد، ئەگەرچیش خراپی زۆری تیابوو، بەڵام لە چاکەش خاڵی نەبوو، ئەوەتا بەڵگەی زۆر ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکەن، لەوانە بۆ نموونە: ڕێزگرتنی سوڵتان لە کورد، کە ئاماژەی زۆر هەن جەخت لەسەر ئەوە دەکەن، هەروەها زۆربەی کەسایەتییەکانی دەوروبەری سوڵتان کورد بوون، لێرەدا ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ ئەو پایەیە بکەین کە میر (تاجولمولک هەزار ئەسپ کوڕی بەنکیر کوڕی سوڵتان عیازی کوردی) هەیبوو[٧٥]، ئەو میرە یەک بوو لە نزیکەکانی کۆڕی سوڵتان و تا ڕادەیەکی گەورە لە هەردوو بوارەکانی سیاسی و سەربازی سوڵتان (تەغرول بەگ) پشتی بە ڕاکانی ئەو میرە دەبەستا.

بۆ چەسپاندنی ئەمە شتێکی دیکە دەگێڕینەوە: دوو لە میرانی عەرەب، کە ئەوانیش (قورەیشی کوڕی بەدرانی عەقیلی) خاوەنی موسڵ، (٤٤٣-٤٥٣ک / ١٠٥١-١٠٦١ز) و، (دبیسی کوڕی مەزیدی ئەسەدی) میری میر نشینی (مەزیدی) لە (٤٠٨-٤٧٤ک / ١٠١٧-١٠٨١ز) بوون، داوایان لە میر (هەزار ئەسپ)ی کورد کرد، لای سوڵتان قسەیێکی خێریان بۆ بکات، تالێیان خۆشبێت، چونکە چووبوونە نێو بزووتنەوەی (بەساسیری)، لە ئاکامیش ئەو هەوڵانەی (هەزار ئەسپ) لەم ڕووەوە لەگەڵ سوڵتاندا، بەری داو، سوڵتان گوێی لە داواکانی ڕاگرت و لێیان خۆشبوو[٧٦].

(بەنداری)کە لە (٦٤٣ک/١٢٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە، شتێکی تر دەگێڕێتەوەو جەخت لەسەر چەندێتی ڕێزی سوڵتان بۆ میر (هەزا ئەسپ) دووبارە دەکاتەوە، دەڵێت:



(کاتێک سوڵتان لە بەغداد جیابوویەوە، ئەو کاتە ڕێگەی بە هەزار ئەسپ دا، بۆ ئەوەی بەرەو ئەهواز بچێت، ئیتر ئەو میرە کوردە سێ ساڵ لەگەڵ سوڵتان پێکەوە ژیان و هێشتا هەر سوڵتان ڕێگەی نەئەدا لێی جیابێتەوە)[٧٧].

لەم دەقەی پێشوو ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە سوڵتان ڕێزێکی تایبەتی بۆ ئەو میرە کوردە هەبووە، چونکە کە ڕێگەی نەداوە لێی جیابێتەوە، کەوا بێت حەزی کردووە هەر لە نزیکییەوەی بێت.

لەلایەکی دیکەوە دارو دەستەی سوڵتان (تەغرول بەگ) زۆربەی جارەکان کۆمەڵێک میرو کەسایەتی کورد بوونە، ئەمەش بەڵگەی چەندێتی ئەو متمانەو ڕێزەیە کە سوڵتان بۆ ئەوانی هەبووە، لە ساڵی (٤٥٢ک/ ١٠٦٠ز)یش سوڵتان هاتە نێو بەغدادو ژمارەیەک میری کورد یاوەری بوون، لە نێویان (ئەبولفەتحی کوڕی ورام)ی[٧٨] پێشەنگی کوردە جاوانییەکان و میر (هەزار ئەسپی کوڕی بەنکیر)و بێجگەی ئەوانەش[٧٩].

ئەم ڕێزە بۆ کورد، بۆ ئەو پایەیە دەگەڕێتەوە کە میرە کوردەکان لە لای خەلافەتی عەبباسی هەیانبوو، لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی سوڵتان (تەغرول بەگ)و ڕۆژگاری دوای ئەویش، باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوە، کاتێک خەلیفە (قائیم بی ئەمریلڵا) بە مردنی (تەغرول بەگ)ی زانی نامەی بۆ میرە کوردو عەرەبەکانی دەوروبەر ڕەوانکرد، لە نێوانیان میر (بەدر کوڕی موهەلهیل)و میر (ئەبولفەتحی جاوانی)و میر (ئەبولنەجمی جاوانی) برای ئەولفەتح و میر (هەزار ئەسپی کوڕێ بەنکیر)و میرە عەرەبەکانی (بەنی خەفاجە)و (مەزید)و (بەنی عەقیل)، لە دووتوێی نامەکانیشیدا بانگی ئەو میرانەی کرد بێنە بەغداد، بۆ ئەوەی ڕاوێژ بکەن، بزانن لە دوای مردنی سوڵتاندا پێویستە چی بکەن[٨٠].

بە بەرچاوگرتنی پەیوەندی باشی نێوان کوردو سەلجوقییەکانیش، دەبینین هەندێ لە میرە کوردەکان بەشداری بۆنەو ئاهەنگەکانی سەلجوقییەکان دەکەن، ئەوەتا لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز) میر (سەرخابی کوڕی بەدری کوڕی موهەلهیلی شازنجانی)[٨١]و میر (هەزار ئەسپی کوردی) بەشداری ئاهەنگی ئەو ژن گواستنەوەیەی سوڵتان (تەغرول بەگ)یان کرد، کە تیایدا سوڵتان کچەکەی خەلیفە (قائیم بی ئەمریلڵا)ی گواستەوە، بەم بۆنەیەوەش سوڵتان جلوبەرگی میرینی تایبەت و دیاری شیاوی پێ بەخشین[٨٢].

(باخسری) کە لە (٤٦٧ک/ ١٠٧٤ز) کۆچی دوایی کردووە، وەسفی ئەو دانیشتنە دەکات، کە بەم بۆنەی سەروو لە بەغدا ئەنجامدراو (پاشاکانی عەرەب و عەجەم و دەیلەم

و كوردانى) بەخۆوە دەگرت و هەموويان بۆ ژن گواستنەوەى سولّتان ئامادە ببوون، (عەميدولمەليكى كەندرى) وەزيرى (تەغرول بەگ)يش وتوێژى لەگەڵ وەزيرەكانى ئەو پاشايانە دەكرد[٨٣].

لەم گێڕانەوەى سەروو، كە جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، دوو ميرى كورد لەگەڵ سولّتان هاتبنە نێو (بەغداد)، چەند راستييەک زەق دەبنەوە: ئەمە گوزارشت لە باشى پەيوەندييە سياسييەكانى نێوان هەردوولا دەكات، لە هەمان كاتيشدا بەڵگەيە لە سەر ئەوەى، كە ميرنشينە كوردييە سەربەخۆكان لە سەردەمى (تەغرول بەگ)دا هەر مابوون، چونكە (سەرخاب) ميرى ميرنشينى عەننازى بوو، هەروەها دەقەكە ئاشكرا جەخت لە سەر متمانەى زۆرى سولّتان بە كوردان دەكات، كە هەر لە يەكەم هەنگاوى دەرچوونى لە (ئورميە)ى (ئازەربێجان)و تا گەيشتنى بە پايتەختى خەلافەت كورد هەر ياوەرى بوون، دوا راستيش كە لەم گێڕانەوەى سەروو بەرجەستە بێت، ئەوەيە كە ميرە كوردەكانيش چووبوونە ژێر ئالاّى سەلجوقييەكان.

دواى خستنە رووى ئەودەقە مێژووييە تايبەتانە بە پەيوەندى سولّتان (تەغرول بەگ)، لەگەڵ ميرنشينە كوردييەكان، دەكرێت بڵێين: پەيوەندى نێوان هەردوولا بە شێوەيەكى گشتى باش بووە، چونكە سولّتان (تەغرول بەگ) سياسەتەكەى وابووە، ميرى هەرێمەكانى دەوروبەر هەر هێندە سۆزو گوێڕايەڵييان بۆ دەسەلاّتى سەلجوقى رابگەيەن، ئيتر هەر خۆيان لە سەر موڵك و ولاّتى خۆيان بمێننەوە، هەروەها كورديش بە رۆڵ و سياسەتى دانايانەى خۆيان، توانيان لە رێگەى ئەوەى كە بە بەردەوامى ماڵ و ديارى ديكە بۆ سولّتانە سەلجوقييەكان بنێرن، لەولاوە ميرنشينەكانيان بە سەربەخۆيى و پارێزراوى بهێڵنەوە.

**ب- هەڵوێستى سولّتان ئەلب ئەرسەلان[٨٤] لە ميرنشينە كوردييەكان:**

سولّتان (تەغرول بەگ) لە هەشتى رەمەزانى ساڵى (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز)كۆچى دوايى كرد[٨٥]و دەوڵەتێكى (بە هەيبەتى، بەهێزو بنەما چەسپاو)[٨٦]ى بە دواى خۆيدا بەجێهێشت، چونكە هەوڵێكى زۆرى دا بۆ چەسپاندن و بەهێزكردنى بنەماكانى دەوڵەتەكەى، بە كارەكيش سەركەوت لەوەى بناغەيەكى تۆكمە بۆ دەوڵەتى تازە لاوى سەلجوقى دابنێت، بەلاّم بە مردنەكەى ململانێيەكى توند كەوتە نێوان تاكەكانى



خانەوادەكەى، لە پێناو ئەوەى كاميان دەسەلاّت بگرنە دەست، چونكە سولّتان (تەغرول بەگ) هيچ كوڕێكى لە دواى خۆى جێنەهێلاّبوو، جێى بگرێتەوە، بۆيە خەڵكێكى زۆر چاويان بڕيبە دەسەلاّتەكەى، بەو نيازەى ببنە جێگرەوەى[٨٧].

ململانێى لەسەر كورسيش، بە چڕى كەوتە نێوان (سلێمانى كوڕى جەغرى بەگ) كە لە دواى مردنى مامى راستەوخۆ دەسەلاّتى گرتە دەست[٨٨]، لەگەڵ (ئەلب ئەرسەلان)ى براى، چونكە ئەمەى دواييش وايدەزانى، خۆى لە برا بچووكەكەى شياوترە، بۆ گرتنە دەستى دەسەلاّت، بۆيە لە گوێڕايەڵى (سلێمان)ى براى دەرچوو، خۆى وەكو (سولّتان) راگەياندو بەمەش هەموو ميرەكانى خانەوادى سەلجوقى دانيان پێدانا[٨٩].

(ئەلب ئەرسەلان)ى سولّتانى نوێ هەر لەگەڵ سەرەتاى سەردەمەكەى خۆى، مەترسييەكى گەورەى رووبەڕوو بووەوە، كە ئەويش خۆى لە ياخيبوونى شەهابولدەولە (قەتلمشى كوڕى ئيسرائيلى كوڕى سەلجوق)دا دەنواند[٩٠]، (شەهابولدەولە) ژمارەيەک قەلاّى سەخت و پارێزراوى هەبوو، لە هەرێمى عيراقى عەجەمى (چياكان)، دەستى بەسەر شارى (رەى)ش داگرت، دەركى بە گرنگييەتى پارێزراوى و سەختى شارەكانى ئەو هەرێمەش كرد، بۆيە بە باشى زانى هەر لەوێدا بمێنێتەوەو، هەر ئەوێشى كردە لانەى ياخيبوونەكەى[٩١].

بەم شێوەيە شەڕێكى يەكلاكەرەوە لە نێوان هەردوو سوپاى سولّتان و سوپاى (قەتلمش) لە نزيک شارى (رەى) روويدا، لەم شەڕەدا (قەتلمش) كوژراو، دواى ئەوەى سولّتان هاتە ناو ئەو شارە، كە ئەمە لە ساڵى (٤٥٦ک/ ١٠٦٣ز) بوو[٩٢]، ئيتر دەسەلاّت هەر بۆ سولّتان مايەوە، خاوەنى كەسايەتييەكى بەهێزو بە توانا بوو، ناوبانگييەكى گەورەشى بە دەست هێنا، ئەوەش چونكە درێژەى بەو سياسەتە فراوانيخوازە دا، كە سولّتان (تەغرول بەگ) دەستى پێكردبوو، لەم بوارەشدا (ئەلب ئەرسەلان) سەركەوتنى گەورەى بەدەست هێناو دەسەلاّتى سەلجوقى لە سەردەمى ئەو (٤٥٥- ٤٦٥ک/ ١٠٦٣- ١٠٧٢ز) زۆر گەورەتر بوو بۆيە زۆر لە مێژوونووسان ستايشى سياسەتەكەيان كردووە، لەونە (ئيبنو خەلەكان) دەڵێت: (دەستى بەسەر مەماليكەكان داگرت و، شانشينەكەى گەورە بووژ هێزەكەى ترسناكتر بوو، هێندەى ولاّتى تريش فەتح كرد، (تەغرول بەگ)ى مامى لەگەڵ فراوانى موڵكەكەيشى، هێشتا وەكو ئەمەى نەبوو)[٩٣].

فەرماندەیی سەربازی و توانای سیاسی، هەردووکیان لە کەسایەتی (ئەلب ئەرسەلان)دا کۆببوونەوە، هەروەها هەلومەرجی ئەو کاتە کەسایەتیەکی وای بۆ دروستکرد گەورەترین کاریگەری لە وێنەکێشانی سیاسەتی سەلجوقیدا هەبێت، ئەویش کەسایەتی وەزیر (نیزامولمەلیک) بوو[٩٤]، ئیتر وەزیر لەگەڵ سوڵتاندا، کەوتنە لێکۆڵینەوە لە وێنەکێشانی هێڵە پانەکانی سیاسەتی وڵاتەکەیان، وەکو دەریش دەکەوێت، لە قۆناغی یەکەمدا، هەوڵەکانیان لە پێناو فراوانکردنی وڵاتەکەیان خستبووە گەڕ.

لەگەڵ سەرەتاکانی ساڵی (٤٥٧ک/ ١٠٦٤ز) دوای ئەوەی بە سەر دوژمنەکانیان زاڵبوون و خۆیان تەواو بیناکرد، ئیتر ئارامی باڵی بەسەر دەوڵەتی سەلجوقیدا کێشا، ئینجا سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) دەستی کرد بە فراوانیخوازیەکەی، لە پێناو جێبەجێکردنی ئەو مەبەستەش، لە بەرە جیاوازەکاندا، فەرماندەیی کۆمەڵێک شەڕی کرد، بەڵام گرنگترینیان و بە مەترسیترینیان، ئەو شەڕانەی بوون، کە لە بەرەی بێزەنتییە دەیکردن[٩٥].

سوڵتان هەوڵیدا ئەو فراوانیخوازییەی سروشتێکی ئایینی وەربگرێت، بۆیە رووی لەو ناوچانە کرد، کە دەکەوتنە نێوان دەریاچەکانی (وان)و (ورمێ)[٩٦]، ئەو ناوچانەش ناوچەی کوردی بوون، هەر لە کۆنەوە کورد تیای دانیشتبوون، لە پاڵ ئەواندا ئەرمەنیش لەو ناوچانە هەبوون، ئەو ناوچانەش دەکەوتنە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی بێزەنتی، بۆیە سوڵتان ویستی دەسەڵاتی بێزەنتی لەو ناوچانە نەهێڵێ و بیانخاتە سەر شانشینە فراوانەکەی، بۆ وەدیهێنانی ئەو مەبەستەش، لە دانیشتوانی ناوچەکە نزیک بووەوە -کە کورد بوون – هەروەها توانی سۆزی ئەوان بۆ خۆی رابکێشێت، بۆیە ئەوانیش هاتنە نێو سوپاکەی و لەگەڵیدا بەشداری زۆربەی شەڕەکانی ئەو بەرەیەیان کرد[٩٧].

ئەوەی لەم رووەی لێکۆڵینەوەکەمان بە لای ئێمەوە گرنگ بێت، هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)ە لە بەرامبەر کورد، چونکە سوڵتان (تەغرول بەگ) سیاسەتێکی تایبەتی لەگەڵ ئەوان پەیڕەو کرد، هات دەسەڵاتی هەر بە دەست خۆیان هێشتەوە لە نێو میرنشینەکانیان، بەو مەرجەی لە بەرامبەردا ئەوانیش سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ دەسەڵاتی سەلجوقی رابگەیەنن، بەڵام لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)دا، وەکو تێبینی دەکرێت، گۆڕانێکی ئاشکرا بە سەر سیاسەتی سەلجوقییەکان لە بەرامبەر



میللەتانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی و بە تایبەت بەرامبەر بە کوردیش، داهات، ئەوە بوو هەرچەندە ئەو دەسەڵاتەی میرنشینە کوردییەکانیان هەر هێڵاوە، بەڵام هەوڵی زۆریشیان دا، بۆ ئەوەی سەرجەم هەرێمەکان بە پایتەختی دەسەڵاتی سەلجوقییەوە ببەستن.

بۆیە دەتوانین بڵێین، سەردەمی ئەو سوڵتانە، سەرەتا یەکەمەکانی ئەو سیاسەتە ناوەندییە بوو، کە سوڵتانەکانی تریان لە دوای ئەمەدا پەیڕەویان لێکرد، بەڵام هەموو هەوڵە زۆرو هێرشە سەربازیە زۆرەکان، کە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بۆ بەستنەوەی هەرێمەکان بە پایتەختی دەسەڵاتەکەی پێیان هەڵسا، تێیاندا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو کورد هەر پارێزگارییان لە سەربەخۆییەکەیان کرد، چونکە سوڵتان لە رووخاندنی میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان سەرنەکەوت، بۆیە هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە، کە هیچ نەبێت ئەو میرنشینە کوردییانە هەر دەبێت سۆزو گوێڕایەڵی خۆیانی بۆ رابگەیەنن، بۆیە بە کارەکی، جارێکی دیکە دەسەڵاتی سیاسی میرنشینە کوردییە بڵاوەبووەکانی هەرێمەکانی (چیاکان)و (ئازەربێجان)و (ئاران)و (جزیرە) سەرلەنوێ سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سوڵتان تازە کردەوە.

ئەوەی لە پێشتردا ئاماژەی بۆ کرا، دەکرێت بکرێتە بەڵگە، بۆ راڤەکردنی دەقە بەردەستەکان، کە جەخت لە سەر سووری سوڵتان دەکەنەوە، لەبەرئەوەی کورد سۆزو گوێڕایەڵی خۆیانی بۆ رابگەیەنن، جا بۆ نموونە: لە ماوەی هێرشەکەی سوڵتان بۆ سەر شاری (ئانی) لە ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز)[٩٨]، (ئەلب ئەرسەلان) رێگەی (ئازەربێجان)ی گرت[٩٩]، ئیتر لەگەڵ سوپاکەی بە کۆمەڵێک شاری کوردیدا تێپەڕی، کاتێکیش کە گەیشتبووە شاری (نەقجوان)، هەواڵی ئەوەی پێگەیشت، کە دانیشتووانی هەردوو شاری (خوی)و (سەلماس)، کە دوو شاری کوردین لە هەرێمی (ئازەربێجان) گوێڕایەڵی خۆیانی بۆ راناگەیەنن، هەروەها شارەکانی خۆشیان لە بەردەم سەلجوقییەکاندا داخستووە، بۆیە سوڵتان هیچی بۆ نەکرا، ئەوە نەبێت، سوپایەکی سەلجوقیی بە فەرماندەیی عەمیدی خوراسان بۆ رەوانکردن، سوپاکە داوای لە خەڵکی هەردوو شارەکە کرد، کە گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سوڵتان رابگەیەنن، ئەگەریش وا نەکەن ئەوا هەڕەشەی لێکردن، بەمەش خەڵکی هەردوو شارەکە ناچار بوون سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سوڵتان رابگەیەنن[١٠٠].

بەم شێوەیە سوڵتان سووربوو، لەسەر وەرگرتنی سۆزو گوێڕایەڵی شارە کوردییەکان لە

بۆ دەسەڵاتەکەی، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەوان لە گوێڕایەڵیدابوونەو هەندێک لە سەربازەکانیشیان پاڵپشتی سوپای سەلجوقییان کردووە، سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە سوپای شەدادی بە فەرماندەیی میر (ئەبولئەسوار) لەگەڵ سوپای سوڵتاندا بەشداری کرد، لە هێرشەکەی بۆ سەر شاری (ئانی)، دوای سەرکەوتنیشیان لەو هێرشەدا، بەڕێوەبەرایەتی ئەو شارەو هەندێ لە ناوچەکانی دیکەی (ئەرمینیا)یان دا بەو میرە کوردە[١٠١].

هەروەها میرە مەڕوانییەکانیش لە (جەزیرە) سۆزو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ سوڵتان تازە کردەوە، ئەوەتا لە کاتی هاتنی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەرەو وڵاتی شام، کە بە (دیاربەکر)دا تێپەڕی لە ساڵی (٤٦٣ک/١٠٧١ز)، خاوەنی ئەو شارە میر (نیزامەدینی کوڕی مەڕوان) لە شارەکەی هاتە دەر بۆ پێشوازی سوڵتانی سەلجوقی، وەکو دابی میرە مەڕوانییەکانیش لەو سیاسەتەی پەیڕەویان لێدەکرد، ئەو میرە کوردە هەڵسا بە ڕاکێشانی سۆزیان بۆ خۆی و سەد هەزار دیناری پێشکەش کردن، بەڵام کە سوڵتان زانی ئەو پارەیەی لە خەڵکی وڵاتەکەی وەرگرتووە، فەرمانی کرد بەوەی کەوا بۆیان بگەڕێننەوە[١٠٢].

دوای ئەوە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەرەو باکوور هات و گەیشتە شاری (ئامەد) (بینی سنوورێکی سەخت وپارێزراوە، بۆیە خۆی پێ موبارەک کرد، دەستی بەسەر شوورەکەی دادێناو، سینگی خۆی پێ دەماڵی)[١٠٣]، بەڵام ماوەیەکی درێژی نەخایاند، کە لەم شارەش هاتە دەرو بەرەو (ڕەها)-(ئورفەی ئێستا)- هات و درێژەی بە هێرشەکەی دا، بۆسەر شارەکانی وڵاتی شام... مەبەستیش لەگێڕانەوەی ئەو باسە، بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی، کە میرنشینی مەڕوانی سۆزو گوێڕایەڵی خۆی بۆ دەسەڵاتی سەلجوقی تازەکردۆتەوە.

(فارقی) شتێکی دیکە دەگێڕێتەوە، کورتەکەی ئەوەیە: (ئەلب ئەرسەلان) لە ساڵی (٤٥٨ک/١٠٦٥ز) هێرشەکەی بۆ سەر وڵاتی مەڕوانییەکان بە فەرماندەیی سالاری خوراسان[١٠٤] و لەگەڵ پێنج هەزار سوار دەست پێکرد، ئەم سوپایە گەیشتە دەوروبەری (دیاربەکر) و...شارەکەی تاڵانیکرد و، دەرگاکان داخران، ئینجا میر (نیزامەددین) لە ڕێگەی بەخششە مادییەکەی، توانی قەناعەت بە فەرماندەی سەلجوقی بکات، کە کۆتایی بە هێرشەکەی بهێنێت[١٠٥].



ئەم هێرشە بە مەبەستی هەڕەشەکردن بوو لە میرە مەڕوانییەکان، بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێت، کە پێویست ناکات بیر لەوە بکەنەوە لە گوێڕایەڵی سەلجوقییەکان دەرچن، لە ڕاستیشدا ئەو هێرشە سەبارەت بە سوڵتان ئاکامی باشی لێکەوتەوە، چونکە لە کاتی تێپەڕینی بە (دیاربەکر)دا لە ساڵی (٤٦٣ک/١٠٧١ز)دا- وەکو لە پێشتردا ئاماژەی پێدرا- میر (نیزامەددین) لە ترسی ئەوان بە پەلە هاتەدەر بۆ ئەوەی سۆزو گوێڕایەڵی خۆی پێشکەش بکات.

هەرچی تایبەتە بە میرەکانی میرنشینی عەننازیش، ئەو میرنشینە ڕووبەڕووی واقعێکی تاڵ بووەوە، ئەویش لەلایێک لەبەر ململانێی نێوان میرەکانیان و لەولاشەوە بە هۆی پاڵەپەستۆی سەلجوقییەکان بوو لەسەری، بۆیە (موهەلهیل)ی میری ئەو میرنشینە، ناچار بوو گوێڕایەڵی خۆی لە بۆیان رابگەیەنێت.

(ئیبنوخەلدون) کە لە (٨٠٨ک / ١٤٠٥ز)کۆچی دوایی کردووە ساڵی (٤٤٦ک/١٠٥٤ز) بە کۆتایی و دوا ساڵی دەسەڵاتی میرنشینەکە دادەنێت[١٠٦]، ئەمەش چونکە (غەز)ەکان لەو ساڵەدا دەستیان بەسەر زۆربەی موڵکەکانی میرنشینی (عەننازی)دا گرت[١٠٧]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە ڕێکن، کە فەرمانڕەوایەتی ئەو میرنشینە تا سەرەتاکانی سەدەی شەشی کۆچی/دوانزەی زایینی بە زیاتر دەستنیشان کردنیش تا ساڵی (٥١١ک/١١١٧ز)[١٠٨] هەر بەردەوام بوو، ئەمەش چونکە فەرمانڕەوایی عەننازی سەد و سی ساڵی تەواو بەردەوام بوو، جا کە دامەزرانیشی لە ساڵی (٣٨١ک/٩٩١ز) بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕووخانی لە ساڵی (٥١١ک/١١١٧ز) بێت، مەغزای گێڕانەوەکەی (ئیبوخەلدون)یش دەکرێت بەوە لێکبدرێتەوە، کە ئەو میرنشینە لە هەرێمی (چیاکان)دا هەر ماوەتەوە، بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو سەربەخۆییەی خۆی لە دەست داوە، کە لە سەردەمی بووەیهییەکان هەیبووە.

لە ماوەی دەسەڵاتی سەلجوقی، میرەکانی ئەو میرنشینە بوونەوە فەرمانڕەوا بە سەر موڵکەکانی پێشوویان و سەر بە دەسەڵاتی ئەوانیش بوون، لە ڕاستیشدا کۆمەڵێک هۆ هەبوون، بۆ ئەوەی ئەو میرنشینە دەسەڵاتی سەربەخۆیی خۆی لە دەست بدات، کە دەکرێت ئەو هۆیانە لەمانەی خوارەوە کورت بکەینەوە: خەریکبوونی میرەکانیان بە ململانێیە

ناوخۆکان و شەڕە زۆرەکانیان لە پێناوی دەسەڵات.. لەگەڵ ئەو شەڕانەیان کە وەکو میرنشین لەگەڵ میرنشینەکانی دەوروبەرو بە تایبەت لەگەڵ (حەسنەوەیهییەکان)و (تاکاوییەکان) دەیانکرد، کە ئەمانەش سەرەنجام وایانکرد، ئەرکی سەلجوقییەکان لە داگیرکردنی زۆرینەی زەوی و موڵکەکانی میرنشینەکە ئاسان بێت، بەمەش سەربەخۆیی خۆیان لە دەستداو بوونە پاشکۆی ئەوان[١٠٩].

بەڵام هەواڵی میرە عەننازییەکان لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)دا وەکو زانیاری کە لەبەر دەستدابێت، لە بارەی میر (بەدری کوڕی موهەلهیلی کوڕی ئەبی شەوک) زۆر کەمە، کە شایانی ئاماژەپێدانە، ئەو میرە پێشتر لەلایەن سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە کرابووە فەرمانڕەوا بەسەر شارەزوورو شارەکانی دیکەی هەرێمی (چیاکان)[١١٠]، هەروەها لە رۆژانی بزووتنەوەکەی (بەساسیری) ئەو میرە لە وڵاتەکەی خۆیدا پێشوازی خەلیفە (قائیم بی ئەمریلڵا)ی عەبباسی کرد[١١١].

لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)یشدا، ئاماژەیەک لە بارەی ئەو میرەوە هەیە، وا دەردەخات کە ئەو میرە کوردە پایەیەکی بەرزی هەبووەو، لە لای سەلجوقییەکان بە میرێکی گەورە زانراوە، (سەبتی ئیبنولجۆزی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: ئەو میرە لە لایەن سوڵتانەوە، لە ساڵی (٤٥٧ک/ ١٠٦٥ز)دا بەرەو (نەیسابور) بانگ کرا، بۆ ئامادەبوون لە ئاهەنگی گواستنەوەی کچی یەک لە پاشا تورکەکان، بۆ (مەلەکشاه)ی کوڕی[١١٢].

دوای ئەمە هەواڵی میر (بەدری کوڕی موهەلهیل) ون دەبێت، بێجگە لەوەش کە لە بارەی مردنییەوە هاتووە، ئیتر هیچێکی تر لە بارەی خۆی و لە بارەی سروشتی پەیوەندییەکانی بە سەلجوقییەکانەوە نازانرێت... میر (بەدر) لە ساڵی (٤٦٧ک/ ١٠٧٤ز) کۆچی دوایی دەکات[١١٣]و لە دوای ئەو میرنشینی عەننازی زۆر لاواز دەبێت، وەکو دەریش دەکەوێت، بە درێژایی بیست ساڵ هیچ کاریگەرییەکی بەسەر رووداوەکاندا نابێت، بە پشت بەستن بەو راستییەش، دەتوانین بڵێین، ئەو میرنشینە نیمچە نەماوبوو، تا میر (ئەبو فارس سەرخابی کوڕی بەدر) توانی لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینیدا زیندووی بکاتەوە، وەکو لە دواتردا دێین باسی ئەمە دەکەین.

شایانی باسە، داننانی کورد بە دەسەڵاتی سەلجوقییان، بووە هۆی ئەوەی زەوییەکانیان



ببێتە شانۆیەکی کردە سەربازییەکانیان، ئەوەتا هەرێمەکانی (جەزیرە)و (ئازەربێجان) لە ماوەی سەردەمی ئەو سوڵتانەدا باری نائاساییان بەخۆوە بینی و باری قورسیان کەوتە سەر شان، چونکە سوپای سەلجوقی بە زەوییەکانیاندا تێدەپەڕی و (ئەلب ئەرسەلان) پیاوێکی عەسکەری بوو، بە چالاکییە گەورەکەی جیا دەکرایەوەو بە هێرشە زۆرەکانی دەناسرا[١١٤]، ئەمەشی یەکەم لە بۆ فراوانکردنی دەوڵەتەکەی و دووەمیش لە بۆ جیهاد لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئیسلام، هەرێمە کوردییەکانیش سەنتەری تیا سەرچاوەگرتووی هێرشەکانی بوون.

لە ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز) سوڵتان بڕیاریدا هێرش بباتە سەر (ئانی)[١١٥] لە (ئەرمینیا) بۆ شەڕ لە دژی بیزەنتییەکان و دەرهێنانی ئەو شارە لە ژێر دەستیان، بۆیە لە (رەی) هاتەدەر بەرەو (ئازەربێجان)...

لە بارەی ئەم هێرشەوە، ساغکەرەوەی کتێبی (زبدة التواريخ)[١١٦]، لە (فاردان)ی مێژوونووسی ئەرمەنی، دەگێڕێتەوە، دەڵێت: سوڵتان خۆی سەرکردایەتی ئەو هێرشەی کرد، بەرەو زەوییەکانی دەوڵەتی بیزەنتی و لەگەڵ سەربازەکانی کە ژمارەیان سەدو هەشتا هەزار سوار بوو[١١٧]، بە زەوییەکانی (ئازەربێجان)دا تێپەڕی و هاتە نێو شاری (مەرەند)[١١٨]، لەوێوە یەک لەو میرە تورکمانانەی کە زۆر هێرشی دەکردە سەر رۆمەکان و، (تەغدکین)ی ناوبوو، هاتە لای[١١٩]و لەگەڵ ئەو میرەدا (خەڵکێکی زۆری جیهادکەر)و شارەزا بەو وڵاتە هەبوون، ئەوان هانی سوڵتانیان دا کە شەڕ بکات[١٢٠].

ئیتر سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەرەو شارەکانی هەرێمەکە پێشڕەوی کردو گەیشتە شاری (نەقجوان)، تیایدا سوپاکەی خست و فەرمانی بە سوپاکەی کرد(بەلەم)ان ئامادە بکەن، ئەمەش بۆ ئەوەی بە هۆیەوەی لە رووباری ئاراس (ئاراکس)[١٢١] بپەڕنەوە، مانەوەی سوڵتانیش لە (نەقجوان) زیاتر بە واتای ئەوە دێت، کە میرە رووادییەکانی فەرمانڕەوای (ئازەربێجان) چووبوونە ژێر رکێفی سەلجوقییەکان، چونکە تێپەڕینی سوڵتان بە زەوییەکانی میرنشینەکەداو بەبێ ئەوەی کوردە رووادییەکان هیچ کۆسپێک بێننە پێشیان، ئەوە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەو میرنشینە لەژێر رکێفی ئەوان بووە، هەروەها ئامادەکردنی ژمارەیەک (بەلەم)یش، بێگومان پێویستی بە کۆشش و بە کاتێک و هەروەها بە وەستاو کرێکارانیش هەبووە.

ئەم دەقەی سەروو، ئاماژەیەکی روونی تیایە، لەمەڕ بەشداریکردنی دانیشتووانی ناوچەکە لە هێرشەکەدا بۆ سەر (ئانی)، جا لە ماوەی خەریکبوونی هێزە سەلجوقییەکان بە ئامادەکردنی (بەلەم)ەکان، هەواڵ گەیشتە گوێی سوڵتان - وەکو لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا کە دانیشتووانی هەردوو شاری (خوی)و (سەلماس) بە رووی سوڵتانی سەلجوقیدا وەستاون، بەڵام (ئەلب ئەرسەلان) عەمیدی خۆراسانی بۆ هەناردن و دوای هەڕەشەکانی لێیان گوێڕایەڵی خۆیان بۆ راگەیاند[١٢٢].

شایانی تێبینی کردنیشە کە (ئیبنولئەثیر) لە بارەی هەڵوێستی خەڵکی (خوی)و (سەلماس) دەنووسێت: (هاتنە ریزی حیزب و سەربازەکانی، هەروەها لەوێدا هێندە پاشا و سەرباز لێی کۆبوونەوە، کە ناژمێردرێن)[١٢٣]، ئەمانە لەگەڵ سوپای سەلجوقی لەو هێرشەیدا بەشدارییان کرد، ئەمەش شتێکی سروشتی بوو، چونکە میرنشینە کوردییەکان لە هەریەکە لە (ئازەربێجان) و (ئاران) و (جەزیرە) هەمیشە رووبەڕووی هەڕەشەی ترسناک و فشاری مرۆیی گەورە دەبوونەوە، نەیاندەتوانی بەرپەرچی بدەنەوە، چونکە لە رۆژئاوایان بێزەنتییەکان بوون، بە بێجگەی ئەوانیش ئەرمەن و هۆزە نەسرانییەکان لە (لان) و بێجگە ئەوانەش[١٢٤].

وەکو دەردەکەوێت، هەڕەشەی بێزەنتی لە پێشینەی هەموو مەترسییەکانی دیکە بوو، چونکە میرنشینەکانی شەدادی و رووادی و مەروانی، لەبەر هەڕەشە بەردەوامەکانیان لەسەر ناوچە سنوورییەکانی نێوانیان، هەردوو تالییەکانیان دەچەشت، لەبەر ئەمەش بەشداری کورد لە هێرشەکەی بۆ سەر (ئانی) زۆر پێویست بوو، بۆ پاراستنی ولاتەکانیان لە مەترسییە دەرەکییەکان، دەکرێت هۆیەکی دیکەش بۆ بەشداری کردنی کورد لە هێرشی سەلجوقی لە دژی بێزەنتییان بخەینە سەر ئەو هۆیانەی پێشوو، ئەویش ئەوەیە، کە هەردوو لایەنی کوردی و سەلجوقی موسڵمان بوون و شەڕەکانیشیان لە دژی بێزەنتییەکان بە ئەرکێکی ئایینی پیرۆز دەزانی کە بەلایانەوە دەچووە خانەی جیهادی ئیسلامی.

لە پێشتردا ئاماژەمان بەوەدا، کە لە ساڵی (٤٤٧ک/١٠٥٥ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) هێرشی هێنایە سەر شاری (ئانی) و لەگەڵیدا سوپای میر (ئەبولئەسواری شەدادی)ش بەشدارییان کرد[١٢٥]، بەڵام وەکو دەردەکەوێت، دواتر ئەو شارە لە دەست شەدادی و سەلجوقییەکان دەرهێنراوەتەوە، بۆیە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بە ساڵێک



دوای گرتنە دەستی دەسەڵاتی، جارێکی دیکە هێرشی هێنایەوە سەر.

ئەوەی سەرنج راکێش بێت، لە ماوەی هێرشەکەی سەلجوقیان بۆ سەر (ئەرمینیا)، ژمارەیەک شاری کوردی رووبەڕووی هێرشەکەیان بوونەوە، چونکە لە کاتێکدا سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) خەریکی ئامادەکردنی هێزەکانی بوو، (مەلەکشاه)ی کوڕی و (نیزامولمەلیک)ی وەزیری رەوانکرد، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر قەڵای (دوین)[١٢٦]، کە کوردە رووادییەکانی تێدا دەژیان، لەم هێرشەیاندا سەربازەکانی (مەلەکشاه) سی هەزاریان لە بەرگریکاران لە قەڵاکەیان کوشت و نزیکەی پەنجا هەزاریشیان لێ بە دیل گرتن[١٢٧]، ئینجا ئەو هێزانە گەیشتنە قەڵایەک، پێی دەگوترا (سەرماری)[١٢٨] و توانیان دەستی بەسەردا بگرن، هەروەها (حوسەینی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەلجوقییەکان توانیان دەست بەسەر قەڵایەکی دیکەشدا بگرن، کە لە (سەرماری)یەوە نزیک بوو[١٢٩]، ساغکەرەوەی کتێبی (زبدة التواريخ) لەو بڕوایە دایە، ئەو قەڵایەی دوایی، قەڵای (قاراباغ) بێت، کە دەکەوێتە باکووری (سەرماری) و، بۆ میر (نەقجوان) ژێر رکێف خرابوو، ئینجا هێرشەکە بەردەوام بوو، تا توانرا دەست بەسەر ژمارەیەک قەڵاو شاری ناوچەکەدا بگیرێت، ئیتر وەکو (حوسەینی) دەیڵێت: (بە هیچ قەڵایەکدا تێنەپەڕی، کە خودا بە هۆی ئەو فەتحی نەکات)[١٣٠].

دوای تەواوبوونی (ئەلب ئەرسەلان) لە ئامادەکارییەکانی سوپاکەی بۆ هێرشە گەورەکەی بۆ سەر شاری (ئانی)، هێزەکانی دەستیان بە خشین کرد بەرەو (ئەرمینیا)، روویان کردە دەڤەری (قارس)[١٣١]، سوڵتان فەتحی کرد، ئینجا هەر لە رێگەی خۆی دەستی بەسەر ژمارەیەک قەڵای دیکەدا گرت[١٣٢]، ئینجا رووی لە (ئانی) کرد، گەیشتە دەوروبەری، بینی شارێکی (تۆکمەکراو و زۆر رێگرە لە چوونە ناوەوەی بێگانان، ئەستەمە دوژمن بکاتە ناوی)[١٣٣]، چونکە سێ لە چواری دەکەوێتە سەر رووباری (ئاراس)ی گەورە و یەک لە چواریشی لەسەر خەندەقێکی پەیوەندداره بە رووبار، شارەکەش بە شوورەیەکی زۆر پۆڵایین دەورەدراوە، سوڵتان ئابڵوقەی خستە سەری و دوای کۆششێکی گەورەو هەوڵانێکی زۆر، هێزەکانی سوڵتان لەگەڵ کورد هاتنە نێو (ئانی)[١٣٤]، ژمارەی کوژراویش لە ریزی دانیشتووانی زۆربوون، لە ژمار بەدەر خەڵکی شار کوژران و، بەهێندەی کوژراوەکانیش دیلیان لێ گرتن[١٣٥].

هەواڵی فەتحکردنی ئەو شارە گەیشتە پایتەختی خەلافەت، کتێبە هەواڵی ئەو فەتحە لە بەغداد خوێندرایەوەو، موسڵمانان پێی دڵخۆش بوون[١٣٦] بەم شێوەیەش شاری (ئانی) لە دەست بێزەنتییەکان هێنرایەدەر، بێگومان یەک لە هۆیەکانی فەتحکردنی ئەو شارەش، بەشداری کوردانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بوون لە هێرشەکەو، ڕۆڵێکی دیاریان بینی لەفەتحکردنی ئەو شارە، چونکە بەهێز و توندو لێزان بوون لە شەڕی نێو چیاو دۆڵەکان[١٣٧]، بۆیە سەلجوقییەکان پشتیان پێ بەستن و، سەرەنجامیش سەرکەوتنیان بە دەستهێنا.

هەروەها فەرماندەیی کردنی هێرشەکەش لە لایەن خودی سوڵتانەوە، هۆیەکی دیکەبوو، لە هۆیەکانی سەرکەوتن، چونکە (ئەلب ئەرسەلان)یش پیاوێکی عەسکەری لە جۆری یەکەم بوو، بەڵام سەرچاوە ئەرمەنییەکان گلەیی دەخەنە سەر ئەو حامیە بێزەنتییەی کە لە (ئانی) بوو، دەڵێن لە ئەنجامی کەمتەرخەمی و خەم ساردییان شارەکە کەوتە دەستی موسڵمانان[١٣٨].

لەگەڵ هاتنە ناوەوەی سەلجوقییەکان بۆ نێو شاری (ئانی)، سوڵتان ئەو شارەی بۆ میر (ئەبولئەسواری شەدادی) بڕیەوە[١٣٩]، ئەمەش بەڵگەیەکی کارەکییە لەسەر ڕۆڵی باشی کورد لە سەرکەوتن بەسەر دوژمندا.

(مونەجیم باشی) کە پشتی بە مێژوویێکی کۆن بەستووە لە دەوروبەری (٥٠٠ک/١١٠٦ز) نووسراوەتەوە، ئاماژە بە ئەوە دەکات، کە سوڵتان توانی لە وڵاتەکانی ڕۆم و ئەرمەندا ژمارەیەکی زۆری قەڵات فەتح بکات و، هەموانی دا بە (ئەبولئەسوار)ی خاوەنی (ئاران)، بۆ ئەوەی بە شانشینەکەی خۆی ببەستێتەوە، چونکە هاوسنوورو بەستراوەبوون بە زەوییەکانی وڵاتەکەی[١٤٠]، بەم شێوەیەش (ئانی) بووە یەک لە مۆڵکەکانی میرنشینی شەدادی کوردی، میر (ئەبولئەسوار) لەگەڵ سوپاکەی لە ساڵی (٤٥٧ک/١٠٦٤ز) هاتە ناو ئەو شارە، فەرمانبەر و شەحنەکانی بە چەک و پیاو. خواردەمەنی(ئەرزاق) و کەتنە هەڵسوڕاندنی کارەکانی[١٤٢١].

(مینۆرسکی) فەرمانڕەوایی شەدادییەکان لە (ئانی)دا دەنرخێنێ، کە وەکو دەزانرێت زۆربەی دانیشتووانی ئەو شارە مەسیحی بوون و، لەم ڕووەوە دەڵێت: میرە شەدادییەکان لە سیاسەتیان لەگەڵ خەڵکە مەسیحییەکان تا ئەوپەڕی بەرێزبوون، لە دەرەنجامی ئەو



سیاسەتە باشەشیان کە پەیڕەویان لێ دەکرد، ڕوانینی دانیشتوانە مەسیحییەکان لەبۆ ئەو میرە کوردانە، وەکو ڕوانینیان بوو بۆ پاشا نیشتمانییە شەرعییەکانی خۆیان، ئەوەی تێبینیش دەکرێت لە ماوەی فەرمانڕەواییێتیان بۆ شاری (ئانی) میرە شەدادییەکان کاریان لەسەر ئەوە دەکرد، گرنگی بەو شارە بدەن، بۆیە هەڵسان شوورەکانی ئەو شارەیان چاککردەوەو تاوەرەکانیان بینا کردەوە، لەو سەردەمەی ئەوانیش هیچ چەوساندنەوەیەکی ئاینی نەخرایە سەرمەسیحییەکان[١٤٢].

لە ڕاستیدا لە سیاسەتی شەدادییەکاندا هیچ جیاوازییەک لە نێوان موسڵمان و مەسیحییەکان و لە نێوان کوردو ئەرمەنەکاندا نەبوو، ئەم گەواهیەی سەرووی (مینۆرسکی) ڕۆژهەڵاتناسیش بێگومان پروپاگەندەی هەندێ لە نووسەرە ڕۆژئاواییەکان ڕەتدەکاتەوە[١٤٣]، کە دەڵێن: ئەو شارە لە ئەنجامی هێرشی سەلجوقییەکان و باڵکێشانی شەدادییەکان بەسەریدا، دەستی تێکدەری پێگەیشت و وێران بوو، هەروەها گەواهییەکەی (مینۆرسکی) ئەوەش نەفی دەکات کە بێزەنتییەکان دەیانگوت خەڵکە مەسیحییەکەمان لە لایەن موسڵمانانەوە دەچەوسێنرێنەوە، بۆیە ماوە دوای ماوە لە تۆڵەی ئەوە هێرشیان دەکردە سەر شارەکانی (ئەرمینیا)، ئەم بارەش یەک بوو لەو هۆیانەی، کە پاڵی بە سوڵتانە سەلجوقییەکانەوە نا، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر مولکەکانی دەوڵەتی بێزەنتی، بەمەش ژمارەیەک شەڕ لە نێوان هەردوو لایەنی بێزەنتی و سەلجوقیدا ڕوویدا.

دەکرێ بڵێین بە هۆی ژمارەیەک پاڵنەرەوە، سوڵتان شاری (ئانی)ی بۆ میری شەدادی بڕیەوە، چونکە ئەو شارە هاوسنووری بێزەنتییەکان بوو و، میرە شەدادییەکان خاوەنی ئەو ناوچەیە بوون، بۆیە مەسەلەی پاراستن و بەڕێوەبردنی ئەو شارە لە لایەن شەدادییەکانەوە زۆر باشتر بوو بۆ سەلجوقییەکان، لەوەی کەوا بێجگەی ئەوان بەڕێوەی ببەن، هەروەها سوڵتان سەرقاڵی هێرشە سەربازییەکانی خۆی بوو، بۆیە هەر هێندە (ئانی)ی فەتحکرد، ئیتر حامیەکی عەسکەری تێدا بەجێهێلا، بەڵام لەوێ نەمایەوە، ئەو هێزەش کە لەسەر سنووری شارەکە بوو، گەورەبوو[١٤٤].

هەروەها متمانەی سوڵتان بە کورد گەورەبوو، بۆیە شارەکەی دایە دەست ئەوان، پاڵنەرێکی دیکەش دووری وڵاتی (ئاران)بوو، لە پایتەختی حوکمیان، چونکە (ئەلب ئەرسەلان) شاری (ئەسفەهان)ی کردە پایتەختی دەسەڵاتەکەی، جا بە هۆی دووری ماوەی نێوانیان، سوڵتان نەیدەتوانی بەسەر باری ئەو شارەدا زاڵ بێت، بۆیە بۆ ئەو میرە

شەدادییەی بڕیەوە، دوا رای دروستیش ئەوەیە، کە سوڵتان دەیویست پاداشتی (ئەبولئەسوار) بداتەوە لەسەر ئەو هەولآنەی کە لەگەڵیدا دای، چونکە لەگەڵ سوپاکەی بەشداری کرد، لە هێرشەکەی بۆ سەر شاری (ئانی).

دەستدرێژییەکانی (بیزەنتی) و (ئەبخاز)ییەکان، بۆ سەر شارە سنوورییەکانی باکوور درێژەی بوو، ئەوەتا دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) لە هێرشەکەی ساڵی (٤٥٦ک/١٠٦٤ز)ی بۆ سەر (ئەرمینیا) و ژێردەست خستنی شاری (ئانی) بە دەستی هێنا، پاشای (ئەبخاز)ی لە -قیرات- لە ساڵی (٤٦٠ک/١٠٦٧ز)ی دیسانەوە دەستی بە هێرشەکەی کردەوە بۆ سەر (ئەرمینیا) و شاری (بەرزەعە)[١٤٥]یش ڕووبەڕووی هێرشێکی (ئەبخازی)[١٤٦] بووەوە، بۆیە سوڵتان بڕیاریدا بە ڕووی ئەو هێرشانەدا بووەستێتەوە، ئیتر یەک لەسەرکردەکانی خۆی کە ناوی (ساوتکین)[١٤٧] بوو، بە فەرماندەیی هێزێکی سەلجوقی، بە ئاراستەی وڵاتی ئەبخازی ڕەوانکرد، هەروەها خۆیشی بە فەرماندەیی هێزێکی دیکە بە ئاراستەی شارو قەڵاکانی (ئەرمینیا) هات[١٤٨]، بەمەش هەندێ لە شارەکانی ناوچەکە، کە کوردیان تیا دادەنیشت، شان بە شانی ئەرمەنییەکان بە دەست بارێکی ناخۆش و شڵەژاویەوەیان ناڵاند، چونکە (ئەلب ئەرسەلان) هێرشی کردەسەر ژمارەیەک شارو قەڵا، لەوانە شارەکانی (شکا)(١٤٩) و (تەفلیس)[١٥٠]، ئەم هەولآنەی سوڵتانیش بەرداربوون، چونکە توانی دەست بەسەر ئەو شارانەدا بگرێت و ژمارەیەکی گەورە لە نەسرانییەکانی ئەو ناوچانە بوونە موسڵمان، کە یەک لەوانە (ئەخستان)ی پاشای (شکا) بوو[١٥١].

پاشای (ئەبخاز)یەکان لە (قیرات)یش لەبەر ئەوەی نەیتوانی چیدیکە بەرەنگاری سوپای سەلجوقی بکات، داوای کرد سوڵتان ئاشتەوایی لەگەڵ بکا، کاتێکیش سوڵتان لە ژێر رکێف خستنی شارەکانی (ئەرمینیا) تەواوبوو، گەڕایەوە (کەنجە) پایتەختی میرنشینی شەدادی، (حوسەینی) کە ئەو ڕووداوانە دەگێڕێتەوە، ئاماژە بەوە ناکات، کە ئایا لەوێ سوڵتان دیداری لەگەڵ (فەزلونی دووەمی) میری شەدادی، ناسراو بە (ئەبولئەسوار)(٤٥٩-٤٨٣ک / ١٠٦٦-١٠٩٠ز) کردووە، یان نا.

بەڵام لە سەرچاوە ئەرمەنییەکاندا وا هاتووە، کە (سوڵتان) لەوێدا چاوی بە میر (فەزلون) کەوتووەو شارەکانی (تەفلیس) و (ڕوستاف)ی بۆ بڕیوەتەوە[١٥٢].

(سەبتی ئیبنولجۆزی) پێچەوانەی هەردوو ئەو رایانەی سەروو دەوەستێت و دەڵێت: لە



ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٤٦٠ک/١٠٦٧ز) سوڵتان لە شاری (کەنجە) دابەزی، (نیزامولمەلیک)ی وەزیریشی هاتە لای (ئەبی لئەسوار) خاوەنی شارەکە، ئەوەی دواییش هاتە پێشوازیی (پێی نایە سەر بەڕی سوڵتان و سوڵتانیش پۆشاکی میرینی تایبەتی پێدا، ئینجا گەڕایەوە وڵاتەکەی و خزمەتی سوڵتانی کردو دیاری وای پێشکەش کرد، وەسف ناکرێت)[١٥٣].

گەڕانەوەی سوڵتان بۆ پایتەختی شەدادییەکان واتای زۆر بەخۆوە دەگرێت، بۆیە هیچ بە دوور نازانرێت هەوڵەکانیان هاوبەش بووبێت، بۆ هێرشکردنە سەر وڵاتی (ئەبخاز) و (بیزەنتی)یەکان، چونکە شارەکانی (بەرزەعە)و (شکا) ڕووبەڕووی هێرشی ئەبخازییەکان بوونەوە، ئەم دوو شارەش سەر بە میرنشینی شەدادی بوون، ئەگەرچیش لە هەندێ کاتدا دەکەوتنە دەست ئەرمەنییەکان، کەواتە هێزە کوردییەکان بەشداری سوپای سەلجوقیان کردووە، لە شەڕکردن لە دژی ئەبخازییەکان، ئەمەش لە پێناو پاراستنی شارو قەڵاکانیان لە هێرشی دوژمنان.

(بەغراتی چوارەم) کشانەوەی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)ی لە (ئەرمینیا)وە بەرەو وڵاتی فارس بە هەل زانی و هێرشی کردە سەر (تەفلیس)[١٥٤]، ئیتر میری شەدادی ئەرکی بەرپەرچدانەوەی خستە ئەستۆی خۆی و بەسەرکردایەتی هێزێکی پێکهاتوو لە سی هەزار پیاو لە (قیرات) دا ڕووبەڕووی (بەغرات) بووەوە، بەڵام ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە سەربازیە لە ئاکامدا، بەشکستێکی گەورەی سوپای شەدادی تەواو بوو و میر (فەزلون) لە گۆڕەپانی شەڕەکە ڕایکرد[١٥٥]، ئەم شەڕەش لە نێوان میرنشینی شەدادی و پاشاکانی ئەرمەن و ئەبخاز، یەک لەو هۆیانە بوو، کە لە ساڵی (٤٦٣ک/١٠٧١ز) شەڕی (مەلازگەرد) لە نێوان سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) و ئیمپراتۆری بیزەنتی (ڕۆمانۆسی چوارەم) ڕوویدات، ئەو شەڕەی کە بە ڕووداوە گرنگ و چارەنووس سازەکانی ناوچەی ئاسیای بچووک (ئەنادۆل) دەژمێردرێت، کە لە ئەنجامیدا چەندین ئاکامی لێ کەوتەوە، بە تایبەتیش سەبارەت بە کورد.

لە چوارچێوەی سیاسەتی (ئەلب ئەرسەلان)ی فراوانیخوازی لە هەرێمەکانی خەلافەتی عەباسی و بۆ بەجێهێنانی سیاسەتی ناوەندییەت، میرنشینی (شوانکارە)ی هەڵکەوتوو لە هەرێمی (فارس)یش ڕووبەڕووی هێرشی سوڵتان بوویەوە، کە لە ساڵی

(٤٥٨ک/ ١٠٦٥ز) لەگەڵ هێزەکانی بەرەو شاری (ئەستەخر) هاتن[١٥٦]و توانی فەتحی قەڵاکەی بکات[١٥٧] والیەکەشی، (ئەبولعەباس فەزلەویەی کوڕی ئالەویە)[١٥٨] دابەزی و ناچار بوو، دیاریەکی زۆرو لە نێویشیان کوپێکی لە (فیرۆزج) دروستکراو[١٥٩]ی پێشکەش کرد، ئەمەش وەکو هەوڵێکی بۆ ئەوەی مەترسی سوپای سەلجوقی لە سەر میرنشینەکەی بە دوور بخاتەوە... (حوسەینی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سوڵتان لە خەزێنەکانی ئەو قەڵایە شتی وای دەرهێنا (نە چاو بینیبووی و نە گوێش بیستبووی)[١٦٠]، فەرمانیشی دا خاوەنی قەڵاکە بۆ شوێنێکی دیکە دوور بخرێتەوە، ئەمەش وەکو تۆڵەسەندنەوەیەک لێی، چونکە بەرەنگاری سوپای سوڵتانی کردبوو[١٦١].

لە کاتێکدا سەرچاوەکان بەم شێوەیە باس لە هێرشی سوڵتان بۆ سەر میرنشینی (شوانکارە) دەکەن، خاوەنی کتێبی (العراضة في الحكاية السلجوقية) ڕووداوەکە بە شێوەیێکی کەمێک جیا دەگێڕێتەوە، دەڵێت: سوڵتان بۆیە هێرشی کردە سەر (فارس)و (شوانکارە)، چونکە (دانیشتووانەکەی ملکەچ نەبوون بۆ فەرمانڕەواییەکەی)[١٦٢]و لە گوێڕایەڵیکردنی یاخیبوون و لە فەرمانەکانی خۆیان دوور گرت، ئەویش بەو پاڵەوانێتیەی لە نێوی بردن و گێڕانییەوە بۆ گوێڕایەڵی لێکردنی و بەجێهێنانی فەرمانەکانی، ئیتر (ئەلب ئەرسەلان) خۆی بەرەو (فارس) هات، زۆرێکی لە فەرمانڕەوا لووت بەرزەکان زەلیل کرد، وای لێکردن بە ملکەچی خەراجی پێبدەن و زۆرێکیشی لەدەستڕۆیشتووانی کوشت[١٦٣].

میرنشینی شەدادیش بە ڕۆڵی خۆی لە هێرشەکانی سوڵتان بۆ سەری رزگاری نەبوو، هەر چەندەش میرەکانی ئەو میرنشینە لە کاتی هێرشەکانی سوڵتاندا بۆ سەر (ئەرمەن)و (ئەبخاز) دەستی یارمەتی و کۆمەکییان بۆ درێژ کردبوو، (نیزامولمەلیک)ی وەزیر هاتە وڵاتی میر (فەزلونی دووەم) خاوەنی (کەنجە)[١٦٤]و ئەو میرە شەدادییە پێشوازی لێکردو بە یاوەری وەزیر بەرەو سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) هاتن، بەمەش سوڵتان بەڕێوەبردنی هەرێمی (فارس)ی بەو میرە سپارد[١٦٥]... ئیتر سەرچاوەکان درێژەی ئەم باسانە بە شێوەیەکی ورد ناگێڕنەوە، ئەوە نەبێت بە کورتی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە دواتر میر (فەزلون) یاخیبوونی خۆی لە دژی دەسەڵاتی سەلجوقی ڕاگەیاند[١٦٦].

(ئیبنولئەثیر) بە شێوەیەکی جیا لەمە ئەم ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە، باس لە هێرشێکی



(نیزامولمەلیک) بۆ سەر (فارس) دەکات، بۆ ئەوەی میر (فەزلون) ملکەچ بکات، هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە یاخیبوونی لە دژی سوڵتان لە یەک لە قەڵا سەخت و پارێزراوەکانی (فارس) بوو، مێژووەکەشی ساڵی (٤٦٤ک/ ١٠٧٢ز)یە[١٦٧].

(حوسەینی)و (ئیبنولئەثیر) درێژە بە قسەکانیان دەدەن، لە بارەی ئەو چارەنووسەی یاخیبوونەکە پێی گەیشت، دەڵێن: (نیزامولمەلیک) لەگەڵ هێزەکانی بەرەو قەڵاکە هات و گەمارۆیدا، بەڵام نەیتوانی بهێتە ناوی[١٦٨]، ئەو کاتە (نیزامولمەلیک)ی وەزیری سەلجوقی بیری لە دۆزینەوەی ڕێگەیەکی دی کردەوە، تا بە هۆیەوەی میر (فەزلون) ناچار بکات خۆی بە دەستەوە بدات، ئیتر فەرمانی بۆ میر (هەزار ئەسپ کوڕی بەنکیری کوردی) دەرکرد، کە لەگەڵ هێزە سەلجوقییەکان بەرەو شوێنی لەدایک بوونی (فەزلون) واتە بەرەو (کەنجە) بهێت و شەڕ لەگەڵ خەڵک و تاکەکانی خانەوادەکەی بکەن، کاتێکیش میری شەدادی بە پلانەکەی وەزیری ناوبراوی زانی، ناچاربوو لە قەڵا ناسراوەکەی بە ناوی خۆی (قەڵای فەزلون)[١٦٩] هاتە خوار، بۆ ئەوەی ڕێگە لە (هەزار ئەسپ) بگرێت، لەوەی کەوا هێرش بکاتە سەر وڵاتەکەی[١٧٠].

وا دەردەکەوێت، هاتنە دەری میر (فەزلون) لە قەڵاکەی هۆیەک بووە، بۆ ئەوەی لە لایەن وەزیر (نیزامولمەلیک) بگیرێت، کە فەرمانیدا بەند بکرێت، تا ئەو کاتەی سوڵتان لە هێرشەکانی بۆ سەر (کرمان) تەواو دەبێت، ئینجا وەزیر لەگەڵ میر (فەزلون)ی دیل بەرەو سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) هاتن، ئەویش لێی خۆشبوو و بڕیاریدا ئازاد بکرێت[١٧١].

ئەم دەقەی پێشوو، ئەوەمان بۆ دەچەسپێنێت، کە هەندێک لە میرە کوردەکان، ئەگەرچیش سۆزو گوێڕایەڵییان بۆ دەسەڵاتی سەلجوقی ڕادەگەیاند، بەڵام لە نێوان ماوەو ماوەیەکی تردا یاخیبوونی خۆیان لە دژی دەسەڵاتەکەیان ڕادەگەیاند، چونکە کورد مەیلیان بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی بوو، ڕازی نەبوون بە سیاسەت و فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان بە سەر وڵاتەکەیان.

زەقترین سیماکانی سیاسەتی (ئەلب ئەرسەلان) بەرامبەر بە کورد جەخت کردنەوە بووە لە سەر ئەوەی ملکەچی خۆیانی بۆ ڕابگەیەن، بۆیە میری میرنشینە کوردییەکان گوێڕایەڵی خۆیان بۆی پێشکەش کرد، بەڵام ئەوانەی لە دژی وەستان و دانیان پێدانەنا،

چارەنووسیان تیاچوون بوو، وەکو چۆن لە ساڵی (٤٦٤ک/ ١٠٧١ز) لەگەڵ میری شەدادی (فەزلونی دووەم) ئەنجامیدا، وەکو لە پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد.

کورتەی گوتە ئەوەیە: سوڵتان دەسەڵاتی سیاسی سەربەخۆی بە دەست کوردانەوە هێشتەوە لە وڵاتەکانیان، هەر کاتێک پێویستیشی بووبێت بۆ چەسپاندنی دەسەڵات توندی بەکارهێناوە، بۆیە هێرشەکانی زۆربوونەو لە چەندین بەرەوە بووە، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی گیانی یاخیبوون لای کورد، بە هۆی ئەو سیاسەتە رەقەی ئەو سوڵتانە لە سەری دەڕۆیشت، وەکو لە ماوەی لاپەڕەکانی پێشوو یاخیبوونی میر (فەزلون)ی میری (کەنجە)مان لە دژی سوڵتاندا بینی، هەروەها لەگەڵ یاخیبوونی میری شوانکارەی کوردی لە هەرێمی فارس، بەڵام وەکو ئاماژەمان بۆیان کرد، سوڵتان زۆر بە دڵڕەقی هەموو ئەو هەوڵانەی ریشەکێش کرد، کە کورد پێی هەڵسان.

هەر لە هێرشەکانی سوڵتان دیسانەوە ئەوەش تێبینی دەکرێت، کەوا کۆششەکانی ئەو سوڵتانە بە مەبەستی بەستانەوەی هەرێمەکانی دەوڵەت بووە لەگەڵ پایتەختی دەسەڵاتەکەی؛ دەشکرێت ئەو کۆششانە بە سەرەتاکانی یەکەم دابنێین بۆ بە ناوەندیەت بوونی دەسەڵاتەکەیان، ئەگەرچیش هەندێ لە لێکۆڵەران جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە،کە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) سیاسەتی لامەرکەزی گرتبێتە بەر بۆ فەرمانڕەوایەتییەکەی، چونکە هیچ رێگریەکی لەوە نەدیوە، کە میرنشینە سەربەخۆکانی نێو جیهانی ئیسلامی هەروەکو خۆیان بمێننەوە[١٧٢].

سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) دیسانەوە پەیڕەوی لەو سیاسەتەی سوڵتانی پێشە خۆی کرد، کە هات تواناکانی وڵاتی کوردی لە خزمەت پرۆژەکانی خۆی بەکارهێنا، ئەوەتا لە کاتی هێرشەکانی بۆ سەر (ئەرمینیا)و (وڵاتی ئەبخاز) خاڵی تیادەرچوونی سوپاکانی شارە کوردییەکان بوو، هەروەها سوپای شەدادی لە پاڵیاندا بەشداری شەڕەکانی کرد، ئەوە جگە لە کۆمەکی ماددیش.

دەتوانرێت بڵێین لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)دا، کورد توانیان تا رادەیەک پارێزگاری لە میرنشینەکانی خۆیان بکەن، تا دوایین رۆژەکانی دەسەڵاتی توانیان لەگەڵ سیاسەتەکەی دەربچن، کە سەرەنجام لە ساڵی (٤٦٥ک/ ١٠٧٢ز)[١٧٣] لە کاتی هێرشەکانی بۆ وڵاتی ئەودیوی زێ لەسەر دەستی یەک لە دیلەکان، کە پارێزگاری لە یەک لە قەڵاکانی ناوچەکە کردبوو و بە (یوسفی خەوارزمی)[١٧٤] دەناسرا، لە سەر دەستی ئەو



دیلە کوژرا، بەمەش کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتییەکەی هات، دوای ئەوەی توانی مولکەکانی دەوڵەتی سەلجوقی زۆر بە گەورەیی فراوان بکات، هەر لە سنوورەکانی چینەوە، تا دەریای ناوەڕاست بگرێتەوە[١٧٥]، بۆیە سەیر نییە کە هەندێ لە سەرچاوەکان ناویان ناوە (سوڵتانی جیهان)[١٧٦].

ئەوەی تێبینی دەکرێت، سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەر لە مردنی هات جێنشینێکی بۆ خۆی هەڵبژارد، ئەوەبوو لە ساڵی (٤٥٨ک/ ١٠٦٥ز) رەزامەندی خەلیفە (قائیم بی ئەمریڵلا)ی لە سەر ئەوە وەرگرت کە لە دوای خۆی (مەلەکشاه)ی کوڕی لە جێی دابنیشێ[١٧٧]، هەروەها لە پێناو زامنکردنی دەسەڵاتەکەی بە سەر سەرجەم هەرێمەکان، هەڵسا بە دابەشکردنی ناوچەکان بە سەر ئەندامانی خانەوادەکەی، هەرێمەکانی بە سەر براو کوڕەکانی دابەشکرد[١٧٨]، ئەم کارانەش لە لایەن ئەو سوڵتانە سەلجوقییە، پێشەکیەک بوو، بۆ ئەوەی (مەلەکشاه)ی کوڕی لە دوای ئەو بە لێبڕاوی کار بۆ سەپاندنی سیاسەتی ناوەندی بکات، کە لە سەردەمی ئەم کوڕەیدا، دەسەڵاتی میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان بە تەواوەتی نەمان.

### دووەم: پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان کوردو سەلجوقییەکان:

دوای ئەوەی هەردوو لایەنی کوردی و سەلجوقی دانیان بە یەکدا نا، دیاردەی پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوانیان بە شێوەیەکی روون زەق بوویەوە، چونکە کورد خاوەن دەسەڵاتی سیاسی سەربەخۆی خۆیان بوون، کە ئەو دەسەڵاتەیان خۆی لەو میرنشینانەیاندا بەرجەستە دەکرد، کە لە هەرێمە کوردییەکان بڵاوبوونەوە، سەلجوقییەکانیش بە رۆڵی خۆیان دەوڵەتێکی سەربەخۆی دانپێنراو بوون لە لایەن خەلافەتی عەباسی، هەردوولای کوردی و سەلجوقیش سووربوون لە دروستکردنی پەیوەندی سروشتی لە نێوانیان، ئەمەش بە هۆی ئەو تێکەڵاوبوون و پێکەوە ژیانە، کە لە دەرەنجامی باڵکێشانی سەلجوقییەکان بە سەر وڵاتی کورددا دروست بووبوو.

بەڵام ئەم پێکەوە ژیانە، بەو مانایە نایەت، کە وڵاتی کورد سەربەخۆیی خۆی لە دەست دا بێت و لە نێو لاشەی قەوارەی سەلجوقیدا توابێتەوە، کە بۆ زانیاری (بارتۆلد) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەلجوقییەکان توانیویانە ژمارەیەک لە ناوچە کوردییەکان بە تورک

بکەن، لەوانە ناوچەی (ئاران) – پایتەختی میرنشینی شەدادی بچووک بکرێنەوە و ناوچەی (شروان)[١٨٠]و (دەربەند)[١٨١]، هەروەها جەخت لە سەر ئەوەش دەکاتەوە، کە لەو ناوچانە زمانی تورکی شوێنی زمانە خۆجێییەکانی گرتەوە، هەر لە بارەی ئەم بابەتەوە (فرای) زیاتر دەڵێت: هۆزە تورکەکان لە (ئاران)و (ئازەربێجان)دا قەراریان گرت و وردە وردە زمانی تورکی شوێنی ئەو زمانانەی تری گرتەوە، کە لە لایەن دانیشتووانەکانیان بەکار دەهێنران[١٨٢].

بەڵام بە وردبوونەوە لە دەقە مێژووییەکان، ئەمە دەرناکەوێت، کە ئەو دوو لێکۆڵەرەی سەروو بۆی دەچن، چونکە ئەوان جیاوازییان لە نێوان بە تورککردنی زمانی و بە تورککردنی رەگەزی نەکردووە، دەنا باڵکێشانی سەڵجوقییان بە سەر هەرێمە کوردییەکان، ئەوە ناگەیەنێت، کە کوردەکان بە تورک کرابن، وەکو ئەو لێکۆڵەرانەی سەروو بۆی دەچن[١٨٣]، بەڵام بە هۆی قەرارگرتنی تورک لە هەندێ بەش لە هەرێمە کوردییەکان، ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی زمانی تورکی لە نێوان دانیشتوانی ئەو ناوچانە بڵاوببێتەوە.

پەیوەندی نێوان کوردو سەڵجوقییەکان، وەکو پەیوەندی نێوان ئاغاو شوێنکەوتەی ملکەچ لە بۆیان نەبوو، کورد بە هاتنی سەڵجوقی بۆ وڵاتەکانیان سەربەخۆیی خۆیان لە دەست نەدابوو، ئەوەتا مانەوەی دەسەڵاتەکەیان واتای ئەوەیە، کەوا سەربەخۆییەکەشیان هەر مابوو، دەشکرێ بەوە راڤەی ئەو هەڵوێستەی کورد بکرێت، کەوا واقیع وای لە کورد کرد، دان بە سەڵجوقییەکاندا بێنن، چونکە ئەوان دەرکیان بەوە کردبوو، کە مانەوەیان بەوە بەستراوەتەوە، بۆیە لە پێناو پاراستنی وڵات و میرنشینەکانیان بە پەلە هاتن ئەو هەنگاوەیان نا.

دەسەڵاتی سەڵجوقیش لەسەر سیاسەتێکی روون پەیوەندی لەگەڵ کورد بەستابوو، کە بە گوێرەی میرنشین و قەوارە سیاسییە کوردییەکان لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر بێگومان ئەو پەیوەندییانە دەگۆڕان، چونکە هەندێ لە میرنشینەکان پەیوەندی باشیان لەگەڵ سەڵجوقییەکان هەبوو، هەوڵیشیان دەدا بەردەوام پەیوەندییان هەروا باش بێت لەگەڵیان، هەندێ میرنشینی دیکەش پەیوەندییان لەگەڵ سەڵجوقییەکان خراپ بوو، بەڵام ئەو پەیوەندییەش هەمیشە گۆڕانی بەسەردا دەهات و لە سەر یەک وەتیرە نەدەڕۆشت، هێندە هەبوو وای لێهاتبوو پەیوەندییەکان دوای ئەوەی پێشتر لە سەر دوژمنایەتی بینا دەکران، لە مەولا لە سەر خۆشەویستی بینا بکرێن.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بگوترێت لە سەرەتادا پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا



باش بوو، هەردوولا هەوڵیان دەدا هیچ کێشەیەک لە نێوانیاندا روو نەدات، چونکە هیچ لایەکیان ئارەزوویان لەوە نەبوو، لەگەڵ یەکدا بچنە نێو ململانێیەکی بێ ئەنجام، کورد لە لایەن خۆیانەوە ئامانجیان هەر ئەوەبوو، قەوارە سەربەخۆکانیان بمێنێتەوە، سەڵجوقییەکانیش لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان بوون، ئامانجیان چەسپاندنی قەوارەیەکی سیاسی بوو، بۆیە نەیاندەویست لەگەڵ کورددا بەیەکدادان لە نێوانیان رووبدات، بۆیە دەبینین سوڵتانە یەکەمەکانی ئەو دەوڵەتە، بە تایبەتی سوڵتان (تەغرول بەگ)[١٨٤] هەوڵیان دەدا لە کورد نزیک ببنەوەو سۆزیان لە بۆ خۆیان رابکێشن، هەروەها لە زۆربەی پرۆژەو کارگێڕییەکان و سوپاکانیاندا پشتیان پێ ببەستن.

پەیوەندی نێوان هەردوولا لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)یش هەر درێژەی بوو[١٨٥]، ئەگەرچیش هەڕەشەکانی هەر بەردەوام بوون، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی سەردەمی سوڵتان (مەلەکشاه)[١٨٦]، لە (٤٦٥-٤٨٥ک/ ١٠٧٢-١٠٩٢ز) پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا گۆڕانی بەسەردا هات، یان باشترە بڵێین سیاسەتی سەڵجوقییەکان بە تەواوی بەرامبەر قەوارەو میرنشینە سەربەخۆکان و لە نێویشیان میرنشینە کوردییەکان گۆڕا، ئەو سوڵتانە بڕیاریدا کۆتایی بە دەسەڵاتی سەرجەم قەوارە کوردییە سەربەخۆکان بێنێ و هەر هەموویان بە پایتەختی فەرمانڕەوایی سەڵجوقی ببەستێتەوە، بەمەش ئاکامی میرنشینە کوردییەکان یان رووخان بوو، یان لاواز بوون بوو لە ژێر فشاری هێرشە بەهێزەکانیان.

ئەوەی تێبینیش دەکرێت، ئەو پەیوەندییانەی لە سەردەمی هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ)و (ئەلب ئەرسەلان)دا کوردی بە سەڵجوقییەکان دەبەستەوە، سیمای روون و دیاری هەبوو، لە کاتێکدا سیاسەتی سوڵتان (مەلەکشاه) بە تایبەت بەرامبەر کورد وا نەبوو، بۆیە لە نێوان هەردوولا ململانێی توند روویدا، لە دواتردا دێینە سەر روونکردنەوەیان.

**أ- بالیۆزەکان لە سەردەمی هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ)و (ئەلب ئەرسەلان):**

یەک لە رووەکانی پەیوەندییە سیاسییە باشەکانی نێوان هەردوو لایەنی کوردی و سەڵجوقی، خۆی لە گۆڕینەوەی (بالیۆز)ەکانی نێوان هەردوولادا دەنواند، یەکەم بەیەکگەیشتنی نێوان هەردوولا لە کاتی هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان روویدا، لەوێوە (بالوێز)و (نێردراو) لە نێوان هەردوولادا گۆڕدرانەوە، چونکە میرە

کوردەکان هەوڵیاندا بە ڕێگەی جۆراوجۆر مەترسی (غەز)ەکان لە سەر وڵاتی خۆیان دوور بخەنەوە، یەک لەو ڕێگایانەش هەناردنی (بالیۆز)و (نێردراو) بوو، بۆ لای بەرپرسە سەلجوقییەکان.

مێژووی یەکەم (بالیۆز) گۆڕینەوەی نێوان هەردوولا، بۆ ساڵی (٤٢٩ک/ ١٠٢٩ز) دەگەڕێتەوە، بە واتە بەر لەوەی سەلجوقییەکان وەکو دەسەلاتێکی سیاسی لە ناوچە کوردییەکاندا دەربکەون، ئەوەش لە کاتێک بوو، کە (غەز) هێرشیان کردە سەر (ئازەربێجان)[١٨٧]، ئیتر میر (وەهسوزانی ڕووادی) نامەی بۆ سەرکردەکەیان ناردو ڕێگەیدا بێنە نێو (تەبرێز)[١٨٨]، هەروەها میرە مەڕوانییەکانی (جەزیرە)ش هەوڵیاندا، لە ڕێگەی هەناردنی (بالیۆز)ەکانیان بۆ لای سەرکردەکانی (غەز)، مەترسییان لە سەر میرنشینەکەیان بە دووربخەنەوە – هەروەکو لە پێشتردا ئاماژە بەوە درا، ئەو کاتەی لە لێکۆڵینەوەدا بووین، لە هێرشەکانیان بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان – چونکە گەیشتبوونە وڵاتی مەڕوانییەکان، بۆیە لە ساڵی (٤٣٣ک / ١٠٤١ز) (سولەیمانی کوڕی نەسرولدەولە)ی میری (جەزیرەی ئیبنوعومەر) نامەی لەگەڵ سەرکردەکانیان گۆڕیەوەو لەگەڵیان کەوتە ئاشتەوایی[١٨٩].

دەکرێت مێژووی یەکەم (بالیۆز) گۆڕینەوەی ڕەسمی لە نێوان میرە کوردەکان و، قەوارەی سەلجوقی بۆ ساڵی (٤٣٥ک / ١٠٤٣ز) بگەڕێنینەوە، ئەمەش لەو کاتەوەی کە (نەسرولدەولە) دەستپێشخەری کرد، لە نامەناردن بۆ سوڵتان (تەغرول بەگ)، تیایدا لە مەترسی دەستدرێژییەکانی (غەز) بۆ سەر وڵاتەکەی خۆی، سکاڵای خۆی بۆ سوڵتان بەرزکردبۆوە، لە ئەنجامی ئەوە نامەیەکی وەڵام لە سوڵتانەوە بۆ ئەو میرە کوردە گەیشت، تیایدا وادەی پێدابوو، کە کار بکات لەسەر وەستاندنی ئەم دوژمنکاریانەیان[١٩٠]، ئەم نامەیەش سەرەتای پەیوەندییە بە ڕاستییەکانی نێوان هەردوولا بوو، ئەم پەیوەندییانەش بەردەوام بوون و فراوانبوون تا میرنشینە کوردییەکانی دیکەشی گرتەوە، ئەوەتا میرنشینی (عەنناز)یش نامە گۆڕینەوەی هەبوو لەگەڵ دەسەلاتی سەلجوقی... لە ساڵی (٤٣٨ک / ١٠٤٦ز) میر (سەعدی کوڕی ئەبو لشەوک) نامەیەکی بۆ (ئیبراهیم یەناڵ) نووسی و تیایدا مەسەلەی هاتنە پاڵ دەسەلاتەکەیانی، خستە بەردەم[١٩١].

لە ماوەیەکی دواتریشدا، ئەم ئاستە بەرزبوویەوەو شێوەی گۆڕینەوەی (وەفد) و



(بالیۆز)ی لە نێوان هەردوولادا بەخۆوە گرت، دوای ئەوەی لە ماوەی ڕووبەڕووبوونەوەی هەرێمە کوردییەکان لە شاڵاوی هۆزەکانی (غەز)ی (تورک) بۆ سەریان پەیوەندییەکان لە ئاستێکی تەسک و سنووردار بوون، ئەم ئاستە وەکو گوتمان بەرەو پێش هات، تا وایلێهات خۆی لە شێوەی (وەفد)و (بالیۆز)ی ڕەسمی بینیەوە، لە ساڵی (٤٤١ک / ١٠٤٩ز) سوڵتان وەفدێکی نارده لای میر (نەسرولدەولەی مەڕوانی)[١٩٢]، بۆ ئەوەی داوای لێبکەن لە وڵاتەکەیدا خوتبە بەناوی سوڵتانەوە بخوێنێتەوە، ئەو میرە کوردەش ڕەزامەندی بۆ نواند.

دوای ئەوەی پەیوەندی نێوان ئەو میرە مەڕوانییەو سوڵتانی سەلجوقی شێوەیەکی سروشتی وەرگرت، ئەو میرە بە ڕۆڵێکی دیبلۆماسی تا ئەوپەڕی گرنگ هەڵسا، کاتێک میانەگەری لە نێوان سوڵتانی سەلجوقی و پاشای ڕۆمی بێزەنتی کرد، چونکە پاشای ڕۆمی بێزەنتی (بالیۆز)ێکی نارده لای ئەو میرە کوردە، داوای لێکرد، بچێت لە لای سەلجوقییەکان میانەگەری بکات، بۆ ئازادکردنی پاشای (ئەبخازی)یەکان، کە لە لایان دیل بوو[١٩٣].

(نەسرولدەولە) دڵنیابوو لەوەی کە لەو کارەیدا سەردەکەوێت، بۆیە شێخولئیسلام (عەبدوڵڵای کوڕی مەڕوان)ی وەکو (نێردراو) نارده لای سوڵتان (تەغرول بەگ) و داوای لێکرد دیلی ناوبراو بەربدات، وەکو دەربیش دەکەوێت کاری ئەو (بالیۆز)ە سەرکەوتوو بووە، چونکە سوڵتان ڕازی بوو پاشای (ئەبخازی)یەکان ئازاد بکات، بێ ئەوەی لەبەرامبەردا هیچ شتێکیش وەربگرێت[١٩٤]، سەرکەوتنی ئەو میرە کوردەش لەو میانەگیرییەی، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، بۆئەوەی ئەو میرە کوردە لە گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکە پایەیەکی بەرچاوی بۆ دروست ببێت، چونکە لە بەرچاوی هەردوولایەنی سەلجوقی و بێزەنتی گەورەبوو، بێجگە لەو شوێنەوارەش کە بە شێوەیەکی تایبەتی بەسەر ئیمپراتۆری بێزەنتیی جێهێلا، کە ئیتر هات وەکو نرخاندنی هەوڵەکانی دیاری لە بۆ ئەو میرە کوردە هەنارد[١٩٥].

لەوەی ڕابوورد، دەکرێت جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کە لەگەڵ کەمی زانیارییەکانیش بەڵام (بالیۆز) گۆڕینەوە لە نێوان کوردو سەلجوقییەکان هەبووە، چونکە زۆربەی سەرچاوەکان ئەگەرچیش ناوی ئەو نێردراو و بالیۆزانەیان نەهێنابێ، کە ئەو ئەرکانەیان

پێ سپێردرابێت، بەڵام جەخت دەکەنەوە لەسەر گۆڕینەوەی نامەو بالیۆز لە نێوانیان، ئەو دەقەی پێشووش جەختکردنەوەیەکی ئاشکرایە لەسەر هەبوونی (بالیۆز) لە نێوانیان، تیایدا دەردەکەوێت (بالیۆز)ێک لە لایەن (نەسرولدەولە)وە بۆ لای سوڵتان نێردراوە، هەروەها دەقەکە ئاماژەیەکی روون بۆ ئەوەش دەکات کە (تەغرول بەگ)چەند رێزی بۆ کەسایەتی ئەو میرە مەڕوانییە هەبووە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پەیوەندی نێوان هەردوولایەنی سەلجوقی و میرانی عەننازی لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر زۆرجار بەرەو خراپی دەهات، بەڵام (بالیۆز) گۆڕینەوەش لە نێوان هەردوولا هەبوو، لە ساڵی (٤٤٥ک / ١٠٥٣ز) سوڵتان (تەغرول بەگ) لە لایەنی خۆیەوە نێردراوێکی نارده لای میر (سەعدی)، داوای لێکرد (موهەلهیل)ی مامی ئازاد بکات[١٩٦]، (ئیبنولئەثیر) بە درێژی باس لەم بابەتە دەکات و دەڵێت: نێردراوی سوڵتان گەیشتە شاری هەمەدان و نامەکەی دایە دەست ئەو میرە کوردە، کە بڕیاری دا لەگەڵ گوێڕایەڵی سەلجوقییەکاندا دەربچێت، بۆیە نێردراوی سوڵتان هەمەدانی جێهێڵاو بەرەو حەلوان رۆشت، جا دەکرێت فەشەلهێنانی کاری ئەو بالیۆزەی سوڵتان بە یەک لەو هۆکارانە بژمێردرێت، کە وای لە سەلجوقییەکان کرد، سوپایەکیان بنێرنە شارەکانی چیاکانی کوردی، بۆ شەڕکردن لەگەڵ میر سەعدی[١٩٧].

بە زیاد لە گۆڕینەوەی (بالیۆز) لە نێوان هەردوولا، دەبینین هەندێ لە سوڵتانە سەلجوقییەکان، لە ناوچەکەدا کوردیان وەکو بالیۆز بەکاردەهێنا، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی رووبەڕووی دەوڵەتەکەیان دەبووەوە، ئەمەش لەبەر زیرەکی سیاسەتی کورد لە چارەسەرکردنی زۆرێکی کێشەو گرفتەکان، چونکە لەسەردەمی بزووتنەوەکەی (بەساسیری)، میر (هەزار ئەسپی کوڕی بەنکیری کوڕی عیاز)ی کوردی بە رۆڵێکی چالاک هەڵسا لە نێوان لایەنە سیاسییەکانی ناوچەکە، ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە میری عەقیلی و میر (بەنی دبیس) ساڵی (٤٤٨ک / ١٠٥٦ز) داوایان لێکرد، لە لای سوڵتان میانەگیرییان بۆ بکات، بەڵکو لێیان خۆش بێت، چونکە هەردووکیان پشتگیری (بەساسیری)یان کردبوو، سوڵتانیش وەکو رێزلێنانێک لە میانەگیری میر (هەزار ئەسپ)ی کوردی لە بۆیان، هەردووکیانی بەخشی[١٩٨].

ئامانج لەو (بالیۆز) گۆڕینەوانە لە نێوان هەردوولا، هەر بە تەنیا دروستکردنی پەیوەندی سیاسی سروشتی لە نێوان هەردوولا نەبوو، بەڵکو دەبینین چەندین (وەفد) لە



لایەن سەلجوقییەکانەوە بۆ لای میرە کوردییەکان دەنێردرا، بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانیان، ئەوەتا لە ساڵی (٤٤٧ک / ١٠٥٥ز) ناکۆکیەک کەوتە نێوان میرەکانی خانەوادەی مەڕوانی و هۆزی بەشنەوی کوردی دانیشتوو لە هەرێمی (جەزیرە)، جا کاتێک سوڵتان (تەغرول بەگ) بە هەواڵی ئەو ناکۆکییانەی زانی، کە لە رێگەدابوو بۆ هێرش کردنە سەر وڵاتی رۆم، نامەیەکی بۆ (نەسرولدەولە) نارد، داوای لێکرد چارەسەرێ بدۆزێتەوە بۆ کێشە هەڵبەستراوەکانی نێوان هەردوو هۆزەکە[١٩٩].

کاتێکیش دەسەڵات کەوتە دەست (ئەلب ئەرسەلان) لە ساڵی (٤٥٥ک / ١٠٦٣ز)، پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەردوولا هەر بەردەوام بوو، زۆرجار سوڵتان خۆی لەگەڵ میرە کوردەکان بەیەک دەگەیشت، ئەوەتا لە ساڵی (٤٥٦ک / ١٠٦٤ز) لەگەڵ میر (ئەبولئەسوار شاور)ی مەڕوانی بەیەکەوە دانیشتن، تا وەکو هەوڵەکانیان یەک بخەن بۆ هێرشکردنە سەر (ئانی)[٢٠٠]، هەروەها لە ساڵی (٤٦٣ک / ١٠٧١ز)یش لە کاتی رۆشتنەوەی بۆ وڵاتی شام، کە بەزەوییەکانی (جەزیرە)و (دیاربەکر)دا تێپەڕی، گەیشتنە (ئامەد)، ئیتر میر (نیزامەدین) هاتەدەر بۆ پێشوازی لێکردنی و بەخێرهاتنی لێکرد بۆ وڵاتەکەی و گوێڕایەڵی خۆی بۆ پێشکەش کرد[٢٠١]، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە گۆڕینەوەی نامەو بالیۆزەکانی نێوان دەسەڵاتی سیاسی کوردی و سەلجوقی، یەک لەو رووە گوزارەشتکەرانەیە، لە پەیوەندییە سیاسییە باشەکانی نێوان هەردوولا، لە ماوەی فەرمانڕەوایی هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ) و (ئەلب ئەرسەلان).

### ب- دیارییەکان

ئەو دیارییانەی لەلایەن میرە کوردە خۆجێیەکان پێشکەش بە سوڵتانە سەلجوقییەکان دەکران، یەک لە رووە گوزارەشتکەرەکانە لە پەیوەندییە کوردییە- سەلجوقییەکان، چونکە مەسەلەی پێشکەشکردنی دیاری لە هەندێ بۆنەدا باوبوو، ئەمەش گوزارشت بوو لە پەیوەندی دۆستایەتی و وەکو هێمایەک بوو، بۆ دەرخستنی سۆزو گوێڕایەڵی، ئەوەی لەم رووەشەوە تێبینی دەکرێت، ئەوەیە کە میرە کوردەکان زۆرجار دیارییان بۆ دەناردن، ئەمەش بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکانیان لەسەریان.

سەرەتاکانی دیاری ناردن لە لایەن کوردەوە، ئەوکاتە دەستی پێکرد کە تورکە (غەز)ەکان هێرشیان هێنایە سەر هەرێمە کوردییەکان[٢٠٢]، جا لە ماوەی ئەو هێرشانە

میرە کوردەکان پارەو دیاری زۆریان بۆ پێشەواکانی ئەو هێزانە دەنارد بۆ دوورخستنەوەی مەترسییەکانیان، هەر لە رێگەی دانی دیاریش بوو، میر (وەهسوزانی روادی) و میر (ناسرولدەولەی مەڕوانی) و چەندین میری بێجگەی ئەوانیش، میرنشینەکانیان لە وێران بوون بە دوورخستەوە.

لە ماوەی دەسەڵاتی سەلجوقی و هەر لە سەردەمی سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە، میرە کوردەکان سووربوون لەسەر بەردەوام بوون لە هەناردنی دیاری، ئەمەش لە پێناو پارێزگاریکردن لە سەربەخۆییەکەیان، ئەوەی شایانی باسیشە دیارییەکان زۆربەی جارەکان لە شێوەی پارەی نەخت بوون، ئەوەتا لە ساڵی (٤٤١ک / ١٠٤٩ز) میر (نەسرولدەولە) دیاری گەورەو لە نێویان پەتی یاقوتی سوور (کە ئەمە لەو گەوهەرە بەنرخانە بوو، کە ئەو میرە کوردە هەیبوون) لەگەڵ سەد هەزار دیناریش، بەسەریەکەوە بۆ سوڵتانی هەناردن[٢٠٣]، (ئیبنولعیبری) زیاد لەمە دەڵێت: میر (نەسرولدەولە) لەگەڵ نێردراوەکەیدا کۆمەڵێک دیاری بۆ سوڵتانی سەلجوقی هەنارد، لە نێویان سی پارچە لە قوماشی زۆر نایاب و پێنج سەد دینار و ژمارەیەک خێوەت و دە هێستر و، ئەسپێکی عەرەبی و، دیلێکیش لە بەتریقە رۆمەکان دەبینران، ئینجا ئەو میرە کوردە بە بالیۆزی تایبەت بە سوڵتانی گوت: (شتێکی دیکەم لەلا نەماوە، بۆ سوڵتان بشێت) ئیتر بەوە بالیۆزی سوڵتان رازی بوو، گرێبەندی ئاشتیی لەگەڵ بەست و ماڵئاوایی کرد و رۆیشت[٢٠٤].

هەناردنی ئەم دیارییە بە نرخانە واتای زۆری هەیە، زیاد لەوەی کە گوزارشتی لە سۆزو گوێڕایەڵی دەکرد لە بۆ سەلجوقییەکان، لە هەمان کاتدا بەڵگەشە لەسەر باشی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا، هەروەها بەڵگەشە لەسەر ئەوەی، کە (نەسرولدەولە) لە هێزی سەلجوقییەکان دەترسا، دەرکیشی بەوە کردبوو، کە ناتوانێت بە روویاندا بوەستێت، بۆیە ئەو دیارییانەی لە بۆ هەناردن.

لە کاتی هێرشەکەی سوڵتان (تەغرول بەگ) بۆ سەر (ئەرمینیا)ش لە ساڵی (٤٤٦ک / ١٠٥٤ز) دیسانەوە (نەسرولدەولە) دیاری زۆری لە بۆ رەوانەکرد[٢٠٥]، چونکە هێزە سەلجوقییەکان لەو شاڵاوەیاندا هێرشیان کردە سەر (مەلازگەرد)، کە ئەمەش یەک لە شارەکانی (ئەرمینیا)ی نزیک لە موڵکی مەڕوانییەکانە، بەڵکو چەندین شاری ئەرمینی



سەر بە میرنشینی مەڕوانی بوون، بۆیە (ئیبنولعیبری) کە وەسفی (نەسرولدەولە) دەکات، بە (خاوەنی ئەرمینیا) ناوی دەبات[٢٠٦].

میر (هەزار ئەسپی کوڕی بەنکیری کوڕی عیازی) کوردیش، کە نزیک بوو لە سەلجوقییەکان ساڵی (٤٤٩ک / ١٠٥٧ز)[٢٠٧] دیاری بەنرخی پێشکەشی سوڵتان (تەغرول بەگ) کرد، تیایدا سێ (زبادی)[٢٠٨]، (فیروزج)[٢٠٩] هەبوو.

لە ماوەی بزووتنەوەی (بەساسیری)ش سوڵتان وەکو تۆڵەکردنەوەیەک لە هەڵوێستی (نەسرولدەولە)، کە دەستپێشخەری کردبوو لە نامە ناردن بۆ بانگخوازی فاتمییان، هێرشی هێنایە سەر (دیاربەکر)، جا دوای ئەوەی سوپای سەلجوقی گەیشتە وڵاتی (نەسرولدەولە)، ئەو میرە نێردراوێکی بە (ملکەچی و گوێڕایەڵی) نارده لای سوڵتان (تەغرول بەگ) و سەد هەزار دیناری پێدا، ئینجا سوڵتان رازی بوو، لێی خۆش بێت[٢١٠].

دیاری و ماڵ بەخشینەکان لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)یشدا هەر بەردەوامبوو، لە ساڵی (٤٦٠ک / ١٠٦٧ز) لە کاتی دابەزینی سوڵتان لەگەڵ وەزیرەکەی (نیزامولملیک) لە جەنزە (کەنجە)، چاویان کەوت بە میر (فەزلون کوڕی ئەبولئەسوار)- خاوەنی ئاران - کە وەکو گوزارشت کردنێک لە گوێڕایەڵییەتی کردنی لە بۆ سوڵتان، کۆمەڵێک دیاری پێشکەشکرد، لە نێو دیارییەکاندا هەزار وشتر و پەنجا ئەسپ و پێنج سەد دەستە جل لە جۆری قوماشی باش و نایاب و، هەندێ دوڕو گەوهەریش کە کێشەکەی سەد هەزار مسقاڵ بوو، هەموو ئەمانە دەبینران، ئەمە بە پێی گوتەی (سبتی ئیبنولجۆزی)[٢١١].

لە کاتی هێرشی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بۆ سەر هەرێمی فارس[٢١٢]و، بە دەستنیشانکردنیش شاری (ئەستەخەر)، میری میرنشینی شوانکارەی کوردی ناچاربوو، دیاری گرانبەها پێشکەشی سوڵتان بکات، کە لە نێو دیارییەکانی کوپێکی دروستکراو لە (فەیروزج)ی گرانبەها هەبوو، هەروەها (سوڵتان)یش لە نێو خەزێنەکانی قەڵا شتی وای دەرهێنا، وەسف ناکرێ[٢١٣].

لەلایەکی دیکە هەندێ لە سوڵتانە سەلجوقییەکان، کە یەک لە میرە کوردەکان دەهات سۆزو گوێڕایەڵی خۆی لە بۆیان رادەگەیاند، ئەوانیش وەکو رێزگرتنێک لەو هەڵوێستە

ئاشتییەیان بەخششی دیکەیان پێ دەدان.. ئەوەتا لە ساڵی (٤٥٥ک / ١٠٦٣ز) لە کاتی ئاهەنگی سوڵتان (تەغرول بەگ) بە ژنهێنانەکەی لە کچی خەلیفە، پۆشاکی میرینی شیاوی بەو میرە کوردانە دا، کە لەلای بوون، لەوانە میر (سەرخاب کوڕی بەدر کوڕی موهەلهیل) و میر (هەزار ئەسپ)، هەروەها زیاد لەمە شتی دیکەی شیاویشی پی بەخشین[٢١٤].

(فارقی) دەڵێت: لە ساڵی (٤٦٣ک / ١٠٧١ز) لە کاتی تێپەڕینی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بە زەوییەکانی (جەزیرە) بۆ ڕووبەڕوونەوەی پاشای ڕۆم، ڕێگەی (دیاربەکر)ی گرت، پێشەخۆی (نیزامولەلیک)ی وەزیری هاتە نێو (میافارقین) و لەگەڵ میری مەڕوانی لە کۆشکەکەیدا کۆبوویەوە، ئیتر (نیزامەدین) ئەوەندەی لە (ماڵ و توحفەی جۆراوجۆر پێدا، کە کەم نەبوون)[٢١٥]، ئینجا ئەو میرە لەگەڵ وەزیری ناوبراودا هاتنەدەر بۆ دیداری سوڵتان، لەگەڵیدا کۆبوویەوە، ڕێزی لێناو، دیسانەوە هێندەی پێشکەشکرد لە: (پارە کە پەسن نادرێت)، سوڵتانیش بە ڕۆڵی خۆی پۆشاکی میرینی تایبەتی پێداو، ڕێزی لێناو، گەڕاندیەوە بۆ میرنشینەکەی[٢١٦].

## ج- ژن لێکهێنانەکان:

بۆ بەهێزکردنی هاوبەندی دۆستایەتی و پەیوەندی سروشتی نێوان کوردو سەلجوقییەکان، هەندێ لە ژنهێنانی سیاسی لە نێوان هەردوولادا ئەنجامدرا، ئەگەرچیش لە سنوورێکی بەرتەسک بوو و، چەند حاڵەتێکی کەم بوون، بەڵام وەکو پڕەنسیپ ژن لە یەکتری هێنان، شتێکی ئاسایی بووە لە نێوانیان.

ئەو مەسەلەیە ناچارمان دەکات، جارێکی دیکە بگەڕێینەوە بۆ ماوەی هێرشەکانی (غەز) بۆ سەر هەرێمە کوردییەکان، چونکە لە کاتی هێرشەکەیان بۆسەر (ئازەربێجان) لە ساڵی (٤٢٠ک / ١٠٢٩ز) یەکەم ژنهێنان لە نێوانیاندا بەئەنجام گەیشت، بەوە پەسن درا، کە ئەم ژنهێنانە بۆ مەبەستی سیاسییە، کە ئەوەبوو میر (وەهسوزانی ڕووادی) کچی یەک لە میرەکانی (غەز)ی هێنا[٢١٧]، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو میرە کوردە ناچار بوو ئەو ژنە بهێنێت، بۆ ئەوەی مەترسییەکانیان لەسەر شارەکەی بەدوور بخاتەوە، هەروەها لەوەدا هیوای ئەوەشی هەبوو، کە (غەز)ەکان یارمەتی بدەن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی



دوژمنەزۆرەکانی لە (ڕۆم) و (ئەرمەن) و (کەرەج)ەکان، کە دەوروبەری (ئازەربێجان)یان دابوو لە باکوور و لە ڕۆژئاواوەش، جگە لەوەی هەندێ لە میرە شەدادییەکانیش دژایەتییان بۆ ئەو میرە کوردە ڕووادییە پیشان دەدا[٢١٨]، جا ئەگەرچیش (وەهسوزان) ناچاربوو، بۆ ڕازی بوون لەسەر ئەم ژنهێنانەی، بەڵام ژن لەیەک هێنان بۆ خودی خۆی شتێکی ئاسایی بوو لە نێوان کوردو غەزە (تورک)ەکان، هەروەها دەبێت ئەوەش لە یاد نەکەین، کە ئەم جۆرە ژنهێنانە ئاکامی باشی لێکەوتەوە بۆ میرنشینی ڕووادی، چونکە بەشێوەیەکی کاتی لە هێرش و خاپووربووندا دەربازی بوو.

هەروەها سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)یش وەکو پاداشت دانەوەیەکی میری کورد (هەزار ئەسپ کوڕی بەنکیر)- کە ناوبراو لە بەناوبانگترین سەرکردە کوردەکان بوو، لە نێو سوپای سەلجوقی- هەڵسا (سەفییە خاتوون)ی خوشکی خۆی پێدا[٢١٩]، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەو میرە کوردە لە لایەن سوڵتان و بیلاتی سەلجوقی پایە و مەکانەیەکی تایبەتی هەبووە، بەکارەکیش هەموو ئەو دەقانەی لەبارەی (هەزار ئەسپ)ەوە نووسراون،جەخت لەسەر ڕۆڵ وریزی ئەو میرە دەکەنەوە، لە لایەن هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ) و (ئەلب ئەرسەلان)، ئەوەندەش بەسە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە خوتبە لە هەریەکە لە (ئەهواز) و (خوزستان) و (بەسرا)، بەناوی (هەزار ئەسپ) دەخوێنرایەوە[٢٢٠].

لە ساڵی (٤٦٠ک / ١٠٦٧ز)یش لە کاتی ئامادەیی سوڵتان لە جەنزە (کەنجە)دا ، لە میوانداری میر (فەزلون)، (ئەلب ئەرسەلان) کچە خوشکی پاشای ئەبخازییەکان لە (قیرات)ی، مارەکردو ئاهەنگەکانی گواستنەوەشی لە شاری (هەمەدان)ی هەرێمی (چیاکان) بەڕێوەبرا، بەڵام دوای ماوەیەک سوڵتان تەڵاقی داو، لە میر (فەزلون)ی شەدادی مارەکردو بۆ ئەوی گواستەوە[٢٢١].

(ئان لمنتن)یش ئاماژەبۆ ئەوە دەکات، کە کوڕی میر (ئەبولفەوارس سەرخاب کوڕی بەدر کوڕی موهەلهیل)ی عەننازی لە ساڵی (٤٦٠ک / ١٠٦٧ز) یەک لە کچەکانی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)ی مارەکردو گواستیەوە[٢٢٢]، بەڵام لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا هیچ ئاماژەیەک نییە، ئەم وتەی سەرووی (ئان لمنتن) پشتگیری بکات، هەروەها ناوبراو ئاماژەی بە ناوی هیچ سەرچاوەیەک نەکردووە، کە ئەو زانیارییانەی

لێوەرگرتبێت، بۆیە وا پێدەچێت، پشتی بە هەندێ لەو سەرچاوە فارسییانە بەستابێت، کە باس لە مێژووی سەلجوقییەکان دەکەن، ئەم ئاماژەیەی پێشووش ئەوە دەگەیەنێت، کە پەیوەندییەکانی نێوان سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) و میرە عەننازییەکان بەرەو باشی هاتبێتەوە، دوای ئەوەی کە لە سەردەمی سوڵتان (تەغرول بەگ)دا ململانێ کەوتبووە نێوان هەردوولا.

## سێیەم: رۆڵی کورد لە سوپای سەلجوقی

هەر لەگەڵ سەرهەڵدانیان وەکو هێزێکی سیاسی لە (خوراسان)، (گرنگیدانەکانی سەلجوقییەکان بە زۆری لەسەر سوپا کورت بوویەوە، چونکە سروشتی کۆچەرییان بەم بۆیەی سەربازییەوە رەنگاندبوونی، هەروەها هەر لەگەڵ سەرەتاکانی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، سروشتی گشتی ئەو دەوڵەتەیان و ئاراستەکەیان سەربازی بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە بنەچە کۆچەر بوون و، پەروەردەکەیان پەروەردەیەکی رەق بوو، بۆیە سوڵتانەکانیان گرنگییەکی تایبەتیان بە مەسەلەی سوپا دا، کاریان کرد لەسەر زۆرکردنی ژمارەکەی و پڕ چەککردنی، بۆ ئەوەی ببێتە هێزێک لەدەستیان لە پێناو بیناکردنی دەوڵەتە بەهێزە فراوانەکەیان.

لەسەرەتادا سوپاکەیان لە کۆمەڵێکی ئەو هۆزانە پێک دەهات، کە وەکو کۆچەر و داگیرکەر دەژیان، هەر سەرۆکێک لە سەرۆکەکانی هۆزە تورکە بڵاوبووەکان لە جیهانی سەلجوقی سوپای خۆی هەبوو، کە لەپیاوانی هۆزەکەی پێک دەهات و خۆی چەکداری دەکردن و پارەی پێدەدان، هەروەها هۆزە تورکمانەکانیش هاتنە نێو ریزەکانی ئەو سوپایە، میرەکانیش کاریان لەسەر ئەوە دەکرد، کە هەریەکەو (مقتع) پارچە زەوییەکی گەورە بۆ سەرۆکی ئەو هۆزانە ببڕنەوە، بۆ ئەوەی نیمچە سەربەخۆ بن، هەروەها هەوڵیاندا بەهەر هۆیەک بێت، لە بۆ خۆیانیان رابکێشن، ئەمەش لە رێگەی پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵی سەرۆک هۆزەکانیان و، زیاد لەوەش هەندێ پلەو پایەی سەربازییان پێدەدان[٢٢٣].

تورکمانەکان رەگەزێکی گرنگی نێو رەگەزەکانی سوپای سەلجوقییان پێکدەهێنا، چونکە بەشی هەرە گەورەی هێزەکانیان لەسوارە تورکمانەکان پێکدەهات، لە پاڵ ئەمانە



سوڵتانەکانیان سووربوون لەسەر ئەوەی رەگەزانی دیکەش بهێننە نێو سوپاکەیان، یەک لە لێکۆڵەران لەم رووەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: رەگەزانێکی زۆر بەشدارییان کرد لە سوپای سەلجوقی، نەک هەر لە رەگەزە تورکەکان و بەس، بەڵکو لەو موسڵمانانەی تر، کە سەرکەوتنی ئاسان و دەستکەوتەکان کاری لێکردن و، هاتنە نێو سوپای سەلجوقی[٢٢٤]، لەو رەگەزانەش (دەیلەم) و (ئەوج) و (فەرسخی)[٢٢٥] و (خەوارزمی)یەکان، هەروەها سوپاکەیان رەگەزی (کورد)یشی بەخۆوە گرت[٢٢٦].

لە راستیشدا هاتنی کورد بۆ نێو سوپای سەلجوقی مەسەلەیەکی سەیر نەبوو، چونکە (کورد) ئامادەیی فراوانیان هەبووە لە سوپاکانی زۆرێکی هێزە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامی... یەکەم بەشدارییان لە چالاکی سەربازی لە ماوە زەمەنییەکەی ئەو لێکۆڵینەوەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٤٢٧ک / ١٠٣٥ز)،(بەیهەقی) کە لە (٤٧٠ک / ١٠٧٧ز کۆچی دوایی کردووە) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سوڵتان (مەسعودی غەزنەوی) (ئەبا حەسەن)ی نووسەری عیراقی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە (سوپا سالار) سەرکردەی سوپای کورد و عەرەبەکان[٢٢٧]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە کورد یەک لە رەگەزە گرنگەکانی نێو سوپای سەلجوقی بووبن.

(بەیهەقی) درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: کورد بەشدارییان کردووە لەو شەڕانەی سوپای غەزنەوی لە دژی سەلجوقییەکاندا کردوویانە، ئەوەتا لە ساڵی (٤٣١ک/ ١٠٣٩ز) بە یاوەرێتی سوڵتان (مەسعود) بەرەو (خوراسان) هاتن، لەو شالاوەیدا فەوجێکی پێکهاتوو لە کوردو عەرەب یاوەری سوڵتان بوون، ئەم فەوجەش بەشداری کرد لە شەڕی (دەندانقان)ی نێوان سەلجوقی و غەزنەوییەکان، کە تیایدا سوڵتان (مەسعود) شکا[٢٢٨].

بەشداری کورد هەر بە تەنیا لە نێو ریزەکانی سوپای غەزنەویدا کورت نابێتەوە، بەڵکو رۆڵێکی زۆر گرنگیشیان هەبوو، لە سوپای هەردوو میرنشینەکانی (عەقیلی)و (مەزیدی)، چونکە سوپاکەی (شەرەفولدەولەی عەقیلی) کوردی بەخۆوە دەگرت[٢٢٩]، رۆڵێکی چالاکیشیان بینی لەو شەڕانەی میرنشینەکە کردنی، بۆیە میرەکانی عەقیلی پاداشتیان دانەوە لە سەر ئەو کۆششانەیان و زۆرێکی ئەو (قتعە) هەرێمانەی دەیانگرتن پێیان دەبەخشین[٢٣٠]، (عەبدولجەبار ناجی) زیاد لەوە دەڵێت: کوردە جاوانییەکان

ئامادەییەکی گەورەیان هەبوو لە (حلله)، ژمارەیەک تاکی جاوانی و شاهنجانی بەشداربیان کرد، لە ریزەکانی سوپای (مەزیدی)[٢٣١]، هەروەها جەخت لە سەر ئەوەش دەکاتەوە، کە: پەیوەندییەکانی نێوان کوردو میرە مەزیدییەکان باش بووە، کۆمەڵێک فەرماندەی سوپای کورد لە نێو سوپای مەزیدی دەرکەوتوون، لە نێویان میر (عەنتەری کوڕی ئەبی عەسکەر)، کە ئەمە لە کوردە جاوانییەکانی حلله بوو، لە ساڵی (٥٣٢ک/ ١١٣٨ز) کۆچی دوایی کرد [٢٣٢]و یەک لە فەرماندە سوپاییە دیارەکانی میرنشینی حللەی مەزیدی بوو، هەروەها براکەی ناوبراویش (موهەلهیلی کوڕی ئەبی عەسکەر) دیسانەوە ئەویش یەک لەو فەرماندە دەرکەوتووانەبوو...

بەم شێوەیە کورد وەکو سەرباز بەشداریکردووە، لە سوپای زۆرێکی وڵات و هێزە ئیسلامییەکان، ئەوەی سەرنج راکێشیش بێت، ئەوەیە کە ئەو کوردانە رەگەزێکی گرنگیان لە نێو ریزەکانی ئەو سوپایانە پێکهێناوە، تەنانەت هەندێکیان نازناوی عەسکەری و کارگێڕییان هەبووە... ئەوەتا لە ساڵی (٤٢٠ک/ ١٠٢٩ز) کاتێک (غەز) هێرشیان هێنایە سەر (موسڵ)، (قەرواشی عەقیلی) داوای یارمەتیی لە میرە کوردەکان کرد[٢٣٣]، کە ئەو کاتە هەموو هۆزێکی کورد میرێکی هەبوو، هەندێ جاریش سەرۆکی ئەو هۆزانە بە پێشەنگ (مقدم) دەناسرا، کە ئەم نازناوەش نزیکە لە نازناوی سەرکردەی سەربازی[٢٣٤].

وا دەردەکەوێت هەموو هۆزێک پێشەنگ (مقدم)ێکی هەبووبێت، بۆ نموونە: میر (ئەبولفەتحی کوڕی ورام) پێشەنگی کوردە جاوانییەکان بوو[٢٣٥]، لەوانەشە هۆزە کوردییەکانی دیکەی وەکو (هەزبانی)و (شاهنجانی)و بێجگەی ئەوانیش پێشەنگێکیان هەبووبێت، بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروباری سوپای تایبەت بە هۆزەکە، ئەو شتەی تێبینیش دەکرێت: هەندێ لە سەرکردە کوردەکان، لە نێو سوپای هێزە ئیسلامییەکان، زەق دەرکەوتن و، پلەی (سەرۆک)یان لە سوپا بە دەست هێنا، هەرچی جیاوازی نێوان پێشەنگ (مقدم)و سەرۆکە (قائد)، ئەوەیە کە (مقدم) کاروباری تیپ (فرقە)یێکی سەربازی دەگرێتە ئەستۆ، بەڵام (قائد) سەرپەرشتیاری باڵای سوپا، یان سەرۆکی گشتی کوردە[٢٣٦].

مێژووی بەکاربردنی کورد لە نێو سوپای ئیسلامی، بۆ ماوەکانی پێش لە سەردەمی



سەلجوقی دەگەڕێتەوە، ئەمەش بە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە شارەزایی شەڕیان هەبووە، هەروەها بەرگەی خراپترین باری ژیانیان گرتووە، زیاد لەمانەش تیرهاوێژی زۆر لێزان بوونە[٢٣٧]، (عەباسی) دەڵێت: کورد: (ئازایی و توانای فریاکەوتن و دەمارگیرییان تیایە، چ سوارەکانیان و چ پیاوانی – پیادەشیان –)[٢٣٨]، جا لەبەر بوونی ئەو سیفەتە باشانەی وەک ئازایی و شارەزایی شەڕکردن، بۆیە زۆرێکی هێزە سیاسییەکان سووربوونە لەسەر ئەوەی سوپاکەیان ئەو رەگەزە بەخۆوە بگرێت، یەک لەو هێزانەش کە بەوەیان حەز کردووە سەلجوقییەکان بوونە، سوپای سەلجوقیش لە رەگەزی جۆراوجۆری بەخۆوە گرتووە، یەکیش لەو رەگەزانە کورد بووە، هەروەکو بۆمان دەردەکەوێت.

لەمەوپێش ئەوەمان روونکردەوە، کە دەسەڵاتی سەلجوقی دانی بەو میرنشینە سەربەخۆیانە دانا، کە پێشتر کورد لە وڵاتی خۆیان دایانمەزراندبوو، میرە سەربەخۆکانیان لە فەرمانڕەواییێتی کردنیان هێشتەوە، بەڵام بەو مەرجەی لە بەرامبەردا ئەوانیش لە سەر گوێڕایەڵیان بمێننەوە بۆ سەلجوقییەکان، ئەم دان بەیەکدانانەی نێوان هەردوولاش لە بۆ یەکتر، بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی وا لە پیاوانی هۆزە کوردییەکان لە سەرجەم هەرێمەکان بێنە نێو ریزەکانی سوپای سەلجوقی، کە کەم نەبن، سەلجوقییەکانیش ئەوپەڕی پێویستییان بە پیاوانی هۆزەکانی کورد هەبوو، بۆ پشتگیریکردنی سوپا شەڕکەرەکەیان لە بەرە لێکجیاکان، هەروەها شەڕەکانیان لە دژی رۆمەکان، رەنگی جیهاد لە پێناوی خوداو بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامی بەخۆوە دەگرت، ئەمەش بە سروشتی حاڵ، هۆکارێکی کاریگەربوو لە هاتنە ژوورەوەی ژمارەیەکی زیاتر لە پیادەو سواری کورد بۆ نێو ریزەکانی سوپاکەیان، ئەم بەشداریکردنەش، چەند ئاماژەیەکی خستەڕوو، بۆ بەیەکەوە گونجانی تەواوی نێوان هەردوولا، بۆیە لە سەرەتادا پەیوەندی نێوانیان بەهێز مایەوە، شتێکی وا رووی نەدا ریزەکانیان تێک بدات.

بە کارەکیش زۆرێکی کورد وەکو سەرباز پەیوەندییان کرد بە سوپاکەیان و رۆڵێکی دیاریان یاریکرد، لەو رووداوانەی لەو ماوەیەدا روویاندا، ئەوەتا لە کاتی هاتنی سوڵتان (تەغرول بەگ) بەرەو (بەغداد) لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) ژمارەیەکی زۆر لە نێو ریزەکانی سوپاکەی بوون[٢٣٩]، هەروەها سوپاکەی (بەساسیری)ش ژمارەیەکی باشی سەربازی کوردی تیابوو[٢٤٠].

زۆربەی جارەکانیش هێزەکانی سەر بە میرنشینە کوردییەکان، لە پاڵ سوپای سەلجوقیدا بەشدارییان دەکرد لە شەڕەکانیان، ئەوەتا لە ساڵی (٤٤٦ک/ ١٠٥٤ز) لە کاتی هێرشەکەی سوڵتان (تەغرول بەگ) بۆ سەر (مەلازگەرد)و شارەکانی (ئەرمینیا)، میر (نەسرولدەولە) یارمەتی سەربازی پێشکەشی سوڵتان کرد[٢٤١]، بە هەمان شێوە لە شالاوی ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز)یش، لە کاتی هێرشی سوڵتان بۆ سەر (ئەرمینیا)، میر (ئەبولئەسوار)ی شەدادی لەگەڵ سوپاکەی بەشدارییان لەو شالاوە کرد، لە راستیشدا بەشداری کوردە شەدادییەکان لەو هێرشەدا، کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە سەرکەوتنی سوڵتان بۆ باڵکێشان و زاڵبوونی بە سەر شاری (ئانی)دا[٢٤٢].

لە ساڵی (٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز)یش میری شەدادی بەشداری لەو هێرشەی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) کرد، کە کردیە سەر شاری (ئانی)، وەکو پاداشتێکیش بۆ هەوڵەکانی سوڵتان شارەکەی بۆ بڕیەوەو کاریگەرییەکەی بە ئەو سپارد[٢٤٣]، بەڵام دوای ئەوە ئەم شارەیان لە دەست دەردەچێتەوە، بۆیە جارێکی تر لە شالاوەکەی ساڵی (٤٦٠ک/ ١٠٦٧ز) بۆ وەرگرتنەوەی شاری (ئانی) لە بێزەنتییەکان، دیسانەوە میری شەدادی بەشداری دەکاتەوە(٢٤٤)، گرنگترین شەڕیش کە کورد تیایدا پاڵەوانیەتییەکانیان تۆمار کرد، شەڕی (مەلازگەرد)ی ساڵی (٤٦٣ک/ ١٠٧١ز)یە[٢٤٥].

هەروەها عەننازییەکانیش بەشدارییان لە شەڕی سەلجوقییەکان، وەکو پێشەکییەک بۆ داگیرکردنی عێراق کرد، ئەوە بوو لە سەر داوای (تەغرول بەگ) (سەعدی کوڕی ئەبی شەوک) لەگەڵ سوپاکەیداو بە یاوەری سوارە (غەز)ەکان بۆ داگیرکردنی عێراق هاتن و گەیشتنە رۆژئاوای (بەغداد) بۆ ترساندنی بووەیهییەکان[٢٤٦].

بەم شێوەیە دەبینین بەشداری کورد لە سوپای سەلجوقی و شەڕەکانیان گەورەبووە، بە تایبەت لە سەردەمی هەردوو سوڵتان (تەغرول بەگ)و (ئەلب ئەرسەلان)، ئەمەش بەهۆی ئەو پەیوەندییە سیاسییە پڕ لە خۆشەویستییەی هەردوو لایەنی بەیەکەوە دەبەستایەوە، بەڵام ئەو پەیوەندییە گۆڕانی بەسەردا هات، کاتێک سەلجوقییەکان پەیڕەوییان لە سیاسەتی ناوەندییان کردو میرنشینە کوردییەکانیان نەهێشت، لەگەڵ ئەمەدا هەڵوێستی کوردیش گۆڕاو، وەکو جاران نەما، ئەگەرچیش هەندێ ئاماژە هەیە، کە هەندێک لە میرە کوردەکان لەگەڵ سوپاکانیان لە هەندێ شەڕدا بەشدارییان لە پاڵ سوپای سەلجوقیدا



کردووە، نموونەی ئەوانە وەکو میر (ئەحمەدیلی کوردی)[٢٤٧] - میری میرنشینی ئەحمەدیلی - کە لە شالاوی ساڵی (٥٠٥ک/ ١١١١ز) لە دژی خاچپەرستەکان بەشداری کرد.

بە زیاد لە بەشداریکردنی سەربازانی کورد لە سوپاکانی سەلجوقییان، لە زۆرێکی هەڵوێستە یەکلاکەرەوەکان، سەرچاوە ئیسلامییەکان نوکی خامەیان خستۆتە سەر ژمارەیەک لەو سەرکردەو میرە کوردانەی ، کە ئامادەییەکی هەمیشەیی و گرنگییەکی سیاسی و سەربازی گەورەیان هەبووە، لەوانە میر (هەزار ئەسپ کوڕی بەنکیر کوڕی عیاز)ی کوردی ، کە ئەوەی ئاگاداری سەرچاوە ئیسلامییەکان بێت[٢٤٨]، دەرک بەوە دەکات، کە ئەو میرە لە سەردەمی هەردوو سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)و (تەغرول بەگ)دا سەرکردایەتییەکی چەند باشی دەکردو مەکانەیەکی چەند بەرچاوی هەبوو، جا هەر بە لەبەرچاوگرتنی ئەو رۆڵە گەورەیەش، کە ئەو میرە لە هەردوو بواری سەربازی و سیاسی پێی هەڵسا، بە باشمان زانی بە درێژی باسی لێوە بکەین.

(هەزار ئەسپ) یەک لە میرە کوردەکانی (لوڕستان) بوو، لە سەرەتای ژیانی سیاسیشی فەرمانڕەوای شاری (ئیزج)بوو، ئەو سیاسەتە (لامەکەزی)یەی بووەیهییەکان پەیڕەوییان دەکرد، ئەو لە بەرژەوەندی خۆی سوودی لێوەرگرت و سنوورەکانی میرنشینەکەی بەو هۆیەوە فراوانکرد، وایلێهات وەکو: یەک لە خاوەنی لاکان (اصحاب الأطراف)ە دیارەکان دەرکەوت، کاتێکیش هێزی بووەیهی لاواز بوو (هەزار ئەسپ) پەیوەندی بە سوڵتان (تەغرول بەگ)ەوە کردو سۆزو گوێڕایەڵی خۆی بۆ ئەو دەربڕی[٢٤٩]، (سوڵتان)یش پێشوازی لەو هەڵوێستەی کردو، هەوڵیدا لە رێگەی سۆزو گوێڕایەڵییەکەیەوە لێی نزیک ببێتەوە، بەرژەوەندی هاوبەشی نێوان هەردوولاش، پاڵینان بەیەکەوە کاربکەن و پەیوەندییەکانی دۆستایەتییەکانی نێوانیان بەهێز بکەن، سوڵتان لە لایەن خۆیەوە هەوڵیدا یەکەمجار سوود لە توانا سەربازییەکانی ئەو میرە وەربگرێت، ئینجا ئامادەیی سەلجوقیانیش لە وڵاتەکەیدا - وڵاتی کورد - بەهێز بکات، هەرچی (هەزار ئەسپ)یشە ئەویش ئامانجی ئەوە بوو پارێزگاری لە مەکانەی سیاسی خۆی بکات و، وڵات و سەربەخۆییەکەشی بپارێزێت.

بە کارەکیش (هەزار ئەسپ) توانی پارێزگاری لە مەکانەی سیاسیی خۆی بکات،

بەڵکو بە تێپەڕینی ڕۆژ ئەو مەکانەیەی گەورەتریش دەبوو، وایلێهات وەکو سیاسی و عەسکەریەکی گەورە زەق بوویەوە، سوڵتان (تەغرول بەگ)یش گرنگییەکی گەورەی پێدا، هەرێمانێکی گرنگی دەوڵەتی سەلجوقیی پێدا، بۆ ئەوەی ئەو بەرێوەیان ببات(٢٥٠).

لە سەردەمی سوڵتان (تەغرول بەگ) (٤٤٧- ٤٥٥ک/ ١٠٥٥- ١٠٦٣ز) میر (هەزار ئەسپ) چالاکییەکی سیاسی و عەسکەری گەورەی هەبوو، لە هاتن و ڕۆیشتنەکانی سوڵتان و لە کۆڕی دانیشتنەکانیشی هەر یاوەری بوو، کە بە زاراوەی ئەمڕۆ دەتوانین بڵێین وەکو ڕاوێژکارێکی سیاسی و عەسکەری سوڵتان وابوو، لە هاتنە نێو بەغدادی سوڵتان لە ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز) ئەو یەک لە یاوەرانی بوو(٢٥١)، هەروەها ڕۆڵێکی بەرچاویشی لە لەناوبردنی بزووتنەوی (بەساسیری)دا بینی، کە ئەوسا چالاکییەکی عەسکەری فراوانی هەبوو، لە بەرەی جەزیرەی فوراتی و، توانی شکست بە کۆمەڵێک هۆزی عەرەب بێنێت لەو ناوچەیە، لەوانەی کە پشتگیری بزووتنەوی ناوبراویان دەکرد، جا بە بەرچاوگرتنی ئەو چالاکییە عەسکەرییە گەورەیەی و کۆششەکانی لە سیاسەتی سەلجوقیدا، (تەغرول بەگ) ڕێگەی پێدا لە کۆمەڵێک لە هەرێمەکان خوتبە بە ناوی ئەو بخوێنرێتەوە، چونکە ڕاستەوخۆ دوای هاتنە نێو بەغدای، (بەسرا)و (ئەهواز)ی بە سێ سەدو شەست هەزار دینار، بۆ (هەزار ئەسپ) زامنکرد(٢٥٢).

میر (هەزار ئەسپ) تا دوای مردنی سوڵتان (تەغرول بەگ)یش، هەر پارێزگاریی لەو مەکانە بەرچاوەی خۆی کرد، چونکە لە سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) نزیک بوویەوەو هەمان ڕۆڵی جارانی گێڕا، پایەیەکی گەورەی هەبوو لە بیلاتەکەی، (بەنداری) دەڵێت: (پایەکەی بەرزبوویەوە، موڵکەکەی فراوانبوو، خوشکی سوڵتانی هێنا، پلەو پایەکی باشی لێ وەدەستکەوت(٢٥٣) (کلود کاهن)یش لە بارەیەوەی دەڵێت: ئەو وەکو چاوێکی وشیاری سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) وابوو، بە هۆیەوە چاودێریی دەکرد(٢٥٤).

هەروەها جێی متمانەو گرنگی پێدانی سوڵتانی سەلجوقی بوو، بۆیە سەیر نییە کە (ئیبنولفوتی) لە بارەیەوە دەڵێت: (لوتبەرز و زۆرداربوو،.. یەک بوو لەوانەی پاشاو میرەکان لێی دەترسان، وڵاتەکەشی پارێزراوبوو، دەستی دوژمنانی پێنەدەگەیشت...)(٢٥٥).

بەڵام سەرەنجام ژیانی ئەو میرە بەنەخۆشی گەدەوە تەواوبوو، کە لە ساڵی (٤٦٢ک /



١٠٧٠ز)(٢٥٦) بەهۆیەوەی کۆچی دوایی کرد و، لە دوای خۆیدا شوێنەوارێکی زۆر و باشی لەبارەی کوردەوە بەجێهێلا.

دەکرێت راڤەی ڕۆڵی (هەزار ئەسپ) لە دەوڵەتی سەلجوقی و هەروەها متمانەکردنی هەردوو سوڵتانەکان (تەغرول بەگ) و (ئەلب ئەرسەلان) پێی، بەوە بکەین، کە ئەمە نموونەیەکە بۆ پەیوەندی بەهێزی نێوان کوردو سەلجوقییەکان، هەر ئەوەش جەخت لەسەر باشی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا دەکاتەوە، لەگەڵ چەندێتی ئەو هاوکارییەی لە نێوان هەردوولادا کرا، لە پێناو بەرەنگاریکردنی مەترسییە دەرەکییەکان، هەروەها بەڵگەشە لەسەر نرخی کوردو گرنگییان لەو ماوەیەدا، چونکە جێی متمانەی دەسەڵاتدارانی باڵا بوونە... زیاد لەمانەش ئەم میر (هەزار ئەسپ)ە، یەک لەو سەرکردە کوردە ئاماژە پێدراوانەیە، کە لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامی شانازییان پێوە دەکات.

بەڵام (لەگەڵ ئەوەشدا) یەک لە لێکۆڵەرە کوردەکان(٢٥٧) بۆ ئەو ڕایە دەڕوات، کە کورد و سەلجوقییەکان هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان لە نێواندا نەبووە.

جگە لە میر (هەزار ئەسپ)، میر (ئەبولفەتح کوڕی ورام)ی پێشەنگی جاوانیانیش ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە هەمان بواردا، هەرچەندیش ئەو لە سەرەتای دەسەڵات گرتنە دەستی پەیوەندی بە بزووتنەوەی (بەساسیری) کردو، خوتبەی بۆ خەلیفەی فاتمی خوێندەوە، کە دوژمنی تەقلیدی خەلافەتی عەباسی و سەلجوقییەکانیش بوو(٢٥٨)، هێزی جاوانیش لە پاڵ سەرۆکی بزووتنەوەی ناوبراودا، لە شەڕەکانی بەرەی جەزیرەی فوراتیدا لە دژی سەلجوقییەکان شەڕیکرد(٢٥٩).

(موئەییەد فی دین)ی بانگخواز بە درێژی ئاماژەی بۆ بەشداریکردنی (ئەبولفەتح) لە بزووتنەوەی (بەساسیری) کردووە، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو نامانەی لە نێوان خۆی و ئەو میرە جاوانییە گۆڕدراونەتەوە، یەک لەو ئاماژە گرنگانەش کە (موئەییەد) باسی لێوەکردووە، کە دەکرێت وەکو بەڵگەی چەندێتی توانای عەسکەری (ئەبولفەتح) بیژمێرین، وەسفی (موئەییەد)ە لە بۆ (ئەبولفەتح)، کە لە بارەیەوەی دەڵێت: (لەهەموو خەڵکی شارەزاتر و ڕاهاتووتر و بەرچاو ڕوونتر بوو، بە کاروبارەکانی عەسکەری و جەنگی)(٢٦٠).

جا بە بەرچاوگرتنی ئەو سیفەتە عەسکەرییانەی (ئەبولفەتح)، سوڵتان (تەغرول بەگ)

سوور بوو لەسەر ئەوەی ئیغرای بکات و پارەو نازناوێکی زۆری پێببەخشێت، بۆ ئەوەی ڕێزی (بەساسیری) جێبهێڵێت و، بیگەڕێنێتەوە ئامێزی دەوڵەت، چونکە لە گەورە میرەکانیش بوو، شوێنکەوتەیەکی زۆریشی هەبوو، بە کارەکیش سوڵتان لەو هەوڵانەی سەرکەوت، بۆیە (ئەبولفەتح) یەکەمی ئەو کەسانەبوو، کە وازیهێنا لە پاڵپشتی و پشتگیریکردنی بزووتنەوەی (بەساسیری)، لە نامەکەی (موئەییەد فی دین)یش ئەوە دەرک دەکرێت، کە یەکێک لە براکانی ئەو میرە جاوانییە هۆی وازهێنانەکەی بووە لە (بەساسیری)[٢٦١]، جا کاتێک بانگخوازی فاتمی بەوە دەزانێت، لەسەر ئەم هەڵوێستەی لۆمەی دەکات، بەڵام (ئەبولفەتح) لاملێ دەکات و جەخت لەسەر دڵسۆزیی بۆ بزووتنەوەی (بەساسیری) دەکاتەوە، هەروەها جەخت لەسەر ئەوەش دەکاتەوە، کە نیازی نییە ئاشتەوایی لەگەڵ سەلجوقییەکان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (ئەبولفەتح) هاتە نێو ئاشتەوایی لەگەڵ سوڵتان، بۆیە (موئەییەد) نامەیەکی بۆ نارد، تیایدا زۆر بە توندی لۆمەی کردو بە غەدرکردن تاوانباری کرد، پێی گوت: (ئەو وڵاتەی تۆ، کە چاوت لەوەیە سەلجوقییەکان بۆتی بگەڕێننەوە، ئەگەر هەر هەموویت بۆ ببێتە زێڕ، ئینجا بۆت بەرامبەر نابێت بەو پاکی و هەیبەتەی کە لە دەستت دا).. لە کۆتایی نامەکەشیدا (موئەییەد) داوای لەو میرە جاوانییە کرد، کە بگەڕێتەوە نێو بزووتنەوەکە[٢٦٢].

وەکو چۆن میر (هەزار ئەسپ) وەکو زووتر ئاماژەمان پێدا بە ڕۆڵی میانەگیر هەڵسا لە نێوان سوڵتان (تەغرول بەگ) و میر (ئەبولفەتحی جاوانی) و بێجگەی ئەویش لە میرانی کوردو عەرەب کە پەیوەندییان بە (بەساسیری) کردبوو، لە پاشان میر (ئەبولفەتح) خۆیشی وەکو میانەگیرێکی لێهات لە لای سوڵتان، کە توانی بیهێنێتەوە بڕوا، تا لە هەردوو میر(دبیس)و (قەرواش) خۆشبێت، سوڵتانیش بەراوێژەکەی ئەوی کردو لە هەردووانیان خۆشبوو[٢٦٣].

لە ساڵی (٤٤٩ک / ١٠٧٥ز)یش کاتێک (ئەبولفەتح) هاتە (بەغداد) سوڵتان پۆشاکانی میرینی تایبەتی پێدا (پۆشاکی سوننیان)، بە گەڕانەوەی ئەو میرە سەلجوقییەش بۆ باوەشی سەلجوقییەکان، بووە یەک لە فەرماندە عەسکەرییە دیارەکانیان و خەلیفە و سوڵتان پاسەوانێتی دەوروبەری (بەغداد)یان پێ سپارد، بە کارەکیش لێزانی و شارەزایی خۆی دەرخست لەو ئەرکەی خرابووە ئەستۆی، چونکە بە درێژایی ئەو کاتەی



ئەو میرە جاوانییە لە ژیان بوو، ئاسایش لەو ناوچانەی ژێر پاسەوانێتی ئەو بەرقەراربوو، بەڵام دوای مردنی لە ساڵی (٤٥٥ک / ١٠٦٣ز)[٢٦٤]، ئارامی ئەو ناوچانە شێواو، خەلافەتیش ئیتر توانای ئەوەی نەمابوو، لە دەستدرێژییەکانی هەندێ لە میرە خۆجێییەکانی ناوچەکە بیپارێزێت...

(مستەفا جەواد) دەڵێت: بە مردنی میر (ئەبولفەتح) کاروانی ژیانی میرێکی گەورەی کورد پچڕا، کە ناوبراو لە سیاسەت و لە شەڕدا دەستێکی باڵای هەبوو، جەولاتی سەرکەوتووو پاڵەوانێتی زەفەربەری هەبوو، چاکەی دەرکردنی هۆزی (جاوان)یش لە شوێنی بەرتەسکی، بۆ ئەو فراوانییەتە لە ڕووداو و مێژووی پڕ لە ژیان و جوولانەوە بۆ ئەو دەگەڕێتەوە[٢٦٥].

لەوەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە پەیوەندییە خۆشەویستییەکانی نێوان هەردوولا، بووە هۆی ئەوەی سوڵتانە سەلجوقییەکان سوود لەو توانا عەسکەرییە گەورانە وەربگرن، کە کورد هەیانبوو، چونکە بەهۆی ڕاهاتنی لەسەر ژیانی پڕ لە چەرمەسەری و پەروەردەی وشک و ڕەق، ئازایەتی یەک لە سیما هەرە دیارەکانی تاکی کورد بوو[٢٦٦]، ئەمەش لەبەر ئەوەی (کورد) لە ناوچەیەکی شاخاوی دانیشتووە، ژیانی سادەو ساکاری تیا ئاسان نەبووە، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، سوود وەرگرتنی سەلجوقییەکان لە توانا عەسکەرییەکانی کورد فراوان و گەورە بووە، چونکە سەرکردەو سەربازی ئازا و بە توانایان لێ هەڵکەوتبوو، ئەوەی جەختیشی لەسەرکراوەتەوە بەخششە پولەکی و دەستکەوت (غنائم)ەکان یەک لەو پاڵنەرانە بووە، کە وایکردووە چەندین ڕەگەزو لە نێوشیان کورد بێنە نێو سوپای سەلجوقی[٢٦٧]، چونکە سەلجوقییەکان بەتایبەت لەبەرەی (بێزەنتی) شەڕی زۆریان دەکرد، کەواشبێت سەرکەوتنیان بەسەر دوژمنان هەمیشە وایلێدەکردن دەستکەوتی زۆریان دەستکەوێت.

بەم شێوەیە هەندێ لەسەرکردە کوردەکان، هەلیان وەرگرت بۆ ئەوەی لە بواری عەسکەریدا دەرکەون، چونکە سەلجوقییەکان لارییان لەوەنەبوو، ڕێگە بەهەر یەکێک بدەن، بۆ ئەوەی توانا عەسکەرییەکانیان گەشە پێبدەن، میر (هەزار ئەسپ)یش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەمە، چونکە ئەو میرە یەک لە فەرماندە عەسکەرییە زۆر سەرکەوتووەکان بوو، لە مێژووی دەوڵەتی سەلجوقی، هەردەمێکیش هەر یەکە لە سوڵتانەکان (تەغرول

بەگ) و (ئەلب ئەرسەلان) خۆی سەرپەرشتی و سەرکردایەتی هێزەکانی دەکرد، یارمەتیدەری دەستە راستیان میر (هەزار ئەسپ) بوو، هەر لەبەر ئەو رۆڵە گەورەو توانا و ئازایەتیەشی نازناوی (تاجوڵلوک)ی پێدرا[٢٦٨].

## چوارەم: شەڕی مەنازگەرد(٢٦٩) (مەلازگەرد)ی (٤٦٣ک / ١٠٧١ز) و شوێنەواری بەسەر پەیوەندییە کوردییە سەلجوقییەکان

هەر لەو رۆژەوەی خەلافەتی ئیسلامی بەرپابوو، ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی چۆن دوژمنی ئەو خەلافەتە بوو، هەرواش وەکو دوژمنی تەقلیدی و سەرەکی ئەو خەلافەتە مایەوە، ئەمەش چونکە لە دەرەنجامی فەتحی ئیسلامی لە جەزیرەو وڵاتی شام ئەم ئیمپراتۆریەتە ژمارەیەک هەرێمی دەوڵەمەندی لە دەست دا، بۆیە بە درێژایی هەردوو سەردەمی ئەمەوی و عەبباسی ئەم ئیمپراتۆریەتە هەڕەشەو هێرشی بەردەوامی دەکردە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، لە بەرامبەریش خەلیفەکانی هەردوو دەوڵەتی ناوبراو، هەوڵیان دەدا ناوچە سنوورییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی بێزەنتی بەهێزو پۆڵایین بکەن، ماوە دوای ماوەش هێرشێک بکەنە سەر ئەو شارە (بێزەنتی)یانەی دەکەوتنە سەر سنوورەکانیان[٢٧٠].

لەسەردەمی عەبباسییەکاندا شەڕی نێوان بێزەنتی و عەبباسییەکان لە هەڵکشان و داکشاندابوو، بە شێوەیەکی گشتیش هێرشەکان بۆ تۆقاندنی دوژمن و دوورخستنەوەی مەترسییەکانیان بوو، زیاد لەوەش مەبەست لەو هێرشانە بۆ ئەوە بوو چەندەی لە تواناداد بێت، دەست بەسەر شارو ناوچەی زیاتردا بگیرێت[٢٧١].

ئەم ناوچە سنوورییانە لەبەر ئەوەی مەترسی بەردەوامی بێزەنتییەکانیان لەسەر بوو، بە تایبەتیش ناوچە سنوورییەکانی شام و جەزیرە، گرنگییەکی تایبەتیان پێدەدرا و وایان دەخواست بخرێنە ژێر چاودێری دەسەڵاتی ناوەند و فەرمانداندە بە تواناکانی لە میرانی تایەفەکان بۆ هەڵبژێرێت، هەر بۆیەش عەبباسییە یەکەمەکان هەوڵی گەورەیان دا لە پێناو بەهێزکردنی ئەو ناوچە سنوورییانە[٢٧٢].

لەسەردەمی سێیەمی عەبباسیداو، بە تایبەت لە دوای ئەوەی رەگەزی بێگانە دەستیان بەسەر ناوەندی خەلافەتدا گرت، بارەکە گۆڕا، ئەوەتا لەسەردەمی بووەیهی، بەواتە: سەردەمی میرنشینە کوردییەکان- سەبارەت بە وڵاتی کورد- خەلافەتی عەبباسی



دەسەڵاتی بەسەر ناوچە سنوورییەکان لە دەست داو، هەندێ لەو میرنشینانە وەکو میرنشینەکانی مەڕوانی وشەدادی و روادی- بە ئەرکی بەرگریکردن لەوڵاتی ئیسلامی راپەڕین و جیهادیان خستە ئەستۆی خۆیان، وەکو دەشزانرێت، بەشەکانی باکوور و باکووری رۆژئاوای وڵاتی کورد دەکەوتنە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی عەبباسی و هەروەکو خاڵی سنووری بوون سەبارەت بەو دەوڵەتە، جیاوازییان دەخستە نێوان ئەو دەوڵەتە و هەرێمە نائیسلامییەکان، ئەو هێزانەش کە هاوسنووری هەرێمە کوردییەکان بوون لە بەشی باکوور و رۆژهەڵاتیان بریتیبوون لە ئەرمەن و کەرەج و خەزەر، لە رۆژئاواشیان دەڵەوتی بێزەنتی بوو، بۆیە ئەو هەرێمانە بەردەوام لە ژێر مەترسی ئەو هێزانە دەکەوتن و رووبەرووی داگیرکاری و بەتاڵانچوون دەبوونەوە، بۆیە سروشتی بوو، بەو پێیەی کە کورد خەڵکی بنجی ناوچەکەنە، هەروەها موسڵمانیشن، ئیتر بێن بەرگری لە وڵاتەکەیان و لە دەوڵەتی ئیسلامیش بکەن.

وا دەردەکەوێت، لە بری دەوڵەتی عەباسی کە دووچاری لاوازی هاتبوو، کورد ئەرکێکی قورسیان گرتبێتە ئەستۆ، چونکە میرەکانی میرنشینە کوردییەکان نزیک لەو هێزانە، هەوڵی گەورەیان دا لە پێناو بەرگریکردن لە زەوییەکانیان، ئەوەتا میرنشینی شەدادی لە (ئاران)، روادی لە (ئازەربێجان)، مەڕوانی لە (جەزیرەو ئەرمینیا)، ئەمانە سێ میرنشین بوون، رووبەڕووبوونەوەی مەترسی بێزەنتی بە پلە (یەک) لە ئەستۆی ئەوان دەکەوت، هەر بۆیەش ئەو هەرێمانە بەردەوام دەکەوتنە بەر پەلاماری (بێزەنتی)یان و بەم هۆیەوەش لە بارێکی خراپ دەکەوتن.

مەترسی بێزەنتییەکان بۆ سەر ناوچە سنوورییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی تا سەرهەڵدانی سەلجوقییەکان وەکو هێزێکی نوێ، هەر بەردەوام بوو، بەڵام بە دەرکەوتنی سەلجوقییان تەرازووی هێز لە ناوچەکەدا گۆڕا، بۆیە ئیتر (بێزەنتی)یەکان لە توانایان نەما هەڕەشە لە شارە سنوورییەکان بکەن، چونکە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان، پلانی سیاسی و سەربازی سەلجوقییەکان ئەوەبوو، فشار بخەنە سەر بەرەی بێزەنتی، ئەمەش بۆ بەجێهێنانی چەندین ئامانج، گرنگترینیان؛ کردنەوەی دەرگاکانی ئاسیای بچووک بوو، لە پێش هێزە تورکییەکەیان، بۆ ئەوەی لەو ناوچانەدا شوێن پێیەک بۆ خۆیان بدۆزنەوە، هەروەها ئەم سەلجوقییانە، شەڕی لەگەڵ رۆمیان خستە خانەی (جیهادە)وە، بەمەش ئەم

شەڕانەیان مۆرکێکی ئایینیان وەرگرت[٢٧٣]، لە پاڵ ئەمەش ئامانجێکی دیکەی سەلجوقییان، فراوانکردنی سنوورەکانی دەوڵەتەکەیان بوو.

دەشێت هێرشە بەردەوامەکانی سەلجوقییان بۆ سەر ئاسیای بچووک، بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتیان بووبێت بە سەر هەرێمە کوردییەکان، چونکە بۆ شەڕەکانیان لەگەڵ رۆم لەم هەرێمانە سەرچاوەیان دەگرت، یەک لە دیارترین دەرەنجامەکانیش، کە لە سەرکەوتنی سەلجوقییەکان لە (مەلازگەرد)ەوە وەدەست هات، باڵکێشانیان بوو بەسەر وڵاتی کورد – مەلازگەرد: یەک لە گرنگترین شەڕەکانی نێوان هەردوو لایەنی سەلجوقی و رۆمییە.

سەلجوقییەکان هەر لە سەردەمێکی زووەوە چاویان بڕیبووە ئاسیای بچووک، (ئیبراهیم یەناڵ) زیاتر لە جارێک هەوڵیدا دەست بە سەر شارەکانیدا بگرێت[٢٧٤]، هەروەها هەریەکە لە هەردوو سوڵتانەکان (تەغرول بەگ)و (ئەلب ئەرسەلان)یش بەشێک لە گرنگیدانەکانیان دابووە ئەو بەرەیەو چەندین سەرکەوتنی گرنگیان وەدەست هێنا، کە ئەوەبوو توانیان دەست بە سەر کۆمەڵێک شارو قەڵای ستراتیژیدا بگرن لە هەرێمی (ئەرمینیا)[٢٧٥].

ئەو هێرش و شاڵاوە سەربازییانەی سەلجوقییەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لە ساڵی (٤٦٣ک/ ١٠٧١ز) لە نێوان هەردوولا روویدا، بە هەوڵدانێکی بچووک دەژمێردرێن، ئەوەبووە سەرکەوتنە بەردەوامەکانی سەلجوقییان وایلێکردن زیاتر پێشڕەوی بکەن، بۆ قووڵایی زەوییەکانی سەر بە دەوڵەتی بیزەنتی، لە بەرامبەریشدا لایەنی بیزەنتی هەستی بەو مەترسییە کرد، کە لە لای رۆژهەڵاتی دەوڵەتەکەی رووبەڕووی دەبووەوە، بۆیە ئەویش بە رۆڵی خۆی هەڵسا بە هێنانی دژە هێرش بۆ سەر ناوچەکانی دەوروبەری (مەلازگەرد)و (ئەرجیش)و (ئەخلات)، کە هەندێکیان سەر بە میرنشینی مەڕوانی بوون، بەمەش ئەم ناوچانە بەر لە روودانی شەڕی (مەلازگەرد)، بە پچڕ پچڕی بە یەکدادانی عەسکەریی نێوان هەردوو لایەنی سەلجوقی و بیزەنتی بەخۆوە دەبینی[٢٧٦].

(رۆمانۆسی چوارەم دیوجینۆس)ی ئیمپراتۆری بیزەنتی (٤٥٩ک – ٤٦٣ک/ ١٠٦٧– ١٠٧١ز) Romanus Diogenes[٢٧٧]، بڕیاریدا سەلجوقییەکان ئاقڵ بکات و پێش لە پێشڕەوییەکەیان بگرێت، بۆیە بە سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە، کە چەند رەگەزێکی وەکو رۆم و رووس و خەزەرو لان و قەبجاق و کەرەج و ئەبخاز و فەرەنگ و



ئەرمەن، پێکیان دەهێنا بەرەو (ئەرمینیا) هات[٢٧٨]، سەرچاوە مێژوییە ئیسلامییەکان لە بارەی ژمارەی تاکەکانی ئەو سوپایە جیاوازن، گوتوویانە لە نێوان دووسەد تا شەش سەد هەزار (سوار) بوونە، بەڵام بێگومان ئەم ژمارەیە زێدڕەوی تێدا کراوە[٢٧٩]، چونکە دابی مێژوونووسان وایە، هەمیشە ژمارەی سوپای دوژمن گەورە دەکەن، بۆیە ئەستەمە ژمارەی دروستی تاکەکانی ئەو سوپا بیزەنتییە بخەملێنرێت... لە هەمان کاتدا ژمارەی تاکەکانی سوپای سەلجوقی هەر بە پێی هەمان ئەو سەرچاوانەی پێشوو، لە بیست هەزار تێپەڕی نەکردووە[٢٨٠] – یان وردتریش لە نێوان (پانزە بۆ بیست هەزار بووە)، بەڵکو هەریەکە لە (راوندی)و (یەزدی) ئەم ژمارەیە بچووکتریش دەکەنەوەو دەیهێننەوە سەر دوانزە هەزار[٢٨١].

هەواڵی هێرشی (رۆمانۆس) بۆ سەر شاری (مەلازگەرد)و ناوچەکانی باکووری دەریاچەی (وان) گەیشتە گوێی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) کە ئەو کاتە لە شاری (خوێ) بوو، لە (ئازەربێجان)، بۆیە هەرچەندە ژمارەی هێزەکانیشی کەم بوون، بەڵام بڕیاری هاتنە دەری دا بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئیمپراتۆری رۆمی، سەرچاوەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە ژمارەی سەربازی هەردوو هێزی رۆمی و سەلجوقی زۆر لە یەک جیاواز بوون، بۆیە دەپرسین: ئایا دەچێتە ئەقڵەوە سوڵتان بەم هێزە سەربازە کەمەی، شەڕی سوپایەکی گەورەو بە باشی پڕ چەک بکات، ئەگەر بێت و کۆمەکی عەسکەری لە پیاوانی هۆزە کوردییەکانی دانیشتووی ناوچەکە وەرنەگرتبێت؟ ئەمەش لەلایەن هەردوو مێژوونووس (سەبتی ئیبنولجۆزی)و (دواداری)ش جەختی لە سەر دەکرێتەوە، کاتێک دەڵێن: لە ماوەی ئەو شەڕەیدا لەگەڵ رۆم، دە هەزار کوردی دانیشتووی ناوچەکە بەگەڵ سوڵتان کەوتن[٢٨٢].

راستیش ئەوەیە، ئەگەر بەشداری کورد نەبوایە لە شەڕی (مەلازگەرد)، سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بەو هێزە کەمەی نەیدەتوانی هێزەکانی رۆم بشکێنێ و بە سەریاندا سەربکەوێت، (حەسەن حەبەشی) دەڵێت: ئەو هۆیەی پاڵی بە (رۆمانۆس)ەوە نا، تا ئەو هێرشە گەورەیەی بۆ سەر شارەکانی (ئەرمینیا) بکات، گەڕاندنەوەی شارەکانی (ئانی)و (قارس)و (مەلازگەرد) بوو، کە لە دەست سەلجوقییانی دەربێنێت و بیانخاتەوە ژێر دەسەڵاتی رۆم، چونکە ئەم شارانە پێشتر یەکەم هێڵی بەرگری لە دەسەڵاتی بیزەنتی بوون

لە ناوچەکە[٢٨٣]، (رۆمانۆس)یش دڵنیابوو لە سەرکەوتنی، بۆیە وەکو هەوڵێک بۆ گرتنەوەی شارەکانی (ئەرمینیا)، لەگەڵ هێزێکی گەورەی بەرەو ئەو ناوچانە هات، کاتێکیش گەیشتە (ئەرزەرۆم) هێزەکانی کردنە دوو بەش، سەرکردایەتی یەکێکیانی بە (تەرخانیۆس) سپاردو داوای لێکرد هێرش بکاتە سەر شاری (خەلات)ی کوردی، کە دەکەوێتە سەر کەنارەکانی دەریاچەی (وان)[٢٨٤] بەشەکەی تری هێزەکانیشی لەژێر فەماندەیی خۆی هێشتەوەو بە ئاراستەی (مەلازگەرد)ی هێنان[٢٨٥].. سەرچاوەکانیش جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە، کە ئەم دوو هێزە هێرشیان هێنایە سەر هەردوو ئەو شارانەو، دانیشتوانەکانیان کە لە کوردو بێجگەی کوردیش پێک دەهاتن، رووبەڕووی کوشتن و بە دیل گیران بوونەوە[٢٨٦].

سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) وەکو بە دەمەوە هاتنی داوای خەڵکی ئەم شارانەو بۆ بە فریاکەوتنیشیان، بەرەو ئەو شارە داماوانە هات، چونکە کۆمەڵێک لە خەڵکی (مەلازگەرد) لە سەرووشیان قازی شارەکە داوایان لێکرد بوو، بە فریایانەوە بێت، (بیزەنتی)یەکانیان لێ دوور بخاتەوە[٢٨٧]، بۆیە ئەویش هیچی تری نەکرد، ئەوە نەبێت، وەڵامی داواکەی دانەوەو، لەگەڵ هێزە کەمەکانی هاتنەدەر بۆ ئەو مەبەستە، دووریش نییە، ئەوەی سەرچاوەکان گوتوویانە سەبارەت بە ژمارەی سەربازی هێزە کەمەکانی راست بێت، چونکە ئەو لەو بڕوایەدا نەبوو (بیزەنتی)یەکان بەو هێزە گەورە گەورەیەوە هێرشی بۆ بێنن، بۆیە ئامادەیی ئەوەی نەبوو، لەگەڵیان بگەنە یەک و پێشوەخت مشووری ئەوەی نەخواردبوو، تا بەسەر ئەو مەسەلەیەدا زاڵ بێت، بۆیە بە خێرایی لەگەڵ هێزەکانی بۆ رووبەڕووبوونەوەی دۆخەکە هاتەدەر، خێزانەکەی و (نیزامولمەلیک)ی وەزیریشی یاوەری بوون، فەرمانی بە وەزیری ناوبراو کرد خێزانەکەی بباتە (تەبریز)ی سەر بە (ئازەربێجان) -پایتەختی میرنشینی رووادی کوردی -هەرچی خۆی و (مەلەکشاه)ی کوڕیشی بوون بەرەو (ئەرمینیا) هاتن[٢٨٨].

هەردوو هێز لە شوێنێک بەیەک گەیشتن پێی دەگوترێت (زەهوە)[٢٨٩]، یان (زەهرە)[٢٩٠] -کە دەکەوێتە نێوان خەلات و مەلازگەرد- لە گەرمەی شەڕەکەش نزیکەی دە هەزار پیاوی کوردی دانیشتووی ناوچەکە، پەیوەندییان کرد، بە هێزەکانی سەلجوقی[٢٩١]، لە لایەکی دووەمیشەوە، میر (نیزامەدینی مەڕوانی) خاوەنی (دیاربەکر)



کۆمەکی عەسکەریی دا بە سوڵتان[٢٩٢]، بێگومان ئەم یارمەتییانەش بە شێوەیەکی گەورە، بووە هۆی ئەوەی هێزە سەلجوقییەکان بەهێز بکات و لە شەڕدا سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان مسۆگەر بکات.

لە پاش شەڕەکانی (حامیەی وەتیس)، سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) توانی سەرکەوتنێکی گەورە بەسەر (رۆمانۆس)دا تۆمار بکات و بە دیلی بیگرێت[٢٩٣]، ئینجا لەگەڵ سوپاکەی هاتە نێو شاری (مەلازگەرد)ی شوورەدار، کە زۆر قایم کرابوو و، بریتی بوو لە قەڵایەکی مەحکەم و پارێزراو[٢٩٤].

بەڵام چۆنیەتی بەدیل گرتنی ئیمپراتۆر، ئەوا لە بارەیەوە سەرچاوە مێژووییەکان زانیاری لێکجیا دەدەنە دەست لەمەڕ ئەو کەسەی کە توانی بە دیلی بیگرێت، بە ڕێککەوتنی زۆربەیان کۆیلەیەکی رۆمی کە ناوی (شادی) بوو و سەربازێکی خاوەن پایەکی هێندە گەورە نەبوو لە ریزەکانی سوپای سەلجوقی، ئەو سەرکەوت لە بەدیل گرتنی(رۆمانۆس)[٢٩٥].

ئەمە لە کاتێکدا کە (ئیبنولعیبری) بە رایەکی تر جیادەبێتەوە، کە لە یەک لە بەتریکەکان وەریگرتووەو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی بێجگەی خۆی دەیڵێت، (ئیبنولعیبری) دەڵێت: خوشکەزای سوڵتان (ئەلب ئەرسلان) ئیمپراتۆری رۆمی بە دیل گرت، بەڵام پیاوێکی کورد بە روویدا راپەڕی، ئەم خوشکەزایەی سوڵتانی کوشت و، (رۆمانۆس)ی بە باشی بەستەوە، وەکو ئەوەی بڵێین: چاکەی بە دیل گرتنی ئیمپراتۆر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، بەڵام هەر دوای ئەوە (ئیبنولعبیری) دێت رای خۆی لەسەر ئەم گوتەیەی سەروو دەخاتەڕوو، دەڵێت: ئەمە بە دوور دەزانرێت پیاوێکی کورد بوێرێت خوشکەزای سوڵتان بکوژێت و، ئیمپراتۆری لە دەست بفرێنێت[٢٩٦].

ئێمەش بۆمان دەکرێت بێین جۆرە پەیوەندی و کۆکردنەوەیەک لە نێوان ئەم گێڕانەوەی (ئیبنولعیبری) و ئەو گێڕانەوەی مێژوونووسانی دیکەش لە بارەی دەستنیشانکردنی ناسنامەی ئەو کەسەی کە (رۆمانۆسی چوارەم)ی ئیمپراتۆری رۆمی بە دیل گرت، دروست بکەین و بڵێین، دەگونجێت ئەو کۆیلە ناوبراوەی کە (شادی) ناوبوو، هەمان ئەو پیاوە کوردە بێت، کە لە گێڕانەوەی بەتریکدا ئاماژەی بۆ کراوە بە واتە کۆیلەکە کورد بووبێت، چونکە وەکو دەزانرێت (شادی) وشەیەکی کوردییە لە عەرەبیدا بەرامبەرەکەی (سعادە)یە، هەروەها ناوی باپیرەی (سەلاحەددین)یش هەر (شادی) بوو[٢٩٧].

گێڕانەوەی گوتەی ئەم بەتریکە لە لایەن (ئیبنولعیبری) و بەم شێوەیە لە دواتریش ڕادەربڕینی (ئیبنولعیبری) لەسەر ئەو گێڕانەوەیە، کە مەسەلەیەکە ناکرێت بڕوای پێبکرێت، دەشێت بۆ ئەوەمان ببات، کە ئەگەر ئەم پیاوە کوردە خۆی ئیمپراتۆری بە دیل گرتبێت، بە شتێکی مەحاڵ نەزانرێت، بە تایبەت کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانە کوردەکەی ئەو ناوچەیە، بەشدارییان لەو شەڕەدا کردبوو.

لە کۆی ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی شکستی (بێزەنتی)یەکان، هەندێ شت ڕوویاندا ئیمپراتۆر هیچ حسێبێکی بۆ نەکردبوون، بۆ نموونە ئەو مورتەزەقە تورکمانەی، کە یەک لە تیپە گرنگەکانی سوپای ڕۆمی بوو، برایەتی خوێن لە دەمارەکانیان جووڵاو هاتنە نێو سەلجوقییەکان[٢٩٨]، هەروەها ململانێی نێوان فەرماندەکانی سوپا، بووە هۆی ئەوەی هەندێکیان لە شەڕ خۆ بە دوور بگرن و، هیچ دەستێکی یارمەتییان بۆ (ڕۆمانۆس) درێژ نەکەن...

(ڕەنیسمان) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لە پێناو گەیشتن بە سەر تەختی بێزەنتی ململانێیەکی توند کەوتە نێوان هەندێ لە فەرماندەکانی سوپاو میرەکان، بۆیە یەک لە دیارترین سەرکردەکانی ئیمپراتۆر لە گۆڕەپانی شەڕ کشایەوە، ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی شپرزەیی لە نێوان سوپای ئیمپراتۆرو هەر بەم هۆیەش سەرەنجام لە شەڕەکە زیانی کرد[٢٩٩]، هەروەها نابێت، ئەو ڕۆڵە گەورەیەش لە بیر بکەین، کە کورد لەو شەڕەدا بینیان، بەڵکو ڕۆڵی کورد بە (یەک) لە گرنگترینی ئەو هۆکارانە دادەنرێت، کە بوونە هۆی سەرکەوتنی سەلجوقییان، بێگومان هۆیەکانی دیکەش بۆ ئەو هەوڵە زۆرانە دەگەڕێتەوە، کە لە لایەن سەلجوقییەکانەوە دەدرا لە پێناو باڵکێشانیان بە سەر ناوچەکە، چونکە سەرکەوتنیان لە باڵکێشانیاندا بەسەر هەندێ لە شارەکانی (ئەرمینیا)، کاریگەری ئاشکرای هەبوو لە سەر ئاسانکردنی ئەرکەکانیان بۆ سەرکەوتنیان لە (مەلازگەرد).

لە کۆتایی ئەم شەڕەش لە سەر ئەوە ڕێککەوتن، کە ڕێککەوتنێک لە نێوان هەردوولادا ئیمزا بکەن، ئەوەبوو سوڵتان لە بەرامبەر چەند مەرجێکی، ڕازی بوو لە سەر ئازادکردنی (ڕۆمانۆس)[٣٠٠]، لە گرنگترین بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیەش، ئەو بەندە بوو، کە ئاشتەوایی نێوان هەردوولا پەنجا ساڵ بخایەنێت، هەروەها ئیمپراتۆر لە بەرامبەر ئازادکردنەکەی ملیۆنێک و پێنج سەد هەزار دینار بدات، هەر کاتێکیش سوڵتان



پێویستی بوو، ئەوا ئیمپراتۆر سوپای ڕۆمی بۆ ڕەوان بکات، هەروەها مەرجێکی دیکەی سوڵتان لە سەر ئیمپراتۆر ئەوەبوو، کە هەموو دیلە موسڵمانەکانی وڵاتەکەی ئازاد بکات[٣٠١].

بەڵام ئەو ئەنجامانەی لە کۆتایی شەڕەکە هاتنە پێش، ئەوا مەترسیداربوون سەبارەت بە هەردوو لایەنی سەلجوقی و بێزەنتی، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێ ئەنجامی دیکەشی لێکەوتەوە سەبارەت بە کوردو ئایندەی وڵات و میرنشینەکانی... هەندێ لە لێکۆڵەرە ڕۆژئاواییەکان هەوڵ دەدەن لە نرخی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە کەم بکەنەوە، کە سوپای ئیسلامی لە (مەلازگەرد) وەدەستی هێنا، ئەوەتا (ڕەنیسمان) وایدەبینێ، کە ئەو سەرکەوتنەی وەدەست هاتوو، نرخێکی وای نەبووە شایانی ئاماژە پێدان بێت[٣٠٢]، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم سەرکەوتنە دەرگاکانی ئاسیای ناوەڕاستی بۆ سوپای ئیسلامی خستە سەر پشت و، لە (ئەرمینیا)ش تورکمانەکان بە یەکجارەکی نەمان[٣٠٣]، بەڵکو ئەم سەرکەوتنە گەورەترین کارەساتێکی یەکلاکەرەوە بوو، کە لە مێژووی (بێزەنتی)دا ڕوویدا، هەر لەبەر قورسی ئەو شەڕەش لە سەر دڵی بێزەنتییەکان، بە دەستەواژەیەکی تەقلیدی ئاماژەیان بۆ ئەو ڕۆژە دەکردو ناویان دەنا (ئەو ڕۆژەزۆر ناخۆشبوو)[٣٠٤].

زیاد لەو دەرەنجامە خراپانەش، کە لە ئەنجامەکانی شەڕی (مەلازگەرد)دا ڕووبەڕووی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی بوویەوە، (ڕۆمانۆس)یش کە لە لایەن موسڵمانانەوە بەدیل گیرا، تەختەکەی لە دەستداو ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی ململانێی نێوان سەرکردە ڕۆمییەکان لە سەر گرتنە دەستی دەسەڵات... (ئیبنولقەلانسی) کە لە (٥٥٥ک/ ١١٦٠ز)کۆچی دوایی کردووە، لە بارەی چارەنووسی ئەم ئیمپراتۆرەوە دەڵێت: (ئیمپراتۆر گەڕێنرایەوە بۆ نێو وڵات و خەڵکی شانشینەکەی، دەڵێن: ئەوانیش کوشتیان و یەکێکی دیکەیان لە جێی دانا، لەبەر چەند شتێک، کە دایانە پاڵی و لێیان بە ڕەوا نەبینی)[٣٠٥].

هەندێکی دیکە وای دەبینن، کە یەک لەو هۆکارە سەرەکیانەی بووە هۆی سەرهەڵدانی شەڕەکانی خاچپەرستان لە دواتردا، شکانی بێزەنتە بوو لە (مەلازگرد)، چونکە خاچپەرستان وایان بینی، کە بێزەنتییەکان لە سە زەوی شەڕدا نازناوی پارێزەرانی جیهانی مەسیحییان لە دەستدا، کە پێشتر بە دەستیان هێنابوو، هەر (مەلازگەرد)یش بووە پاساو بۆ هاتنە ناوەوەی ڕۆژئاوا[٣٠٦].

یەک لە ئەنجامەکانی دیکەی ئەو سەرکەوتنە لە (مەلازگرد)، دانانی بناغەی دەوڵەتی

سەلجوقی رۆم بوو، چونکە شەڕەکە بووە هۆی ئەوەی دەسەڵاتی بێزەنتی هەر بە تەنیا لە ناوچەی ئاسیای بچووکدا قەتیس بمێنێ، بەمەش هاتنە ناوەوەی تورک بۆ ناوچەکە دەستی پێکردو، گەیشتنە (ئەنادۆل)، بەمەش ئەرکی (سلێمانی کوڕی قەتلمش)[٣٠٧] لە دامەزراندنی یەک لە لقەکانی دەوڵەتی سەلجوقی لەو ناوچەیەدا ئاسان بوو، سوڵتان (مەلەکشاه) بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمەی بە ناوبراو دا و، ئەویش سەرکەوت لە باڵکێشانی بەسەر ئەو ناوچەیەو تیایدا دامەزراندنی قەوارەیەکی سەلجوقی[٣٠٨].

شەڕی (مەلازگەرد)و دەرەنجامەکانی بە شێوەیەکی گەورە کاریان کردە سەر کوردو هەرێمە کوردییەکان، کە بوونە زەمینێک بۆ هێرشە بە دوای یەکدا هاتووەکانی سەلجوقییان، ئەگەرچیش کورد رۆڵێکی گەرەیان بینی لە رووبەڕووبوونەوەی بێزەنتییەکان و خەڵکی ناوچەکە لە پاڵ سەلجوقییان بەشداری شەڕەکەیان کرد، میرە کوردەکان کۆمەکییە عەسکەرییەکانی خۆیان پێشکەش بە سەلجوقییان کرد، بەڵام سەلجوقییەکان ئەم یارمەتییانەی کوردانیان لەبەر چاو نەگرت، بەڵکو سەرکەوتنیان لەو شەڕەی (مەلازگەرد)، رێگەی لە پێشدا خۆشکردن، بۆ دەستگرتن بە سەر هەرێمە کوردییەکان[٣٠٩].

لە راستیش دوورناکەوینەوە، گەر بڵێین: سەرکەوتنەکەیان جارێک بوو بۆ رووخاندنی میرنشینە کوردییەکان، ئەوەبوو یەکەم کاری سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) دوای تەواوبوونی لەو شەڕە، بەندکردنی میر (مەملانی کوڕی وەهسوزانی رووادی)و منداڵەکانی بوو، کە ئەمانە فەرمانڕەوایانی (ئازەربێجان) بوون، بەمەش رێگە لە بەردەم (مەلەکشاه) کوڕی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) خۆشبوو، کە لە ساڵی (٤٦٩ک/ ١٠٧٦ز)[٣١٠] ئەو میرنشینە بڕووخێنێت، هەروەها (والی) سەلجوقییان بۆ سەر هەردوو شاری (خەلات) و (مەلازگەرد) هەڵبژێرێت... (فارقی) دەڵێت: ئەم دوو شارە لە ژێر فەرمانڕەوایی میرنشینی مەڕوانی دەرچوون[٣١١]. هەر لە رۆژی دەرچوونیشیان، واتە لە ساڵی (٤٦٣ک/ ١٠٧١ز)، دەسەڵاتی بە راستی ئەو میرنشینە هەر بە سەر ئەو شارانەیدا مایەوە، کە لە هەرێمی (ئەرمینیا) بوون، سەلجوقییەکانیش لەم سەرکەوتنەیان هەلیان وەرگرت، تا دەست بە سەر هەرێمە کوردییەکاندا بگرن، کە ئیتر کردیانن بە سەنتەری فەرمانڕەوایەتییان و دوای ئەو شەڕە راستەوخۆ وڵاتی کورد (کوردستان) بووە لانەی تیاهاتنی سەلجوقییان[٣١٢].



لە لایەکی دیکەوە، ئەو شەڕە بووە هۆی بڵاوبوونەوەی گرۆهە تورکمانەکان لە ناوچە کوردییەکاندا، ئەمەش لەو راستییەیە، کە مێژوونووس (بەدرەدین عەینی)کە لە (٨٥٥ک/ ١٤١٥ز) کۆچی دوایی کردووە، جەختی لە سەر دەکاتەوە، کە دەڵێت: تورک لە گەڵ سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) هاتنە وڵاتی (دیاربەکر)، (کۆچەری خانوو دەوار بوون)[٣١٣].. وەکو جەختکردنەوە بۆ ئەم گوتەیەی (عەینی)ش (ئیبنوتەغری بەردی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە دوای سەرکەوتنەکەی سوڵتان بەرەو هەرێمی (دیاربەکر) هات و تیایدا ژمارەیەک لە قەڵای پارێزراوی فەتحکرد[٣١٤].

لەگەڵ ئەو دەرەنجامانەش کە لەو شەڕەدا کەوتنەوە، سەبارەت بە سەلجوقی و کوردو بێزەنتییەکان، بەڵام هێشتا ئەم شەڕە گرنگییە تایبەتییەکەی خۆی لە مێژووی ئیسلامیدا دەپارێزێت، چونکە لە دەرەنجامەکانی ئەم شەڕە مەترسی بێزەنتی لە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی عەباسی نەما، کە ئەم ناوچە سنوورییانەی دەوڵەتی عەباسی پێشتر بەردەوام بە دەست هەڕەشەو هێرشە بەردەوامەکانی بێزەنتییەکان دەیانناڵاند، لەبەر گرنگی ئەو سەرکەوتنەش کە لە (مەلازگەرد) وەدەستهات سەبارەت بە عەباسییەکان، خەلیفە (قائیم بی ئەمریڵلا) بە کتێبێک پیرۆزبایی ئەو فەتحەی بۆ سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) هەناردو تیایدا بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ کرد: (کوڕە گەورە بەڕێزەکە، پشتگیریکەرە سەرکەوتوو و زەفەربەرەکە، سوڵتانی ئەعزەم، خاوەنی عەرەب و عەجەم، گەورەی پاشایانی میللەتان... سوڵتانی وڵاتی موسڵمانان، سەلمێنەری ئەمیری ئیمانداران)[٣١٥].

## پەراوێزكان

١- ئەمین: تاریخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕە (١٢٥).

٢- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (١٤٣-١٧٥-٢٠٦)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (٦٤٢-٦٤٤)؛ ئیبنولئەثیر: التاریخ الباهر في الدولة الأتابكیة في الموصل، ساغكردنەوەی: عەبدولقادر ئەحمەد طلیمات، قاهیرە ١٩٦٣ز، لاپەڕەكانی (١٣-٢٢-٢٧-٥٠).

٣- قەزوینی: تاریخ گزیدە، لاپەڕە (٤٣٨)؛ ئەمین: تاریخ العراق فی العصر السلجوقی، لاپەڕە (١٢٦).
.

٤- حەسەن: تاریخ الإسلام، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٧).

٥- (محەمەد ئەمین زەكی) و (عەبدولرەقیب یوسف) لە نووسینەكانیاندا بە شێوەیەكی زێدەڕەوانە باسیان لە خراپییەكانی باڵكێشانی سەلجوقی بۆ سەر وڵاتی كوردان كردووە، هەروەها (فؤاد حەمە خورشید)یش لە رۆژنامەی (التآخی) وتارێكی بە ناونیشانی (الأكراد والغزو السلجوقي) بلاوكردەوە، تیایدا باسی لەو وێرانەییە كرد، كە داگیركەری سەلجوقی لە كوردستاندا بە ئەنجامی گەیاندووە... بڕوانە: خلاصة تاریخ الكرد وكردستان، لاپەڕەكانی (١٣٦-١٤٢)؛ الدولة الدوستكیة، بەشی یەكەم، لاپەڕەكانی (٢١٩-٢٢١)؛ وتاری (الأكراد والغزو السلجوقي) رۆژنامەی (التآخي)، ١٩٧١ ، لاپەڕە (٢).

٦- لەبارەی پەیوەندی نێوان كورد و سلجوقیەكان بڕوانە لاپەڕەكانی دواتری ئەم بەشە.

٧- تاریخ البیهقی، لاپەڕە (٥٠٦)؛ مەقریزی، السلوك، بەشی یەكەم، لاپەڕەكانی (١٣٦-١٣٧)؛ ئەمین: تاریخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕە (١٢٦).

٨- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٦).

٩- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی هەشت، لاپەڕە (٢٢٦)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٣)؛ عەینی: السیف المهند، لاپەڕە (١٧٢)؛ نیكلسون: دائرة المعارف لإسلامیة، ماددەی (تەبریز)، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٧٨).

١٠- ئیبنو لقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٩١)؛ راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٧٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨٣)؛ ئیبنولوەردی: تتمە المختصر، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٥٨)؛ حلمی: السلاجقة، لاپەڕە (٣١)؛

The new Ency Britannic, VoL 16, P. 503.



١١- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٥).

١٢- (نەقجوان) یان (تشوی): ناوی ئەو شارە بە چەند شێوەیەك هاتووە، لەوانە (نەخشیفان)، (نەخشوان)، (نەقجوان) ... شارێكە لە وڵاتی (ئاران) دەكەوێتە بەشی باشووری ئەو وڵاتە، لەسەر رووباری (ئاراس)، نزیكەی چوار (فەرسەخ)یش/(٢٤كم) لە شاری (دوین)ەوە دوورە؛ ئیبنو حەوقەل: صورة الأرض، لاپەڕە (٣٠٣)؛ یاقوت: معجم البلدان، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٢٩٨)؛ بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: رەسوڵ: الشدادیون فی بلاد آران، لاپەڕەكانی (٣٢-٣٣).

١٣- بڕوانە لاپەڕەكانی (١٤٧-١٥١) لە دەقە عەرەبییەكەی ئەو كتێبە.

١٤- خورشید: الأكراد والغزو السلجوقي، لاپەڕە (٢).

١٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (٥٢٨-٥٢٩).

١٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٠٩).

١٧- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٢٨)؛ محەمەد خەضری بەگ: محاضرات تاریخ الأمم الإسلامیة، لاپەڕە (٤١٧).

١٨- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٢٩)؛ بەدلیسی: الشرفنامة، لاپەڕە (٤٠).

١٩- نەقشەبەندی: الكرد فی الدینور، لاپەڕەكانی (٢٢٥-٢٢٨).

٢٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)؛ محەمەد خەضری بەگ: محاضرات تاریخ الأمم الإسلامیة، لاپەڕە (٤١٧).

٢١- ئیبنولعیبری: تاریخ الزمان، لاپەڕەكانی (٩٦-٩٧)؛ تكریتی: الإمارة المروانیة، لاپەڕە (١٢٩)..

٢٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ دائرة المعارف الإسلامیة الكبری، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (١٢٠).

٢٣- تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ زوبێر بیلال ئیسماعیل، أكراد روسیا القیصریة والاتحاد السوڤیتي، گۆڤاری (القافلة)، ژمارە (٢)، ساڵی ١٩٩٩ ، لاپەڕە (٤٢).

٢٤- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٧٠)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٤١)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدینور، لاپەڕە (٢٣٦).

٢٥- داقوقا: ئەم ناوە بە چەند شێوەیەك هاتووە، لەوانە: (داقوقا)، (دقوقاء)، (دقوق)، (طاووق) ... شارۆچكەیەكە دەكەوێتە نێوان كەرخینی (كەركووك)و خانیجار (طوزخورماتو) بە یەك لە شارە كۆنەكانی عێراق دەژمێردرێت ... یەزدی: الظفرنامة (بە فارسی)، تەهران، ١٩٩٦ز، بەشی یەكەم،

لاپەڕە (٦٦١)؛ لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، لاپەڕەكانی (١٢٠-١٢١).

٢٦- ماهكی: درانەپاڵە بۆ هۆزێكی كوردی بەم ناوە، دانیشتووانی باكووری ڕۆژئاوای (لوڕستان) لە نزیک (كرمانشاه)ن، ئەوسا میرنشینێكی بچووكیان دامەزراند، هەر بەناوی هۆزەكەیان ناسرا... الشرفنامة، لاپەڕە (٤١)؛ ئەمین زەكی: الخلاصة، لاپەڕە (٤٣١).

٢٧- راوندەین ... دووانەی (راوند)ە، قەلایەكی بچووكی نزیک (نەهاوەند)ە .. الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٣٦).

٢٨- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٧٠)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٤١)؛ الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٣٦).

٢٩- المنتظم: بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٢٣)؛ ئیبنولئەثیر هەروەها دەڵێت: نەسرولدەولە خاوەنی دیاریەكر (سەرباز و دیارییەكی زۆری بۆ سوڵتانی سەلجوقی) رەوانكرد؛ الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩).

٣٠- تاريخ الزمان، لاپەڕە (٩٧).

٣١- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ سوهێل زەكار: في التاريخ العباسي والأندلسي، لاپەڕەكانی (١٧٤-١٧٥).

٣٢- تاريخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ رەسوڵ: الشداديون، لاپەڕە (٦٥).

٣٣- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)؛ تكريتی: الإمارة المروانية، لاپەڕە (١٢٤).

٣٤- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠)؛ عەسلی: فن الحرب الإسلامي، لاپەڕە (٣٤٢)

٣٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠).

٣٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣٠)؛ مەسەلەكە هەر بە دانی پارە تەواو نەدەبوو، بەڵكو هەر لەو ساڵە دیارییەكانی میر (نەسرولدەولە) گەیشتنە سوڵتان، بریتیبوون لە جلی رەنگاورەنگ، چەند ئەسپێک، سێ بەلەمی تێكشكاو، شتانێكی دیكەی زۆر .. سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٥).

٣٧- تكريتی: الإمارة المروانية، لاپەڕەكانی (١٣١-١٣٢).

٣٨- كەسرەوی: شەهریاران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٠٣)؛ رەسوڵ: الشداديون لاپەڕە (٦٦)؛
Studies in caucasian history, P. 196.

٣٩- مایدەشت: قەڵا و شارۆچكەیەكە لە دەوروبەری (خانەقین) لە (عێراق) .... معجم البلدان، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٥٠) ... دەشتی (مایدەشت)یش لە كۆندا گرنگییەكی زۆری هەبوو، چونكە رێگەی



خوراسانی بازرگانی بەوێدا تێدەپەڕێ، لەو كاتانەدا كە خەڵكی لە (حەلوان)ەوە بەرەو رۆژهەڵات بۆ (قرێمسین) دەهات.... مستەوفی قەزوینی: نزهە القلوب، لاپەڕە (١٠٨).

٤٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەكانی (٥٨٩-٥٩٠)؛ بەدلیسی: الشرفنامة، لاپەڕە (٤٢)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕەكانی (٢٣٦-٢٣٧).

٤١- نەعمانییە: شارۆچكەیەكی بچووكی نیوەی رێی نێوان (واست)و (بەغداد)ە، دەكەوێتە سەر كەناری دیجلە... یاقوت: معجم البلدان، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٢٩٤).

٤٢- الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٠).

٤٣- بەندینجین: شارۆچكەیەكی بەناوبانگی بەری (نەهراوان)ە، لە دەوروبەری چیاكان .... یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٤٩٩)؛ ئەو شوێنە ئەمرۆكە بە (مەندەلی) دەناسرێت، نزیكەی (٩٣ /كم) لە ( بەعقوبە)ەوە دوورە ... ئەمین: تاريخ العراق فى العصر السلجوقى، لاپەڕە (١٦١)، پەراوێزی ژمارە (٤).

٤٤- نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕەكانی (٢٣٦-٢٣٧).

٤٥- جەواد: جاوان، لاپەڕە (١٤)؛ نەقشەبەندی، ملاحظات حول جاوان، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی دووەم، ژمارە (٢)، ١٩٧٤ز، هەردوو لاپەڕەكانی (٢٧٨) و (٢٨٢).

٤٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٠)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٦).

٤٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٠).

٤٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٣٧).

٤٩- ئیبنولجۆزی، المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٣٠)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٢)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٣٩)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٢٦).

٥٠- ئیبنولجۆزی، المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەكانی (١٢٩-١٣٠)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨)؛ ئیبنولئەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (١٦٨).

٥١- ئیبنولجۆزی، المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٣٠)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٣)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٦).

٥٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٧٠)؛ ئەمین زەكی: مشاهير الكرد و كردستان، بەشی

دوانزەهەم، لاپەڕە (٢١٠).

٥٣- دینور و مشاهیرها، بەرگی شەشەم، لاپەڕە (٥٦٩).

٥٤- المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٥٧)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٥).

٥٥- فارقی: تاريخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (١٧٧)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٩٥)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٦٩)؛ ئیبنوعیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٩٠)؛ زەكار: في التاريخ العباسي.

٥٦- تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕە (١٧٩).

٥٧- سەرچاوەکانی بەردەستمان ئاماژە بۆ ناوی ئەو میرە ناکەن.

٥٨- فارقی: تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕە (١٨١).

٥٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦٠- فەخرولدەولە: ناوی (ئەبو نەسر کوڕی جوهەیری ثەعلەبی مووسڵی)یە (٣٩٨-٤٨٣ك/ ١٠٠٧-١٠٩٠ز) ... یەکێک بووە لە پیاوەکانی بەڕێوەبردن و زانست، خاوەنی ئەقڵ و ڕاو حەزم بوو، سەرەتا بووە وەزیری (نەسرولدەولە ئەحمەد کوڕی مەڕوان)ی خاوەنی (دیاربەکر و میافارقین)..

لە دواییدا بووە وەزیری کوڕەکەی (نیزامەدین)، ئینجا نامەی بۆ خەلیفە (قائیم بی ئەمریللای عەبباسی) نارد، بۆ ئەوەی ببێتە وەزیر ... بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ئیبنو خەلەکان: وفيات الأعيان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕەکانی (١٢٧-١٢٨)؛ زامباور: معجم الأنساب و الاسرات الحاكمة، قاهرە،١٩٥١ز، لاپەڕە (٢٣).

٦١- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (١٨١).

٦٢- المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٢٦)؛ تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٥)؛ حەمەوی: التاريخ المنصوري، لاپەڕە (١٥٤)؛ ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٨٨)..

٦٣- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (١٨٦).

٦٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣٢)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٠)، سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١٠٠)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨٤)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٥٨).

٦٥- ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٤١)؛ نەقشەبەندی: الكرد فی الدينور، لاپەڕە (٢٣٦).



٦٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٨)؛ ئەبولفیداء، المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧٢)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٥٠٥)؛ کەسرەوی: شەهریاران گمنام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١١)؛ نەقشەبەندی: ئازەربێجان، لاپەڕە (١٧٠).

٦٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٥٠)؛ ئازەربێجان، لاپەڕە (١٧٠).

٦٨- Studies in caucasian history, P. 168.

٦٩- مرآة الزمان، لاپەڕە (٧٤، ٧٥).

٧٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧٢- نەقشەبەندی: آذربيجان، لاپەڕە (١٧٢).

٧٣- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٩٤)؛
Studies in caucasian history, P. 168. بە گواستنەوە لە (تاريخ الباب و الأبواب)ی نووسەرێکی نادیار.

٧٤- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٩٤)؛ نەقشەبەندی: آذربيجان، لاپەڕە (١٧٣) Ibid, P. 168 ; .. ئەوەی تێبینی دەکرێت: لەو گێڕانەوەیەیدا سەبتی ئیبنولجۆزی کە باسی (مەملان) دەکات، بە (مەملانی رازی) ناوی دەبات و مەبەستی لێی (مەملانی روادی) یە.

٧٥- لە بارەی ڕۆڵی میر (هەزار ئەسپ) لە هەردوو ڕووی سیاسی و عەسکەرییەوە لە دەوڵەتی سەلجوقی، بڕوانە هەردوو لاپەڕەکانی (١٧٣)و (١٧٥)ی ئەو بەشە لە دەقە عەرەبییەکەی.

٧٦- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٠)و (٢٤).

٧٧- تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٧).

٧٨- نازناوی (پێشەنگ)، لێکچووە بە نازناوی (سەرۆک) لە بواری سەربازییەوە، وەکو دەریش دەکەوێت، هەموو هۆزێک پێشەنگێکی هەبووە، (ئەبولفەتحی کوڕی ورام)یش پێشەنگی کوردە جاوانییەکان بوو .... ناجی: الإمارة المزيدية، لاپەڕەکانی (١٨٥-١٨٦).

٧٩- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٧١)؛ ئیبنوتەغری: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٦٧)..

٨٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧١)؛ النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٦٧).

٨١- ئەو میرە میر ئەبولفەوارس سەرخاب کوڕی بەدر کوڕی موهلهیلی کوردییە، خاوەنی شارەزوور و

کەنکور و داقوقا و خەفتیزکان بوو، لە میرەکانی سوڵتان (تەغرول بەگ)ی سەلجوقی بوو، دواتر بووە میری (بەرکیاروقی کوڕی مەلەکشاه) ... ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٣٨)؛ حەمەوی: التاریخ المنصوري، لاپەڕە (١٦٠)؛ بۆ زانیاری زیاتریش لە بارەیەوەی بڕوانە: نەقشەبەندی: الکرد في الدینور، لاپەڕە (٢٤٥).

٨٢- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٦).

٨٣- دمیة القصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٨١٣).

٨٤- ئەمە (عەزەدولدەولە ئەبو شوجاع ئەلب ئەرسەلان محەممەد کوڕی داود کوڕی میکائیلی سەلجوقی)یە، لە ساڵی (٤٢٤ک/ ١٠٣٢ز) لە دایک بووە، برازای سوڵتان (تەغرول بەک)ە و دووەم سوڵتانی دەوڵەتی سەلجوقییە، لە ماوەی لاوێتیدا زەق بوویەوە، چونکە لە تەمەنێکی بچووکدا فەرماندەیی سوپاکەی (جەغری بەگ)ی باوکی کرد، بە تایبەت لە شەڕەکانی لەگەڵ غەزنەوییەکان، لە ساڵی (٤٥٠ک/ ١٠٥٨ز)یش توانی مامی خۆی لە فیتنەکەی (ئیبراهیم یەناڵ) رزگار بکات، ئینجا بووە جێنشینی باوکی لە فەرمانڕەوایی (خوراسان) دا، لە ساڵی (٤٥٥ک/ ١٠٦٣ز)یش لە دوای مردنی (تەغرول بەگ)ی مامی دەسەلاتی گرتە دەست ... راوندی: راحة الصدور، لاپەڕەکانی (١٨٥-١٨٦)؛ (ئیبنولفوتی: تلخیص مجمع الآداب، بەشی چوارەم، پاری یەکەم، لاپەڕەکانی (٤٣٧-٤٣٨)؛ برتساک: دائرة المعارف الإسلامیة، ماددەی (ئەلب ئەرسەلان)، بەشی چوارەم، لاپەڕەکانی (١٦٣-١٦٤).

٨٥- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٩١)؛ ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣١)؛ دەواداری: کنز الدرر و جامع الغرر، ساغکردنەوەی سەلاحەددینی مونجید، قاهیرە، (١٩٦١ز)، بەشی یەکەم، پاری شەشەم، لاپەڕە (٣٧٨)؛ مستەوفی قەزوینی: تاریخ گذیدە، لاپەڕە (٤٣٨)

The Cambridge bistovy of Iran, vol 5, p.235.

٨٦- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣٤)؛ عەسلی: فن الحرب الإسلامي، لاپەڕە (٣٤٤).

٨٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٦)؛ سوهەیل زەکار ئیبراهیم بەیزون: تاریخ العرب السیاسی، بەیروت، ١٩٧٤ز، لاپەڕە (٢٩٦)؛

Suphi saat GI: Tarihi Gdisim I Gin De Irak, P. 57.(بەتورکی لاتینی)



٨٨- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٧)؛ ذهبي: العبر: بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٣٤)؛ مستەوفی قەزوینی: تاریخ گذیدة، لاپەڕە (٤٣٨)؛ حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، لاپەڕە (٤٧).

٨٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩)؛ حلمي: السلاجقة، لاپەڕە (٣٢).

٩٠- شهابولدەولە قەتلمش کوڕی ئیسرائیل باوکی سلێمان باپیرەی سوڵتانە رۆمیە سەلجوقییەکانە ... ذهبي: العبر: بەشی سێیەم، لاپڕە (٢٤٠).

٩١- ذهبي: العبر: بەشی سێیەم، لاپڕە (٢٤٠).

٩٢- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٣٠)؛ ئیبنولعەدیم؛ بغیة الطلب، لاپەڕە (١٦)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٩٠).

٩٣- وفیات الاعیان: بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٦٩)

٩٤-نیزامولملیک: ناوی (ئەبو عەلی حەسەن کوڕی ئیسحاقی طوسی)یە لە ساڵی(٤٠٨ک/ ١٠١٧ز) لە (طوس) لە دایک بووە، لە پیاوانی زانست و سیاسەت بووە، لە پیاوە نزیکەکانی (جەغری بەگ) بووە لە خوراسان، دواتر بووە وەزیری سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)، دوای ئەویش هەر بە وەزیری بۆ (مەلەکشاه)ی کوڕی سوڵتان(ئەلب ئەرسەلان) مایەوە، بۆ ماوەی سی ساڵ، لە (٤٥٥-٤٨٥ک/ ١٠٦٣-١٠٩٢ز) رۆڵێکی زۆر گرنگی بینی لە نەخشەکێشانی سیاسەتی دەوڵەتی سەلجوقی... بۆ زانیاری زیاتریش لە بارەوەی بڕوانە: ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی دووەم، لاپەڕە (١٢٨)؛ ئیقبال: الوزارة في عهد السلاجقة، لاپەڕە (٣٥).

٩٥- فامبری: تاریخ بخاری. لاپەڕە (١٣٦)؛ حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق لاپەڕە (٥١)؛ مۆریس کرۆزیە: تاریخ الحضارات العام، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٣٣٨).

٩٦- مستەفا: دخول الغز(الترك) الى بلاد الشام، لاپەڕەکانی ((٣٢٠- ٣٢١).

٩٧- سەیری لاپەڕەکانی دوای ئەمە بکە لە لێکۆڵینەوەکە.

٩٨- حوسەینی: زبدة التواریخ، هەردوو لاپەڕەکانی (٨٧) و (٩٠)؛ جەمال رەشید لقاء الکردواللآن في بلاد الباب وشروان، لەندەن، ١٩٩٤ز، لاپەڕە (٢٣٢)؛ بۆل ئەمیل: تاریخ ارمینیا، وەرگێڕانی: شوکور عەلاوی بەیروت(بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٢٨).

٩٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٨).

١٠٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٨- ٣٩).

١٠١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٧)؛ مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (١٩٩)؛ رەسوڵ:

الشداديون، لاپەڕە (٦٨)؛ موكرياني: كوردستاني موكرياني، لاپەڕە (٨٦).

١٠٢- فارقي: تاريخ آمد وميافارقين، لاپەڕەكاني (١٨٧-١٨٨)؛ ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٦٤)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٣٩)؛ ئيبنولعەدیم: زبدة الحلب من تاريخ حلب، گرنگیدان بە چاپكردن و ساغكردنەوەی(سامی دەهان)، دیمەشق، ١٩٥٤ز، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕەكانی (١٨٦-١٨٧).

١٠٣-ئيبنولئەثير: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٦٤).

١٠٤- سالار: زاراوەیەكی لەبنەچەدا فارسییە، بە واتای سەرۆكی سوپا دێت...

هەژار: هەنبانە بۆرینە (فەرهەنگی كوردی- فارسی)، تەهران، (١٣٦٩، كۆچی/هەتاوی)، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (٤٠٨)؛ ئادی شیر: الالفاظ الفارسية المعربة، بەیروت، ١٩٨٠، لاپەڕە (٨٣)

١٠٥-تاريخ آمد وميافارقين ، هەردوو لاپەڕەكانی (١٨٢) و(١٨٤)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەكەم، لاپەڕەكانی (٢٧٤- ٢٧٥).

١٠٦- تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٨).

١٠٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە كانی(٦٠٢-٦٠٣)ك، تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٨).

١٠٨- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٣٨)، ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢٢)؛ ئیبنولوەردی: تتمة؛ ابو لفداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨)؛ بەدلیسی: الشرفنامة، لاپەڕە (٢٤١).

١٠٩- بڕوانە: نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٤١).

١١٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٥)؛ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٤١).

١١١- بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (١٩)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنوكەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٨٢)

١١٢- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١٢٣).

١١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٧٢).

١١٤- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١١٩)؛ كاهن، دائرة المعارف الاسلامية، مادەی ئەلب ئەرسەلان، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٦٥).



١١٥- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣٦)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٧)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٢٣)؛ ئیبنوعیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٩٦)؛ دائرة المعارف الاسلامية الكبرى، بەرگی یەكەم لاپەڕە (١٢٠)؛
Studies in Caucasian history, p 168.

١١٦- زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٨)، پەراوێزی ژمارە(١).

١١٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١٨- مەرەند: یەكێك بووە لە شارەكانی ئازەربێجان، لە نێوان(خوێ) و (تەبریز)دا دە فەرسەخ/ نزیكەی(٦٠كم) دووری هەیە.. قودامەی كوڕی جەعفەر: الخراج و صناعة الكتابة، لاپەڕە (١١٠)؛ یاقووت: معجم البلدان، بەشی پێنجەم.

١١٩- طەغتكین: لە سەرچاوەكاندا شتێكمان لە بارەی ژیاننامەی دەست نەكەوت، وا دەردەكەوێت یەك لە فەرماندە توركەكانی ئامادەی ناوچەكانی ئازەربێجان و ئەرمینیا بێت، ئەمەش بۆ پاراستنی ناوچە سنوورییەكان لە هەڕەشەی بێزەنتییەكان، وەكو تێبینیش دەكرێت، ئەم ناوە بە دوو شێوەی لێكجیا هاتووە، ئیبنو لئەثیر بە (طەغدكین) ناوی هێناوە و (حوسەینی)ش بە (طەغتكین) ناوی هێناوە... الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٧)؛ زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٧).

١٢٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٧).

١٢١- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٨)؛ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٨)

١٢٢- هەمان ئەو دوو سەرچاوەیەی پێشوو.

١٢٣- الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٨).

١٢٤- ڕەشید: لقاء الكرد واللان، لاپەڕە (٢١٥).

١٢٥- كەسرەوی: شهرياران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٠٣).

١٢٦-حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٨)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١٧٧).

١٢٧- سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١١٧).

١٢٨- سەرماری: لە بنەچەدا(شەماری)یە، كە قەڵایەكی گەورە و ویلایەتێكی فراوانی نێوان (تەفلیس) و(خەلات)ە... یاقوت: معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢١٥)؛ هەر ئەمەش ئەو (سەرماری)یەی ئێستایە لە توركیا... حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٨)، پەراوێزی ژمارە(٣).

١٢٩- زبدة التواريخ، لاپەڕە (٨٨).

١٣٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٨٩).

١٣١- قارس: یەک لە شارەکانی(ئەرمینیا)یە، لە هەرێمی (تەفلیس)، نێوانی لە (تەفلیس) دوو ڕۆژە ڕێیە،... یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم،لاپەڕە (٣٢٣)؛ ئەم (قارس)ە ئێستاکە یەکێکە لە شارەکانی تورکیاو، هەموو دانیشتوانەکەی کوردن.

١٣٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٨)؛ عەسلی: فن الحرب الاسلامي، لاپەڕە (٣٤٥).

١٣٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٠).

١٣٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٣٣)؛ ئیبنولعیبری: تاريخ الزمان، لاپەڕە (١٠٦)؛ ئەمیل، تاريخ ارمينيا، لاپەڕە (٣٠)؛

Studies in Caucasian history, p 169.

١٣٥- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٣٦)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤١)؛ ئیبنوعیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٢٩٦).

١٣٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤١)؛ بوستانی: دائرة المعارف، بەیروت، (بەبێ ساڵی چاپ)، بەرگی چوارەم، لاپەڕە (١٨٨).

١٣٧- عەباسی: اثار الاول في ترتيب الدول. میسر١٩٢٥ز، لاپەڕە (١٤٧).

١٣٨- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٩٤)، پەراوێزی ژمارە(١)، بە وەرگرتن لە سەرچاوە ئەرمەنییەکان.

١٣٩- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕەکانی (٤٢-٤٣)؛ مونجیم باشی: جامع الدول(بەشێک لە بارەی شەدادییەکان) لاپەڕە (١٩٩)؛

Studies in Caucasian history, p 169.

١٤٠- جامع الدول، لاپەڕە (١٩٩).

١٤١- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ ڕەشید: لقاء الكرد واللان، لاپەڕە (٢٢٩).

١٤٢- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی (ئانی)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١١٢)

١٤٣- ژمارەیەک لە لێکۆڵەرە ڕۆژئاواییەکان لە نووسینە تایبەتییەکانیان لە بارەی ململانێی (سەلجوقی- بێزەنتی) جەختیان لەسەر هێرشەکەی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) بۆ سەر شاری(ئانی) لە ساڵی(٤٥٦ک/ ١٠٦٤ز) کردۆتەوە، ئەوەشیان جەخت کردۆتەوە کە ئەو شارە لە ژێر فشاری ئەو سوپایە تورکە هەرەسی هێناوە، کە هێرشێکی هێندە وەحشیانەی کردۆتە سەر ئەو شارە، لە پێشتردا نموونەی نەبووە، لە نێو شارەکە دەستیان بە کوشتن و وێرانکردن کردووە، بەڵام ڕاستی بە پێچەوانەی ئەوەیە، کە ئەو نووسەرانە پروپاگەندەی بۆ دەکەن، چونکە(ئانی) هەر مایەوە و لە سای شەدادییەکاندا ژیانی سروشتی خۆی بەسەر برد... بگەڕێوە بۆ: فامبری: تاريخ بخاری، لاپەڕەکانی (١٣٦-١٣٧)؛ ئەمیل: تاريخ ارمينيا، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٨) و(٣٠)؛ کاهن: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی (ئەلب ئەرسەلان)، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ شترک: مادەی (ئەرمینیا)، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٤٥).

١٤٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤١)؛ ئەو مێژوونووسە دەڵێت: سوڵتان سوپایەکی بەهێزی تیا بەجێهێشت.

١٤٥- بەرزەعە: یاقوتی حەمەوی دەڵێت: ئەم شارە دەکەوێتە ئەو پەڕی(ئازەربێجان)... معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣٧٩)... دەشکەوێتە نێوان هەردوو شاری (باب الابواب) و (شماخ)، لە یەکەمیان(١٩٨کم) و لە دووەمیشیان(٨٤/کم) دوورە.... ئەستەخری: مسالک الممالک، لاپەڕە (١٢٢)؛

H udud AL- Calam,P58.

١٤٦- حوسەینی زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٣)

١٤٧- ساوتکین: ناوی(عیمادولدەولەوەلدین ئەبو مەنسور ساوتکین)ە، پاسەوان و فەرماندەیەکی سوڵتان(ئەلب ئەرسەلان) بووە، لە ساڵی(٤٧٧ک/ ١٠٨٤ز) مردووە، سامانێکی گەورەی ماڵی لە دوای خۆی جێهێڵاوە، چونکە فەرماندەییکردنی بۆ سوپای سەلجوقی لە هێرشە سەربازییەکانیان، یەک لەو هۆیانەبوو، کە ببوونە هۆی ئەوەی سامانەکەی زۆر بێت، چونکە زۆرجار دەستی دەکرد بە تاڵانکردنی ئەو ناوچانەی هێرشیان دەکردە سەر، لە ساڵی(٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز)یش سوڵتان(مەلەکشاه) هەرێمی (ئاران)ی پێدا... حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (٧٩)، پەراوێزی ژمارە(٢).

١٤٨- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٣).

١٤٩- (شکا) یەکێک بووە لە شارەکانی (ئاران)، کەوتۆتە دووری چواردە فەرسەخ لە باکووری شاری(بەرزەعە)، واتە نزیکەی(٨٤کم)... ئیبنوحەوقەل: صورة الارض، لاپەڕە (٢٩٤)؛ مەقدسی: احسن التقاسيم، لاپەڕە (٣٧٦).

١٥٠- تەفلیس: شارۆچکەی(کرجستان)ە، دەکەوێتە بەرزاییەکانی ڕووباری(کەڕ)، ئیبنوحەوقەل وای

پەسن داوە، کە شارێکی سەخت و پارێزراوە... صورة الارض، لاپەڕە (٢٩٤)؛ مستەوفی قەزوینی: نزهة القلوب، لاپەڕە (١٠٨).

١٥١- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٣).

١٥٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (١٠٤- ١٠٥)؛ ڕەشید: لقاء الكرد واللان، لاپەڕە (٢٣٤).

١٥٣- مرآة الزمان، لاپەڕە (١٣٦).

١٥٤- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٦).

١٥٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٥٦- ئەستەخر): شارۆچکەیەکە لە هەرێمی(فارس)، دەکەوێتە بەشی باکووری ئەو هەرێمە، لە قەڵا و شار و ئاوایییە ناودارەکانی(فارس)ە... یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢١١)؛ لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، لاپەڕە (٣١١).

١٥٧- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٨٨)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٠)؛ یەزدی: العراضة في الحكاية السلجوقية، لاپەڕە (٤٦).... راوندی دەڵێت: سوڵتان(ئەلب ئەرسەلان) لە ماوەی هێرشەکەی بۆ سەر میرنشینی شوانکارەی کوردی خەڵکێکی زۆری کوشت.

١٥٨-میر ئەبو لعەبباس فەزلەویە: میرێکی (رامانی)یە، کە (رامانی) یەک لە تیرەکانی هۆزی شوانکارەی کوردییە، لە هەرێمی(فارس)... بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی، بڕوانە: ئەمین زەکی: مشاهير الكرد وكردستان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٠٦)؛ لامیتون: دائرة المعارف الاسلامية، مادەی(ئیلات)، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (٣١٨).

١٥٩- (فەیروزج): لە (فەیروز)ی فارسییەوە هاتووە، جۆرێکە لە بەردە پیرۆزە گرانبەهاکان... ئیبنومەنزور: لسان العرب، بەرگی دووەم، لاپەڕە (٣٤٥).

١٦٠- زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٠).

١٦١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٦٢- حوسەینی، لاپەڕە (٤٦).

١٦٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٦٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٠١)؛ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧١).

١٦٥- حوسەینی: زبدة التورايخ، لاپەڕە (١٠١).



١٦٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٢).

١٦٧- الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٧١-٧٢).

١٦٨- زبدة التواريخ، لاپەڕە (١١٠)، الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٢).

١٦٩- نەیسابوری: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣٤)؛ خودابەخش: الحضارة الاسلامية: وەرگێڕانی: عەلی حوسنی خەربوتلی، جیزە، ١٩٦٠ز، لاپەڕە (٧٢)،بۆ زانیاری زیاتریش، بڕوانە ڕەسوڵ: الشداديون، لاپەڕە (٦٦).

١٧٠- (حوسەینی) لە هەڵەدا کەوتووە، کاتێک ئاماژەی بەوەداوە کە (نیزامولمەلیک) میر (هەزار ئەسپ)ی وەکو هێرشبەر ناردۆتە سەر وڵاتی میر (فەزلون)، چونکە (هەزار ئەسپ) لە ساڵی(٤٦٢ک/ ١٠٧٠ز) مردووە، مێژووی ئەو هێرشەش کە (نیزامولمەلیک) کردوویەتی لە ساڵی(٤٦٤ک/ ١٠٧٢ز) بووە، کەواتە میر(هەزار ئەسپ) ئەو سەرکردەیە نەبووە، کە ڕەوانەی(کەنجە) کرابێت، ڕاستیش ئەوەیە، کە (ئیبنولئەثیر) ئاماژەی بۆ کردووە، کە دەڵێت: وەزیر تایەفەیەک سەربازی بەرەو ئەو شوێنە نارد کە خانەوادەی (فەزلون)ی لێ بوو، بێ ئەوەی ئاماژە بۆ (هەزار ئەسپ) بکات... بڕوانە زبدة التواريخ، لاپەڕەکانی (١٠١-١٠٢)؛ الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٧١-٧٢).

١٧١- حوسەینی زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٠٢)؛ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٢).

١٧٢-کاهن: دائرة المعارف لاسلامية، مادەی(ئەلب ئەرسەلان)، بەشی چوارەم، لاپەڕە (١٦٨)؛ ناجی: الامارة المزيدية، لاپەڕە (٨٦).

١٧٣- ئیبنولقەلانسی: ذيل تاريخ دمشق، لاپەڕە (١٠٦)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٧٦)؛ راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٩١)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٣-٧٤)؛ یەزدی: العراضة في الحكاية السلجوقية، لاپەڕە (٥٢)؛ عەینی: السيف المهند، لاپەڕە (١٧٤).

١٧٤- ئیبنولعیبری: تاريخ الزمان، لاپەڕە (١١٣)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨٩).

١٧٥- S.N. Fisher: The Middle East history,P94.

١٧٦- ئیبنولقەلانسی: ذيل تاريخ دمشق، لاپەڕە (١٠٦)؛ ئیبنولعەدیم: بغية الطلب، لاپەڕە (١٦).

١٧٧- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (٩٤)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٦٩).

١٧٨- The Cambridge history of Iran, vol 15, P234.

١٧٩- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی(ئاران)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٦٩).

١٨٠- شروان(شێروان) دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای دەریای قەزوین، لە نێوان (بەرزەعە) و (باب الابواب) شارۆچکەکەی بریتییە لە (شەمافی)... بلازری: فتوح البلدان، لاپەڕە (٣٦٤)؛ قەلقشەندی: صبع الاعشی، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٣٦٤)؛ لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، لاپەڕە (٢١٤).

١٨١- دەربەند: وشەیەکی کوردییە بە واتای تەنگەبەر یان ئەو ڕێگایە دێت کە دەکەوێتە نێو دوو چیا، ئەو ناوەش هاوواتایە لەگەڵ زاراوەی عەرەبی(باب الابواب)، بۆیە بەمە ناونراوە، چونکە دەکەوێتە یەک لە دەربەندەکانی چیای قبق (قەوقاز)، لەسەر دەریای قەزوین(خەزەر)، ئەم شارە دەکەوێتە دووری نزیکەی(١٠٨ /کم) لە (بەرزەعە).. لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، لاپەڕە (٢١٤)؛ ڕەسوڵ: الشداديون في بلاد اران، هەردوو لاپەڕەکانی (٣١) و(٣٦).

١٨٢- دائرة المعارف الاسلامية، مادەی (ئاران)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٧٢).

١٨٣- (بارتۆلد) زێدەڕەوی کردووە لە گوتەکانی، گوتوویەتی زاری تورکی (ئازەری) ئەو زارەیە کە لە کاتی ئێستادا هەموو (ئازەربێجان) قسەی پێدەکەن، بەم شێوەیەش ئەو ڕۆژهەڵاتناسە بەم قسانەی نەفی ئەوە دەکات، کە کورد لەو هەرێمە گرنگە هەبن، کە بە وڵاتێکی کۆنی کورد دەژمێردرێت...تاريخ الترك في اسيا الوسطى، لاپەڕە (١٠١).

١٨٤- لە بارەی سیاسەتی سوڵتان(تەغرول بەگ) لە بارەی کورد، بگەڕێوە بۆ هەردوو لاپەڕەکانی (١٢٧) و(١٤١) لە دەقە عەرەبییەکە.

١٨٥- بگەڕێوە بۆ هەردوو لاپەڕەکانی (١٤١) و(١٥٨) لە دەقە عەرەبییەکە.

١٨٦- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی سوڵتان(مەلەکشاه) و سیاسەتە ناوندەییەکەی، بڕوانە: بەشی چوارەم، هەردوو لاپەڕەکانی (١٩٢) و(٢٠٠) لە دەقە عەرەبییەکە.

١٨٧- بڕوانە: بابەتی هێرشەکانی(غەز) بۆ سەر (ئازەربێجان)، هەردوو لاپەڕەکانی (٥٠) و (٥٧) لە دەقە عەرەبییەکە.

١٨٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨١)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥١).

١٨٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٦)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە



(٤٥١)؛ تکریتی: الامارة المروانية، لاپەڕە (١٢٧).

١٩٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٣٨٩)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٥٢).

١٩١- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (١٣٠)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٣٢)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٢٦)؛
The Ency of Islam, P1139.

١٩٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ سوهەیل زەکار: مدخل الى تاريخ الحروب الصليبية، دمشق، ١٩٧٠ز، لاپەڕە (٩٢).

١٩٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٥٥٦- ٥٥٧)؛ یوسف: حضارة الدولة الدوستكية، بەشی دووەم، لاپەڕە (٦٦).

١٩٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٥٧).

١٩٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو،

١٩٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٥٩٤-٥٩٥).

١٩٧ هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٩٥)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٢٩).

١٩٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٢٩).

١٩٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٦٠٦).

٢٠٠- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (١٩٩).

٢٠١- فارقی: تاريخ آمد وميافارقين، لاپەڕە (١٨٧)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٦٤).

٢٠٢- پێویستی لێکۆڵینەوەکە وا دەخوازێت هەندێ زانیاری و گێڕانەوە دووبارە بکرێنەوە، مەبەست لە دووبارە کردنەوەشیان درێژکردنەوە نییە، بەڵکو پێویستی زانستی لێکۆڵینەوەکەیە.

٢٠٣- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕەکانی (٢٢٢-٢٢٣)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە ((٨٨).

٢٠٤- تاريخ الزمان، لاپەڕەکانی (٩٦-٩٧).

٢٠٥-ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٩٩)

٢٠٦- تاريخ الزمان، لاپەڕە (٦٩).

٢٠٧- قازی ڕەشید کوڕی زوبەیر: کتاب الذخائر و التحف، ساغکردنەوەی محەمەد حەمیدوڵڵا، کوەیت،

ئینجا کێشە ناوخۆییەکان بەم شێوەیە خراپ نەبوون، بەڵکو باری گشتی میرنشینی مەڕوانی بە بەراورد لەگەڵ میرنشینەکانی تر باش بوو، چونکە هێمنی و خۆشی باڵی بەسەر هەموو لایەکیدا کێشابوو، –وەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێدا– بۆیە ئەو میرنشینە وەکو میرنشینەکانی تر بە هۆی لاوازیی نەڕووخا، بەڵکو بەهێزبوو، وەکو چۆن هەوڵی دوایین میری، کە میر (ناسرولدەولە)یە بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتەکەی جەخت لەسەر ئەو راستییە دەکاتەوە، چونکە لێدانەکەی سەلجوقییان شتێکی کاتی بوو، بۆیە زوو بەزوو میر توانی بۆ ولاتەکەی خۆی بگەڕێتەوەو، لە (دیاربەکر)دا دەسەڵاتەکەی خۆی دروستکردەوە، هەروەها لە ساڵی (٤٨٥ک / ١٠٩٢ز) شیا بەشێک لە مۆڵکەکانی میرنشینەکەشی وەربگرێتەوە[٩٥].

ئەمەش چونکە لە دوای مردنی سوڵتان (مەلەکشاه) کوردی (دیاربەکر) هەوڵیاندا لە نوێوە میرنشینەکەیان زیندوو بکەنەوە، ئیتر دەستیان کرد بە کۆشش لەو پێناوەو، شاعیر (ئیبنو ئەسەدی فارقی)[٩٦]ش، رۆڵێکی گەورەی هەبوو لەو بوارە، چونکە ئەو شاعیرە بێجگە لە توانا ئەدەبییەکەی، دەستێکی باڵاشی لە بواری سیاسەتدا هەبوو، لەبەر ئەوەی لە سەردەمی (ناسرولدەولە) لە (ئامەد)و دەوروبەریدا ئەو باجی کۆدەکردەوە[٩٧]، وەکو دەریش دەکەوێت، چاوی لەوە بووە پۆستی گەورە لە میرنشینەکە وەربگرێت، جا کاتێک (دیاربەکر) لە جێگرە سەلجوقییەکان بەتاڵ بوو، خەڵکی (میافارقین) بە دەوریدا کۆبوونەوە، لەوەش بەدوا ئیتر دەستی کرد بە فەرمانڕەواییێتی کردنی شارەکەو، پاراستنی ئاسایشەکەی.

(فارقی) لەم بارەیەوە دەڵێت:(ئیبنو ئەسەد پیاوێکی شاعیرو ئەدیب بوو، کۆمەڵێک خەڵک و قوتابی هەبوو، کۆمەڵێکیش پەیوەندییان پێوەکردو، کۆمەڵە گەنجێکی بەدەوردا کۆبووەوە ... ئیتر بە شارەکەدا دەگەڕاو، شورەی شارەکەی دەپاراست)[٩٨].

لەکاتێکدا ئەو بەرەوپێش چوونە لە (دیاربەکر)دا روویدا، میر (ناسرولدەولە) لە مەنفاکەی خۆیدا لە گوندی (حەربە) بە وردی چاودێری ئەو رووداوانەی دەکرد،، چونکە ئەو میرە مەڕوانییە، هەر لە یەکەم رۆژی دوورخرانەوەی لە ساڵی (٤٧٨ک / ١٠٨٥ز) نیازی ئەوەی هەبوو، بگەڕێتەوە ولاتەکەی و، میرنشینەکەی دابمەزرێنێتەوە، بۆیە دەستی کرد بە پەیوەندی لەگەڵ شاعیر (ئیبنو ئەسەدی فارقی) وادەی ئەوەی پێدا کە ئەگەر شاری



(میافارقین)ی پێبدات، ئیتر ئەویش وەزارەت بداتە ئەو، شاعیری ناوبراویش رازی بوو لە سەر ئەوەی ئەو شارە بە میر (ناسرولدەولە) بدات، ئەوەبوو لە سەرەتای ساڵی (٤٨٦ک / ١٠٩٣ز) میر (ناسرولدەولە) گەیشتەوە ئەو شارەو، کاروبارەکانی وەکو جاران لێکردەوە، (ئیبنو ئەسەد)یشی کردە وەزیرو، نازناوی (موحیولدەولە)ی پێدا[٩٩].

شایانی باسە (فارقی) کە بە تەنیا خۆی لەنێو هەموو مێژوونووسانی دیکە، قسەی لە بارەی چۆنیەتی دروستبوونەوەی میرنشینی مەڕوانی کردووە، ئەوەی روونەکردۆتەوە، کە ئایا دەسەڵاتی ئەو میرنشینە دوای دروستبوونەوەی، هەموو ئەو زەوییانەی گرتۆتەوە کە پێشتر سەر بە خۆی بوون، یان هەر بە تەنیا (میافارقین)و هەندێ شاری دیکەی هەرێمی (دیاربەکر)ی گرتۆتەوە؟

لەو بڕوایەداین ئەو میرنشینە لەو ماوە کورتەی دروستبوونەوەیدا، نەیتوانیوە هەموو مۆڵکەکانی بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی بگەڕێنێتەوە، بەڵام هەوڵەکانی بەردەوام بووە، بۆ ئەوەی وەکو سەردەمی پێشووی لێ بهێتەوە.

بێگومان مردنی سوڵتان (مەلەکشاه) بووە هۆی هاتنەپێشی بارێکی سیاسی تایبەت لە هەرێمەکانی دەوڵەتی سەلجوقی، چونکە ململانێی نێوان منداڵەکانی بووە هۆی لاوازبوونی سەلجوقییەکان، ئەوەش بووە هۆی ژیانەوەو دروستبوونەوەی ژمارەیەک لەو میرنشین و دەوڵەتە سەربەخۆیانەی کە پێشتر دەوڵەتی سەلجوقی هەڵیلوشیبوون و، لەنێو ئەوانەش میرنشینی مەڕوانی، بەڵام یەک لەوانە دەرکەوت کە چاویان بڕیبووە دەسەڵات ئەویش (تاجولدەولە تەتش)بوو[١٠٠]، کە وردە وردە کەوتە جووڵە لە (شام)ەوە بەرەو هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی و، دەستی گرت بەسەریاندا.

(تەتش) بەرەو ولاتی مەڕوانییەکان هات و، دەستی گرت بەسەر (میافارقین)، چونکە بەدەستییەوەی درا، هەرچی میر (ناسرولدەولە)شە لە شارەکە هاتە دەر بەرەو (تاجولدەولە)و داوای ئەمانی لێکرد، شایانی تێبینییە، کە ماوەی فەرمانڕەوایێتی ئەم دواییەی (ناسرولدەولە) تەنیا پێنج مانگ بوو[١٠١].

ئەوەی سەرنج راکێشیش بێت، راکان جیاوازن لە بارەی مێژووی مردنی میر (ناسرولدەولە).. (فارقی) دەڵێت: ئەو لە (جەزیرە) لە ساڵی (٤٨٦ک / ١٠٩٤ز) کۆچی دوایی کرد، بە واتە لەهەمان ئەو ساڵەی (تەتش) دەستی بەسەر ولاتەکەیدا گرت،

زیاد لەوەش دەڵێت خێزانەکەی لە (دیاربەکر) گومەتێکی لەسەر گۆڕەکەی دروستکرد، دەیڕوانییە سەر (دیجلە)[١٠٢].

بێجگەی (فارقی)ش وای دەبینن، کە (ناسرولدەولە) لە ساڵی (٤٨٩ک / ١٠٩٥ز) لە ماڵی جوولەکەیەک کۆچی دوایی کردبێت، لەو شوێنەی کە کاتی هێرشەکەی (فەخرولدەولە)بۆ سەر (دیاربەکر)و داگیرکردنی، (جگەرموش)[١٠٣] گرتی، خێزانەکەشی هەڵیگرت بردیەوە بۆ خاکی باوانی و، لە گۆڕستانی خانەوادەکەی ناشتی، بە مردنیشی کۆتایی بە فەرمانڕەواییێتی مەڕوانییەکان هات[١٠٤].

لەگەڵ ئەوەشدا کە بە شێوەیەکی کارەکی ئەو میرنشینە لە ساڵی (٤٧٨ک / ١٠٨٥ز) کۆتایی پێهێنراو، زۆربەی ناوچەکانی لەلایەن سوپای سەلجوقییەوە داگیرکرا، بەڵام قەڵای (هتاخ) تا ساڵی (٥٣٢ک / ١١٣٧ز)یش هەر بەدەست یەک لە تاکەکانی خانەوادەی مەڕوانی مایەوە، چونکە یەک لەو رووداوانەی (ئیبنولئەسیر) دەیانگێڕێتەوە، بەڵگەیە لەسەر بەردەوامبوونی میرنشینەکە تا نیوەی یەکەمی سەدەی شەشی کۆچی / دوازدەی زایینی .. ئەمەش لەبەر ئەوەی هەرچەندەش میرەکانی ئەو خانەوادە فەرمانڕەوایە سەربەخۆیی میرنشینەکەیان لەدەست دابوو، بەڵام هەندێ لە میرەکانیان هێشتا جۆرە سەربەخۆییەکی خودییان هەبوو، لە هەندێ لە قەڵاکانی (دیاربەکر)، بەڵام لە ساڵی (٥٣٢ک / ١١٣٧ز) (حیسامەدینی تەمرتاشی ئیلیغازی)[١٠٥] (خاوەنی ماردین) دەستی گرت بەسەر قەڵای (هتاخ) لە وڵاتی (دیاربەکر)، کە لە هەندێ لەو میرە مەڕوانییانەی ستاند، کە پێشتر خاوەنی هەموو (دیاربەکر) بوون، ئەمەش (دوا شت بوو کە مابوویان، پاکی بۆ ئەو خوایەی زیندوو و بەردەوامەو، موڵکەکانی لە دەست ناچن)[١٠٦]، بەم شێوەیە دەبینین، ئەم دەستەی سەلجوقییەکان لە میرنشینی مەڕوانییان وەشاند، بە تەواوەتی کۆتایی پێ نە هێنا، بەڵکو میرنشینەکە توانی خۆی لێ رزگار بکات و، لە دەستی دەربچێت، تا دواتر هاتەوە پێش بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دەربکەوێتەوە.

هەرچی سەرەنجامی (ئیبنو ئەسەدی فارقی)شە، ئەوا دوای باڵکێشانی (تەتش) بەسەر (دیاربەکر) ئەو بەرەو (حەلەب) رۆیشت، ماوەیەک تیایدا مایەوە، تا کۆتایی بە ململانێکانی نێوان (تەتش) و(بەرکیارۆق) هات و، (بەرکیارۆق) کاروبارەکانی وڵاتی گرتەدەست، ئیتر بە پێی فەرمانێکی سوڵتان (بەرکیارۆق) بۆ جێگرەکەی بەسەر شاری



(حەران) لە ساڵی (٤٨٧ک / ١٠٩٤ز) لەو شارەدا ئەو شاعیرەش کوژرا، ئەمەش بە تاوانی ئەوەی، کە یارمەتی میر (ناسرولدەولە)ی دابوو، بۆ دروستکردنەوەی میرنشینی مەڕوانی، چونکە جێگری سوڵتان بەسەر (حەران)ەوە، بە سوڵتانی گوتبوو، کە ئەو شاعیرە بەر لە گەیشتنی نوێنەرانی سوڵتان بۆ (میافارقین) ئەو رێگەی بۆ (ئیبنو مەروان) خۆشکردو شارەکەی پێدابوو، بۆیە وەکو ئاماژەمان پێدا هەر لەو ساڵەدا ئەو شاعیرە کوژرا[١٠٧].

لە دوای رووخانی مەڕوانییەکان، (مەلەکشاه) بەرەو (شام) هات، بەڵام بە (مووسڵ)دا تێپەڕی، بۆ ئەوەی ئەو موڵکە فراوانەیە وەربگرێت، کە هێزەکانی دەستیان بەسەردا گرتبوو، جا کە لە باری (جەزیرە) دڵنیابوو و، عەمیدێکی بۆ سەری هەڵبژارد، بەرەو وڵاتی شام هات، چونکە هەندێ کێشە لە نێوان میرەکانی ئەو ناوچەیەدا روویدابوو[١٠٨].

کاتێک سوڵتان لە زەوییەکانی شام نزیک بوویەوە، گەیشتە قەڵایەکی پارێزراو لەو دەوروبەرە پێی دەگوترا (شەعیر)[١٠٩]، کە دەکەوتە سەر لوتکە چیایەکی بەرزو، خاوەنەکەشی میرێکی کورد بوو، (هەمەدانی)[١١٠] دەڵێت: سوڵتان (مەلەکشاه) چەندین جار سوپای بەرەو ئەو قەڵایە هەنارد، بەو مەبەستەی داگیری بکات، بەڵام هێزەکانی دەستەوسان بوون لەوە، بۆیە ناچار بوو خۆی هێرشی بێنێتە سەر، ئیتر هەموو ئەو رێگایانەی گرت کە بەرەو قەڵاتەکە دەچوون و، گەمارۆی لەسەر قەڵا توندکرد، ئەوکاتە ئەو میرە کوردە دەرکی بە نالەباری هەڵوێستی کرد، لە بەرامبەر ئەو هێزە گەورەیەی سەلجوقیان، بۆیە هات ژنەکەی کوشت، خۆیشی هەڵدایە خوارەوەی قەڵا، کە بەمە قاچێکی شکا، ئیتر گیراو هێنرایە بەر دەستی سوڵتان، سوڵتان پرسیاری لێکرد:(بۆچی خۆت بەدەستەوە نەداو، خۆت هەڵدایە خوارەوەی قەڵات)[١١١]. وەڵامیی دایەوە گوتی:(ژنێکی جوانم هەبوو، ترسام لەوەی بکەوێتە دەستی دوژمن بۆیە کوشتم، هەرچی خۆشمم کە خۆم هەڵدا، چونکە بەلامەوە بمرم باشترە، نەوەک بە دیلی بکەومە بەر دەستی ئێوە)، ئینجا (مەلەکشاه) گوتی:(لەبەردەم ئازایەتیدا سوپاکان دەشکێن، غیرەتی ئەم پیاوە وای لێکرد ژنەکەی بکوژێت، بوێریەکەشی وای لێکرد خۆی لەسەرووی قەڵاتەوە هەڵبداتە خوارەوەی)، بۆیە لەبەرامبەر ئەم ئازایەتیە کەم وێنەیە، هیچ لە بۆ سوڵتان نەمایەوە، ئەوە نەبێت ئەو

میره کورده ببەخشێت، هەروەها هەر لەسەر قەڵاتەکەشی هێشتەوە[112].

ئەم دەقەی سەروو، کە بە تەنیا خاوەن کتێبی (عجایب نامە) دەیگێڕێتەوە زێدەڕەویەکی ئاشکرای تیایە، هەروەها لە ڕاستیش دوورە، چونکە بەرگری کردنی خاوەنی قەڵاکە لە دژی سوپاکانی سوڵتان ئاساییە، بەڵام خۆی لە بەرزی قەڵاکەوە هەڵدێرابێتە خوارەوەی قەڵاو، نەشمردبێت، ئەوەیان ناچێتە ئەقڵەوە!

ئێمە بەو گوتەیەمان هەر لە بنجەدا دەقەکە بە دوور نازانین، چونکە دوورنییە سوڵتان (مەلەکشاه) خۆی هاتبێتە ئەو شوێنەی باسکراوە، گەمارۆی قەڵاکەیدا بێت و، ئەو میرە کوردەش بەرگری کردبێت، چونکە سوڵتان ئامانجی ئەوەبوو، سەرجەم هەرێمەکان بە پایەتەختی فەرمانڕەوایی سەلجوقی ببەستێتەوە، بەڵام دەڵێین بە شێوەیەکی زەق زێدەڕەوی بەسەر دەقەکەوە کراوە.

### ج- لەبەریەک هەڵوەشانەوەی میرنشینی (عەننازی)-[شاذنجانی]

لەدەرەنجامی ژێر رکێف کەوتنی بۆ سەلجوقییەکان، میرنشینی (عەننازی)ش وەکو هەریەکە لە میرنشینە کوردییەکانی دیکە، ڕووبەڕووی بارێکی خراپی ناوەخۆ بوویەوە، چونکە دەسەڵاتی سەلجوقی بەردەوام دەستیان لە کاروبارەکانی ناوەخۆی ئەو میرنشینە وەردەدا، بۆیە ئەم میرنشینە ململانێیەکی تاڵی نێوان میرەکانی بەخۆوە دیت، کە دوو بەرەیان پێکهێنا بوو، یەکیان بەرهەڵستکار بوو بۆ دەسەڵاتی سەلجوقی و، ئەوەی تریشیان پشتگیریکەر بوو لێیان[113].

زانیارییەکانی لە بارەی ئەو میرنشینە لە درێژەی قسەی مێژوونووسان لەمەڕ بووەیهی و سەلجوقییەکانەوە، یان لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی ئەو میرنشینە لەگەڵ میرنشینەکانی دیکەمان پێگەییوە، دەنا لە سەردەمی سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)دا (٤٥٥-٤٦٥ک / ١٠٦٣-١٠٧٢ز) بە هیچ شێوەیەک باس لەو میرنشینە نەکراوە، کە ئەمەش بە زۆری ڕەنگ بێت لەبەر ئەوە بووبێت، کە لەو ڕۆژگارە ئەو میرنیشنە لاواز بووبێت و، بە هۆی فراوانبوونی سەلجوقییەکان موڵکەکانی زۆر بچووک بووبێتەوە، هەروەها لەو ماوەیەدا میری ئەو میرنشینە، میر (بەدری کوڕی موهەلهیل)بووە، کە ئەویش گوێڕایەڵێکەرێکی باشی سەلجوقیان بوو و، ببووە یەک لە شوێنکەوتەکانیان، هەر سەر بە ئەوانیش مایەوەو،



لە گوێڕایەڵییان دەرنەچوو تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد لە ساڵی (٤٦٧ک / ١٠٧٤ز)[114].

لە دوای (بەدر)دا فەرمانڕەوایی کردنی میرنشینەکە کەوتە دەست (ئەبولفەوارس سەرخاب)ی ناسراو بە (ئەبولشەوک)ی کوڕی، ئەمە هاوچەرخی سوڵتان (مەلەکشاه)بوو، ئەوەشی لەبارەی بزانین، ئەوەیە: ئەو میرە تا ساڵی (٥٠٠ک/ ١١٠٦ز) هەر بە میری شازنجانییەکان مایەوە[115].

هەرچەندەش بەهۆی کەوتنی ئەو میرنشینە بۆ ژێر دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقی، لاوازی و جۆرە هەڵوەشانەوەیەک دووچاری هاتبوو، بەڵام تا ساڵی (٥١١ک / ١١١٧ز) هەر نەڕووخا[116]، بیروڕاش لەسەر ئەوەیە، کە بەو هۆیە هێڵایان ئەو میرنشینە بمێنێتەوە، چونکە ئەوەی لەو قەوارە کوردییە مابوویەوە، بە تەنیا پێشەوایەتییەکی خێڵەکی بوو، ئەم گوتەیەشمان کار لە زنجیرەی ڕووداوە مێژووییەکان ناکات، چونکە (عەننازی)یەکان هەر لەو ڕۆژەوەی سەلجوقییەکان پێیان نایە نێو وڵاتەکەیان، ئیتر سەربەخۆیی خودی خۆیان لەدەست دا، ئیتر دەسەڵات و هێز بۆ میرەکانیان نەمایەوە، بەڵکو تەنانەت لەسەرچاوەکانیشدا ئیتر هەواڵیان نابیسین، مەگەر زۆر بە کەمی نەبێت، ئەمش بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئەو میرنشینەو، بەشدارینەکردنی لە ڕووداوە سیاسییە گشتییەکان، بۆیەش سەرچاوە ئیسلامییەکان هەر تەنها بە باسکردنی دەسەڵاتی سەلجوقی واز دێنن، بەو پێیەی خۆی خاوەنی بڕیاری و دەسەڵاتە.

هەندێ هەوڵ درا بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ئەو میرنشینە گیانی بە بەردا بکرێتەوە، ئەوەتا لە ساڵی (٤٩٥ک / ١١٠١ز) میر (سەرخاب) توانی قەڵای (خەفتیدکان)[117] بگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بێگومان دوای ئەوەی کە پێشتر لە دەستی دەرهێنرابوو. لەو ساڵەی ئاماژەمان پێدا، یەک لە میرە تورکمانەکان کە ناوی (قەرابلی) بوو لە هۆزی (سەلفەر)ی تورکمانی بوو، هاتە نێو زەوییەکانی (سەرخاب)و ئاژەڵەکانی خۆی تیایدا دەلەوەڕاند، بەڵام ئەو میرە کوردە ڕێگەی لێگرت و، کۆمەڵێک لە پیاوەکانی کوشت، (قەرابلی)ش داوای یارمەتی لە تورکمانەکان کرد، بۆیە سوپایەکی گەورە هاتنە فریای و، لە شەڕێکدا لەگەڵ (سەرخاب) ڕووبەڕووبوویەوە، لە ئاکامدا ئەو میرە کوردە شکاو، دوو هەزار لە پیاوەکانی کوژران[118].

کوژرانی ئەو ژمارەیە لە شوێنکەوتوانی (سەرخاب)، واتای ئەوە دەگەیەنێت، کە (سەرخاب) سوپایەکی گەورەی هەبووبێت، بەڵام نەیتوانیبێت بەرپەرچی هێزەکانی تورکمانەکان بداتەوە، بەم تێکشکانەش (سەرخاب) بەرەو چیاکان گەڕایەوە، بەوەش (قەرابلی) و هێزەکانی دەستیان بەسەر هەموو موڵکەکانی (سەرخاب)دا گرت، بێجگە لە (دقوقا)و (شارەزوور)، کاتێکیش پارێزەرانی قەڵای (خەفتیدکان) بەو شکانەی (سەرخاب)یان بیست، نەفسیان وای بۆ رازاندنەوە کە ئەم هەلە بقۆزنەوەو، دەست بەسەر هەموو پارەو، خەزێنەکانی ئەو میرە کوردەدا بگرن[١١٩].

بیرورا وایە ئەو قەڵایە زیاتر لە دوو ملیۆن دیناری تیابوو بێت، ئەو برە پارەیەش بە بەراورد لەگەڵ ئەو سەردەمە زۆر گەورە بووە، بۆیە دەستیان بەسەرداگرتوو، دوو سەد هەزار دیناریان لێ رەوانکرد بۆ سوڵتان (بەرکیارۆق)، بەڵام وەکو دەردەکەوێت میر (سەرخاب) بەو بارە رازی نەبووە، بۆیە بە لێبڕاوی کاری بۆ وەرگرتنەوەی قەڵاکە کردووە، بە کارەکیش دوای ماوەیەکی کورت، توانی بیگەڕێنێتەوە ژێر دەستی خۆی، چونکە یەک لە پارێزەرانی قەڵاکە، هاوڕێیەکەی تری کوشت و، نامەیەکی بۆ (سەرخاب) نووسی، داوای ئەوەی لێکرد، ئەمانی پێبدات، بۆ ئەوەی قەڵاکەی بەدەستەوە بداتەوە، میریش وادەی پاراستنی ژیان و ماڵی پێدا، بەم شێوەیە (خەفتیدکان) گەڕایەوە ژێر دەستی میر (سەرخاب)، کە بێجگە لەو قەڵایە چەندین شاری دیکەشی لە ژێر دەستدا بوو، لەوانە (کەنکور)و (قەرێمسین)و (دقوقا)و (خانیجار)و (شارەزوور) و دەوروبەرەکەی[١٢٠].

وا دەردەکەوێت سەرکەوتنی میر (سەرخاب) لە باڵکیشانەوەی بەسەر قەڵای ناوبراودا، سەردەمی بووژانەوەی میرنشینەکە بووبێ سەرلەنوێ[١٢١]، دوای ئەوەی زۆربەی موڵکەکانی خۆشی لە دەست دابووە، لەگەڵ درێژەی ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو میرە کە ساڵانی (٤٦٧-٥٠٠ک / ١٠٧٤-١١٠٦ز)ی گرتۆتەوە، بەڵام سەرچاوە هەبووەکانی بەردەستمان هیچی لەبارەیەوە باس ناکەن، تەنها دوو گێڕانەوە نەبێت، یەکەمیان لەبارەی هەڵوێستی ئەو میرە عەننازییە لە ململانێکەی نێوان سوڵتان (بەرکیارۆق)و (محەمەدی کوڕی سوڵتان مەلەکشاه)ی برای، کە ئەمەش لە کاتی خۆیدا ئاماژەی بۆ دەکەین.

گێڕانەوەی دووەمیش، لە بارەی مردنی ئەو میرەیە لە ساڵی (٥٠٠ ک / ١١٠٦ز)[١٢٢]، تیایدا لە ئاماژەیەکدا ئەوە خراوەتەڕوو، کە (سەرخاب) چ سامانێکی



گەورەی هەبووە، جیا لەوەی ئاماژەمان بۆیکرد، کە گوتمان لە قەڵای (خەفتیدکان) دوو ملیۆن دیناری هەبوو، (ئیبنولئەثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت:(پارەیەکی زۆری هەبوو و، ئەسپەکانیشی نەدەژمێردران)[١٢٣]، خاوەنی (شەرەفنامە)ش زیاد لەوە دەڵێت:( خاوەنی سامانێکی گەورەو هێزێکی مەتین بوو)[١٢٤].

لە کاتێکدا میری عەننازی ئەم هەموو سامانە گەورەیەی هەبووبێت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی ئەو میرنشینە، زۆری خێرات و، هێزە ئابوورییەکانی، بەڵام ئەم سامانانە لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکەو پیاوانی میرنشینەکە بەکارنەبراون، بەڵکو میرەکان و دەسەڵاتدرانی سەلجوقی بۆ خۆیان قۆرخ کردووە.

لەگەڵ لەبەریەک هەڵوەشانەوەشی، میرنشینی عەننازی بەردەوامبوو لە فەرمانڕەواییێتی کردنی بەسەر هەندێ ناوچەی رۆژئاوای هەرێمی (چیاکان) تا رۆژی رووخانی لە ساڵی (٥١١ک / ١١١٧ز).

### د- میرنشین و دەسەڵاتە کوردییەکانی دیکە، لە سایەی دەسەڵاتە ناوەندییەکەی سوڵتان (مەلەکشاه):

لە پاڵ ئەو میرنشینانەی ئاماژەیان بۆ کرا، لە وڵاتی کورددا میرنشینانێکی تری قەوارە بچووکتر بڵاوبوونەوە، دەسەڵاتیان بچووکتربوو، هەروەها ژمارەیەک پێشەوایەتی خێڵەکیش هەبوون، جا وەکو هاتووە: سوڵتان (مەلەکشاه) هەندێ لەو میرنشینانەی رووخاند، لە هەمان کاتدا هەندێکی تری هێشتەوە، بەڵام کاری لەسەر لاوازکردنیان دەکردو، سیاسەتی لەبەرامبەر میرنشین و پێشەوایەتییە خێڵەکییەکانی دیکەشی، سیاسەتێکی ناجێگیرو لە یەکجیابوو.

ئەوەی تایبەت بە هۆزی (هەزبانی)یە، وەکو دەزانرێت تاکەکانی ئەو هۆزە، میرنشینێکی بچووکیان لە (ئەربل)و دەوروبەری دامەزراندو، لە چوارچێوەی داننان بە سوڵتانی سەلجوقی لە ماوەی سەدەی پێنجەمی کۆچی / یازدەی زایینی، بە شێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتییان کرد[١٢٥].

ئەوەی تێبینی دەکرێت، ئەو زانیارییانەی تۆمار کراون لە بارەی میرنشینی (هەزبانی)، لە چەند ئاماژەیەکی خێرای (ئیبنولئەسیر)و (ئیبنولمستەوفی)ی خاوەنی (تاریخ أربل) تێناپەڕن و، ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە ئەو میرنشینە لە سەردەمی سوڵتان (مەلەکشاه)و دوای ئەویش، هەر ماوەو، پارێزگاری لە دەسەڵاتەکەی خۆی کردووە، وەکو دەریش دەکەوێت، سەلجوقییەکان هەوڵیان نەداوە ئەو میرنشینە بڕوخێنن، چونکە هەر لە بنجدا ئەو میرنشینە مەترسی دروستنەدەکرد لەسەر بوون و دەسەڵاتیان لە ناوچەکە.

چونکە زۆرجار شڵەژان و فەوزاو نائارامی سیاسی، بە هۆی ململانێی نێوان میرەکانی هەردوو هۆزی (هەزبانی)و (حەکیمی) لە سەر دەسەڵات، لە ناوەخۆی ئەو میرنشینە سەریهەڵدەدا[١٢٦]، بۆیە بەم شێوەیە میرنشینەکە ئیتر لە باریدانەدەبوو، مەترسییەکی ئەوتۆ بۆ سەر سەلجوقییەکان دروست بکات، هەر بۆیەش (مەلەکشاه) کاری نەکرد لەسەر ڕووخاندنی.

لە درێژەی خوێندنەوەی ڕووداوەکاندا، وا دەردەکەوێت، کە میرە هەزبانییەکانی (ئەربل) گوێڕایەڵی سەلجوقییەکانیان کردووەو، سۆزی خۆیان بۆ ڕاگەیاندوون، لەبەرامبەریشدا سەلجوقییەکان بە پێویستیان نەبینیوە سوپا بۆ (ئەربل) بێنن، هەروەکو چۆن لە دەرهەق میرنشینە کوردییەکانی تر ئەوەیان کردووە، لەوەش زیاتر، میرە هەزبانییەکان هاتوونەتە نێو سوپای سەلجوقی و، خزمەتگوزارییەکانی خۆیان بۆ پێشکەش کردووە، ئەوەتا میر (فەزل کوڕی ئەبیلهیجای هەزبانی) یەک لە یاوەرانی سوڵتان (مەلەکشاه) بووە لە کاروانەکەیدا بۆ وڵاتی شام، لە ڕێگاش سوڵتان ناوبراوی وەکو نێردراوێک هەڵبژاردووە، لە لایەن خۆیەوەی، بۆ میری مەڕوانی[١٢٧].

بەردەوامبوونی فەرمانڕەوایی هەزبانی لە (ئەربل)، بووە هۆی بەشداریکردنی ئەو میرنشینە لەو ڕووداوانەی بەسەر ناوچەکەدا هاتن، لە ساڵی (٤٨٩ک / ١٠٩٥ز) خاوەنی (ئەربل) میر (ئەبولهیجای هەزبانی) بوو، خۆی خزاندە نێو ئەو ململانێیە ناوەخۆییەی نێوان میرە عەقیلییەکانی خاوەنانی (مووسڵ)[١٢٨]، هەروەها زۆرجاری تریش میرەکانی ئەو میرنشینەکوردییە، هاتوونەتە نێو کێشەکانی نێوەخۆی عەقیلییەکان و، بوونەتە لایەنێکی کێشەکە، ئەگەرچی ئەو مەسەلەیەش پەیوەندی بە میرنشینەکەی ئەوانەوە نەبوو.



دیسانەوە میرەکانی ئەو میرنشینە ڕۆلیان هەبوو لەو ململانێیانەی لەنێوان فەرماندە سەلجوقییەکان دروستبوو، ئەوەتا لە ساڵی (٥٠٠ک / ١١٠٦ز) میر (ئەبولهیجاء) ڕۆڵێکی زۆر گرنگی یاریکرد لەو ململانێیەی نێوان دوو لە فەرماندە سەلجوقییە بە یەک کێبرکێ کەرەکان لە سەر شاری (مووسڵ)، کە ئەوانیش (جگەرمش)و (جاولی سقاو) بوو[١٢٩]، لە ماوەی ئەو ململانێیەشدا، ئەو میرە کوردە بە لێبڕاوی هەوڵی بۆ ئەوە دەدا، کە ئەو مەترسییەی ڕوو لە وڵاتەکەی دەکات، بە دووری بخاتەوە، نەبادا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتیان.

سەلجوقییەکان ئەوەیان دەزانی کە هەزبانییەکان دەسەڵات و هێزێکی گەورەیان هەیە لە (ئەربل)و دەوروبەرەکەی، بۆیە وایان بە باشی بینی، لەسەر میرنشینەکەی خۆیان بیانهێڵنەوەو، دانیان پێدا بنێن، هەروەها ڕێگەیان بدەن لەو ناوچەیە فەرمانڕەوایی بکەن، لەبەرامبەر ئەوەشدا بەوەندەیان واز هێنا کە هەزبانییەکان سۆزو گوێڕایەڵی خۆیانیان بۆ پێشکەش بکەن[١٣٠].

بەڵام ئەو سەربەخۆییەی ئەو میرنشینە هەیبوو، زۆری درێژە نەکێشا، چونکە لە پڕێکدا ڕووخا، کە لە ڕاستیدا دەرکەوتنی ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) گەورەترین کاریگەری هەبوو لەسەر ڕووخانی ئەو میرنشینە، چونکە ئەم ئەتابەکە دەستی کرد بە فراوانبوون لەو ناوچەیە، بەوەش لە ساڵی (٥٢٦ک / ١١٣١ز) هەولێر کەوتە چوارچێوەی زەوییەکانی[١٣١].

هەرچی میرنشینی جاوانییە لە ناوچەکانی (بەندنیجین)و (نەهراوان)و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی (دیجلە)، کە شان بە شان لەگەڵ میرەکانی (مەزیدی) فەرمانڕەواییان کردووە، ئەوا بەشی هەرەگەورەی مێژووی ئەو میرنشینە کوردییە، پەیوەندی بەهێزی بە مێژووی (مەزیدی)یەوە هەیە، ئەوەی تایبەتیشە بە پەیوەندییەکانی (جاوانی) لەگەڵ سەلجوقییەکان –ئەوا لە پێشتردا ئاماژەمان دا– بە پەیوەندی میر (ئەبولفەتح کوڕی ورامی جاوانی) (٤٠٣-٤٥٥ک ١٠١٢/-١٠٦٣ز) لەگەڵ سوڵتان (تەغرول بەگ)، کە لە دوای هەڵوێستە دژایەتیەکەی ئەو میرە لە بۆ سوڵتان، بوو بە یەک لە سەرکردە ناودارەکانی[١٣٢].

لە ماوەی سەردەمی سوڵتان (مەلەکشاه)یشدا، میری جاوانییەکان، میر (سەیفودەولە

کوڕی ئەبو نەجم کوڕی بەدر کوڕی ورام)بوو (٤٥٥-٤٧١ک / ١٠٦٣-١٠٧٨ز)[١٣٣]، کە لە بارەیەوەی هیچ شتێک نازانین پەیوەندی بە سروشتی پەیوەندییەکانیەوەی هەبێت لەگەڵ سەلجوقییەکان، چونکە مێژوونووسان بۆ ماوەیەکی نزیکەی سێ یەکی ئەو سەدەیە باس لە هەواڵەکانیان ناکەن، ئەمەش بە بۆشاییەکی گەورە دەژمێردرێت لە مێژووی ئەو هۆز، کە لەبیرکراوە.

لە ماوەی دووەمی فەرمانڕەوایی (مەلەکشاه)دا، میر (ورام کوڕی ئەبی فیراس کوڕی ورام) (٤٧١- پاش ٥٠٠ک / ١٠٧٨-١١٠٦) فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی دەکرد[١٣٤]، بەڵام لە بارەی ئەو میرەش هەروەکو میرەکەی پێشەخۆی هیچێک نازانین لە بارەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەلجوقییەکان، هێندە هەیە لەگەڵ ئەو نادیارییەش لە مێژووی ئەو میرنشینە، بەڵام تا ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچی / دوازدەی زایینی ئەو میرنشینە هەر پارێزگاری لە فەرمانڕەوایەتیەکەی خۆی کردبوو، دەشکرێت ساڵی (٥٥٨ک / ١١٦٣ز) بە ساڵی دروستی کەوتنی دەسەڵاتی (بەنی ئەسەد)و (جاوانی)یە هاوپەیمانەکانیان بژمێرین، چونکە لەو ساڵەدا خەلیفەی عەبباسی (موستەنجیدبیللا) (٥٥٥-٥٦٦ک / ١١٦٠-١١٧٠ز) فەرمانی دەرکرد کۆتایی بە هەردوو ئەو میرنشینانە بهێندرێت[١٣٥].

لە پاڵ میرنشینە کوردییە گەورەو بچووکە خاوەن دەسەڵاتە سنووردارەکان، هەروەها پێشەوایەتی خێڵەکی نیمچە سەربەخۆش لە ناوچە جیاوازەکانی وڵاتی کورددا پەرش و بڵاوبوون، بە وێنەی پێشەوایەتی بەشنەوی لە قەڵای (فێنک)[١٣٦]، کە هەر لە سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زایینیەوە[١٣٧] فەرمانڕەوای ئەو قەڵایەیان لەژێر دەستدا بوو، هەروەها پێشەوایەتی هەکاری هەبوو لە عەمادییە و چیای هەکاری، لەگەڵ پێشەوایەتی مەهرانی لە شاروچکەی (حەسەنیە) (زاخۆ)و، پێشەوایەتی حەمیدی لە قەڵاکانی (عەقر)و (شوش)، ئەوەی تێبینی دەکرێت، دەسەڵاتی سەلجوقی لە ماوەی فەرمانڕەوایی سوڵتان (مەلەکشاه)دا هەر بە رووخاندنی قەوارە گەورە خاوەن شان و دەسەڵاتدارەکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا وازی هێنا، بەڵام چاوپۆشی لە قەوارە بچووک و پێشەوایەتیە خێڵەکیەکان کرد، بۆیە ئەو پێشەوایەتیانە هەر مانەوە. ئەوەتا (بەشنەوی)یەکان مانەوە فەرمانڕەواییتی قەڵای (فێنک)یان کرد، تا سەدەی حەوتی کۆچی/ سێزدەی زایینی ..



(قەزوینی) کە لە (٦٨٢ک / ١٢٨٣ز) کۆچی دوایی کردووە، لە بارەیەوەی دەڵێت: (قەڵایەکی بۆ خۆی سەربەخۆیە .. سێ سەد ساڵەو لە دەست کوردە بەشنەوییەکانە، کە خەڵکێکن پیاوەتی و دەمارگیرییان هەیە)[١٣٨]، لەوانەشە مانەوەی پێشەوایەتیکردنی ئەو قەڵایە لە دەست تاکەکانی ئەو هۆزە، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ئەوان لەنێو خۆیان یەکگرتوو و هاوکاری یەک بوون، چونکە سەر بە یەک عیرق بوون، هەر ئەوەشە یارمەتی مانەوەیان و بەردەوامی فەرمانڕەواییەکەیانی دا، بۆ ئەم هەموو ساڵە درێژە، لە گوتەکانی (ئیبنولئەسیر) هەروەها ئەوەش دەردەکەوێت، کە ئەو هۆزە لە هەوڵەکانیدا لەپێناو پارێزگاریکردن لە دەسەڵاتەکەی سەرکەوت، لەگەڵ هەموو ئەو فشارانەش کە دەخرایە سەری جا لە لایەن سەلجوقییەکانەوە بووبێت، یان لە لەلایەن ئەتابەکییەکان[١٣٩].

هەرچی پێشەوایەتییە خێڵەکییەکانی دیکەی وەکو (هەکاری)و (مەهرانی)و، (حەمیدی)شن، هەموو ئەوانە هەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشی کۆچی/ دوازدەی زایینی هەرەسیان هێناو کۆتایی بە دەسەڵاتەکەیان هات، چونکە لە ساڵی (٥٢٨ک / ١١٢٣ز) ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) توانی بە شێوەیەکی یەکجارەکی کۆتایی بە هەمووان بهێنێت.

بەم شێوەیە دەکرێت، بگوترێت: لەگەڵ سیاسەتە ناوەندییەکەی سەلجوقییەکان و (مەلەکشاه)دا، کە بووە هۆی رووخانی میرنشینە کوردییەکان، کورد هێشتا هەر توانیان پارێزگاری لە هەندێ مۆڵک و دەسەڵاتیاندا بکەن .. بۆ وێنە (شەدادی)یەکان وەکو میرنشینێک لە ساڵی (٤٦٨ک / ١٠٧٥ز) رووخان، بەڵام لکێکی ئەو خانەوادە فەرمانڕەوایە تا ساڵی(٥٩٥ک / ١١٩٨ز)یش هەر فەرمانڕەواییتی (ئانی)ی دەکرد .. (رووادی)یەکانیش بە رۆڵی خۆیان لە ساڵی (٤٦٩ک / ١٠٧٦ز) گەڕانەوە، چونکە میر (ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وەهسوزان) سەرکەوت لە دامەزراندنی میرنشینێکی سەربەخۆ بە ناوی خۆی لە (ئازەربێجان) لە ساڵی (٥٠١ک / ١١٠٧ز) .. بە هەمان شێوە میرنشینی مەڕوانیش کە لە ساڵی (٤٧٨ک / ١٠٨٥ز) رووخا، بەڵام هەندێک لە میرو تاکەکانی خانەوادە فەرمانڕەواکەی توانییان هەندێ ناوچەی دەسەڵاتی پێشوویان بگێڕنەوە ژێردەسەڵاتی خۆیان و، تا ساڵی (٥٣٢ک / ١١٣٧ز)یش هەر لەبەر دەستی

خۆیان مایەوە .. میرنشینی (عەننازی)ش ئەگەرچیش لاواز و لەبەریەک هەڵوەشاوەبوو، هەروەها ئەو میرنشینە کوردیەش کە لە (لوڕستان) فەرمانڕەوایی دەکرد، ئەویش هەر مایەوە، چونکە (ئیبنولفوتی) کە ژیانی میر (هەزار ئەسپ کوڕی بەنکیری کوڕی عیازی) کوردیی نووسیوە، لە بارەیەوەی دەڵێت: (و لاتەکەی شورە پارێزراوە، دەستی دوژمنانی پێناگات، لێی بدەن، ئێستاش لە دەستی منداڵەکانیەتی)[١٤٠].

**دووەم: فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە وڵاتی کورد، لە دوای رووخانی میرنشینەکان.**

سەلجوقییەکان دوای ئەوەی کۆتاییان هێنا بە دەسەلاتی میرنشینە سەربەخۆکان و لەنێویشیان میرنشینە کوردییەکانی نێو چوارچێوەی دەوڵەتەکەیان، باری ناوەخۆیی خۆیان و دەزگا کارگێڕیەکانیان ڕێکخست، بەلام ئەوەی لەم بابەتە بکۆڵێتەوە رووبەڕووی ئاستەنگی لێکجیا دەبێتەوە، چونکە ماددەیەکی مێژوویی لەم بارەوە دەست ناکەوێت، لێرەشدا پرسیارێک خۆی زەق دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا سەلجوقییەکان سیستەمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی خۆیان لەسەر بنەمای ئەو سیستەمە کۆچەریەیان دامەزراند، کە لەوکاتەی لە وڵاتی ئەو دیوی زێ بوون هەیانبوو؟ یان گۆڕان و پێشکەوتنیان بەسەردا هێنا؟

بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەکرێت بگوترێت: دەرخستنی رایەکی دروست لەم بارەیەوە شتێکی قورسە، چونکە کێشەکە لەوەدا خۆی دەنوێنێت، کە سەرچاوە ئیسلامییەکان جەختیان نەخستۆتە سەر ئەو لایەنانەی تایبەتن بە سیستەمی فەرمانڕەوایی و کارگێڕییان، چونکە زۆربەی گرنگیدانەکانی ئەو سەرچاوانە بۆ رووداوە سیاسی و سەربازییەکان بووە، بۆیە کاری لێکۆڵەر لە دەرخستنی رایەک لەم بارەیەوە قورس دەبێت.

جا ئەگەر ئاماژەکان لە بارەی سیستەمی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە بەغدای پایتەختی خەلافەت و شارەگەورەکانی ژێر دەستیان وەکو (ئەسفەهان)و (رەی) بەم شیوەیە کەم بن، ئەی دەبێت ئەم ئاماژانە لە بارەی کوردو ولاتی کوردان چۆن بێت، کە زۆربەی مێژوونووسان خۆیان بە دوورگرتووە لەوەی کەوا قسەی لە بارەوە بکەن، بە شێوەیەک خەریکە ئەو دەقانەی لە بارەی سیستەمی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە هەرێمە کوردییەکان



پێمان دەگەن، لە هەندێ هەواڵی کەم تێپەڕ نەکەن، بەلام دەکرێت پشت بەم بەشە بچووک و کەمەی زانیاریە ببەسترێت و لەگەڵ هەندێ راڤەکردن و دەرکێشان لە ماوەی خۆێندنەوەی سەرچاوەکان، بە هەمووویانەوەش بتوانرێت، وێنەیەکی روون لە بارەی سروشتی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان لە ولاتی کورددا لە دوای رووخانی میرنشینەکان، بخرێتەڕوو.

دەکرێت بگوترێت: کە کەمی ئاماژە مێژووییەکان بۆ ئەو سیستەمانە لە هەرێمە کوردییەکان، واتای هەر نەبوونیان ناگەیەنێت، چونکە لە ماوەی ئەو بابەتە تایبەتەی[١٤١] لە پێشوودا باسمان لێوەکرد، لە بارەی ئەو سیستەمانە بەر لە رووخانی میرنشینەکان، بینیمان دەسەلاتی سەلجوقی ئەگەرچیش فەرمانڕەوایەتی بەدەست دەسەلاتە فەرمانڕەوا کوردەکە هێلابووەوە،بەلام لە هەمان کاتدا کاری بۆ ئەوە دەکرد، بەشێوەیەکی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، ئەو هەرێمانە بە دەسەلاتی ناوەندیی ببەستێتەوە،، بۆیە فەرمانبەرە کارگێڕی و سەربازییەکان وەکو (شەحنە)و (عەمید)و بێجگەی ئەوانەشیان دەناردنە سەرجەم شارەکان، جا لە پێش رووخانی میرنشینەکان، میرو پێشەوایانی هۆزە کوردییەکان لە ولاتی خۆیان فەرمانڕەوابوون، لە پاڵیشیان کۆمەڵێک پایەی وەکو (وەزارەت)و (حجابة)و (داد)و (حسبە) و بێجگەی ئەوانەش هەبوون[١٤٢]، ئینجا لەگەڵ بوونی ئەو پۆستانەش، دەسەلاتی سەلجوقی فەرمانڕەواییێکی سەربازی و، یەکێکی تریشی وەکو بەرپرسی کارگێڕی بۆ فەرمانڕەوایی کردن لەو هەرێمانەدا دەنارد.

وەکو تێبینی دەکرێت، زۆربەی ئەو پایەو پۆستانە دوای رووخانی میرنشینەکانیش هەر مانەوە، چونکە لە راستیدا رووخانی میرنشینەکان بە واتای کۆتاهاتنی رێکخستنەکانی پێشوو نایێت، کە لە شوێنیاندا رێکخستنی نوێ دانرابن، پەیوەندییان بەوەی پێشە خۆیان نەبووبێت، بۆیە دەکرێت ئاماژە بەوە بدەین، کە سەلجوقییەکان دوای ئەوەی کۆتاییان بە دەسەلاتی سیاسی کورد هێنا لە ولاتەکەی، سیستەمی نوێیان بۆ فەرمانڕەوایی دانەهێنا، بەڵکو سیستەمە کۆنە پیادەکراوەکەیان بە کارەکی کردەوە سیستەمی فەرمانڕەوایی خۆیان.

بۆ وێنە پۆستی (شەحنە) واتە (فەرمانڕەوای سەربازی)، هەروەکو خۆی مایەوە، دەدرا بە سەلجوقییەک بۆ ئەوەی لە رووی سەربازییەوە هەرێمەکە بەڕێوەببات، زیاد لەوە پۆستی

(عەمید)یش (بەرپرسی کارگێڕی) شان بە شانی (شەحنە) مایەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەم هەرێمانە فەرمانڕەواییێکی سەربازی و یەکێکی تری کارگێڕی بەڕێوەی دەبردنەوەو راستەوخۆ سەر بە سوڵتان بوون، لە کاتێکدا هەرێمەکە پێشتر لەلایەن میرێکی کوردو ئەو دوو فەرمانڕەوا سەربازی و کارگێڕییەی سەلجوقیان بەڕێوەدەبرا، بەڵام دوای رووخانی میرنشینەکان، ئێتر ئەم سیستمە بوونی نەما.

سوڵتان (مەلەکشاه) بە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە دامودەزگاکانی فەرمانڕەوایی گرنگییەکی تایبەتیان هەیە لە پارێزگاری کردنی ئاسایش و ئارامی، گرنگییەکی گەورەی بەم دامودەزگایانەدا، زۆر زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی شێوازێکی گونجاو بۆ سیستمی فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمانە بدۆزێتەوە، کە سەلجوقییەکان باڵیان بەسەردا کێشابوون، (راوندی) لە ئاماژەیەکیدا جەخت لەسەر ئەو رایەمان دەکاتەوەو دەڵێت: (باوانی سوڵتان مەلەکشاه کەوتنە دوای فەتحکردنی جیهان، بەڵام کە نۆرە هاتە سەر ئەو، کەوتە دوای بەڕێوەبردن و ئاوەدانکردنەوەی)[١٤٣]، هەروەها لە سەر ئەوەش سوور بوو، کە کەسانی لێهاتوو هەڵبژێرێت بۆ گرتنەدەستی پۆستە کارگێڕییەکانی دەوڵەتەکەی، ئەوەتا (لە سەردەمی ئەو چینێکی نووسەری باش دروستبوون، پۆستەکانیان لک و پۆپی لێبووەوە مووچەیان بۆ زامنکردن، دەرگاکەشی هەمیشە کراوەبوو، بۆ سەرجەم لێهاتوو و زاناکان ... هەریەکەی بۆ بە والی بوون بشیابوا، دەیکردە والی، هەر یەکێکیشی ببینیبوایە شایانی ئەوەیە لە شوێنەکەیدا بەرزبکرێتەوە، بەرزیدەکردەوە، هەر یەکێکیشی بدیبوایە سوود لە زانستەکەی وەردەگیرێت، دەوڵەمەندی دەکرد).[١٤٤]، (ئیبنولقەلانسی) زیاد لەوە دەڵێت: (بۆ دادگەری و رەوابینی -ئینساف- رێگەی باوکە دادگەرەکەی گرت، جێگرەکانی بە رێکی خستەسەر شارو شاروچکەکان و، ئەوانەی جێی متمانەشی بوون، بۆ پاراستنی ماڵ و سامانەکانی دانان)[١٤٥].

بێگومان چەند هۆیەک زۆر یارمەتی (سوڵتان)یاندا، لە دەستکردنی گرنگیدانەکانی بە سیستمی فەرمانڕەوایی لەنێو دەوڵەتەکەی و، لەو سەرکەوتنەی کە بە دەستی هێنا، لە توندکردنی دەسەڵاتەکەی بەسەر هەموو ئەو هەرێمانەی سەر بە دەسەڵاتە ناوەندییەکەی بوون، دەشێت لە پێشینەی هەموو ئەو هۆیانەش بوونی (نیزامولمەلیک)ی وەزیری بێت لە تەکیدا، چونکە ئەو وەزیرە لە هەردوو بواری سیاسی و کارگێڕی زۆر بە توانا و لێزان بوو،



کە ئەمە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە سەرخستنی ئەزموونی سەلجوقی لە سەپاندنی سیاسەتە ناوەندییەکەیان، چونکە دوای رووخاندنی فەرمانڕەوایی میرنشینە سەربەخۆیەکان، جیهانێکی ئیسلامی یەکگرتوو دروستبوو، بۆیە سەردەمی (مەلەکشاه) دوا سەردەمی بووژانەوەو پێشکەوتن بوو، لە مێژووی ئیسلامیدا[١٤٦].

سوڵتان (مەلەکشاه) لەگەڵ گرتنەدەستی دەسەڵاتی لە ساڵی (٤٦٥ک/ ١٠٧٢ز) بەڕێوەبردنی هەموو کاروبارەکانی وڵاتی دایەدەست وەزیرەکەی (نیزامولمەلیک)[١٤٧]، ئەوەتا سوڵتان بە وەزیرەکەی گوت: (کاروبارەکان هەر هەموویان، گەورەو بچووکیانم بۆ تۆ گەڕاندەوە، تۆ باوکی، سوێندی بۆ خواردو چەند (ئەقتاع)[١٤٨] پارچە زەویانێکی زیاد لەوەی هەیبوو، لە نوێ بۆی بڕیەوە، پۆشاکی میرینی تایبەتیشی پێدا، چەند نازناوێکیشی پێدا، لەنێویان یەکێکیان نازناوی (ئەتابەک)[١٤٩]بوو ... (ئەویش لە ئازایەتی و لێهاتوویی و باشی هەڵسوکەوتەکانی، ئەوەی پێشان دا کە بەهۆیانەوەی بە ناوبانگ بوو)[١٥٠].

وەزیری ناوبراو دوای ئەم داننانەی سوڵتان لە بۆی، دەستیکرد بە رێکخستنی کاروبارەکانی وڵات، یاسای گەڕاندەوەو وڵات و هەرێمەکانی ئاوەدانکردەوە، زۆربەی کارەکانیشی سەرکەوتوو بوون، لەوانەیە نهێنی ئەو سەرکەوتنەشی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە وەزیر سەبارەت بە کارگێڕی و فەرمانڕەواییتی ئەو هەرێمانەوە پیشنیاری دەکرد، کە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی و هەرێمە کوردییەکانیش لە چوارچێوەیان بوو، چونکە وڵاتی کورد بەتاڵ بوو لە میرنشینە سەربەخۆکان و، دەسەڵاتی کوردی بە تەنیا لە هەندێ قەوارەی بچووک و دەسەڵاتی دیاریکراو کورتبووەوە، بۆیە ئەو ناوچانە راستەوخۆ کەوتنە چوارچێوەی دەوڵەتی سەلجوقی.

لە خوارەوە هەوڵ دەدەین وێنەیەکی روون لە بارەی سروشتی فەرمانڕەوایی سەلجوقی دوای رووخانی میرنشینەکان، لە هەرێمە کوردییەکاندا بخەینەبەرچاو.

### أ- فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە هەرێمەکانی (ئاران)و (ئازەربێجان).

دوای رووخانی هەردوو میرنشینی شەدادی و روادی، سەرچاوەکان ئاماژە بە سروشتی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە هەردوو هەرێمی (ئاران)و (ئازەربێجان) ناکەن.

ئەوەی تایبەتە بە (ئاران)، سوڵتان (مەلەکشاھ) لە ساڵی (٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز) ئەم هەرێمەی بۆ یەک لە سەرکردەکانی بڕیەوە، پێی دەگوترا (سەرهەنگ ساوتکین)[١٥١]، بەمەش سەرەتایەکی بۆ دەرکەوتنی سیستمی (ئەقتاع) دانا لە ماوەی مێژووی سەلجوقی، چونکە ئەو دەوڵەتە لەسەر فراوانبوونی دروستبوو بوو، بۆیە پێویستی دەکرد، فەرمانبەرە کارگێڕییەکانی وەکو (میر)و (والی)و بێجگەی ئەوانیشیان تێدا دابمەزرێنن، ئەو فەرمانبەرانەش دەبوو مووچەی خۆیان لە دەوڵەت وەربگرن، بۆیە گەیشتنە چارەسەرێک بۆ ئاسانکردنی ئەو مەسەلەیە، ئەویش دابەشکردنی (ئەقتاع)ەکان بوو، چونکە ئەو (ئەقتاع)ە لە بری مووچەی نەختی بوو[١٥٢]، دەسەڵاتی سەلجوقی بۆ گەورە میرو فەرمانبەرە کارگێڕیەکانی وەکو (والی)و (شەحنە)و (فەرماندە سوپا)کانی دەبڕیەوە[١٥٣]، یەکەم کەسیش کە لە سەردەمی سەلجوقی ئەو سیستمەی داهێنا، (نیزامولمەلیک)ی وەزیر بوو[١٥٤]، چونکە دەرکی بە ناهاوسەنگی سیستمی دارایی دەوڵەت کردبوو، کە داب وابوو، لە هەرێمەکاندا پارە دەهێنراو بەسەر سەربازەکاندا خەرج دەکرا، بەڵام وەزیر وای بینی، کە لەبەر ناهاوسەنگییان پارە لە هەرێمەکاندا دەست ناکەوێت، بۆیە هات ئەو وڵاتانەی وەکو (ئەقتاع) بەسەر سەربازەکاندا دابەشکرد[١٥٥].

بەمەش (ساوتکین) بووە خاوەنی ئەو (ئەقتاع)انەی کە خۆیان لە (ئاران)دا دەنواند، کە لە ساڵی (٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز) وەریگرتن و وای لێهات، لە بری میرە شەدادییەکان بووە خاوەنی دەسەڵات لەو هەرێمە، لە پاڵ بوونی (ساوتکین)یش وەکو فەرمانڕەواییێکی سەلجوقی، دەسەڵاتی سەلجوقی سوور بوو لەسەر ئەوەی فەرمانبەرانی دیکەشی بۆ بنێرێت، بۆ فەرمانڕەوایی هەرێمەکە، بە وێنەی (شەحنە)و (عەمید)، ئیتر سوڵتان لە رێگەی فەرمانڕەوای سەربازی و بەرپرسی کارگێڕیی لە یەکەیەکەی هەواڵەکانی باری ناوەخۆی هەرێمەکانی دەوڵەتەکەی بە بەردەوامی ئاگاداربوو، ئەم دوو پۆستانەش لە دوای رووخانی میرنشینەکانیش هەر بەردەوام بوون.

هەرچی تایبەتە بە هەردوو هەرێمی (ئاران)و (ئازەربێجان) هیچ دەقێکی مێژووییمان لە دەستدا نییە، پشتگیری ئەو گوتەیەی سەروومان بکات، بەڵام ئەوەی جەختی لەسەرەوە کرا بێت ئەوەیە، کە سەلجوقییەکان زووتر فەرمانبەرانی خۆیان رەوانکردووە بۆ بەڕێوەبردنی هەردوو هەرێمەکان، ناشچێتە ئەقڵەوە لە کاتی دەسەڵاتی میرنشینەکان ئەم دوو پۆستە



هەبووبن و دوای رووخانیان نەمابن، بۆیە بەڕێوەبردنی ئەم دوو هەرێمە لەلایەن فەرمانبەرانی سەلجوقی شتێکی ئاسایی بووە.

بەڵام -وەکو ئاماژەمان پێدا- شاڵاوی (مەلەکشاھ) بۆ سەر هەرێمی (ئاران) نەبووە هۆی ئەوەی بە تەواوی کۆتا بە دەسەڵاتی شەدادیەکان بهێنرێت، چونکە ئەم خانەوادە کوردیە کۆن بوون و هەندێ لە شارەکانی ئەو هەرێمە موڵکی خۆیان بوو، بۆیە شاری (ئاران)و دەوروبەرەکەی تا دوای سەردەمی (مەلەکشاھ)یش لە ساڵی (٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز) هەر بە دەست خۆیان مایەوە[١٥٦].

ئەوکاتەش کە تاکەکانی بنەماڵەی سەلجوقی، خەریکی ناکۆکیە ناوخۆیی و ململانێکانیان لەسەر دەسەڵات بوون، وایلێهات خانەی دەسەڵاتی شەدادی ساڵ لەدوای ساڵ گەورەتر دەبوو، بۆیە میرنشینەکە تا کۆتاییەکانی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی هەر مایەوە، بەم شێوەیەش بەڕێوەبردنی (ئاران) دابەش ببووە سەر هەردوو دەسەڵاتی سەلجوقی و کوردی (شەدادی)، بەڵام بەشی گەورەتری هەرێمەکە بە دەست سەلجوقیان بوو، هەر لە ژێر دەسەڵاتیشیان مایەوە، هەر لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی تر وەکو (ئەقتاع) بۆ یەکێک لە میرەکانی ئەو دەوڵەتە دەبەخشرا.

هەمان گوتەی پێشوو بۆ هەرێمی (ئازەربێجان)یش راستە، کە هەر لە تەنیشت هەرێمی (ئاران)یشەوە بوو، چونکە میرنشینی (رووادی)ش لە سەردەستی هەردوو سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان)و (مەلەکشاھ)ی کوڕیشی بە بەر شاڵاوێکی بە ئازار کەوت، بەڵام قەدەر وای بۆ (ئەحمەدیلی کوڕی ئیبراهیم)ی حەفیدی میر (وەهسوزان) هێنایە پێش، بتوانێت کەمێک هەیبەت بۆ میرنشینی رووادی بگەڕێنێتەوە.

لێکۆڵەران لەو بڕوایەدان، کە ونبوونی میرە رووادییەکان لەسەر شانۆی رووداوەکان، لە ماوەی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، بۆ تۆکمەیی رێزەکانی دەوڵەتی سەلجوقی دەگەڕێتەوە لە سەرەتاکانی دروستبوونی، بە تایبەت لەسەردەمی هەرسێ سوڵتان (تەغرول بەگ)و (ئەلب ئەرسەلان)و (مەلەکشاھ)، هەروەها لەو رۆژگارەدا فەرمانڕەوا خۆجێییەکانی (ئازەربێجان) هیچ کاریگەری و دەسەڵاتێکیان نەبوو لە بەڕێوەبردنی هەرێمەکەدا، بەڵکو بە راستەوخۆیی کەوتبوونە ژێر رکێفی باڵکێشانی بەهێزی سەلجوقییەکان و (ئازەربێجان)ببووە سەنتەری دەسەڵاتی سەلجوقی[١٥٧].

لە هەندێ لە دەقە مێژووییەکاندا ئەوەمان دەکەوێتە بەرچاو، کە هەندێ لە میرو سەرکردەکانی (سەلجوقیان)، (ئەقتاع)ی فراوانیان هەبوو لە (ئازەربێجان)، ئەمەش راڤەی چەندێتی هاتنە ناوەوەی دەسەلاتی سەلجوقی دەکات، بۆ هەرێمەکە، لەسەر حسێبی زەوی و موڵکەکانی میرنشینی روادی، ئەوەتا میر (ئەنر) کە یەک لە میرەکانیان بوو چەند (ئەقتاع)ێکی لە (ئازەربێجان) هەبوو[١٥٨]، هەروەها میر (محەمەد کوڕی باغی سیان)یشیان چەند (ئەقتاع)ێکی لە هەمان هەرێمدا هەبوو، ئەو (ئەقتاع)انە پارەیەکی چاکیان بۆ زامن دەکرد، هەر بەو پارەیە چەند قوتابخانەیەکی لە (ئەنتاکییە) دروستکرد[١٥٩].

ئەوەی تێبینی دەکرێت، سولتانە سەلجوقییەکان ئەو (ئەقتاع)انەیان بۆ ئەو میرو کەسانە دەبڕیەوە، کە سەربەخۆیان بوون، یان خزمەتێکی دیاریکراویان پێشکەش کردبوون، ئەم (ئەقتاع)انەش پارەیەکی باشیان لێ وەدەست دەکەوت، چونکە هەرێمە کوردییەکان ناسراون بە سەرچاوە دارایی و ئابوورییە زۆرەکانیان[١٦٠].

**ب- فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە (دیاربەکر)و (میافارقین).**

لە کاتێکدا کە سەرچاوە مێژووییەکان هیچ ئاماژەیەکیان نەکردووە، لە بارەی سروشتی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە هەردوو هەرێمی (ئاران)و (ئازەربێجان)دا، لەدوای رووخانی میرنشینەکانی (شەدادی)و (روادی)، ئەوا ئاماژەی بەهێز لەبارەی ئەو سیستمانەوە هەن، لە (دیاربەکر)و (میافارقین) لە دوای نەمانی میرنشینی مەڕوانی تیایان، لە ساڵی (٤٧٨ک/ ١٠٨٥ز)، هۆی بوونی ئەو دەقانەش بۆ بوونی مێژوونووسێکی وەکو (فارقی) دەگەڕێتەوە، کە هەڵساوە بە تۆمارکردنی مێژووی میرنشینی مەڕوانی، هەر لە دامەزراندنیەوە، تا رووخانی، هەر بەوەش وازی نەهێناوە، بەڵکو لە کتێبەکەیدا ئاماژەی زۆر گرنگی لە بارەی باری ئەو ناوچەیە، لە دوای رووخانی میرنشینەکەش تۆمارکردووە، هاتووە کتێبەکەی بە کۆمەڵێک دەقی گرنگ دەوڵەمەند کردووە، لە بارەی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان لە ناوچەکەدا.

بوونی مێژوویێکی تایبەت و تۆمارکراو لەمەڕ (مەڕوانییەکان)، ئەوەی بۆ ئاسان کردووین، کە بیرۆکەیەکی روون لە بارەی سیستمی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە وڵاتی کورد



بە شێوەیەکی گشتی و لە هەرێمی (دیاربەکر) بە شێوەیەکی تایبەتی، بخەینەڕوو، کە باس لە شتە بچووکەکانی ئەو مەسەلەیە دەکەن، ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کە ئەو سیستم و دامەزراوە حکومیانە لە هەرێمە کوردییەکانی دیکەش هەبووە، کاتێک کتێبەکە دەڵێت (شەحنە) لە (دیاربەکر)دا هەبووە، ئەمە مانای ئەوەیە، کە ئەو پۆستە لە (ئاران)و (ئازەربێجان)و هەرێمەکانی تریشدا هەبووە، کە دیارە سەبارەت بە پۆستەکانی دیکەش هەر بەم شێوەیە.

وەکو جەختی لەسەر کراوەتەوە، زۆربەی ئەو پۆستە کارگێڕی و دارایی و دادوەرییانەی لەسەردەمی میرنشینی مەڕوانی لە (دیاربەکر)دا هەبوون، دوای رووخانی میرنشینەکەش هەر مانەوە، بەتایبەت پۆستە پێویستەکانیان[١٦١]، ئەوەتا پۆستەکانی (قازی)و ( )، (مستەوفی)و (پۆلیس)و بێجگەی ئەوانەش هەروەکو خۆیان مانەوە، هەروەها سەلجوقییەکان چەند پۆستێکی کارگێڕی دیکەشیان داهێنا، کە بەستراوبوونەوە بە دەسەلاتی ناوەندییان، هەروەها (فارقی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لە ساڵی (٤٩٢ک/ ١٠٩٨ز)، (قازی)ی (میافارقین) مرد، هەروەها ( )یش هەر لەو شارەدا هەبوو[١٦٢].

هەرچی پۆستی (مستەوفی)یە ئەوا ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرابوو، سەرپەرشتی وەرگرتنی ئەو مافانەی دەوڵەت بکات، کە وەکو پارە دەکەونە ئەستۆی خەڵکی[١٦٣]، هەر لە خوێندنەوەی دەقە مێژووییەکان دیسانەوە ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێت کە پۆستی (مستەوفی) لە لیستی پۆستە داراییەکانی مەڕوانییەکان هەبووەو دوای رووخانیشیان هەر ماوە، هۆی مانەوەشی ئەوە بووە، کە ئەم پۆستە گرنگ و پێویست بووە بۆ سەرجەم وڵاتەکان، (ئەسەد فارقی) شاعیریش کە رۆڵی هەبووە لە ژیاندنەوەی میرنشینەکە، لەساڵی (٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز)، (مستەوفی) بووە لە (میافارقین)[١٦٤].

لە راستیدا پۆستی (مستەوفی) لە هەموو کات و شوێنێکداو، بۆ هەموو وڵاتێک لە وڵاتان پێویستە، دەوڵەتی سەلجوقیش پێویستییەکی زۆری بە پارە هەبوو، بۆ پێداویستییەکانی سوپاو، کەناڵە جۆراوجۆرەکانی دیکەی دەوڵەت، بۆیە دوای رووخانی میرنشینی مەڕوانیش ئەو پۆستەی هەر هێشتەوە.

ئەمەی بۆ جاری یەکەم سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە، کە رووخانی میرنشینی مەڕوانی بووە هۆی دروستبوونی فەرمانڕەواییەکی بەدیل، کە لە کۆمەڵێک فەرمانبەری تورک پێکهاتبوو.. (فارقی) لەسەر زاری یەک لەو ئەستێرەناسانە دەگێڕێتەوە، کە پێشبینی رووخانی میرنشینی مەڕوانییان کردبوو، دەڵێت:(ئیبنو عیسون) ئەستێرەناسێکی میر نیزامەدین بوو و رۆژێکیان لەگەڵ میر لە دیوەخانەکەیدا دانیشتبوون، بە میری گوت: گەورەمان، ئەم وڵاتە چەند خۆشەو، چەند ئاوەدانە!! بەڵام بەختی بەسەر دەچێت، لەدوای تۆ و بنەماڵەکەت[١٦٥]، وێرانەیی و جەورو ستەم باڵی بەسەردا دەکێشێت .. خەڵکیش بەمە سەریان سوڕما، بەڵام ئەوەی گوتی و پێشبینی کرد، راست دەرچوو، چونکە دوای مردنی (نیزامەدین)و دەرچوونی وڵات لە ژێردەستی (ناسرولدەلە)، تورک هاتنە وڵاتەکە، (والی)یەکانی گۆڕدران و وێرانەیی و جەوروستەم باڵیان بەسەردا کێشا، خەڵکەکەشی بەو هێندەی ئەستێرەناسەکە گوتی: هەژار کەوتن. هەروەها ئەو مێژوونووسە درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت:(تا ئێستاش ئەم وڵاتە بۆ یەک لە دەی ئەو بارە نەگەڕاوەتەوە، کە لە رۆژانی (نیزامەدین)دا تیای دەژیا)[١٦٦].

ئەوەی تایبەتە بە سروشتی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە هەرێمی (دیاربەکر)، ئەوا بۆ رۆژگارو مێژووی ئەو شالاوە دەگەڕێتەوە، کە وەزیر (فەخرولدەولەی کوڕی جوهەیر) لە ساڵی (٤٧٦ک/ ١٠٨٣ز) دا سەرکردایەتی کردو لە دەرەنجامیدا، فەرمانڕەوایی ئەو شارە بە وەزیری ناوبراو درا[١٦٧].

هەروەها سوڵتان رێگەی ئەوەشی پێدا، کە لە دوای ئەوەی بەسەر مەڕوانییەکاندا زاڵ دەبێت، خوتبە بۆ خۆی بخوێنێتەوەو لەسەر دراویشدا ناوی خۆی هەڵکەنێت[١٦٨].

بە پێی ئەو فەرمانەی (مەلەکشاه)یش (فەخرولدەولە)ی وەزیر، بوو بە فەمانڕەوای (دیاربەکر).

بەم پێیەش کەوا بێت رێککەوتنێکی نێوان هەردوولا هەبوو لەسەر شتێکی دیاریکراو، ئەویش ئەوە بوو، ئەرکی (ئیبنو جوهەیر) ئەوەیە کۆتایی بە فەرمانڕەوایی مەڕوانییەکان بێنێت لە (دیاربەکر)، لە کاتێکدا کە سەریش کەوت، ئەوا دەبێتە فەرمانڕەوا بەسەر ئەو ناوچانەی ژێردەسەڵاتی مەڕوانییەکان، بە کارەکیش (فەخرولدەولە) توانی کۆتایی بە فەرمانڕەوایی ئەو میرنشینە کوردییە بێنێت، بەمەش بە ناوی سەلجوقییەکانەوە بووە فەرمانڕەوا بەسەر (دیاربەکر).



(فەخرولدەولە) دوای ئەوەی فەرمانڕەوایەتییەکەی بۆ جێگیر بوو، (میافارقین)ی کردە پایتەختی تیا دانیشتنی خۆی[١٦٩]و، (زەعیمولدەولە)ی کوڕیشی بۆ فەرمانڕەوایی کردنی (ئامەد) رەوانکرد، هەروەهاش بۆ هەریەکە لە شارەکانی هەرێمەکە (والی)یەکی هەڵبژارد، (والی)ی (حسن کیفا) (یاقوتی خادیم)بوو، کە ئەم ناوبراوە توانی ئاسایش و ئارامی بۆ ئەو شارە بگەڕێنێتەوەو پایەکانی فەرمانڕەوایی سەلجوقیی تیا بەهێز بکات[١٧٠].

هەروەها (فەخرولدەولە) کەوتە دووبارە چاککردنەوەی تەلارو تاوەرە رووخاوەکانی شارەکان، کە لە ماوەی گەمارۆکەی بۆ سەریان وایان لێهاتبوو، شوورەکانیشی چاک کردنەوە، فەرمانبەرو جێگرەکانی بەسەر هەموو لایەکی (دیاربەکر) دانان، بەم شێوەیەش ئەو وڵاتە هەر هەمووی کەوتە ژێر فەرمانی ئەو، پارەش لە هەموو لایەکەوە هەر بەسەر ئەودا دەڕژا[١٧١].

وەکو روونە (فەخرولدەولە) بارە گشتیەکەی لە بەرژەوەندی خۆی بەکارهێناو بە تەنیا خۆی فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمەی کرد، باڵی بەسەر هەموو ئەو کەل و پەل و سامانە تایبەتیانەی خانەوادەی مەڕوانی داکێشاو هەر هەموو مەسەلە گەورەو بچووکەکانی خستنە ژێر دەسەڵاتی خۆی[١٧٢]. باپیری مێژوونووس (فارقی)، کە ناوی (ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئەزرەق)بوو، (نازر)ی دارایی بوو لە (حسن کیفا)[١٧٣]، (نازر)یش پۆستێکی کارگێڕی-دارایی بوو، بۆیە داهێنرا، تا یارمەتیدەری وەزیر بێت، لە بەرێوەبردنی کاروبارەکانی (وڵات)[١٧٤]، چەند جۆرێکیشی هەبوو، دیارترینیان (نازر)ی دارایی بوو، کە لە ماوەی فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە (دیاربەکر)، ئەم پۆستەش لە پاڵ پۆستەکانی دیکەدا داهێنرا، (ئیبنو ئەزرەق) یەک لە فەرمانبەرانی سەردەمی سەلجوقی بوو، ماوە دوای ماوە لە لای وەزیر ئامادە دەبوو و پارەی ئەو باجانەی بۆ دێنا کە لە دانیشتوانی (حسن کیفا) کۆی کردبوونەوە، لە یەک لەو دیدارانەیدا لەگەڵ وەزیر، وەزیر گلەیی ئەوەی لێکرد، کە ئەوەندەی هێناویەتی کەمە!! هەر لە ماوەی ئەو دیدارەش (ئیبنو جوهەیر) هەموو ئەو کەل وپەل و گەوهەرو سامانەی بە (ئیبنو ئەزرەقی نازر) پیشاندا، کە لە خانەوادەی مەڕوانییەکانی دەست بەسەردا گرتبوو، لەنێو ئەوانەش تەسبیحە تایبەتیەکەی میر (ناسرولدەولە)، ئەوەشی بە (ئیبنو ئەزرەق) گوت کە ئەم تەسبیحە هۆی وێرانبوونی ماڵی مەڕوانییەکان بوو و، بووە هۆی ئەوەی وڵاتەکەیان لە دەست دەربچێت[١٧٥].

بە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە (ئیبنو ئەزرەق) (نازر)ی دارایی بووە لە (حسن کیفا)و لەو

ماوە هاوچەرخەی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان لە (دیاربەکر)، گێڕانەوەکانی ئەو لەگەڵ ڕاستیدا دژ ناوەستن، لە یەکێک لەو ئاماژانەی (فارقی) لە مێژووەکەی خۆیدا تۆماری دەکات و لە باپیریەوەی دەگێڕێتەوە، دەڵێت: (فەخرولدەولەی وەزیر لە ولاتدا قەراری گرت، لەگەڵیاندا باشبوو، بەتایبەتیش لەگەڵ خەڵکی میافارقین، ڕێزی لێنان و کارو مووچەی پێدان و چەند شتێکی لە سەردا لابردن، خۆی لە میافارقین دانیشت، خەزێنەکانی ماڵی مەڕوانیشی هەمووی برد، کە لە ڕەگەزی جیاو جۆری جیاوازەوە پێک دەهاتن[١٧٦].

لەوەی پێشوودا ئەوە دەخوێنینەوە، کە (فەخرولدەولە) هەوڵیداوە خەڵکە کوردەکانی ناوچەکە بۆ پاڵەخۆی ڕابکێشێت، هەوڵیدا ئەو ڕقەیان هەڵمژێت کە لە ئەنجامی ڕووخاندنی میرنشینەکەیان بۆیان دروست ببوو، بۆیە بە باشی لەگەڵیان جوولایەوە، بە تایبەت لەگەڵ خەڵکی (میافارقین)، چونکە ئەو شارە پێشتر پایتەختی فەرمانڕەوایی مەڕوانییەکان بوو، لە دواتریشدا ببووە پایتەختی فەرمانڕەوایی سەلجوقی.

لە پاڵ فەرمانڕەوایی گشتی، سەلجوقییەکان شەحنە(فەرمانڕەوای سەربازی)شیان بۆ هەموو شارە کوردییەکانی سەر بە دەسەلاتەکەیان ڕەوانکرد، دوای گرتنی (دیاربەکر)، سوڵتان ئەو شارە و تەواوی قەلاکانی ناوچەکەی دایە وەزیر (فەخرولدەولە)[١٧٧]، ئەو سەربازانەش کە لە شالاوەکەدا بۆ سەر ئەو شارە بەشدارییان کردبوو، هەموویان گەڕانەوە لای سوڵتان، بەلام سوڵتان میر (جەبەق)ی وەکو (شەحنە) بەسەر ئەو شارەدا هێشتەوە و سێ سەد سواریشی نایە ژێر دەستی[١٧٨]، شایانی باسە (جەبەق) یەک لە میرە تورکمانەکان بوو، لە ناوچەکەدا دەسووڕایەوە، تا ئەو کاتەی سوڵتان هەڵیبژارد ببێتە (شەحنە) بەسەر (دیاربەکر)[١٧٩].

بەم شێوەیە (فەخرولدەولە)ی وەزیر و میر (جەبەق)ی فەرمانڕەوای عەسکەری، فەرمانڕەوایی ئەو هەرێمەیان گرتە ئەستۆ، (فەخرولدەولە)ش (حسن زیاد)ی وەکو (ئەقتاع)ێک بۆ ئەم (شەحنە)یەی بڕیبووە[١٨٠]، ئەویش تیای مایەوەو لە دوای خۆیشی کەوتە دەست منداڵەکانی[١٨١]، ئەمەش لەوانەیە مانای ئەوە بێت، کە ئەم پۆستە هەر لە دەست ئەوانەوە مابێتەوە، چونکە لە ساڵی (٤٧٨ک/ ١٠٨٤ز) میر (جەبەق)ی ناوبراو وەکو فەرمانڕەواییێکی عەسکەری هەڵبژێردراو، ماوەیەک لەو پۆستەی مایەوە، منداڵەکانیشی هەر لەگەڵی مانەوە لە (حسن زیاد).



هەڵوێست زۆر درێژەی نەکێشا لە بەرژەوەندی (ئیبنو جوهەیر)ی جێگر بۆ فەرمانڕەواییێتی (دیاربەکر)، چونکە سوڵتان (مەلەکشاه) زانیاری تەواوی هەبوو، بەوەی کەوا وەزیرەکەی لە ماڵ و سامانی ماڵی مەڕوانیدا دەستی بەسەردا گرتبوو، ئەمەش بە دڵی سوڵتان نەبوو، بۆیە دوای دوو ساڵ فەرمانڕەواییکردنی، سوڵتان بەدوایدا هەنارد، ئەویش بیری لەوە کردەوە لێی یاخی بێت، بەلام بینی توانای ئەوەی نییە، بۆیە (میافارقین)ی جێهێلاو بەرەو (ئەسفەهان) هات، ئەوکاتەش ئاگادار کرایەوە کە لە فەرمانڕەوایەتیکردنی (دیاربەکر)دا لادرا[١٨٢].

دوای (ئیبنو جوهەیر) (قەوامودینی ئەبی عەلی بەڵخی)، کە ئەمە (ئەبو عەلیی بەڵخی)یە، ئەو پیاوە وەکو (عەمید) بۆ فەرمانڕەواییکردنی (دیاربەکر) هەڵبژێردرا، ناوبراویش لە (ذي الحجة)ی ساڵی (٤٧٩ک/ ١٠٨٦ز) گەیشتە ئەو شارەو بووە جێگر بەسەری[١٨٣].

بەم شێوەیە بۆ ولاتی (دیاربەکر) (شەحنە)یەک و (عەمید)ێک هەڵبژێردران، (شەحنە) کە میر (جەبەق) بوو و (عەمید)ەکەش (ئەبو عەلیی بەلخی)بوو، سیستەمی فەرمانڕەوایی سەلجوقیش بۆ بەڕێوەبردنی ولات و هەرێمەکانی سەربەخۆیان لەوانە پێکدەهات، چونکە بە بێ جیاکردنەوە، هەموو شارێکی ئیسلامی، کە لە ژێر دەستی ئەواندا بوو، (عەمید)و (شەحنە)یەکیان بۆی ڕەوانکردبوو، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، سکالایەکی زۆر لە دژی فەرمانڕەوای عەسکەری (شەحنە)، یان بەرپرسی کارگێڕی (عەمید) پێشکەشی سوڵتان دەکران، ئەم سکالایانەش لە پایتەختی خەلافەت و هەروەها لە ولاتی کوردیش تۆمار کراون.

وەکو دەردەکەوێت ئەوەش لە مەسەلە ئاسایی و سروشتییەکان بووە، چونکە کە فەرمانبەرە سەلجوقییەکان سەرپێچییەک دەکەن لە کارەکانیان، ئەو کاتە خەڵکەکە لێیان توڕە دەبێت، ئەوەتا لە ڕووداوەکانی ساڵی (٤٧٥ک/ ١٠٨٢ز) (خەلیفە موقتەدی بیئەمریللا)ی عەبباسی (شێخ ئەبا ئیسحاقی شیرازی)[١٨٤] ی نارده لای سوڵتان (مەلەکشاه) لە (ئەسفەهان)، کە شایانی ئاماژە پێدانە شێخی ناوبراو نامەیەکی بۆ سوڵتان پێ بوو، سکالای بەخۆوە دەگرت لە (عەمید)ی عیراق (ئەبی لفەتح کوڕی ئەبی لەیس)[١٨٥].

ئەم نێردراوەی خەلیفە داوای لە سوڵتان کرد، سنوورێک بۆپێشێلکارییەکانی

(عەمید)ی ناوبراو دابنێت، (مەلەکشاه)یش وەڵامی داوایەکەی دایەوەو، ئاگادرایەکی بۆ ئەو (عەمید)ە نارد، تیایدا داوای لێکرد، کە دەست نەخاتە نێو کاروبارەکانی خەلیفە(١٨٦) ... جا ئەگەر ئەو (عەمید)ە لە هەڵەدا بکەوێت، کە لە سەنتەری خەلافەتەوەیە، ئەدی دەبێت کاروبار لە هەرێمە کوردییە دوورەکان لە پایتەختی فەرمانڕەوایی سەلجوقی چۆن بوو بێت، بۆیە سکاڵا لە دژی (عەمید) هەروەها لە لایەن کوردیشەوە پێشکەش بە سوڵتان دەکرا، (فارقی) دەڵێت: (ئەبا عەلی بەڵخی) لە سەرەتای گرتنەدەستی پۆستەکەی بە باشی لەگەڵ خەڵکەکە جولایەوەو، چاکەی لەگەڵ خەڵکەکە کرد، کەسی نەدەگرت بە (شەرع) نەبوایە(١٨٧)، بەڵام لە دواییدا وردە وردە وازی لەم سیاسەتەی چاکەو لێبوردنەی هێنا لەگەڵ دانیشتوان، بۆیە کەوتە ژمارەیەک هەڵە، کە ئەمە وایکرد خەڵکی ناوچەکە بە خراپی لە دژیدا بجووڵێنەوە، بۆیە جێگرێکی بەسەر شاری (ئەرزن)ەوە دانا، پێی دەگوترا (بستی)، بەڵام وا دەردەکەوێت لەم هەڵبژاردنەیدا سەرنەکەوتبێت، چونکە ئەم جێگرە سیاسەتێکی رەقی لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە بەکارهێنا، بەمەش ستەمی لە خەڵکی (ئەرزن) کردو ماڵ و سامانی دەست بەسەردا گرتن، ئەمەش رقی دانیشتوانەکەی هەڵسان و هاتنە دەرگای سوڵتان سکاڵای خۆیان لە دژیدا پێشکەش کرد(١٨٨).

کارەکانی (عەمید)ی سەلجوقی لە (میافارقین)، پەرچەکردارێکی بەهێزی لەلایەن دانیشتوانەوە دروستکرد، ئەوان زیاتر مەیلیان بەلای (فەخرولدەولە)ی وەزیر بوو، فەرمانڕەوای پێشووی ناوچەکە، چونکە لە بۆیان باشبوو، بۆیە پیاوماقووڵ و ناودارانی شارەکە، لەنێویان؛ (ئەبو لهیجاء)و سەرۆک (ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی موسەک)و قازی (ئەبو بەکر کوڕی سەدەقە)و بێجگەی ئەوانەش هاتنە لای سوڵتان (مەلەکشاه)، ئازارەکانی خۆیان لەدەست (ئەبی عەلی بەڵخی)ی (عەمید) دەربڕی و داوایان لێکرد، لە سەر کار لای ببات، بەڵام ئەم داوایەیان لەلایەن سوڵتانەوە زۆر گوێی لێنەگیرا، چونکە رەتیکردەوە گوێ بەم قسانەیان بدات، بەڵام دوای ئەوەی گوێی لە دەنگی گەورەی ئەو ناڕەزاییە بوو کە لە نێوان ئەندامانی وەفدی کوردی دروستبوو، لەم هەڵوێستە رەقەی خۆی پاشگەزبووەوە، چونکە پرسیاری لە وەزیرەکەی کرد: ئەو دەنگە دەنگە چییە؟ (نیزامولمەلیک)یش وەڵامی دایەوە: (ئەمانە خەڵکی دیاربەکرن، هەرایان لە دژی (ئەبی عەلی)یی، بە مەش سوڵتان فەرمانی دەرکرد بە لەسەرکارلابرانی (ئەبی عەلی) لەو پۆستەیە(١٨٩).



دوای ئەم گۆڕانکارییە سوڵتان (عەمیدولدەولەی کوڕی جوهەیر)ی بە فەرمانڕەوا بۆ سەر (دیاربەکر) هەڵبژارد، ئەویش ئەم وڵاتەی بۆ سێ ساڵان بە (ملیۆنێک دینار) زامنکرد ... ئینجا (مەلەکشاه) بە یاوەرێتی (نیزامولمەلیک)ی یاوەری هاتەدەر بۆ لای ئەو وەفدە کوردییەی لە (دیاربەکر)ەوە هاتبوونە لای، دڵی راگرتن و فەرمانی پێکردن بە یاوەری (عەمیدولدەولە) بەرەو ماڵی خۆیان بگەڕێنەوە، وەکو رێزلێنانێکیش لەوەی کەوا وەکو وەفد هاتوونەتە لای، سوڵتان بۆ خەرجییەکانیان (١٠) هەزار درهەمی پێبەخشین، ئەندامانی وەفدەکەش لەنێوان خۆیان، لەبارەی ئەو پارەیەی پێی بەخشین کەوتنە راوێژکردن، بینیان ئەو پارەیە بە پێی گوتەی ئەندامانی وەفدەکە، بە هەموان نابەخشرێت، بەڵکو هەر سەرۆک و پێشەنگەکان (چینە دەسەڵاتدارەکە) وەریدەگرن، بۆیە لای سوڵتان پێشنیاریان کرد لە بڕی ئەو پارەیەی کە هەر گەورەکان لە دواییدا بۆ خۆیانی قۆرخ دەکەن و، هەژارانی لێ بێبەش دەبێت، ئەوا لە بری ئەوە باجە سەپێنراوەکانی سەریان، بە تایبەت ئەوەی سەر خاوەن زەوییە کشتوکاڵییەکان سووک بکات، بەمەش هیچ لەبەردەم سوڵتان نەمایەوە ئەوە نەبێت، رازی بێت لەسەر داواکەیان(١٩٠).

دوای ئەم رووداوانە، (عەمیدولدەولە) لە (ذي القعدة)ی ساڵی (٤٨٢ک/ ١٠٨٩ز) گەیشتە (میافارقین)و بە فەرمانی سوڵتانی لە (مەلەکشاه)ەوە کاروبارەکانی ویلایەتی (دیاربەکر)ی گرتە ئەستۆ، بەم شێوەیە ئەم فەرمانڕەوایە لە (میافارقین)دا نیشتەجێ بوو و، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی باجەکانی بێ ئەوەی دانیشتوان لە دژی دەسەڵاتی سەلجوقی تورە بکات، چونکە (عەمیدولدەولە) لە سوڵتانەوە فەرمانی بۆ هاتبوو، کە لەگەڵ خەڵکەکەدا باش بێت(١٩١).

بە کارەکیش ئەم فەرمانڕەوا نوێیە، سیاسەتێکی نەرم و نیانتری لە سیاسەتی فەرمانڕەوای پێشوو (بەڵخی) پەیڕەو کرد، چونکە: (تەماشای خەڵکەکەی کرد، چاکەی لەگەڵدا کردن، رەچاوی کردن، مووچەی پێدان)(١٩٢).

فەرمانڕەوایی (عەمیدولدەولە) بەسەر (میافارقین)و پاشماوەی موڵکەکانی مەروانییەکان، تا ساڵی (٤٨٤ک/ ١٠٩١ز) بەردەوام بوو، بەڵام لەو ساڵەدا لەلایەن سوڵتانی سەلجوقییەوە بانگکرا، ئەویش بە یاوەرێتی ناودارانی ناوچەکە لەنێویان قازی (ئەبو بەکر کوڕی سەدەقە)و قازی (قاسم کوڕی نەباتە کوڕی موسەک)و (ئیبنو ئەزرەق)ی باپیری مێژوونووس، بەرەو (ئەسفەهان) بەرێکەوتن و لەوێدا چاوی بە (مەلەکشاه)

کەوت[۱۹۳]، ئینجا بەرەو (بەغدا) جێی هێشت، لەلایەن خەلیفە (موقتەدی عەبباسی) وەزارەتی گرتەدەست[۱۹٤]، بەڵام هەرچی وەفدە یاوەرەکەشی بوو، ئەوا وەزیر ڕێزی لێنان و دوای چەند ڕۆژێک بەرەو شارەکەیان گەڕانەوە[۱۹٥].

هەرچی تایبەت بە فەرمانڕەوایی (دیاربەکر)یشە، ئەوا (عەمیدولدەولە) بەر لەوەی تێیدا دەربچێت، (کافیلدەولە ئەبو بەرەکات کوڕی جوهەیر)ی برای هەڵبژارد، بۆ ئەوەی کاروبارەکانی بگرێتە دەست، (کافی)ش تا مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٤٨٥ک/ ۱۰۹۲ز) لەو پۆستەدا مایەوە، بەڵام لەو ساڵەدا بەرەو سوڵتان هات و، ئەو پارەیەی پێ بوو، کە لە دانیشتوانەکەی وەرگرتبوو، کەچی لە کاتێکدا هێشتا لە ڕێگا بوو، هەواڵی مردنی سوڵتان مەلەکشاهی پێگەیشت، بۆیە ناچاربوو بۆ (دیاربەکر) بگەڕێتەوە، کە ئەویش دوای گەیشتنی هەواڵی مردنی سوڵتان بە دانیشتوانەکەی، باری سیاسیی شڵەژابوو[۱۹٦].

لە دوای مردنی سوڵتان (مەلەکشاه)، هەلومەرج گۆڕا، چونکە دوای ئەوەی دانیشتوان بە هەواڵی مردنی سوڵتانیان بیست، لەنێو خۆیاندا لەسەر چارەنووسی وڵاتەکەیان، کەوتنە ناکۆکی، چاوەڕوانی ئەوەیان کرد، نوێنەری سوڵتانی نوێ بهێت و وڵات وەربگرێت، لە نامەیەکیشیان بۆ سوڵتان (بەرکیارۆق)یان نووسی: (ئەمە وڵاتی باوکتەو جگە لە پێوە کەسی دی قبوڵ ناکا، جا دێیت وەریبگری، یان یەکێک دەنێریت وەریبگرێت، چونکە وڵاتەکەمان بۆ پاراستووی)[۱۹۷]، بەڵام دەوڵەتی سەلجوقی لەسەر گرتنەدەستی دەسەڵات، ڕووبەڕووی ململانێیەکی تاڵی نێوان مندالەکانی سوڵتان دەبووەوە، بۆیە ئەو بارە سیاسییە شڵەژاوە، ڕێگەی بە (بەرکیارۆق) نەدا، کە لە ساڵی (٤٨٥ک/ ۱۰۹۲ز)[۱۹۸] دەسەڵاتی گرتەدەست، تا فەرمانبەرێکی سەلجوقی ڕەوان بکات، بۆ ئەوەی فەرمانڕەوایەتی (دیاربەکر) بگرێتەدەست، بۆیە بارەکە دانیشتوانی ناچار کرد، بە دوای میر (ناسرولدەولە)ی دوورخراوەدا بنێرن، کە لە گوندی (حەربە)ی باکووری (بەغداد) ژیانی دەبردەسەر، داواشیان لێکرد بگەڕێتەوە وڵاتەکەی، فەرمانڕەوایەتیەکەی بگرێتەدەست، کە بێگومان بۆ ئەو هەڵوێستەشیان، خەڵکەکە لاوازی سەلجوقیەکانیان بە هەل زانی[۱۹۹].

ئەو میرە کوردە گەڕایەوە (جەزیرە)و سەر لە نوێ میرنشینەکەی ژیاندەوە، ئەگەرچیش وەکو دەردەکەوێت، هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە ڕەتیانکردبۆوە ئەو میرەو یان



مەڕوانییەکانی تر بگەڕێنەوە سەر دەسەڵات، چونکە لە جەورو ستەمەکەیان وەڕس ببوون[۲۰۰]، بەڵام ئەم تاوانە هەموو میرەکانی ئەو خانەوادەیە ناگرێتەوە، چونکە فەرمانڕەوایی هەندێکیان بەوە جیاکراوەتەوە، کە لە سایەیدا ئارامی سیاسی و پێشکەوتنی ئابووری بەرجەستە بووە، بۆیە زیاتر مەسەلەکە ڕەنگ بێت ئەوە بێت، کە دانیشتوانەکە هەڵوێستیان بەرانبەر بە (ناسرولدەولە)ی دوایین میری میرنشینەکە خراپ بووبێت، کە بە بەخیلی و پارە خەرج نەکردن بۆ میللەتەکەی دەناسرێت، یان وەکو (ئیبنو لئەثیر) ئاماژەی بۆ دەکات، دانیشتوانەکە لەو نوێنەرە مەڕوانییانە بە ڕق بوون، کە ستەمیان لە میللەت دەکرد[۲۰۱].

### ج- فەرمانڕەوایی سەلجوقی لە ناوچە کوردییەکانی دیکە:

دوای ئاگاداربوون لە سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی سەلجوقی، لە هەرێمەکانی (ئاران)و (ئازەربێجان)و (جەزیرە)، ماوەتەوە باس لە بەشەکانی دیکەی وڵاتی کورد بکەین، وەکو هەرێمی (چیاکان)و دەسەڵاتە خێڵەکیەکانی هەندێ قەڵای بڵاوەبوو لەنێویدا.

سەبارەت بە هەرێمی (چیاکان) کە سەر بە فەرمانڕەوایی میرنشینی (عەننازی)بوو، زووتر باسی لێوەکرا، کە ئەو میرنشینە وەکو هێزێکی سیاسی نەکەوت، وەکو میرنشینە کوردییەکانی دیکە، بەڵکو میرەکانی توانیان پارێزگاری لە فەرمانڕەوایێتییان بکەن، بەڵام سەربەخۆییان لە دەستدا، چونکە سەلجوقییەکان دەستیان بەسەر هەموو کاروبارە سیاسی و کارگێڕی و ئابوورییەکانی میرنشینەکەیدا گرتبوو، بەس لە بارەی چۆنیەتی فەرمانڕەواییان، ئەوا وەکو تێبینی دەکرێت، فەرمانڕەوایی میرە شازنجانییەکان هەر بەردەوامبوو، بەڵام سەلجوقییەکان فەرمانبەرە کارگێڕی و عەسکەرییەکانیان ڕەوانکرد، تا لە ڕووی کارگێڕییەوە هەرێمەکە بەڕێوەببەن.

بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایی هەرێمی چیاکان لە مەسەلە ئاسانەکان نەبوو، ئەمەش لەبەر شوێنی ئەو هەرێمە، کە دەکەوتە سەر ڕێگەی خوراسانی بازرگانی، کە هەر ئەو ڕێگەیە بەرەو پایتەختی خەلافەتیش دەچوو، جا لە کاتێکدا دەسەڵاتی سیاسی میرە عەننازییەکان لە فەرمانڕەواییێتی هەندێ ناوچەدا، تا ساڵی (٥١١ک/ ۱۱۱۷ز)یش هەر بەردەوام بوو، چەندین شارمان لە ناوچەکە دەدیت، فەرمانڕەواییەکەی لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی دیکە

دەگوازرایەوە، چونکە لە دوای مردنی سوڵتان (مەلەکشاه)، (تەتش) باڵی بەسەر شارەکانی ئەو هەرێمەدا گرت، هەر چەندەش فەرمانڕەوایەکەی زۆری نەخایاند، بەڵام دەسەڵات لەدەست جێگرەکانی مایەوە[٢٠٢].

ئەو ماوەیەشی کە لە دوای باڵکێشانی (تەتش) هات، ئەوا وەکو جەختی لەسەر کراوەتەوە، دەسەڵاتی سەلجوقی ئەوەندەی لە توانای بوو بێت، هەوڵیداوە ناوچەکە لەگەڵ پایتەختی دەسەڵاتەکەی ببەستێتەوە، بۆیە ئەگەرچیش ئاماژە نییە، لە بارەی بوونی دوو پۆستەکانی (عەمید)و (شەحنە)، بەڵام بوونی (شەحنە) لە (ئەسفەهان) کە ئەمە – گەورەترین شاری چیاکانە– بەڵگەیە لەسەر بوونی ئەو پۆستە لە شارەکانی دیکەش، چونکە وەکو دەڵێن: لە ساڵی (٤٩٣ک/ ١٠٩٩ز)، (شەحنە)ی (ئەسفەهان) بەدەستی (باتنی)یەکان کوژرا[٢٠٣].

وا دەردەکەوێت، کە هەندێ لە پۆستە کارگێڕییەکانی وڵاتی کورد، تا دوای رووخانی میرنشینەکانیش هەر مابوون، ئەوەبوو لە ماوەی ئەو بەشە تایبەتەی تیایدا باس لە سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی سەلجوقی بەر لە رووخانی میرنشینەکان کرا، تیشکمان خستە سەر ئەوەی کە پۆستێکی سەلجوقی هەبوو، پێی دەگوترا (سەرۆکی عیراقەین)، ئاماژەش هەیە بۆ پۆستی (سەرۆکی عیراقەین) هەردوو عیراقەکان، ماناشی ئەو کەسەیە، کە فەرمانڕەوایی هەردوو عیراقی عەرەبی و عەجەمی دەکات، (ئەبو ئەحمەدی نەهاوەندی) کە لە (٤٦٩ک/ ١٠٧٦ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەو ئەو پۆستەی گرتبووە ئەستۆ، کە پێشتریش وەکو (عەمید) بەسەر شاری (بەغدا)ەوە دامەزرێنرابوو[٢٠٤].

لە هەندێ لە دەقەکان وا دەردەخەن، کە میرو سەرکردە سەلجوقییەکان (ئەقتاع)و (زەوی کشتوکاڵی) هەرێمی (چیاکان)یان، بەو فەرمانبەرە عەسکەری و مەدەنییانەی دەوڵەتەکەیان دەبەخشی، کە وەکو (ئەقتاع) جێی رەزامەندییان بوون، ئەوەتا شاری (حەلوان) کە یەکە لە شارە نزیکەکانی هەرێمی (چیاکان)ی نزیک لە زەوییەکانی (سەواد)، سوڵتان (مەلەکشاه) بۆ (ئەرتەقی کوڕی ئەکسەب)ی بڕیەوە، کە ناوبراو سەرکردەیەکی عەسکەری بوو، زووتر لە خزمەت سوڵتانی سەلجوقیدا کاریکردبوو، کۆمەڵێک کاری گرنگی لە بۆ سەلجوقیان بە ئەنجام گەیاندبوو، بۆیە سوڵتان (ئەقتاعی حەلوان و چیاکان)ی[٢٠٥] لە بۆ بڕییەوە، ئەو شارەش سەنتەرێکی ستراتیژی گرنگ بوو، لە باشووری وڵاتی کورد[٢٠٦]، ژمارەیەک لە مێژوونوسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە،



کە (ئەرتەق) بەسەر هەرێمی (چیاکان) زاڵبوو، ئەمەش مانای ئەوەیە، کە ژمارەیەک لە شاری کوردی کەوتوونەتە چوارچێوەی (ئەقتاع)ی ئەو میرە سەلجوقییە[٢٠٧].

بە هەمان شێوە فەرمانڕەوایی میرنشینی (هەزبانی)ش لە (ئەربل)و دەوروبەری بەردەوام بوو، چونکە سەلجوقییەکان رێگەیان بە سەربەخۆیی میرانی ئەو میرنشینە دا لە فەرمانڕەوایی کردنیان، بەو مەرجەی (هەزبانی)یەکانیش دان بە بوونی سەلجوقیدا بنێن[٢٠٨]، بۆیە دەکرێت میرەکانی هەزبانی وەکو نوێنەرانی سوڵتانی سەلجوقی بژمێردرێن[٢٠٩]، بۆ جەختکردنەوەی شوێنکەوتەیی (ئەربل)یش، ئەوا نووسەری سەلجوقی (عەمید فەخرولکوتاب ئەبو ئیسماعیل حوسێنی کوڕی عەلی)ی خاوەن نازناوی (موئەیدوددینی ئەسفەهانی) ناسراو بە (تەغرائی)، لە (ئەربل) بووە وەزیری میرە هەزبانییەکان ئەوانەی کە پشتیوانی سەلجوقیەکانیان دەکردو، وەزارەتەکەشی بەردوام بوو، تا لە ساڵی (٥١٥ک/ ١١٢١ز) کوژرا[٢١٠].

دواجاریش ئەوەی شایانی ئاماژە پێدان بێت ئەوەیە، کە پێشەوای هۆزە کوردییەکانی قەڵاکانی بڵاوەبوو بە وڵاتی کورد، وەکو (مەهرانی)و (هەکاری)و (حەمیدی)و (بەشنەوی)، سەربەخۆیی خۆیان پاراست و، لە شێوەی ئۆتۆنۆمیەکی سەربەخۆ، فەرمانڕەوایی ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆیان کرد، بۆشمان دەکرێت، بڵێین: سەڵجوقییەکان ئەمانەیان هێڵایەوە، چونکە قەوارەی بچووک بوون و، کاریگەرییان نەبوو لەسەر دەسەڵاتی ئەوان، بۆیە ئەو قەوارە بچووکانە، بۆ ماوەیەکی درێژتر لە قەوارەکانی دیکە مانەوە، پارێزگارییان لە سەربەخۆیی خۆیان کرد، لەبەر ئەمەش فەرمانبەرە سەلجوقییەکان فەرمانڕەوایی ئەو قەڵایانەیان نەکرد، بەڵکو فەرمانڕەوایی و بەڕێوەبردنییان هەر بە دەست دانیشتوانەکانیانەوە بوو، هەر لەسەر ئەم بارەش مانەوە، تا ئەو رۆژەی بۆ یەکجارەکی لەسەر دەستی ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) رووخێنران.

## پەراوێزکان

١- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٠٦)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٧٩)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٢١)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٤٨)؛ ئیبنو تەعزی بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٣٥).

٢- ئیبنو خەلەکان: وفیات الأعیان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (١٣٥).

٣- سوڵتان (مەلەکشاە) کاتێک دەسەڵاتی گرتە دەست، تەمەنی لە هەژدە ساڵ تێپەڕی نەدەکرد، چونکە سەرچاوەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە مێژووی لەدایکبوونی (مەلەکشاە) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٤٤٧ک/ ١٠٥٥ز)، لەبەر ئەوەش لە ساڵی (٤٦٥ک/ ١٠٧٢ز) دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، کە وابوو ئەوەی لەو بارەوە دەیڵێین راستە.. بڕوانە: حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٢٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢١١)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٧٠).

٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٢٧٩)،؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٦)؛ میر خواند: روضة الصفا، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٦٧٢؛
Suphi SAATGI: RARIHI GELISIM IGINPE IRAKE YURK, P. (56). و (بە تورکی لاتینی).

٥- راوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (١٩٨)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٨)؛ سەفەدی: نکت الهمیان، لاپەڕە (١١٨).

٦- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٥٠).

٧- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕەکانی (١٠٦-١٠٧).

٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٧٩)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٦٢).

٩- مەعازیدی-جەمیلی: تاریخ الدویلات العربیة الإسلامیة، بەغداد، ١٩٧٩ ز، لاپەڕە (٩٤).

١٠- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٣١٣)؛ ئیبنو عەساکر: تهذیب تاریخ دمشق الکبیر، رێکخستن و پەراوێزی: عەبدولقادر بەدران، بەیروت، ١٩٧٩، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٤٣)، سەفەدی: أمراء دمشق في الإسلام، ساغکردنەوەی: سەلاحەدینی مونجید، دیمەشق، ١٩٥٥، لاپەڕە (٢١)؛

The cambridge history of Iran, vo I 5, P 235.

١١- میر خواند: روضة الصفا، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٦٧٢).

١٢- بگەڕێوە بۆ پێشدەستیە مێژووییە تایبەتەکە لەمەڕ میرنشینە کوردییەکان.

١٣- الشرفنامە، لاپەڕە (١٢١).



١٤- وفیات الاعیان، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (٢٨٤).

١٥- النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٣٥)، (ئیبنولئەثیر) دەڵێت:(شانشینەکەی سوڵتان مەلەکشاە زۆر بە گەورەیی فراوان بوو، هەموو وڵاتەکان گوێڕایەڵی خۆیان بۆی راگەیاندو، بووە خاوەنیان، هەر لە سنوورەکانی چینەوە، تا داروم، لە زەوییەکانی شام، لە هەموو ئەو ناوچانە خوتبە بە ناوی ئەو دەخوێنرایەوە، یەمەن و حیجازیش گوێڕایەڵییان بۆ دەربڕی، هەموو ساڵێکیش خیراجی لە پاشای قوستەنتینییەو سەمەرقەندو سەرجەم وڵاتانی پشت زێ وەردەگرت) ... تاریخ الباهر، لاپەڕە (١١).

١٦- فامبری: تاریخ بخاری، لاپەڕە (١٣٨).

١٧- بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٦٥)؛ حەسەنێن: سلاجقة إیران والعراق، لاپەڕە (٦٧ ، ٨١)؛ حەسەنێن: أربیل في العهد الاتابکي، لاپەڕە (٢١).

١٨- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢)؛
STUDIES IN Caucasiam history.

١٩- (مەسعودی کوڕی نامدار) لەوەدا کەوتۆتە هەڵە، کە دەڵێت: لە ساڵی (٤٦٨ک/ ١٠٧٥ز) سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان) (ئاران)ی دا بە (ساوتکین)ی فەرماندەی، بەڵام لە راستیدا سوڵتان (مەلەکشاە) ئەو کارەی کرد، چونکە لە ساڵی ئاماژە بۆکراودا سوڵتان (مەلەکشاە) دەسەڵاتداربوو، نەک سوڵتان (ئەلب ئەرسەلان).

٢٠- مەبەست لێی میر (فەزلونی دووەم)ی میری میرنشینی شەدادییە.

٢١- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢)؛ بە گوازتنەوە لە (مەسعود نامدار)ەوە.

٢٢- الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧).

٢٣- جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٠).

٢٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٥- بڕوانە لاپەڕەکانی (١٤٧-١٥٤) لە لێکۆڵینەوە عەرەبییەکە.

٢٦- حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٣٢).

٢٧- مونجیم باشی: پشتی بە مێژوویەکی کۆن بەستووە لە دەوروبەری ساڵی (٥٠٠)ی کۆچی، کە لەبارەی میرنشینی شەدادی نووسراوە.

٢٨- (راوندی) ستایشی سوڵتان (مەلەکشاە)و سیاسەتە ناوەندیەکەی دەکات، کە بە ئاکامی باش بۆ دەوڵەتی سەلجوقی بەکۆتا هات، سوڵتان بە هۆیەوەی توانی دەست بەسەر (ئاران)دا بگرێت، مێژوونووسی ناوبراو (راوندی) لەم بارەیەوە چەند دێرە شیعرێکیش تۆمار دەکات، کە ئەمەی خوارەوە چەند نموونەیەکە لەو دێرانە:

ئەو گەورەی سەلجوقیانە .. سولتانێکی دادگەرە
لە ماوەی یەک ساڵدا توانی دەست بەسەر هەموو مەمالیکدا بگرێت ...!
سوپا شاهییەکەی بە ڕێکەوت
دەستی بەسەر کەنجە و ئاران داگرت
بە هۆی شمشێرە تیژەکەشی
دەستی بەسەر زەوییەکانی نێوان ڕۆم و زنجان داگرت
دوژمنانت لە ترسی شمشێرەکەت شکان و هەڵاتن
تۆش دەستت بەسەر هەموو ماڵ و کەل و پەلەکانیان دا گرت ...!

٢٩- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢)؛ فرای: دائرة المعارف الإسلامیة، ماددەی (ئاران)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٧٢).

٣٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧)؛ الذهبی: دول الإسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٦٨)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٥٦)؛ ئەمین زەکی: مشاهیر الکردو کردستان، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٠٧).

٣١- کەسرەوی: شهریاران گمنام، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٢٧)؛ ئەمین زەکی: الخلاصە، لاپەڕە (١٣٤).

٣٢- لەبارەی میر (بوزان) سەیری لاپەڕە (٢٥٢)ی دەقە عەرەبییەکە بکە.

٣٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧).

٣٤- لەبارەی (باغی سیان)ەوە بڕوانە لاپەڕە (٢٥٢)ی دەقە عەرەبییەکە.

٣٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧).

٣٦- جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢) بە وەرگرتن لە (مەسعودی کوڕی نامدار)ەوە.

٣٧- مونجیم باشی: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢)؛ ڕەسول: الشدادیون فی بلاد آران، لاپەڕە (٥٧).

٣٨- هەرچەندە ئاماژەشمان پێداوە، بەلام نازانین ئەوە چەند ڕاستە کە شەدادییەکان بە دەستی تەتەر ڕووخابن، چونکە وەکو دەزانرێت هێرشەکانی ئەو هۆزانەی (تەتەر) بۆ سەر جیهانی ئیسلامی لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەی کۆچی /سێزدەی زایینی بووە، نەوەک لە ساڵی ٥٩٥ک، بۆیە لەو بڕوایە داین فەرمانڕەواییێتی شەدادی لەسەر دەستی هێزێکی دیکەی جیا لە (تەتەر) ڕووخا بێت، دووریش نییە، هێرشەکانی (کەرەج) هۆیەک بوو بێت بۆ ڕووخانی شەدادییەکان، چونکە ئەو میرنشینە زۆر دەکەوتە بەر هێرش و پەلامارەکانی (کەرەج)، بە کارەکیش لە ساڵی (٥٥٦ک/ ١١٦٠ز) (کەرەج) شاری (ئانی)یان داگیرکرد، بۆیە ڕووخانی شەدادییەکان لە ماوەی یەک لەو هێرشانەی (کەرەج) بە دوور نازانین.



٣٩- ڕوس: دائرة المعارف الإسلامیة، ماددەی بەنو شەداد، بەشی سێزدەهەم، لاپەڕە (١٨٣).

٤٠- لە بارەی پەیوەندییەکانی میرنشینی شەدادی لەگەڵ ئەو هێزە سیاسییانە، بڕوانە: ڕەسول: الشدادیون، هەردوو لاپەڕەکانی (٦٩)و (٧٣).

٤١- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٥٨).

42- Ctudies in Caucasian History, P. 168.

نەقشبەندی: آذربیجان، لاپەڕە (١٧٥).

٤٣- بەوەرگرتن لە مێژووی (الباب و الأبواب)؛ Minorisky: Ibid, P.169.

٤٤- نەقشەبەندی: آذربیجان، لاپەڕە (١٧٥).

٤٥- هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (١٨٢).

٤٦- حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (٨٧؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٧).

٤٧- کەسرەوی: شهریاران گمنام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢٩).

٤٨- هەمان سەرچاوە پێشوو.

٤٩- بڕوانە هەردوو لاپەڕەکانی (٢٦٧)و (٢٧٢) لە دەقە عەرەبییەکە.

٥٠- تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕە (١٩٩).

٥١- کتاب الاعتبار، فیلیب مەتی، وڵاتە یەکگرتووەکان، ١٩٣٠ ، لاپەڕە (٨٧)؛ یوسف: حضارة الدولة الدوستکیة، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٧٦-٧٧).

٥٢- کتاب الاعتبار، لاپەڕە (٨٨).

٥٣- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١١٩)؛ ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٢٨)؛ ڕاوندی: راحة الصدور، لاپەڕە (٢٠٢)؛ ئیبنولعەدیم: بغیة الطلب، لاپەڕە (٩٧)، میر خواند: روضة الصفا، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٦٧٣).

٥٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٥٦)؛ موکریانی: ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی چوارەم، لاپەڕەکانی (٣-٥).

٥٥- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٠٠-٢٠٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (١١٦-١١٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٤)؛ ئیبنو تەغدی بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٠٨)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٨٦).

٥٦- تاریخ الزمان، لاپەڕە (١١٧).

٥٧- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢١٨)، ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٥٦).

٥٨- موكریانی: ئاوڕێكی پاشەوە، بەرگی چوارەم، لاپەڕەكانی (٣-٤).
٥٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٥٦).
٦١- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (٢١٨)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٢٩).
٦٢- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (٢٠٨)؛ تكريتي: الإمارة المروانية، لاپەڕە (١٠٥).
٦٣- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (١٧٣).
٦٤- تاريخ الدول والإمارات الكردية، لاپەڕە (١٢٨)؛ مشاهير الكردو كردستان، لاپەڕە (٥٣).
٦٥- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (١٧٣)
٦٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٦٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو.، لاپەڕە (٢٠٨).
٦٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٢٩)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٢٢٣)؛ ئەبولفیداء، المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٥).
٧٠- كۆسات: لەوە دەچێت مەبەست لێی مۆسیقای سوپا بێت؛ قەلقەشەندی: صبح الأعشى، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٨)؛ ئیبنو واسل: مفرج الكرب، ساغكردنەوەی جەمالەدین شیال، قاهیرە، ١٩٥٣، بەشی یەكەم، لاپەڕە (١١)، پەراوێزی ژمارە (١).
٧١- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٢٩)؛ داوداری: كنز الدرر، **بەشی شەشەم**، لاپەڕە (٢٣٤)؛ ئیبنولكەسیر: البداية والنهاية، بەشی دوازدەهەم، لاپەڕە (١٢٤).
٧٢- فارقی: تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (٢٠٩)، ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٣٤)؛ التاريخ الباهر، لاپەڕە (٥)؛ ئەبو شامە، كتاب الروضتين، ساغكردنەوەی: محەمەد حلمی محەمەد ئەحمەد، قاهیرە، ١٩٦٢ز، بەشی یەكەم، پاری یەكەم، لاپەڕە (٥٩)؛ ئیبنولعەدیم: زبدة الحلب، بەشی دووەم، لاپەڕە (٨٤).
٧٣- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی (عەمیدولدەولە) بڕوانە: ئیبنو طەبا طەبا: الفخري، لاپەڕە (٢٣٨)؛ دیوەچی: تأريخ الموصل، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٢٠٠).
٧٤- قەسیمولدەولەی كوڕی عەبدوڵڵای ناسراو بە (حاجب)، باپیرەی بنەماڵەی ئەتابەكی خاوەنی (موصل)ەو باوكی (عیمادەدینی زەنگی)شە، یەك لە مەمالیكەكانی سوڵتان مەلەكشاهی



سەلجوقی بوو، سوڵتان مەلەكشاه لە ساڵی (٤٧٩ك/ ١٠٨٧ز) كردییە والی شاری (حەلەب)، بە هۆی ئەوەش كە رۆڵێكی گەورەی لەسەر شانۆی رووداوە سیاسی و سەربازییەكانی دەوڵەتی سەلجوقی بینیوە، مێژوونووسان گرنگییەكی تایبەتییان پێداوە، لە ساڵی (٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز) لە كاتی شەڕكردنی لەگەڵ (تاجولدەولە تەتش)دا دەكوژرێت...
ئیبنولعەدیم: بغية الطلب، هەردوو لاپەڕەكانی (٩٧-١١٠)؛ ئیبنوخەلەكان: وفيات الأعيان، بەرگی یەكەم، لاپەڕە (٢٤١)؛ بۆ زانیاری زیاتریش لە بارەی بگەڕێوە بۆ: عیمادەدینی خەلیل: عمادالدين الزنكي، موصل، ١٩٨٥ز، هەردوو لاپەڕەكانی (٣١)و (٣٥).
٧٥- لە بارەی (ئەرتەقی كوڕی ئەكسەب) بڕوانە لاپەڕە (٢٦٣) لە بەشی پێنجەمی دەقە عەرەبییەكە.
٧٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٣٤).
٧٧- لە سەرچاوەكاندا، ژیاننامەی ئەم دوو میرەی دوایی ناكەونە بەرچاو، لەوانەیە دوو لە كەسایەتییەكانی (میافارقین)بن، هەرچی میری یەكەمە، واتە (ئەبولهیجائی رووادی)، عەبدولرەقیب یوسف لەو بڕوایەدایە، یەك بێت لە میرەكانی میرنشینی رووادی لە ئازەربێجان و بە یەك لە هۆیەكان هاتبێتە وڵاتی مەروانییەكان، وەكو تێبینیش دەكرێت، ناوبراو تەنانەت تا دوای رووخانی میرنشینی مەروانیش، هەوەكو میرێكی دیارو ناسراوی ناوچەكە مایەوە «الدولة الدوستيكية، بەشی یەكەم، لاپەڕەكانی (٣٠١-٣٠٢).
٧٨- فارقی: تأريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕەكانی (٢٠٨-٢٠٩)؛ یوسف: الدولة الدوستكية، بەشی یەكەم، لاپەڕە (٣٠١).
٧٩- سەبطی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٢٣٣).
٨٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٨١- تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (٢١٠).
٨٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە (٢١١).
٨٣- فارقی: تاريخ آمدو ميافارقين، لاپەڕە (٢١٠)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٣٤)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕەكانی (٧٥-٧٦)؛ ئیبنولعەدیم: زبدة الحلب، بەشی دووەم، لاپەڕە (٨٤)؛ فەوزیە یونس فەتاح: علاقات الموصل مع الدولة العباسية، نامەیەكی ماجستێری بڵاونەكراوەیە، زانكۆی مووسڵ، ساڵی ١٩٨٧ز، لاپەڕە (١٥٤).
٨٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٤)؛ سەبطی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (٢٣٦).
٨٥- فارقی: تاريخ آمدو ميافارقين، هەردوو لاپەڕەكانی (٢٠٩)و (٢١٢)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٤)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەكانی (١٤٣-١٤٤)؛

ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٩٦).

٨٦- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕەکانی (٢١٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٤٣)؛ ئیبنولکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوازدەم، لاپەڕە (١٢٧)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٦).

٨٧- أحسن التقاسیم، لاپەڕە (١٤٠).

٨٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٤٣)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٦).

٨٩- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢١٢)، ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٤٤)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (٢٩٨-٢٩٩).

٩٠- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٤٤).

٩١- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢١٢).

٩٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو. لاپەڕە (٢١٤).

٩٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩٤- الإمارة المروانیة، لاپەڕە (١٠٧).

٩٥- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢٨٥)؛ الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٢٢)؛ بغیة الطلب، لاپەڕە (١١٧)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕەکانی (٣١٥-٣١٦).

٩٦- ئەمە (ئەبو نەسر حەسەنی کوڕی (ئەسەدی فارقی)یە، لە ساڵی (٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز) مردووە، پێشەواو نەحوی و زمانەوان بووە، خەڵکی میافارقین بووە، لە بوارەکانی زمان و ئەدەبدا دانراوی زۆری هەیە .. بڕوانە: قەفطی: أنباء الرواة، ساغکردنەوەی: محەمەد ئەبولفەزل ئیبراهیم، قاهیرە (١٩٥٠ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٤)؛ سیوطی: بغیة الوعاة، ساغکردنەوەی محەمەد ئەبولفەزل ئیبراهیم، قاهیرە (١٩٦٥ز)، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٠٠).

٩٧- یاقوتی حەمەوی: معجم الادباء، (بەبێ ساڵی چاپ) مەرجیلوت پێیداچۆتەوە، (مصر ١٩٢٣، ١٩٣٠ز)، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٥٦)؛ أنباء الرواة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٤)؛ صەفەدی: الوافي بالوفیات، بەشی یازدەهەم، لاپەڕە (٤٠٢)؛ بغیة الوعاة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٥٠٠).

٩٨- تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕەکانی (٢٣٢-٢٣٣)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣١٦).

٩٩- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢٣٥)؛ ئیبنولعەدیم: بغیە الطلب، لاپەڕ (١١٧)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٤٠)؛ یوسف: الدولة الدوستکیة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٣١٦).



١٠٠- لەبارەی هەوڵەکانی (تاجولدەولە تەتش) بۆ باڵکێشان بەسەر هەرێمەکانی دەوڵەتی سەلجوقی، بڕوانە هەردوو لاپەڕەکانی (٢٥٢-٢٥٧) لە دەقە عەرەبییەکە.

١٠١- فارقی: تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢٣٦)؛ ئیبنولعەدیم: بغیة الطلب، لاپەڕە (١١٧)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٤٠).

١٠٢- تاریخ آمدو میافارقین، لاپەڕە (٢٤٧)

١٠٣- (شەمسولدەولە جگەرمش) یەکێکە لە میرە سەلجوقییەکان، لەنێوان ساڵانی (٤٩٥-٥٠٠ک/ ١١٠١-١١١٥ز) کاروبارەکانی مووسڵی گرتەئەستۆ، .. ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٤٢)؛ هەندێ لە لێکۆڵەرە کوردەکان لەو بڕوایەن (جگەرمش) لە کوردەکانی (بەنو وەهبان)ی دانیشتوانی جەزیرەی ئیبنو عومەرە، بەڵام خزمەتی سەلجوقییەکانی کردووە، بەمە بۆتە یەک لە فەرماندەکانیان .. ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی چوارەم، لاپەڕە (٣)؛ مەحموود: الهذبانیون في آذربیجان، لاپەڕە (٥٤)، پەراوێزی ژمارە (٤).

١٠٤- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٥٦)؛ حەمەوی: التاریخ المنصوري، لاپەڕ (١٥٨).

١٠٥- لەگەڵ کۆتایی سەدەی پێنجی کۆچی/ یازدەی زایینی، ئەرتەقییەکان دەستیان بەسەر کۆمەڵێک شارو قەڵای (دیاربەکر) داگرت، بەمەش لەو ناوچانە میرنشینی ئەرتەقییان دامەزراند، لە ساڵی (٥٠٢ک/ ١١٠٨ز)یش دەسەڵاتەکەیان بووە دوو بەش، یەکەمیان لە (حصن کیفا)و ئەوی تریان لە (ماردین)بوو ..(حیسامەدینی تەمرتاش)یش یەکێکە لە میرە ئەرتەقییەکانی ماردین، لەنێوان ساڵانی (٥١٦-٥٤٧ک/ ١١٢٢-١١٥٢ز) فەرمانڕەوایێتیی کردووە .. ماردینی: دەستنووسی (تاریخ ماردین)، لاپەڕە (٢٠٩)؛ محەمەد خەزری بەگ: محاضرات تاریخ الأمم الإسلامیة، لاپەڕەکانی (٤٥٢-٤٥٣)؛ مینورسکی: ماددەی (تەیمور طاش)، دائرة المعارف الإسلامیة، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩٨)؛ بۆ زانیاری زیاتریش لە بارەی ئەرتەقییەکان بڕوانە: بەشی پێنجەمی دەقە عەرەبییەکە، هەردوو لاپەڕەکان (٢٦٢)و (٢٦٧).

١٠٦- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی یازدەهەم، لاپەڕە (٦٥).

١٠٧- یاقوتی حەمەوی: معجم الادباء، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٦١)؛ ئیبنولعەدیم: بغیة الطلب، لاپەڕە (١١٨)؛ صەفەدی: الوافي بالوفیات، بەشی یازدەهەم، لاپەڕە (٤٠٣)؛ قەفطی: أنباء الرواة، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٩٧).

١٠٨- ئیبنولقەلانسی: ذیل تأریخ دمشق، لاپەڕە (١١٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (١٤٨)و (١٥٠).

١٠٩- (شەعیر): لە سەرچاوە جوگرافییەکاندا نەگەیشتینە ئەنجامێک لەبارەی دەستنیشانکردنی

شوێنەکەی، بەڵام رای زیاتر لەسەر ئەوەیە، قەڵایەک بوو بێت، لەنێوان مووسڵ و وڵاتی شامدا.

١١٠- ئەم گێڕانەوەیە بە تەنیا یەک مێژوونووسی فارس بە ناوی (هەمەدانی) لای خۆی تۆماری کردووە، کە لە پێشەکی کتێبەکەیدا هاتووە، کتێبەکەشی لە ساڵانی نێوان (٥٧١-٥٩٠ک) نووسیوە، ناوی ناوە (عجایب نامە) و پێشکەشی سوڵتان (تەغرولی کوڕی ئەرسەلان)ی سەلجوقیی کردووە، ئەم کتێبە کۆمەڵێک رووداوی دەگمەن و سەیر بەخۆوەدەگرێت، کە دانەری کتێبەکە کۆی کردوونەتەوە، یەک لەو گێڕانەوانەشی ئەوەیە کە لەبارەی ئازایەتی ئەو میرە کوردەی خاوەنی قەڵای (شەعیر) تۆماری کردووە.

١١١- عجایب نامە: تەهران، ١٩٩٦ز، لاپەڕە (٤٥٦).

١١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١١٣- بگەڕێوە بۆ هەردوو لاپەڕەکانی (١٣٣-١٣٤) لە دەقە عەرەبییەکە.

١١٤- سەبطی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١٧٢)؛ نەقشەبەندی، الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٤١).

١١٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٣٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دوانزدەهەم، لاپەڕە (٢)، لاپەڕە (٢٢٢) .

١١٦- ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢٢) .

١١٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٤٦)؛ (خەفتیذکان)یش قەڵایەکە لەنێوان (ئەربل)و (شەهرەزور).

١١٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٤٦).

١١٩- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٤٦).

١٢٠- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٣٤٦-٣٤٧).

١٢١- نەقشەبەندی، الكرد في الدينور، لاپەڕە (٢٤٥).

١٢٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٤٨)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢٢)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٨).

١٢٣- الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٤٣٨).

١٢٤- بەدلیسی، لاپەڕە (٤٢).

١٢٥- مەحموود: الهذبانيون في آذربيجان، لاپەڕە (٩٨)و لاپەڕەکانی دوای.

١٢٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٦٣٥)؛ ئیبنولمستەوفی: تاريخ أربل، ساغکردنەوەی: سامی کوڕی سەید خەماسی صەفار، بەغداد، ١٩٨٠ز، بەشی دووەم، لاپەڕە (٤٦٢)؛ حوسێن: أربيل في العهد الاتابكي، لاپەڕە (٣٨)؛ دائرة المعارف الإسلامية، ماددەی



(أربل)، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٢٠)..

١٢٧- ئوسامە کوڕی مونقیذ: کتاب الاعتبار، لاپەڕە (٨٧).

١٢٨- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢٥٨-٢٥٩).

١٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٤٢٢-٤٢٥)؛ ئەرسن موسا رەشید: الهذبانيون و دورهم السياسي والعسكري في القرن الخامس الهجري، لێکۆڵینەوەیەکە پێشکەشی کۆلیجی ئاداب زانکۆی سەلاحەدینی کردووە، ساڵی ١٩٨٥ز، لاپەڕە (٩).

١٣٠- مەحموود: الهذبانيون في آذربيجان، لاپەڕە (١٠٥).

١٣١- سەبطی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، لاپەڕە (١٨٩)؛ ئەبو شامە: الروضتين، بەشی یەکەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٧٧)؛ ئیبنو واصل: مفرج الكروب، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٩٨)، بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: مەحموود: الهذبانيون في آذربيجان، هەردوو لاپەڕەکانی (٥٨)و (٦٢).

١٣٢- بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی (١٧٥)و (١٧٦)ی دەقە عەرەبییەکە.

١٣٣- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١١٢)؛ جەواد: جاوان، لاپەڕەکانی (٢١)و (٢٢).

١٣٤- کۆتایی ئەو میرە نازانرێت، بە بێجگە ئاماژەیەک کە لە رووداوەکانی ساڵی (٤٨٨ک/ ١٠٩٥ز) لە بارەیەوە هاتووە، ... بڕوانە: ئیبنو الجوزي: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٨٤)و (٨٥)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٦٩)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٤٤٠)و (٤٤٩).

١٣٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی یازدەهەم، لاپەڕەکانی (٢٩٦)و (٢٩٧).

١٣٦- فنك: قەڵایەکی سەختی تۆکمەی کوردە بەشنەوییەکان بوو، لە نزیک جەزیرەی ئیبنو عومەر، دووری نێوانیان دوو فەرسەخە، بە واتە (١٢ کم) .. یاقوت: معجم البلدان، بەشی چوارەم، لاپەڕە (٢٧٨).

١٣٧- الكامل، بەشی یازدەهەم، لاپەڕە (٤٣٨)؛ ئیبنولئەثیر دەڵێت: فێنک یەک لە سەختترین و پارێزراوترین قەڵایەو، لەسەر چیایەکی بەرزە، هی کوردە بەشنەوییەکانە.

١٣٨- آثار البلاد، لاپەڕەکانی (٤٣١-٤٣٢).

١٣٩- الكامل، بەشی یازدەهەم، لاپەڕەکانی (٤٣٨-٤٣٩).

١٤٠- تلخيص مجمع الآداب، بەشی چوارەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٣٧٩).

١٤١- بگەڕێوە بۆ بۆ هەردوو لاپەڕەکانی (١١٤)و (١٢٣)ی دەقە عەرەبییەکە.

١٤٢- لەبارەی سیستمی فەرمانڕەوایی تایبەت بە میرنشینە کوردییەکان، بەر لە رووخانیان، بڕوانە: نەقشەبەندی، الكرد في الدينور، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٥٢)و (٢٥٨)؛ آذربیجان، هەردوو لاپەڕەکانی (٣٧٦)و (٤٠٤)؛ رەسول: الشداديون، هەردوو لاپەڕەکانی (٩٨)و (١٠٥)؛

مەحموود: الهذبانيون في آذربيجان، هەردوو لاپەڕەكانى (١٢٧)و (١٤٥)؛ تكريتى: الإمارة المروانية، لاپەڕە (١٥٢) و لاپەڕەكانى دواترى.
١٤٣- راحة الصدور، لاپەڕە ( ١٩٨).
١٤٤- ئيبنولقەلانسى: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٥٩)
١٤٥- ذيل تأريخ دمشق، لاپەڕە (١٠٦).
١٤٦- فامبرى: تاريخ دمشق، لاپەڕە (١١٣).
١٤٧- نەيسابورى: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣٢)؛ ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕە (٧٩)؛ The Cambridge History of Iran VOL 5, P. 237 .
١٤٨- (الاقطاع) كۆيە، تاكەكەى (قطيعە)يە، لە زماندا (أقطعه الشيء) واتە ڕێگەى دا بە بڕينى، (قطيعة)ش پارچەيەكە لە زەوى لە بەرامبەر (خيراج)ێک كە پێى دەدرێت، سوڵتان بە خەڵكێكى دەدات؛ ئيبنو مەنظور: لسان العرب، بەشى هەشتەم، لاپەڕە (٢٧٦)؛ (قەلقەشەندى)ش دەڵێت: سەرجەم ئەم (قطعە) زۆرانەى كە دراونەتە ميرەكان، بريتينە لە پارچە زەوييەک، خاوەنى (قطعە) كە خۆى هەڵسوكەوتى تيادەكات و، بەشێک لە سوودەكانى ئەو پارچەيەى بە دەوڵەت دەدات .. صبح الأعشى، بەشى چوارەم، لاپەڕە (٥١).
١٤٩- لە بارەىماناى (ئەتابەک)و سەرهەڵدانى لە ماوەى دەسەلاتى سەلجوقى، بڕوانە: بەشى پێنجەم، هەردوو لاپەڕەكانى (٢٥٧)و (٢٥٩).
١٥٠- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕە (٧٩).
١٥١- مونجيم باشى: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢).
١٥٢- ئيبراهيم عەلى طەرخان: النظم الاقطاعية في الشرق الأوسط، قاهيرە، ١٩٦٨ز، لاپەڕە (٢١)؛ حەسەنێن: أربيل في العهد الأتابكي، لاپەڕە (٢٢).
١٥٣- نەعمان ثابت: الجندية في الدولة العباسية، بەغداد، (١٩٥٦ز)، لاپەڕە (٢٩٢)؛ تاريخ العراق، لاپەڕە (٣٢٩).
١٥٤- النظم الاقطاعية، لاپەڕە (٢١).
١٥٥- بەندارى: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٦٠)؛ النظم الاقطاعية، لاپەڕە (٢٤)؛ أربيل في العهد الأتابكى، لاپەڕە (٢٣).
١٥٦- مونجيم باشى: جامع الدول، لاپەڕە (٢٠٢)؛ ئەحمەد سەعيد سلێمان، تاريخ الدول الإسلامية، مصر، ١٩٧٢ز، لاپەڕە (٣٥٨)؛ Studies in Cacasian History, P. 169.
١٥٧- نەقشەبەندى، آذربيجان، لاپەڕە (١٧٩).
١٥٨- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕە (٢٨١).



١٥٩- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (٤٤٥).
١٦٠- آذربيجان، لاپەڕە (١٨٢).
١٦١- يوسف: حضارة الدولة الدوستكية، بەشى دووەم، لاپەڕەكانى (١١٣-١١٤).
١٦٢- تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕە (٢٦٦).
١٦٣- قەلقەشەندى: صبح الأعشى، بەشى چوارەم، لاپەڕە (٣٠).
١٦٤- صەفەدى: الوافي بالوفيات، بەشى يازدەهەم، لاپەڕە (٤٠٢)؛ سيوطى: بغية الوعاة، بەشى يەكەم، لاپەڕە (٥٠٠).
١٦٥- تأريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕەكانى (٢٠٣-٢٠٤).
١٦٦- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (٢٠٤).
١٦٧- ئيبنولجۆزى: المنتظم، بەشى نۆيەم، لاپەڕە (٦)؛ ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕە (١٢٩).
١٦٨- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕە (١٢٩)؛ ئيبنوكەثير: البداية والنهاية، بەشى دوازدەهەم، لاپەڕە (١٢٤).
١٦٩- فارقى: تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕە (٢١٢).
١٧٠- هەمان سەرچاوەى پێشوو.
١٧١- هەمان سەرچاوەى پێشوو.
١٧٢- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (٢١٢).
١٧٣- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕەكانى (٢١٤)و (٢١٥).
١٧٤- قەلقەشەندى: صبح الأعشى، بەشى چوارەم، لاپەڕەكانى (٢٨-٢٩).
١٧٥- فارقى: تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕە (٢١٧).
١٧٦- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (٢١٦).
١٧٧- هەمان سەرچاوەى پێشوو، لاپەڕە (٢١٢).
١٧٨- هەمان سەرچاوەى پێشوو؛ بەندارى: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٧٦).
١٧٩- ئيبنولئەثير: الكامل، بەشى دەيەم، لاپەڕەكانى (١٢٩-١٣٠).
١٨٠- حصن زياد: قەلايەكە لە ئەرمينيا، بە (خەرتبرت) دەناسرێت و دەكەوێتە نێوان (آمد)و (ملطية) .. ياقوت؛ معجم البلدان، بەشى دووەم، لاپەڕە (٢٦٤).
١٨١- تاريخ آمد و ميافارقين، لاپەڕەكانى (٢١٢-٢١٣)؛ ئەو مێژوونووسە دەڵێت: دواى ئەوەى (حصن زياد) بە دەست منداڵەكانى مير (جبقا)ەوە بوو، يەک لە ميرەكانى ميرنشينى ئەرتەقى توانى لێيان بسێنێت و بيخاتە سەر ناوچەكانى ژێر دەسەلاتى خۆى، ئێستاش كۆمەڵێک لە نەوەى

ئەو میرە تورکمانە ماون، لە (حصن کیفا) دادەنیشن و لە خزمەت ئەرتەقییەکانی ئەو (حصن)ەن .. لاپەڕە (٢١٣).

١٨٢- فارقی: تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕە (٢١٩).

١٨٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٥٨)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوقی، لاپەڕە (٧٦)؛ ئیبنو کەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوازدەهەم، لاپەڕە (١٣١).

١٨٤- ئەبو ئیسحاقی شیرازی (٣٩٣-٤٧٦ک/ ١٠٠٢-١٠٨٣ز) لە رووی زوهدو زانستەوە، یەک لە کەسایەتیە دیارەکانی مێژووی عەباسییە، وەکو مودەڕیس لە قوتابخانەی نیزامییە لە بەغدا دەرسی گوتۆتەوە، بەوە جیاکراوەتەوە کە لەو ماوەیەدا پایەکی بەرزی لەنێو کۆمەڵگای بەغدا هەبووە.. ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٩)و (٣١)؛ حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٤٩).

١٨٥- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٢٥).

١٨٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٦).

١٨٧- تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕە (٢٢٢).

١٨٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٢٢-٢٢٣).

١٨٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٣).

١٩٠- تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕەکانی (٢٢٤-٢٢٥).

١٩١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٩٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٢٥).

١٩٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەکانی (٢٢٧-٢٢٨).

١٩٤- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٥٧)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٨٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٠٠) .

١٩٥- فارقی: تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕە (٢٢٨).

١٩٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٢٨- ٢٣٠).

١٩٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٣٠-٢٣١).

١٩٨- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٣)؛ بەنداری: تأریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨١)؛ ئیبنو تەغری بەردی: النجوم الزاهرە، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٣٥)؛ حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٧٧).

١٩٩- فارقی: تاریخ آمد و میافارقین، لاپەڕە (٣٧٧).



٢٠٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٠١- الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٤٣).

٢٠٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٣٣)؛ ئیبنو کەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوازدەهەم، لاپەڕە (١٤٤).

٢٠٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (١٠٦).

٢٠٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢٠٥- ئیبنو خەلەکان: وفیات الأعیان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٩١)؛ صەفەدی: الوافي بالوفیات، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٣٣٦)؛ قەرمانی: أخبار الدول، لاپەڕە (٢٧٨)؛ بوستانی: دائرة المعارف، بەشی دووەم، لاپەڕە (٧٨٦).

٢٠٦- کاهن: دائرة المعارف الإسلامیة، ماددەی ئەرتەق، بەشی دووەم، لاپەڕە (٥٢٦).

٢٠٧- ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٩١)؛ قەرمانی: أخبار الدول، لاپەڕە (٢٧٨)

٢٠٨- ئومید ئیبراهیم جوزەلی: الحیاة العلمیة في أربیل، نامەیەکی ماجستێری بڵاونەکراوەیە، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٢ز، لاپەڕە (١٢).

٢٠٩- الهذبانیون في آذربیجان، لاپەڕە (١٠٥).

٢١٠- ئیبنو خەلەکان: وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە (١٩١)؛ حوسێن: أربیل في العهد الأتابکي، لاپەڕەکانی (٣٧-٣٨).

# بەشی پێنجەم

## هەرێمە کوردییەکان لە دوای مردنی سوڵتان(مەلەکشاه)دا

**یەکەم: کێشەی نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکان و کاریگەریی لەسەر وڵاتی کورد.**

**دووەم: زاڵبوونی تاجولدەولە (تەتشی کوڕی ئەلب ئەرسەلان) بەسەر هەرێمە کوردییەکان.**

**سێیەم: ئەتابەکیەتەکان لە وڵاتی کورد و سەردەمی سەلجوقی.**

١- ئەتابەکیەتی ئەرمینینا(شایەکانی ئەرمینیا لە خەلاّت)

٢- میرنشینی(ئەرتەقییە) لە (دیاربەکر).

٣- (ئەحمەدیلییە) لە (ئازەربێجان).

**چوارەم: بارە سیاسییەکانی کورد لە سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی و تا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەی زەنگی.**

**- دروستبوونی ئەتابەکیەتی زەنگی لە موسڵ و کاریگەرێتیی لەسەر میرنشین و دەسەلاّتە کوردییەکان.**

**یەکەم: کێشەی نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکان و کاریگەریی لەسەر وڵاتی کورد.**

دەوڵەتی سەلجوقی لە سەردەمی سوڵتان(مەلەکشاه)(٤٦٥-٤٨٥ک/ ١٠٧٢-١٠٩٢ز) گەیشتە لوتکەی هێز و فراوانی، سوڵتان توانی گەلێک هەرێم و ویلایەت بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی، تورکەکانیش دوای ئەوە لەو ناوچانەدا رێگەیان بۆ خۆشکردن و تیایدا قەراریان گرت.

ئەو سیستەمەی مەلەکشاه بۆ کارگێڕییەتی دەوڵەتەکەی دایهێنا دەرەبەگایەتی بوو، هات بۆ هەر یەکە لە میرەکانی، ناوچە یان هەرێمێکی دابڕی، بۆ ئەوەی کاروبارەکانی بەڕێوە ببات، بێ ئەوەش بۆ ئەمە بگەڕێتەوە لای دەسەلاتی ناوەند، لە بەرامبەر ئەوەشدا، ئەو میرانە ساڵانە دەبوو بڕێک پارە بۆ ناوەندی فەرمانڕەوا(دەسەلاتی ناوەندی) بنێرن و کاتێکش پێویست بوو هەندێ سەربازیان پێشکەش بکەن(١).

بەڵام ئەم فراوانبوون و ئەو هێزە، زۆریان درێژە نەکێشا، بەڵکو لەگەڵ کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی سوڵتان(مەلەکشاه) ئاژاوە و پەشێوی جۆراوجۆر ڕووبەڕووی سەلجوقییەکان بوونەوە، چونکە سوڵتان(مەلەکشاه) لە لایەکەوە لەگەڵ (نیزامولمەلیک)ی وەزیری و لەو لاشەوە لەگەڵ (موقتەدی بی ئەمرێللا)ی خەلیفەی عەباسی (٤٦٧-٤٨٧ک/ ١٠٧٥-١٠٩٤ز) کەوتە ململانێ، بۆیە ئیتر بەیەکەوە گونجان، لە نێوان سوڵتان و وەزیرەکەیدا، شتێکی ئاسان نەبوو(٢).. ململانێی توند کەوتە نێوانیان، وەزیر زێدەڕەوی لە هەڵسوکەوتەکانیدا کرد، منداڵ و لە خۆ نزیکەکانی خستنە سەرتەختی ویلایەتەکان، کاتێک سوڵتان دەرکی بەو دەسەلاتە گەورەیە کرد، کە وەزیرەکەی پێی گەیشتووە، ترسا دەسەلاتەکەی خۆی لە دەست بچێت، بۆیە نامەیەکی بۆ رەوانکرد، تیایدا نووسی: (ئەگەر تۆ لە موڵکدا هاوبەشمی و لە دەسەلاتدا دەستت لەگەڵ دەستی من دایە، ئەوە حوکمی خۆی هەیە، ئەگەریش تۆ جێگرمی و لە ژێر فەرمانڕەوایی من دای، ئەوا پێویستە پابەندی سنوورەکانی جێگری و شوێنکەوتەیی بیت، ئەو منداڵانەشت هەر یەکەیان دەستی بەسەر پارچەیەکی گرنگ و ویلایەتێکی گەورەدا گرتووە، کەچی ئەمەش قەناعەتی بۆ دروست نەکردوون هاتوون لە سیاسەتدا لایانداوە و بە ناڕەوا چاویان بڕیوەتە شتی زیاتر، تا وایان لێهات ئاوا و ئاوایان کرد...(٣).

وەڵامی وەزیر (نیزامولمەلیک)یش رەقتر و توندتر بوو، بە سوڵتانی گوت: (ئەگەر تا



ئێستا نەتزانیوە، من لە موڵکدا هاوبەشتم، ئەوا بیزانە، چونکە تۆ کە گەیشتویتە ئەم پایە، بە راو تەدبیری من بووە)... ئینجا گوتی: (سوڵتان ئەوەی نایەتەوە یاد، کاتێک باوکی کوژرا، من هەڵسام بە سەرپەرشتی کردنی، خەواریجەکانی نێو ئالی خۆیشی و بێجگەی ئەوانیش کاتێک لێی راپەڕین، سەرکوتم کردن. ئەو کاتە، ئەو دەستی پێمەوە دەگرت و پابەندم دەبوو و سەرپێچی نەدەکردم، بەڵام کاتێک کاری بۆ یەکلابووەوە و رای خەڵکانی لەسەردا گردبووەوە، شارە دوور و نزیکەکانی بە رووداا کرانەوە و، خەڵکە دوور و نزیکەکان گوێڕایەڵییان کرد، وای لێهات تاوانی بۆ هەڵدەبەستام... جا ئەگەر سوورە لەسەر گۆڕانێک، با بەر لە ڕوودانی ئامادەیی بۆ وەربگرێت)(٤).

ئەم بەیەکدا چوونە قسەییە، چەندێتی گرژی پەیوەندی نێوان سوڵتان و وەزیرەکەیمان بۆ روون دەکاتەوە... بۆیە لە کوژرانی (نیزامولمەلیک) کە لە ساڵی(٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز) و لە دوای ئەم ناکۆکییە هات، پەنجەی تاوانبارکردن بۆ سوڵتان درێژ دەکرێت، لەوەی کەوا دەستی هەبێت لە رێکخستنی ئەم تیرۆرە(٥)، چونکە (مەلەکشاه) و (نیزامولمەلیک) لە شاری (ئەسفەهان)ەوە، بە ئاراستەی (بەغدا) دەگەڕانەوە لە رێگادا، لە هەرێمی (چیاکان)(٦) لە رۆژی(١٠)ی رەمەزاندا (وەزیر) بە دەستی پیاوێکی (باتنی) کوژرا(٧).

کوژرانی وەزیر (نیزامولمەلیک) زیانێکی گەورەبوو بۆ دەوڵەتی سەلجوقی، چونکە کەسێک بوو، کەسایەتیەکی بەهێز و ئەقڵێکی گەورە و تەدبیرێکی دروستی هەبوو، بۆیە بە هۆکارێکی کاریگەر لە هۆکارەکانی پشتگیریکردن و چەسپاندنی، بینای قەوارە سیاسییە سەربەخۆکەیان دادەنرا، لە جیهانی ئیسلامی(٨).

زیاد لە زەقبوونەوەشی وەکو وەزیر و سیاسییەکی زیرەک، گرنگی بە زانست و ئەدەب و رۆشنبیریش دەدا، رێزی لە زانا و نووسەران دەنا، خاوەن رۆشنبیریەکی فراوانبوو، دامەزراندنی زۆربەی قوتابخانەکان، کە بە ناوی ئەوەوە ناونران – قوتابخانەکانی نیزامی– چاکەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێیەوە، وەکو دەردەکەوێت، شارە کوردییەکانیش بە دەوری خۆیان، بێبەش نەبوونە لە سوود وەرگرتن لەو قوتابخانانە، بە ئاماژەیەک لە مێژوونووسانەوە: (هیچ وڵاتێک لە شتێک لەوانە– ئەو قوتابخانانە/ وەرگێڕ– خاڵی نەبوو، تەنانەت جەزیرەی (ئیبن وعومەر)یش، کە ئەمە گۆشەیەکە لە زەوی، گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادرێت، قوتابخانەیەکی گەورەی باشی تیا بیناکراوە)(٩).

ئەم قوتابخانەیە بۆ چەندین سەدە چالاکیە زانستیەکانی پێشکەش دەکرد، بە قوتابخانەی(رضی الدین) دەناسرا[١٠]، بنکەیەکی بلاوکردنەوەی زانست و رۆشنبیری بوو، لە نێوان دانیشتوانە کوردەکانی ناوچەکە.

سوڵتان(مەلەکشاە) دوای کوژرانی (نیزامولمەلیک) زۆر تەمەن درێژ نەبوو، بەڵکو دوای ئەو بە سی و پێنج رۆژ لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد[١١].

سەلجوقییەکان بە مردنی سوڵتان و کوژرانی وەزیرەکەی، دوو کەسایەتی بەهێزی سیاسەتزان و بە ئەزموونی بوارەکانی کارگێڕی و سەربازییان لە دەستدا، کە بەو بەهێزیەیان، ئەوان دەوڵەتیان بەهێز دامەزراندبوو، ئیشوکارەکانیان باش رێکخستبوو، بەڵام دوای ئەوان وای لێهات لاوازی لە ناوەوە قەوارەکەیان بخواتەوە، چونکە دوای (مەلەکشاە) دابەشبوون و ململانێ لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات، کەوتە نێو منداڵەکانی[١٢].

مردنی سوڵتان چەندین ئەنجامی خراپی لێکەوتەوە، چونکە چاکەی بە دەستهێنانی چەندین دەستکەوتی زۆر بۆ دەوڵەتی سەلجوقی و لەسەر هەردوو ئاستی ناوە و دەرەوە بۆ ئەو دەگەڕایەوە، بۆ نموونە لەسەر ئاستی ناوخۆ، توانی سیاسەتێکی ناوەندی بینا بکات، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی چەندین ویلایەت و هەرێم، لە نێویشیاندا هەرێمە کوردییەکان، بگەڕێنەوە ژێر سایەی دەسەڵاتی ناوەندی، لەسەر ئاستی دەرەوەش لەبەرەی بێزەنتینییە توانی پێشکەوتنێکی ئاشکرا بە دەست بێنێت، چونکە بۆ یەکەم جار بوو، سەلجوقییەکان شوێن پێیان لە ئاسیای بچووکدا کردەوە و، بەمەش دەوڵەتێکی سەربەخۆیان لە دڵی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دامەزراند[١٣].

مەلەکشاە هەروەها توانی دەزگایەکی کارگێڕی تۆکمە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو هەرێمانە دابێنێت، کە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی، بۆیە لە ماوەی سەردەمەکەیدا، کە نزیکەی بیست ساڵی خایاند، لەبەر تۆکمەیی دەسەڵاتەکەی بەسەر کاروبارەکانی وڵات، رووبەڕووی کێشەیەکی سیاسی ئەوتۆ نەبووەوە، شیاوی باس بێت... بەڵام ئاسایش و ئارامی زۆر درێژی نەخایاند، چونکە دوای مردنی چوار کوڕی بەجێهێشت، ئەوانیش(بەرکیاروق) و(محەمەد) و (مەحمود) و(سەنجەر) بوون[١٤].

هیچ یەکێکیشان نەگەیشتبوونە ئەو تەمەنەی بتوانن بچنە سەر تەختی سەڵتەنەت،



بۆیە ململانێیەکی درێژ و تاڵ، لەسەر جێگرتنەوەی باوکیان، کەوتە نێوان ئەو برایانە[١٥].

لە سەرەتادا، لە ژێر کاریگەری (تورکان خاتون)ی دایکی، (مەحمود)ی کوڕی بچووک بەجێنیشنی باوکی لە (بەغدا) دامەزرێنرا[١٦]، کە بۆ زانیاری تەمەنی (مەحمود) ئەو کاتە لە چوار ساڵ زیاتر نەدەبوو، بەڵام (تورکان) دەسەڵاتی بەسەر کاروبارەکانی سەنتەری خەلافەتدا دەڕۆیشت، بۆیە بە خێرایی بۆ سەر تەخت بەرزکردنەوەی کوڕەکەی رێکخست، بەڵام لە هەندێ لە تیپەکانی سوپا (سەربازەکان) بیرۆکەی لەسەر تەخت دانیشتنی (مەحمود)یان قەبووڵ نەکرد، بەڵکو داوایان کرد، (بەرکیاروق)ی کوڕە گەورەی مەلەکشاە، هەڵبژێردرێ، بۆ ئەوەی ببێتە سوڵتانی دەوڵەتی سەلجوقی[١٧].

دانیشتنی (مەحمود) لەسەر تەختی سەڵتەنەت و، رەتکردنەوەی ئەمە لە لایەن شوێنکەوتووانی (بەرکیاروق)، بووە سەرەتای شەڕێکی تەڕ و وشک سووتێنەر و جیهانی ئیسلامی پارچە پارچە کرد، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، زۆربەی ئەو شەڕانەی لە نێوان ئەو برایانە روویاندا، گۆڕەپانەکەیان شارە کوردییەکان بوو، بە تایبەت هەرێمی(الجبال)(چیاکان) ئەمەش بەهۆی شوێنی جوگرافیی، کە دەکەوتە نێوان سەنتەری خەلافەتی عەباسی و سەنتەری فەرمانڕەوایی سەلجوقی، ململانێیەکەش سێبەری خۆی بەسەر سەرجەم ویلایەتە سەلجوقییەکان و لە نێویشیاندا هەرێمە کوردییەکان درێژ کردووە.

شارە کوردییەکانی هەرێمی چیاکان (الجبال)، لە دەرئەنجامی ئەو شەڕانەی لە نێوان دوو براکان (بەرکیاروق) و (مەحمود)دا روویاندا، بارێکی ئاڵۆزیان بە خۆوە بینی، ئەوەبوو دوای راگەیاندنی بە سوڵتان بوونی ئەوەی دوایین، (تورکان خاتون) بە یارەوی سەربازی سەلجوقییەکان بەرەو هەرێمی چیاکان(الجبال) هات[١٨]، چونکە (بەرکیاروق) دوای ئەوەی ناچاربوو، لە ترسی هێزە شەڕکەرە هاتووەکان، ئەسفەهانی شوێنی نیشتەجێی خۆی جێبێڵێ و، بەرەو هەرێمی چیاکان(الجبال) بێت، لە نزیک شاری (بروجرد)ی کوردی هەردوو هێزەکان پێکیانداداو سەرەنجام (بەرکیاروق) توانی شکستێکی گەورە بەسەر (تورکان خاتون) و هێزەکانیدا بێنێ، ئینجا دوای ئەوە خۆی بەرە و (ئەسفەهان) کشایەوە[١٩].

هیچ زانیارییەک لە بارەی کورد و رۆڵیان نییە، لەو ململانێیە توندەدا، زیاترین راش

ئەوەیە کە کورد وەکو رەگەزەکانی تر لە دەوڵەتی عەباسی، لە ئەنجامی ئەو بارە خراپەوە، ئازاری زۆریان کێشاوە، چونکە وەکو ئاشکرایە شەڕ و کوشت و بڕ وێرانە بە دوای خۆیدا دێنێ، کوردیش ئەگەرچی خۆیان لایەنێک نەبوون لەو ململانێیانە، بەڵام وڵاتەکەیان شانۆیەکی شەڕەکان بووە.

لە جەرگەی شەڕەکانی نێوان هەردوو برا، (بەرکیاروق) و (مەحمود) کێبڕکێکەرێکی سێیەمیش لە ساڵی(٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز) سەری هەڵدا و، داوای کرد خۆی ببێتە سوڵتان، ئەویش تاجولدەولە (تەتشی کوڕی ئەلب ئەرسەلان)ی برای سوڵتانی مردوو بوو، بەسەرهەڵدانی ئەویش بارەکە زیاتر گرژ و ئاڵۆز بوو، بە تایبەتیش سەبارەت بە وڵاتی کورد، چونکە (تاجولدەولە) باڵی بەسەر زۆربەی هەرێمە کوردییەکاندا کێشا، وەکو لەمەولا ئاماژەیان پێدەدەین.

سەرکەوتنی (بەرکیاروق) بەسەر (مەحمود)ی برای، لەشەری (بروجردا)دا یەکلاکەرەوە نەبوو، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەنجامی شەڕەکە لە بەرژەوەندی (بەرکیاروق) بوو، توانی لە پاشان کاروباری بۆ راستەڕێ بێ و، فەرمانڕەوایەتی بگرێتە دەست، بەڵام حەزەکانی (تورکان خاتون) بۆ بەرزکردنەوەی کوڕەکە بۆ سەر تەختی دەوڵەتی سەلجوقی، هێشتا تەواو نەبووبوو، بۆیە لە ساڵی(٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز)، (تورکان خاتون) هەوڵیدا مەیلی ئەمیری ئازەربێجان، (ئیسماعیل کوڕی یاقوتی) بەرەو خۆی رابکێشێت، بۆ ئەوەی شان بە شانیدا بووەستێت لە رووبەڕووبوونەوەی (بەرکیاروق)ی دوژمنی کوڕەکەی[٢٠]. جا ئەگەرچیش ئەم ئەمیرە سەلجوقییە ناوبراوە خاڵۆی (بەرکیاروق) بوو، بەڵام ئەم هەموو شت و وادە زۆرەی (تورکان خاتوون) پێیدا، لە خشتەی برد و وای لێکرد وەڵامی داواکاریەکەی بداتەوە، بۆیە ژمارەیەکی زۆری تورکمان و بێجگەی ئەوانیشی کۆکردەوە، (سەرهەنگ ساوتکین)ی خاوەنی هەرێمەکانی(ئاران)یش بە گەلی کەوت[٢١].

ئەم گێڕانەوەیەی پێشوو، ئاماژەیەکی گرنگی تیایە، لە هەرێمێکی کوردی، چونکە ئازەربێجان، کە تیایدا میرە کوردە (رووادییەکان) فەرمانڕەوایەتییان دەکرد، لە دەیەی هەشتەمی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی کەوتە دەست میرێکی سەلجوقی، ئەمەش دوای ئەوەی لە ساڵی (٤٦٩ک/ ١٠٧٦ز) ئەو میرنشینە کوردییە رووخا[٢٢]، ئیتر سوڵتان (مەلەکشاه)، ئەم هەرێمەی بە (یاقوتی) بەخشی، بۆ ئەوەی بە بەڕێوەبردنی



کاروبارەکانی هەڵسێت.

(مەلەکشاه)یش- وەکو لە پێشتردا ئاماژەمان پێدا- چەند هەرێمێکی تایبەتی بۆ میر و سەرکردەکانی دەوڵەتەکەی بڕیبووەوە، هەر یەکە لەو هەرێمانەش لە ئەستۆیان بوو، لە کاتی پێویستدا، ژمارەیەک سەرباز بۆ گەورەکەیان(مەلەکشاه) بنێرن[٢٣].

ئەگەرچیش سەرچاوە ئیسلامییەکان ئاماژەیان بە ناسنامەی پاڵپشتیکەرانی شەڕەکان نەدابێت، بەڵام دوور نییە کورد لەو شەڕانەدا بەشدارییان کردبێت، بە تایبەتی کە ململانێیەکە لەسەر زەوی کورددا بەڕێوە چوو، هەروەها ئاماژەکەی (ئیبنولئەثیر) تەواو ئاشکرایە، کاتێک نووسیویەتی (ئیسماعیل یاقوتی) ئەمیری(ئازەربێجان) (خەڵکێکی زۆری لە تورکمان و بێجگەی ئەوانیش کۆکردەوە)[٢٤]، ئەوەی زانراویشە، (ئازەربێجان)، ئەو ساکە ژمارەیەک شاری کوردی بەخۆوە گرتبوو جا کاتێک (یاقوتی) ئەو هێزانەی کۆکردبێتەوە، ئەگەری زۆری هەیە، لە نێویاندا کوردیش هەبوون.

هێزەکانی (تورکان خاتون) لە هەرێمی چیاکاندا(الجبال) کۆبوونەوە و لە لای شاری (کەرەج) -کە یەک لە شارەکانی هەرێمی چیاکان بوو- لەگەڵ هێزەکانی (بەرکیاروق) دایان بە یەک، سەرەنجام (ئیسماعیل یاقوتی) و سەربازەکانی شکان و بەرەو (ئەسفەهان) کشانەوە، (بەرکیاروق) و ئەوانەی سەر بە ئەویش شەڕەکەیان لە بەرژەوەندی خۆیدا بردەوە، بەمەش بالا دەستی خۆی گەڕاندەوە، لە سەپاندنی دەسەڵاتەکەی، مەسەلەکەش لە کۆتاییدا بە کوژرانی (یاقوتی) لەسەر دەستی یەک لە ئەمیر و سەرکردە سەلجوقییەکانی شوێنکەوتەی سوڵتان (بەرکیاروق) تەواو بوو[٢٥].

دوای ئەم شەڕە، لە نێوان لایەنگرانی (بەرکیاروق) و (مەحمود)دا، بارەکە تارادەیەک هێمن بووەوە، (بەرکیاروق) لە ساڵی(٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز) بەرەو (بەغدا) هات و لەسەر مینبەرەکاندا خوتبەی خوێندەوە، نامەی بۆ خەلیفەی عەباسی (موقتەدی بیئەمریللا) نارد و تیایدا داوای کرد، کە خوتبە بە ناوی ئەوەوە بخوێنرێتەوە، خەلیفەش رەزامەندی بۆ نواند و، بە (روکنولدین) ناونرا[٢٦]، دوای وەرگرتنی دەسەڵاتیش، توانی هەندێ لەو کێشانەی رووبەڕووی بوونەوە، چارەسەریان بکات، لە هەمان ساڵیشدا، واتە (٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز) (تورکان خاتون) لە (ئەسفەهان) مرد و دوای ئەو (مەحمود)یش مرد[٢٧]، بەمەش فەرمانڕەوایی بۆ (بەرکیاروق) یەکلابووەوە.

ئەم هەموو شەڕ و ململانێیەی نێوان سەلجوقییەکان، شوێنەواری خراپی بەسەر سەرجەم هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامی و تەنانەت سەنتەری خەلافەتیشدا جێهێلا، ئەوەتا خەلیفەی عەباسیش پارێزراو نەبوو لەو رووداوانە، بەڵکو بە هۆی خۆسەپاندنی سەلجوقییەکان بەسەر کاروبارەکانی فەرمانڕەوایی، ئەویش لە پایەی کەم بووەوە و دەسەڵاتی بەرەو لاوازی هات، ئەمە بێجگە لەوەش، کە بۆ سوڵتانەکانیان، سالآنە چەند جارێک، خەلیفەکان دەبوو چەندین نازناو ببەخشن، هەموو ئەم کارانەش هۆیەک بوون، بۆ شلەژانی باری ناوخۆی خەلافەت، لە هەموو رووەکانی سیاسی و ئابووری و دەروونی، بۆ وێنە لە ساڵی (٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز) خەلیفە (موقتەدی بی ئەمریللا)[٢٨] لە ناکاو کۆچی دوایی کرد، دوای خۆی (موستەزهیر بیللا)ی کوڕی[٢٩]، (٤٨٧-٥١٢ک/ ١٠٩٤-١١١٨ز) جێگەی گرتەوە، کە سوڵتان(بەرکیاروق) بەیعەتی پێدابوو، ئەم بەیعەتدانەی (بەرکیاروق)یش بۆ خەلیفە تا بگاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی، چەندێتی ئەو بارە لاوازیە پێشان دەدات، کە خەلافەت تێیدا دەژیا، چونکە راستەوخۆ کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان.

باری هەرێمە کوردییەکانیش لە باری ناوەخۆی خەلافەت باشتر نەبوو، چونکە لەو ماوە زەمەنییە، ئەو هەرێمانە کەوتنە دەست میرە سەلجوقییەکان، دەسەڵاتی سیاسی کوردیش هیچ رۆڵێکی باشیان نەما لە فەرمانڕەوایێتیی کردنی ولاتەکەیان، بۆیە سوڵتان(بەرکیاروق) هەڵسا بە دابەشکردنیان بەسەر خۆی و (محەمەد)ی برایدا، چونکە لە ساڵی(٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز) کە هاتە نێو بەغدا (محەمەد)ی برای یاوەری بوو[٣٠]، هات شاری جەنزە(کەنجە)ی کوردی و هەرێمەکانی سەر بەو شارەی بۆ ئەو برێبەوە[٣١]، ئیتر ئەم ناوچانە بوونە سەر بە (محەمەد) و هەروەهاش سوڵتان فەرمانی ئەوەی دەرکرد (ئەتابەک)ێک بۆ براکەی هەڵبژێرێت ئەویش ئەمیر(قەتلغ تکین) بوو[٣٢].

وەکو دەشزانرێت، سەلجوقییەکان ئەتابەکەکانیان بۆ ئەوە هەڵدەبژارد، تا ببنەبەرپرس و پەروەردەکەری منداڵە سوڵتانەکانیان، جا (قەتلغ تکین) کە وەک ئەتابەکێک بۆ (محەمەد) دامەزرێنرا، لەبەر بچووکی تەمەنی ئەوەی دووەم بوو، بەڵام کاتێک گەورەتربوو، دەسەڵات و هێزی زیادیان کرد، (قەتلغ تکین)ی کوشت و دەستی بەسەر هەموو شارە و شارۆچکەکانی (ئاران) و لە نێویشیاندا شاری(کەنجە)دا گرت[٣٣].



سوڵتان(بەرکیاروق) سوور بوو لەسەر هەڵبژاردنی والی و ئەمیرەکانی هەرێمەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە دوای ئەوەی هەرێمی (ئاران)ی بۆ (محەمەد)ی برای برێبەوە، هەرێمی (فارس)یش کە ئەو کات لە ژێر فەرمانڕەوایی میرەکانی (شوانکارە)دابوون، ئەویشی بۆ ئەمیر(ئەنر) برێبەوە[٣٤]، بەڵام کاتێک (ئەنر) ویستی فەرمانڕەوایەتی ئەو هەرێمە بگرێتە دەست، میرەکانی (شوانکارە) بەروویدا وەستان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی (ئەنر) نەتوانێ فەرمانڕەوایەتی هەرێمی ناوبراو بگرێتە دەست، ئەو کاتە سوڵتان(بەرکیاروق) داوای لێکرد، هەر لە هەرێمی چیاکان(الجبال) بمێنێتەوە، بەڵام (ئەنر) وای بە باشترزانی بەرەو هەرێمەکانی خۆی لە (ئازەربێجان) بگەڕێتەوە، لەوێوەش، بیری ئەوەی بۆ هات، کە لە سوڵتان یاخیبێت، بۆیە هەڵسا نامەیەکی بۆ (محەمەدی کوڕی مەلەکشاه)ی خاوەنی (کەنجە) نووسی، تێیدا داوای لێکرد، کە بەیەکرا کار بکەن، لە دژی (بەرکیاروق)ی برای[٣٥].

ئیتر لە ساڵی(٤٩٢ک/ ١٠٩٨ز) ململانێیەکی نوێ لە نێوان (بەرکیاروق) و (محەمەد)ی برای دەست پێدەکات، کە ئەمەی دوایین بووە سەرچاوەی نیگەرانییەکی زۆر بۆ سوڵتانی سەلجوقی، لەو ساڵەدا (محەمەد) ناوی براکەی لە (خوتبە)دا دەرکرد، لەمەودوا خوتبەی بە سوڵتان بوونی خۆی خوێندەوە، هەروەها سوپای کۆکردەوە، کەوتەڕێ بۆ شەڕکردن لەگەڵ (بەرکیاروق)[٣٦]، کۆمەڵێک میریش لە نێوانیاندا هەندێ لە میرە کوردەکانیش هاتنە پشتگیری سوپاکەی، ئەو میرانەش بریتی بوون، لە (کەربوخا)ی میری (موسڵ) و (جگرمش)ی میری (جەزیرەی ئیبن وعومەر) و، خاوەنی (گەنگور) میری (عەنناز)ی (سەرخاب کوڕی بەدر)[٣٧].

میرنشینی (عەنناز) کە سەرچاوەکان خۆ بە دوور دەگرن لە تۆمارکردنی هەر هەواڵێک لە بارەی و بۆ سالآنێکی زۆر لەگەڵ رووداوەکانی ساڵی(٤٩٢ک/ ١٠٩٨ز) جارێکی تر دەکەوێتەوە ژێر تیشک و، ئاماژە بۆ یەک لە میرەکانی دەکرێت، کە ئەمیش میر (سەرخاب)ە، فەرمانڕەوایەتی (عەنناز) بە دەست ئەو میرە ناوبراوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە بەهۆی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی سەلجوقییەکان، میرنیشەکە سەربەخۆیی خۆی لە دەست دابوو.

(سەرخاب)ی خاوەنی (گەنگور) لەگەڵ ژمارەیەک لە میر و سەرکردەی دیکە، بەرەو

رووی سوڵتان(محەمەد کوڕی مەلەکشاه) هاتن و لە شاری (قوم) پێیگەیشتن و سۆز و پاڵپشتی خۆیان لە بۆی پێشکەش کرد[٣٨]، هەوڵەکانی (محەمەد)یش بۆ راگەیاندنی سوڵتانیەتی خۆی بەری دا، ئەوەبوو لە مانگی(ذي الحجة)ی هەمان ساڵدا، خەلیفەی عەباسی رەزامەندی خۆی دەربڕی، لەسەر ئەوەی کە ئیتر لە بەغدا خوتبە بە ناوی ئەو بخوێنرێتەوە و نازناویشی بووە (غياث الدنيا و الدين)[٣٩].

بەڵام هەڵویست لە بەژەوەندی سوڵتان(محەمەد)دا زۆر درێژەی نەکێشا، بەڵکو لە ساڵی دوانزە، واتە ساڵی(٤٩٣ک/ ١١٠٠ز) سەر لە نوێ لە (بەغداد)دا، بڕیاری ئەوە دەرکرا، کە خوتبە بە ناوی سوڵتان(بەرکیاروق) بخوێنرێتەوە[٤٠]، ئینجا سوڵتان(بەرکیاروق) هات لە سەنتەری خەلافەتدا، (عەمیدولدەولەی کوڕی جوهەیر)ی قۆڵبەست کرد و خستیە بەندیخانە، داواشی لێکرد هەموو ئەو ماڵ و پارانەی بۆ بگەڕێنێتەوە کە کاتی خۆی لە سەردەمی سوڵتان(مەلەکشاه)دا کە ئەوساکە خۆی و (فەخرولدەولە)ی باوکی والی (دیاربەکر) بوونە و دەستیان کەوتووە، داوای کرد هەموو ئەو ماڵ و پارانەی بۆ بگەڕێنتەوە[٤١].

(ئیبنولجۆزی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: سوڵتان(بەرکیاروق) بە بارێکی سەختی ئابووریدا تێدەپەڕی، چونکە تاکەکانی سوپا داوای پارە و پولیان لێدەکرد، بۆیە سوڵتان بە دەوروبەرەکەی خۆی گوت: [ (ئیبنو جوهەیر)ی وەزیر، خۆی و باوکی، لە سەردەمی دەسەڵاتی خاوەن شکۆ سوڵتان (مەلەکشاه)دا، ئەوان هەڵسوکەوتیان لە دیاربەکر و جەزیرەدا کردووە، بۆیە دەبێت هەموو مافێک بۆ خاوەنی خۆی بگەڕێتەوە][٤٢].

ئەم ئاماژەیە، بەڵگەیە لەسەر دەوڵەمەندی میرنشینی مەروانی، کە لە گوتەی مێژوونوسی ناوبراودا ئەوە تێدەگەین، چونکە ئەوەی (فەخرولدەولە) و (عەمیدولدەولە)ی کوڕی لە ماڵ و سامانەکانی (مەروانی)یەکاندا، دەستیان بەسەردا گرتووە، زۆربووە، بە شێوەیەک کە (بەرکیاروق) دوای تێپەڕینی چەندین ساڵ بەسەر فەرمانڕەوایی ئەم دووانە بەسەر (دیاربەکر)دا، ئینجا دێت داوای گەڕانەوەی هەموو ئەو ماڵ و سامانانەیان لێدەکات، کە لە لایانە، هەروەها سوڵتان لەگەڵ (عەمیدولدەولە)دا، لەسەر ئەوە رێک دەکەون، کە ئەوەی دووەم بڕی سەد و شەش هەزار دیناری بۆ بگەڕێنێتەوە[٤٣].

لە بە دوای یەکداهاتنی رووداوەکاندا، ئەوە دەردەکەوێت، کە هەڵوێستی میرە



کوردەکان، لە ململانێ زۆرەکانی نێوان سەلجوقییەکاندا لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات، هەڵوێستێکی هەمیشە گۆڕاو و ناجێگیریان بووە، ئەوەتا دوای سۆز نواندن و پشتگیری کردنی میری (عەنناز)ی (سەرخاب کوڕی بەدر) بۆ سوڵتان(محەمەد) لە ساڵی(٤٩٢ک/ ١٠٩٩ز)، لە ساڵی پاشتردا (٤٩٣ک/ ١١٠٠ز) لە هەڵوێستەکەی پەشیمان بووەوە و جارێکی دیکە سۆزی خۆی بۆ سوڵتان(بەرکیاروق) نواند، هەر بەمەش نەوەستا، بەڵکو لەگەڵ هێزەکانی سەر بە سوڵتان(بەرکیاروق) هات بەشداری ئەو شەڕەی کرد، کە لە نێوان سوڵتان (بەرکیاروق) و (محەمەد)ی برایدا هەڵگیرسا[٤٤].

(بەرکیاروق) لەو ساڵەدا، لە بەغدادەوە، بە مەبەستی شەڕکردن لەگەڵ (محەمەد)ی برای، سەری هەڵگرت و لە رێگەی خۆیدا بە (شارەزوور)دا تێپەڕی، سێ رۆژ لەوێدا مایەوە و (خەڵکێکی زۆری لە تورکمان و بێجگەی ئەوانیش بەگەل کەوتن)[٤٥]، میر (سەرخاب) لەو شەڕەدا بەشداریکرد، کە لە نێوان هەردوو برادا، لە نزیک (ئەسپیزروز)[٤٦] روویدا، لەو شەڕەشدا میر (سەرخابی کوڕی بەدر) فەرماندەیی لای راستی سوپای سوڵتانی دەکرد[٤٧].

شەڕی نێوان هەردوولا، بە شکانی سوپاکەی (بەرکیاروق) بە کۆتا هات و بێجگە لە پەنجا سوار بەولاوە، کەسی دیکەی لەگەڵ نەما[٤٨]، سەرچاوە مێژووییەکانیش ئاماژە بۆ ئەو هۆیە ناکەن، کە پاڵی بە میر (سەرخاب) وەنا، هەڵوێستی خۆی بگۆڕی و لە پشتگیریکردنی بۆ سوڵتان(محەمەد) پاشگەز بێتەوە، جارێکی تر ببێتەوە پشتگیریکەری (بەرکیاروق)ی برای.

وای لێهات (محەمەد) و (بەرکیاروق)ی برای پێشبڕکێیان دەکرد، بۆ شەڕی نوێ، ئەوەتا لە ساڵی(٤٩٤ک/ ١١٠٠ز) شەڕی دووەم لە نێوانیاندا روویدا، گۆڕەپانی شەڕەکە شارەکانی هەرێمی چیاکانی کوردی بوو، سەرەنجامیش ئەمجارە بە شکانی (محەمەد) شەڕ بە کۆتا هات[٤٩]، سوڵتان(بەرکیاروق) سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر براکەیدا تۆمارکرد، بۆیە بڕیاریدا بەرەو بەغدا بەڕێ بکەوێت، بۆ ئەوەی سەر لە نوێ سوڵتانیەتی خۆی رابگەیەنێتەوە، بەڵام کاتێک لە (رەی) بوو، بە هۆی کەمی پول و پارەی بەردەستی تووشی هەندێک کێشە هات، بۆیە هەندێک لە خەڵکانی شوێنکەوتە و لەوانەی لە دەوروی بوون، لە نێوانشیان میری (ئازەربێجان)، بە روویدا هەڵگەڕانەوە،

واتە (ئازەربێجان) بووە هەرێمێکی دەرەبەگی دەسەڵات بۆماوەیی(وراثي)، لەبەر ئەوە، بە دوای ئەوەی ئەو هەرێمە وەکو پارچەیەکی براوە بۆ (ئیسماعیلی کوڕی یاقوتی)، ناوبراو فەرماندەیی تیادەکرد، دوای مردنی لە ساڵی(٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز) منداڵەکانی جێیان گرتەوە و ئیتر وەکو هەرێمێکی لە دەست منداڵانی ئەمیری ناوبراو مایەوە[٥٠].

لە دوای سەرکەوتنی (بەرکیاروق) بەسەر(محەمەد)ی برایدا لە ساڵی(٤٩٤ک/ ١١٠٠ز) (مەودودی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی یاقوتی) میری ئازەربێجان، یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاند و داوای پارە و پولی کرد، لە بەرامبەر ئەوەی کە لە شەڕدا لە پاڵ سوڵتاندا بووەستێت، بۆیە سوڵتان(بەرکیاروق) لەبەردەم ئەم هەڵوێستە ترسناکەدا ناچار بوو، هێزێک بۆ بەرپەرچدانەوەی (مەودود) ڕەوان بکات، ئیتر هات، (قەوامولدەولە کەربوقا)ی بە فەماردەیی سوپایەکی دە هەزار سوار، بۆ ناوبراو ڕەوانکرد[٥١].

سوڵتان(بەرکیاروق) بە پەلە ڕووەو بەغدا کەوتە ڕێ، بۆ ئەوەی خۆی لابدات، لە مەسەلەی شەڕ لەگەڵ براکەیدا، لەسەر ڕێی خۆیدا گەیشتە (حەلوان) و ماوەیەک تیایدا مایەوە، ئینجا بەرەو سەنتەری خەلافەت پێشڕەوی کرد[٥٢]، بەم شێوەیەش شارەکانی هەرێمی چیاکانی کوردی لە لایەک بوونە گۆڕەپانی شەڕی نێوان سەلجوقییەکان و لەو لاشەوە بوونە پردی بەسەردا پەڕینەوەی سوپاکان، بۆیە ئەم ناوچانە هەردوو تاڵییەکانیان چەشت و هەر لە پاش مردنی سوڵتان(مەلەکشاه)ەوە، ئیدی هێمنی و ئارامییان بە خۆوە نەبینی، ئەمەش لەبەر شوێنە جوگرافییە زیندووەکەی، کە دەکەوتە ڕێگەی پێدا تێپەڕینی سوپاکانی سەلجوقی، هەروەها باری تا ئەوپەڕی خراپیان ڕووبەڕووبووەوە، چونکە ئەو شارانە گۆڕەپانی شەڕبوون و بەم هۆیەوە زۆرجاران دووچاری بە تاڵان چوون و ، وێرانەبوون دەهاتن، لەسەر دەستی سوپا سەلجوقییەکان، بۆ وێنە لە ساڵی(٤٩٤ک/ ١١٠٠ز) سەربازەکانی(محەمەد)ی برای سوڵتان(بەرکیاروق) هەڵسان بە تاڵانکردنی خەڵکی هەمەدان و دەوروبەری و، ماڵ و ئاژەڵێکی زۆریان بردن، هەروەها سەد هەزار دیناریشیان لە سەرۆکی شارەکە وەرگرت[٥٣].

سوڵتان(بەرکیاروق) نەیتوانی لە (بەغدا) بمێنێتەوە، چونکە (محەمەد)ی برای کە ئەویش گەیشتبووە (حەلوان)، پێی گەیشت، ئەمەش دوای ئەوەبوو، کە سەربازەکانی(محەمەد) دەستیان بەسەر (هەمەدان) و شارەکانی دیکەی (چیاکان)دا



گرتبوو، هەروەها لە (حەلوان)یش کۆمەڵێک (میر) پەیوەندییان پێوەکردبوو و، وەکو سوڵتانی سەلجوقییەکان، پشتگیری خۆیان بۆ دەربڕیبوو، دوای ئەوەش کە (محەمەد) گەیشتەوە (بەغداد)، جارێکی دیکە خوتبەی گێڕاوە سەر ناوی خۆی[٥٤].

لە ساڵی(٤٩٥ک/ ١١٠١ز) شارەکانی (چیاکان) زنجیرەیەک شەڕی دیکەی نێوان دوو براکانیان بەخۆوە بینی، (محەمەد) بەرەو شارەکانی ئەو هەرێمە هات و گەیشتە (روزراور)[٥٥] کاتێکیش (بەرکیاروق) ئەوەی بیست، لەگەڵ هێزەکانیدا بەرە (نەهاوەند) هاتن، لە (روزراور) لەگەڵ براکەی پێک گەیشتن، بەڵام بە هۆی خراپی باری ئاووهەوای ناوچەکە، شەڕیان دانەمەزراند[٥٦]، چونکە وەکو دەزانرێت، ئەو ناوچەیە بە زستانی سەخت و بەفری زۆری جیادەکرێتەوە، بۆیە ئەم بارە وای کرد، شەڕ لە نێوان هەردوو لادا ڕوونەدات و سەرەنجام بێن لەسەر ئەوە ڕێک بکەون ئاشتەواییەک لە نێوان هەردوو لادا ئیمزا بکەن و بە پێی بەندەکانی ئەم ئاشتەواییە، هەرێمەکانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد[٥٧].

دوو براکان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە سوڵتانیەت بۆ (بەرکیاروق) بێت، بەڵام ویلایەت و هەرێمەکان، لە نێویشیاندا (ئازەربێجان) و (دیاربەکر) و (جەزیرە) و (کەنجە) و ئاوایییەکانی سەر بەو هەرێمانە و (موسڵ)یش بە (محمەد) ببەخشرێن، بەڵام (بەرکیاروق) مەرجی ئەوەی خستە سەر براکەی کە ساڵانە لە پارە و پوولی ئەو هەرێمانەی بۆ بڕیوەتەوە، ملیۆنێک دیناری پێبدات[٥٨]. هەروەها (بەرکیاروق) خۆیشی پەیمانی ئەوەی بە براکەی دا، کە پشتگیری سەربازیی بکات، بۆ ئەوەی ئەو هەرێمانەی لە سەرووەدا باسکران، کە بۆی بڕیونەتەوە، ئەگەر هەر یەکێکیان ژێر ڕکێفی نەکەوتن، بە زەبری هێز دەستیان بەسەردا بگرێت، کە ئەمەش دیسانەوە، بەندێکی تری ڕێککەوتنە ئاشتەوایییەکەی نێوان دوو براکان بوو[٥٩]... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەم هەرێمە کوردییە براوانە لە بۆ (محەمەد)، هێشتا بە شێوەیەکی تەواو نەکەوتوونەتە ژێر ڕکێفی سەلجوقییەکان، لەوانەیە سوڵتان(بەرکیاروق)یش، دەرکی بەوە کرد بێت، کە کاتێک براکەی دەیەوێت دەست بەسەر ئەو هەرێمانەدا بگرێت، کە بۆی براونەتەوە، چیی ڕووبەڕوو دەبێتەوە، لەو ماوە زەمەنییەی شەڕ و ململانێ زۆرەکانی نێوان سەلجوقییەکان، کە لە دوای خۆیاندا شەڕەکان زیانی مرۆیی و ماڵی زۆریان بەو ناوچانەدا گەیاند، کە تیایدا

دادەمەزران، بە شێوەیەکی گشتی دانیشتوانەکان سەلامەت دەرنەچوون و (زیان و نائارامی و لاوازی باڵی بەسەر خەڵکاندا کێشا)[٦٠].

(محەمەد) خۆی پابەند نەکرد، بەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ براکەی پێی گەیشتبوون، بۆیە ئەو پارەیەی بۆ ڕەوان نەکرد کە بەپێی بەندەکانی ڕێککەوتنەکە دەبوو بە براکەی بدات، ئەمەش وایکرد هەر لە هەمان ساڵدا[٦١] سەر لە نوێ شەڕ و ململانێکانی نێوان هەردوولا جارێکی دیکە دەست پێبکەنەوە، بە سروشتی حاڵیش دیسانەوە شارەکانی هەرێمی (چیاکان) بوونەوە گۆڕەپانی ئەو شەڕ و ململانێیانە[٦٢].

دیسانەوە و بۆ جاری چوارەم، لە ساڵی(٤٩٥ک/ ١١٠١ز) لە شارەکانی هەرێمی (چیاکان)دا شەڕ لە نێوان هەردوو برادا کەوتەوە، کە سەرەنجام لە بەرژەوەندی (بەرکیاروق) تەواو بوو[٦٣]، بەڵام سەرچاوەکانی لەبەر دەست هەن، ئاماژە بۆ ڕۆڵی کورد لە دانیشتوانی ئەو هەرێمەدا ناکەن، لەو هەموو شەڕ و کردە سەربازیانەی، کە دوای مردنی سوڵتان (مەلەکشاه) ڕووبەڕووی دەوڵەتی سەلجوقی بوونەوە، بۆیە هەموو ئەوەی دەکرێت لە بارەی وڵاتی کوردەوە بگوترێت لە دوای ساڵی(٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز) ئەوەیە، کە ئەو وڵاتە بووە گۆڕەپانێک بۆ شەڕ و ململانێی باڵە سەلجوقییە دژ بە یەکەکان، لە پێناو گرتنە دەستی دەسەڵاتدا.

هەرچی هەواڵی میرەکانی بنەماڵە کوردییەکانن، کە لەو هەرێمانەدا فەرمانڕەواییان دەکرد، ئاماژەکان لە سەریان کەمن، ئەوە نەبێت، هەندێ گێڕانەوەی پەرش و بڵاو لە بارەی میرێکی مەڕوانی و یەکی شەدادی دەکەوێتە بەرچاو[٦٤].

لە ساڵی (٤٩٥ک/ ١١٠١ز)، لە (قەوامولدەولە کەربوقا)ی -ئەمیری موسڵ- ئەو کەسەی کەوا لە ساڵی(پێشتردا لەگەڵ هێزەکەی بەرەو (ئازەربێجان) ڕۆیشت، بۆ کۆتایی هێنان بە یاخی بوونی خاوەنەکەی (مەودودی کوڕی ئیسماعیلی یاقوتی) و دوای سەرکەوتنی لە ئەرکەکەی دەستی بەسەر (ئازەربێجان)دا گرت و ماوەیەک تیایدا مایەوە، لە ناکاو لە شاری (خوێ) ئەم (قەوامولدەولە کەربوقا)یە مرد[٦٥]، بەڵام بەر لە مردنی، وەسیەتی بۆ یەک لە مەمالیکەکانی، کە (سەنقرجە)ی پێدەگوترا، کرد و داوای لێکرد فەرمانداەیی تورکەکان بکات بەرەو (موسڵ) بچن و، بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان ، بە کردەوەش مەملوکی ناوبراو، بەرەو (موسڵ) هات و داگیریکرد، بەڵام دەمڕاستانی



شارەکە، بە فەرمانڕەواییەکەی ڕازی نەبوون، بۆیە نامەیەکیان بۆ (موسا تروکمانی) لە (حسن کیفا) ڕەوانە کرد، بۆ ئەوەی بە جێگرەوەی (کەربوقا) ئەو فەرمانڕەواییێتییان بکات[٦٦].

میر (موسا) گەیشت و یەک لە منداڵەکانی میر(مەنسوری کوڕی مەڕوان)- دوایین میرەکانی میرنشینی مەڕوانی لە دیاربەکر- یاوەریی دەکرد، بوونی ئەو میرە کوردەش لەگەڵ (موسا)دا بە سوودێکی گەورە بۆ (موسا) شکایەوە، چونکە (سەنقرجە) دەستپێشخەری کرد و هات لە (موسا)ی دا، بەڵام ئەوەی دووەم نەیتوانی بە ڕوویدا هەڵبشاخێتەوە، بۆیە کوڕەکەی (مەڕوان)، (سەنقرجە)ی مەملوکی کوشت، بەمەش سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لە ڕزگارکردنی ژیانی (موسای تورکمانی)، کە بە هاوڕێیەتی ئەو میرە کوردە هاتە نێو (موسڵ) و کاروبارەکانی گرتە دەست[٦٧].

لە مەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە میرە مەڕوانییە کوردەکان، ئەگەرچیش میرنشینەکەیان و دەسەڵاتە سیاسیەکەشیان بە دەستی سەلجوقییەکان ڕووخا، بەڵام هەر لە وڵاتەکەی خۆیان ماونەتەوە، هەروەها دەقە پێشووەکە ئەوە دەردەخات و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە تاکەکانی ئەو بنەماڵەیە، لە نێوان میرەکانی دیکەی ناوچەکە، مەکانەیەکی تایبەتیان بۆ خۆیان پاراستووە، ئەوەتا دەرچوونی میری مەڕوانی لەگەڵ فەرمانڕەوای (حسن کیفا) بەرەو (موسڵ)، ئەوە دەگەیەنێت، کە (موسا تورکمانی)، بەو ئازایی و توانا و لێهاتنەی میرە کوردی ناوبراوی زانیوە، بۆ چوونەکەشی لە جێ بووە، چونکە ئەو میرە کوردە (موسا)ی لە مردنێکی مسۆگەر دەرباز کرد.

لەگەڵ سەرکەوتنیشی بۆ چوونە ناو (موسڵ)، کاروبار لە بەرژەوەندی (موسا)دا بە کۆتا نەهات، بەڵکو ڕووبەڕووی کێبڕکێیەکی توند بووەوە، لە هەندێک لەو میرانەی ناوچەکە، کە حەزیان دەکرد (موسڵ) لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بێت، یەک لەو میرانەش(جگەرمش)ی میری - جەزیرەی ئیبن و عومەر- بوو، کە هات شارەکەی ئابلۆقەدا، بەمەش (موسا) ناچار بوو، داوای یارمەتی لە میر (سەقمانی کوڕی ئەرتەق)ی میری دیاربەکر بکات[٦٨]، بۆ دڵنەرم کردنیشی شتی زۆری پێبەخشی لە ناویشیان شاری (حسن کیفا)، بۆیە (جگەرمش) لە خۆشی دەستکەوتنی (حسن کیفا)، هات ئابڵوقەی سەر (موسڵ)ی شکاند، بەڵام کوژرانی (موسا تورکمانی) لەسەر دەستی هەندێ منداڵ

پلانەکەی هەڵوەشاندەوە، بۆیە میر (سەقمان) گەڕایەوە (دیاربەکر) و خاوەندارێتی (حسن کیفا)یشی بە دەست هێنا، بەڵام هەرچی (موسڵ)ە، (جگەرمش) دەستی بەسەردا گرت و کاری بە باشی تێدا بەڕێوەبرد (بووە شای عەرەب و کوردان)[٦٨].

شارە کوردییەکانی هەردوو هەرێمی (ئازەربێجان) و (ئەرمینیا)، لە ساڵی (٤٩٦ک/ ١١٠٢ز) کۆمەڵی رووداوی زۆر ترسناکیان بە خۆوە بینی، کە پێشتر شتی بەم شێوەیان بە خۆوە نەدیبوو، باری ناوەخۆی دەوڵەتی سەلجوقی هێمن نەبووەوەو شەڕەکانی نێوان هەردوو برا، (بەرکیاروق) و (محەمەد) بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشت[٦٩]، بەڵکو بەیەکدادانەکانی نێوانیان درێژەی کێشا و لە ساڵی ئاماژە بۆ کراودا، لە دەروازەی شاری (خوێ) لە (ئازەربێجان) شەڕێکی دیکە لە نێوان هەردوو برا هەڵگیرسا، بەڵام هەڵوێستی بۆ هیچ لایەکیان یەکلانەکردەوە، لە ئەنجامی ئەمەدا، هەریەکەیان بەرەو لایەکی جیا، لە شوێنی ئەوی تردا رۆیشت، (بەرکیاروق) هات، بۆ چەند رۆژێک لە چیایەکی نێوان (مەراغە) و (تەبریز) هەڵیدا، بەڵام (محەمەد) لە شارەکانی (ئەرمینیا)دا سووڕایەوە، گەیشتە (ئەرجیش) و (خەلات) و (ئانی)[٧٠].

یەک لە میرەکانی بنەماڵەی (شەدادی) کوردی فەرمانڕەوایی شاری (ئانی)ی دەکرد، کاتێک (محەمەد) گەیشتە ئەو شارە میرەکەی پێی دەگوترا (منۆچهەر)[٧١]، ئەمەش برای میر (فەزلونی کوردی) بوو؛ بوونی میری (شەدادی) لە شاری (ئانی)، ئەوە دەگەیەنێت، کە میرەکانی ئەو بنەماڵە فەرمانڕەوایە، لەگەڵ بچووکبوونەوەی دەسەڵاتیشیان لە (ئاران)، هێشتاش هەر پارێزگارییان لە فەرمانڕەوایێتی ئەو شارە دەکرد، کەواتە میرە (شەدادی)یەکان لە ژێر سایەی فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکانیش، هێشتا پارێزگارییان لە هەندێ ناوچەی دەسەڵاتی خۆیان کردبوو.

دوو براکان دەرکیان بەوە کرد، کە پێویست بەوە ناکات لەوە زیاتر شەڕ و ململانێکانی نێوانیان درێژە پێبدەن، گەیشتنە ئەو رایەی، چارەسەری کێشەکان، بە رێگەی ئاشتییانە سەرکەوتووترە، چونکە شەڕە بەردەوامەکانی نێوانیان، گەندەڵی لێ کەوتەوە -وەکو (ئیبنولئەثیر) دەڵێت: (ماڵەکان بە تاڵان براون، خوێنەکان رژان، وڵات وێرانبووە، گوندەکان سووتاون، سەڵتەنەتیش چاوی تێبڕیبون و لەسەریان مەحکومە، وای لێهات پاشاکان ژێر دەست کەوتن، دوای ئەوەی خۆیان دەست رۆیشتووبوون، بەڵام میرە گەورەکان



ئەوەیان هەڵدەبژاردو ئەوەیان بەلاوە باشبوو، بۆ ئەوەی فەرمانڕەواییێتی و دەسەڵات و چەوساندنەوەکانیان بەردەوام بێت[٧٢].

ئەم گەواهیدانەی (ئیبنولئەثیر) ئەو نەهامەتییانەمان بۆ دەردەخات، کە بەسەر جیهانی ئیسلامی و بە تایبەتی وڵاتی کورددا هات، هەر لە رژاندنی خوێن و بە تاڵانبردنی ماڵ و وێرانکردنی شار و گوندەکان... لەگەڵ نزیکبوونەوەی بە کۆتا گەیشتنی ململانێکانی نێوان دوو برایەکانیش وڵاتەکەیان لە نێواندا دابەشکرا، لە هەرێمەکانی چیاکان و تەبەرستان و خوزستان و فارس و دیاربەکر و جەزیرە، خوتبە بە ناوی (بەرکیاروق)ەوە دەخوێندرایەوە[٧٣]، بەڵام بەشەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامی لە ژێر دەستی(محەمەد) کەوتن، ئیتر لە ناوچە ئابلۆقە دراوەکەی نێوان رووباری (ئەسپیزروز) و تا (بابولئەبواب)، یان روونتر بڵێین، لە هەرێمەکانی ئەرمینیا و ئاران و ئازەربێجان و ئەسبەهان و شامیش خوتبە بە ناوی (محەمەد)ەوە دەخوێنرایەوە[٧٤].

بەم شێوەیە هەرێمە کوردییەکان، لە ژێر رەحمی سوڵتانە سەلجوقییەکان کەوتن، بەرژەوەندییان چۆن بوایە، ئاوایان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکردن، بۆیە جارێکیان سوڵتان(محەمەد) کاروبارەکانی ئەو هەرێمە کوردیانەی دەگرتنە دەست و جارێکی دیکەش دەکەوتنە ژێر کۆنترۆڵی (بەرکیاروق) و بار بەو شێوەیە مایەوە تا دوایین رۆژەکانی فەرمانڕەوایەتیی سەلجوقی.

**دووەم: زاڵبوونی تاجولدەولە (تەتشی کوڕی ئەلب ئەرسەلان) بەسەر هەرێمە کوردییەکان.**

لە دوای مردنی سوڵتان مەلەکشاه لە ساڵی (٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز) ژمارەیەک لەو کەسانە دەرکەوتن، کە چاویان بڕیبووە دەسەڵات و حەزیان دەکرد سەڵتەنەت بۆ خۆیان بە دەست بێنن، یەک لەوانە ، تاجولدەولە[٧٥] (تەتشی کوڕی ئەلب ئەرسەلان)ی برای سوڵتان (مەلەکشاه) بوو، بۆیە لە کاتێکدا جیهانی ئیسلامی شەڕێکی تەڕ و وشک سووتێنێ نێوان منداڵەکانی سوڵتان (مەلەکشاه)ی بە خۆوە دەبینی، تاجولدەولەش کە فەرمانڕەوای دیمەشق و ناوچەکانی سەر بەو شارە بوو، بۆ داوای عەرش، ئەویش کەوتە خۆ[٧٦].

(تەتش) لە کۆکردنەوەی ژمارەیەک لە شوێنکەوتە و لایەنگران، بۆ رووبەڕووبوونەوەی

کوڕە براکانی سەرکەوت، لەوانەش کە پشتگیرییان لێکرد، بریتی بوون لە: قەسیمولدەولە (ئەقسەنقەر)ی میری(حەلەب) و (باغی سیان)ی[77] میری ئەنتاکیە و (بوزان)[78]ی میری ڕەها (ئورفە) و حەڕان، ئەم سێ میرانەش سەرکەوتن لەوەی کەوا، لە ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆیاندا خوتبە بە ناوی (تەتش)ەوە بخوێننەوە[79].

(تەتش) دوای سەرکەوتنی، لە بۆخۆ مسۆگەرکردنی میرەکانی شام، دەستی کرد، بە جێبەجێ کردنی نەخشەکانی بۆ گەیشتنە دەسەڵات، بۆیە سەرەتا ئەوەی لەسەر بوو، کە هەرێم و ویلایەتەکانی سەر بە دەوڵەتی سەلجوقی داگیر بکات، لەبەر ئەوە لە ساڵی(٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز) بە فەرماندەیی هێزەکانی خۆی و لەگەڵ هەر سێ میرە ناوبراوەکانیش، بەرەو (ئەسبەهان) هات[80]، لە ڕێگای خۆیشی هەرێمە کوردییەکانی، وەکو ئازەربێجان و ئەرمینیای داگیرکردن، ئەمەش چونکە بە دوو سەنتەری زیندوو و ستراتیژی ناوەڕاستی هەرێمەکانی ئەو دەوڵەتە دادەنران.

شایانی باسە، ئەو ئاماژانەی لە بارەی کورد و وڵاتەکەیان هەن، لە ماوەی سەرهەڵدانی تاجولدەولە (تەتش)دا، ئەگەر چی کەمیش بن، بەڵام پەردەمان لە رووی ئەو بارەدا بۆ هەڵدەدەنەوە، کە ئەو هەرێمانە لە ئەنجامی باڵکێشانی دەستڕۆیشتووەکان بە سەریاندا تێیکەوتن، وەکو دەشزانرێت گۆڕانکارییە زۆرەکان لە دەسەڵاتی سیاسی و لە دەزگاکانی کارگێڕی و فەرمانڕەواییتیدا لە ناوچەیەکی دیاریکراو، بە شتی خراپ بۆ سەر ناوچەکە و بۆ سەر دانیشتوانەکەی دەشکێتەوە، وڵاتی کوردیش، دوای رووخانی میرنشینە سەربەخۆکانی، ئارامی و ئاسایشی بە خۆوە نەبینی، بەڵکو لە دەرەنجامی باڵکێشانی خاوەن دەسەڵاتە سەلجوقییەکان ئازاری زۆری چەشت.

لەگەڵ سەرەتای ساڵی (٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز) تاجولدەولە دەستی کرد بە فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی، هات هەندێک سنووری نێوان (جەزیرە و شام)ی داگیرکرد[81]، ئینجا بەرەو (موسڵ) هات، لەوێدا (کافی کوڕی فەخری دەولە کوڕی جوهەیر)ی جەزیرەی ئیبن و عومەر، هاتە لای، ئەویش ڕێزی لێناو، کردییە وەزیری خۆی[82].

(فارقی) دەڵێت: (تاجولدەولە) دوای ئەوە رووی لە وڵاتی مەڕوانییەکان کرد لە – دیاربەکر– کە میرەکەی (ناسرولدەولەی مەڕوانی) بوو، دوایین میری میرنشینەکەبوو، کە توانی باڵی بەسەر (میافارقین)دا بکێشێتەوە و لە نوێوە دەسەڵاتی ئەو میرنشینە کوردیەی بۆ سەر بگەڕێنێتەوە[83].



(تاجولدەولە) گەیشتە (دیاربەکر) و باڵی بەسەر شارەکانیدا کێشا[84]، بۆیە (ناسرولدەولە)ش دوای ئەوەی تەنها پێنج مانگ بوو حوکمرانی ئەو هەرێمەی دەکرد، ناچار بوو داوای ئاسایش لە (تەتش) بکات و بچێتە ژێر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو[85].

بە باڵکێشانی (تاجولدەولە) بەسەر دیاربەکر، کۆتایی بە فەرمانڕەوایی مەڕوانی کوردی لە ناوچەکەدا هات، دەکرێت ئەم بارە نوێیەش بە دووەم لێدرانی میرنشینی مەڕوانی بژمێردرێت، لەسەر دەستی سەلجوقییەکان.

(تاجولدەولە) ماوەیەک لە (میافارقین) مایەوەو کاروبارە کارگێڕی و ئابوورییەکانی ڕێکخست، (فارقی) جەخت لەسەر ئەو سیاسەتە باشەی دەکاتەوە، کە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا پەیڕەوی کردووە، دەڵێت: (باشی لەگەڵ خەڵکەکەیدا کرد، دادگەرانە مامەڵەی کردن، دەیەک و قست و باجەکانی دیکەی لەسەر لابردن... خەڵک لەسایەیدا خۆشترین ژیانیان بە دەست کەوت)[86].

هەروها (تەتش) –وەکو ئاماژەمان بۆ کرد– (کافی کوڕی جوهەیر)ی کردە وەزیری خۆی و (میافارقین)ی بە ئەودا، جێگرێکیشی بەسەر ناوچەکەدا بۆ دانا، ئەویش (تەغتکین) بوو[87].

وەکو دەردەکەوێت، (تەتش) مەبەستی لەم گۆڕانکاریانەی، بۆ ڕێکخستنی کاروبارە سیاسی و کارگێڕییەکانی ناوچەکەبوو، ئەوەتا (ئیبنولقەلانسی) وەکو پشتگیرییەک بۆ ئەوەی بۆی چووین، دەڵێت: کاتێک (تەتش) دەستی بەسەر هەرێمەکانی (جەزیرە و دیاربەکر)دا گرت (تیایاندا ئەو باوەڕ پێکراوە تایبەتیانەی خۆی کردە والی، کە خۆی لێیان رازی بوو)[88]، وەکو دەریش دەکەوێت، بەو سیاسەتەی مەبەستی ئەوە بووە کورد بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و لە داواکردنی تەختی سەلجوقی لە بۆ خۆی پشتگیری ئەوان بۆ خۆی مسۆگەر بکات، هەروەها دەشیویست باری ناوەخۆی ئەو ناوچانە دوای ئەوەی چەندین ساڵ بوو ئارامییان بە خۆوە نەدیبوو، ئێستاکە بەرەو هێمنی و ئارامییان بێنێتەوە.

لە دوای ئەوە، بە مەبەستی داگیرکردنیان، (تەتش) بەرەو هەرێمەکانی دیکە، درێژەی بە هێرشەکانی خۆی دا، بەڵام هەر کە ناوچەکەی جێهێلا، ئیتر هێندەی نەبرد، ئەو

پیاوانەی خۆی کە بەسەر شار و هەرێمەکانیدا جێهێڵا بوو، رووبەڕووی هەندێ کێشە بوونەوە، لەوانە، لە ساڵی(٤٨٨ک/ ١٠٩٥ز) ئاژاوە و شڵەژان لە دژی (تەغتکین)دا لە (ئامەد) سەریان هەڵدا، کە شایانی باسە وەکو لە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردبوو، ناوبراو جێگری (تەتش) بوو بەسەر دیاربەکر... ئەم ئاژاوەیە لە لایەن خەڵکی شارەکە سەری هەڵداو، یاخیبوونی خۆیان راگەیاند، بۆیە (تەغتکین)ی جێگر، هات ئابڵوقەی شارەکەی دا، هەندێ لە دانیشتوانەکەی کوشت، بەمەش (ئامەد) هەر لە ژێر دەسەڵاتی (تاجولدەولە)دا مایەوە[٨٩].

لەو کاتەدا کە (تەغتکین) لە هەوڵی زاڵبووندا بوو بەسەر یاخیبوونی دانیشتوانی (ئامەد)، (تاجولدەولە) لەگەڵ هێزەکانی خۆی درێژەی بە پێشڕەوییەکانی دەدا، هەرێمی ئازەربێجان جێی ئومێد و مەبەستە فراوانیخوازییەکەی بوو، بە کارەکیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی[٩٠]، کاتێکیش (بەرکیاروق)ی سوڵتان بە فراوانبوونی دەسەڵاتی مامی و باڵکێشانیی بەسەر هەرێمەکانی(جەزیرە و ئازەربێجان)ی زانی بڕیاریدا بەرپەرچی بداتەوە[٩١].

(تاجولدەولە) دوای ئەوەی هەندێ لە میرەکانی بە وێنەی (قەسیمولدەولە ئەقسەنقەر) و (بوزان) لێی جیابوونەوە، هەستی بە لاوازی هەڵوێستی خۆی کرد و دەرکی بەوە کرد کە لە توانایدا نییە بە رووی (بەرکیاروق)دا بوەستێتەوە، بۆیە وای بە باش بینی هێزەکانی بکشێنێتەوە و بە کارەکی بەرەو ولاتی شام کشایەوە[٩٢].

هەرێمە کوردییەکان شوێنی تیا تێپەڕین بوون بۆ سوپاکەی (تاجولدەولە)، بۆیە جارێکی دیکە شارەکانی (جەزیرە) کەوتنە دەستی، کە (دیاربەکر) یەکەمی ئەو شارانە بوو کە داگیری کرد، ئینجا (خەلات)یشی لە (ئەرمینیا) داگیرکرد و ئینجا بەرەو (ئازەربێجان) هات و (هەموو ئەو شوێنانەی کردنە موڵکی خۆی)[٩٣].

ئەم فراوانیخوازییەی (تا جولدەولە) هەرێمی (چیاکان)یشی گرتەوە، ئەوە بوو شاری (هەمەدان) و دەوروبەرەکەشی کەوتنە دەستی، جا کاتێک بەو پلەیەی هێز و دەسەڵات گەیشت، داوای لە خەلیفەی عەباسی (موستەزهیر بیلڵلا) کرد، لە (بەغدا) خوتبە بە ناوی ئەوەوە بخوێندرێتەوە[٩٤].

لەولاشەوە لە بەرامبەر ئەو جووڵانەوانەی مامی و دەستگرتنی بەسەر ئەو ناوچە



فراوانانە، (بەرکیاروق) هەستی بە ترسناکی هەڵوێستەکە کرد، ئەو کاتە لە (نەسێبین) بوو، ئیتر بەرەو (ئەربل) -پایتەختی میرنشینی هەزبانی- هات[٩٥]، دواتر بەجێی هێشت و بەرەو (شارەزوور)هات، کە ولاتی میر (سەرخابی کوڕی بەدر)[٩٦] -میری میرنشینی عەننازی بوو- (ئیبنولئەثیر) ئیتر ئاماژە بە هەواڵی دیکە نادات، کە لە ماوەی تێپەڕینی سوڵتان بە ولاتی عەننازییەکاندا روویدابێت، هەر بەو ئاماژەیەی واز دێنێت، کە دەڵێت: (بەرکیاروق) لە (تەتش) نزیک بووەوەو ماوەی نێوانی لەگەڵ مامی (١٠ / فەرسەخ) رێگە کەمتر بووەوە، بەڵام لە یەکەم شەڕی نێوانیان (تەتش) توانی شکست بە هێزەکانی برازاکەی بێنێت[٩٧].

لە ساڵی (٤٨٨ک/ ١٠٩٥ز) بە کوژرانی (تەتش) ململانێی نێوان (بەرکیاروق) و (تەتش) بە کۆتا هات[٩٨].. چونکە دوای زنجیرەیەک شەڕ کە زۆربەیان لە شارە کوردییەکانی هەرێمی (چیاکان) کران، سوڵتان سەرکەوت لە خۆ رزگارکردن لە ململانێی مامی، بەم شێوەیەش لە مەترسییەکی تری رزگاری بوو، کە راستەوخۆ هەڕەشەی لێدەکرد.

بەمجۆرە ولاتی کورد بووە شانۆی ململانێکانی نێوان سەلجوقییەکان لەسەر دەسەڵات، لە ماوەی ساڵانی نێوان(٤٨٦-٤٨٨ک/ ١٠٩٣-١٠٩٥ز) زۆربەی هەرێمە کوردییەکان کەوتنە ژێر رکێفی (تاجولدەولە)، دوای کوژرانیشی فەرمانڕەوایی هەندێکیان کەوتە دەست (رەزوان)ی کوڕی، هەروەها ئاماژە بۆ باری (دیاربەکر)یش هەیە کە دوای ئەوە چی لێهات؟ چونکە میر (باغسیان)ی خاوەنی (ئەنتاکیە) ئاماژەی بۆ شا (رەزوان) کرد، کە رووبکاتە (دیاربەکر) و ژێر دەستی بخات، چونکە شارەکە بە تاڵ بووە، نە (والی) و نە هیچ (جێگر)ێکی بە سەرەوە نییە بیپارێزێت[٩٩].

لە ساڵی (٤٩٩ک/ ١٠٩٩ز) (شەمسولملوک دەقاقی کوڕی تاجولدەولە) لەگەڵ سەربازەکانی لە (دیمەشق)ەوە، بەرەو (دیاربەکر) هاتن، بۆ ئەوەی لەو کەسەی وەربگرێت کە بە سەریەوەیە، ئیتر پێیگەیشت و (میافارقین)ی وەرگرت، (ئەوەی تیا رێکخست، کە یەکێک بیپارێزێت، بەلاکانی لێ بە دوور بخاتەوە)[١٠٠].

(فارقی) بیرۆکەیەکی تەواو لە بارەی باری سیاسی و کارگێڕی لە شارە کوردییەکانی جەزیرە بە دەست دەدات، لە دوای کوژرانی (تاجولدەولە تەتش) لە ساڵی(٤٨٨ک/ ١٠٩٥ز)، کە ئیتر ناوچەکە دابەش بوو، هەر شارەی کەوتە دەست یەک لە (والی) یان

میرە سەلجوقییەکان کە (لە دوای مردنی تاوجولدەولە بوونە خاوەنی هەموو دیاربەکر)، لە - میافارقین- بەولاوە هیچ کوێیەکی تر بۆ پاشا (دەقاق) نەمایەوە، (ئیبراهیمی کوڕی یەناڵ)یش -ئامەد-ی لە دەست ما، کە لە دوای مردنی خۆیشی کەوتە دەست منداڵەکانی)[١٠١].

ئەم مێژوونووسە لە گێڕانەوەکەیدا بە درێژی باس لە میرەکانی ناوچەکە دەکات، دەڵێت: (حیسامولدەولە تەغتکین دەستی بەسەر شاری بەدلیس داگرت و شاری -ئەرزن- یشی لە میر شاروخ وەرگرت، ئینجا میر -شاروخ-یش لە بری ئەرزن شاری -حانی-ی وەرگرت)[١٠٢] میرێکی تورکمانیش کە قزل ئەرسەلان (شێری سوور)ی پێدەگوترا، دەستی گرت بەسەر شارەکانی (سەعەرد) و (تەنزە) و (یاهموند)[١٠٣]، شاری (میافارقین)یش کەوتە دەست منداڵەکانی (تاجولدەولە)[١٠٤].

(دەقاق) و (رەزوان) لە (شام)ەوە لە ڕێگەی جێگر و والییەکانیان شارەکانی (جەزیرە)یان بەڕێوەبرد، میر (تاش) جێگری (دەقاق) بوو، بەسەر شاری (میافارقین)، لە ساڵی (٤٩١ک/ ١٠٩٧ز)یش بۆ بەسەرکردنەوەی موڵک و جێگرەکانی و، بۆ زانیاری پەیدا کردن لەسەر کاروبارەکانی وڵات لە نزیکەوە، میر (دەقاق) هاتە (دیاربەکر)، لەوێ سەرجەم ئەو میرانەی (دیاربەکر) کە سەر بە ئەو بوون لەبەر دەستی کۆبوونەوە، شایانی باسە میر (دەقاق) لەو گەشتەیدا (محەممەد عەجەمی) وەزیر یاوەرێتیی دەکرد، کە ناوبراو خەڵکی (دوین) بوو[١٠٥].

میر (دەقاق) کاروبارەکانی کارگێڕیەتی (میافارقین)ی ڕێکخست، لە ساڵی (٤٩٧ک/ ١١٠٣ز) وەزیرێکی بۆ ئەم شارە هەڵبژارد ناوی (محەممەد) بوو، کە دوور نییە ئەم (محەممەد)ە، ئەو (محەممەد عەجەمی)یە بوبێت، کە لە گەشتەکەی ساڵی (٤٩١ک/ ١٠٩٧ز) میر (دەقاق)دا یاوەری میر بوو، هەروەها سەرۆکێکی پاسەوانی بۆ دامەزراند پێی دەگوترا (یەغمور)، جا دوای ئەوەی میر (دەقاق) لە ڕێکخستنی کاروبارەکانی ئەو شارە تەواو بوو، گەڕایەوە بۆ پایتەختی دەسەڵاتەکەی لە (دیمەشق)، وەزیرەکەشی دەستی کرد بە کارەکانی لە (میافارقین) و، کچی یەک لە میرە کوردەکانی وەکو هاوسەر بۆ خۆی هێنا[١٠٦].

هەر لەو ماوەیەدا واتە ساڵی (٤٩٥ک/ ١١٠١ز) دەسەڵاتی ئەرتەقییەکان بەسەر (حسن کیفا) و (ماردین)یش دامەزرا.



## سێیەم: ئەتابەکیەتەکان[١٠٧] لە وڵاتی کورد و سەردەمی سەلجوقی:

مێژووی سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتەکان بۆ سەردەمی سەلجوقی و وردتریش بۆ ماوەی فەرمانڕەوایی سوڵتان(مەلەکشاه) دەگەڕێتەوە، چونکە لەو ڕۆژگارەدا (ئەقتاع)ێکی زۆر بۆ میر و سەرکردەکانی سوپا بەخشرا، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەسمی سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو سیستمە بۆ دوای مردنی (مەلەکشاه) دەگەڕێتەوە، کە یەک لەو دەرەنجامە خراپانەی مردنەکەی بەجێی هێلان، سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتەکان بوو[١٠٨]، چونکە دەوڵەتی سەلجوقی لە نێوان چەند میرێکی بچووک دابەشکرا، ئیتر وڵات کەوتە دەست کۆمەڵێک (ئەقتاع)ی هەرێمەکان، هەروەها لەبەر بچووکی تەمەنی ئەو میرانە، دەوڵەت ناچار بوو، بێت (ئەتابەک)یان بۆ دابمەزرێنێت[١٠٩].

ئەوە بوو هەر کاتێک سوڵتان بیویستایە یەک لە منداڵەکانی بۆ سەر شارێک لە شارەکان، یان هەرێمێک لە هەرێمەکان دابمەزرێنێت، سوور دەبوو لەسەر ئەوەی (ئەتابەک)ێکی لەگەڵدا بنێرێت، بۆ ئەوەی هاوکاریی بکات، ئەم پۆستەش هەر لەسەر گەورە پیاوانی دەوڵەت و سەرکردەکانی سوپا کورت دەبوویەوە کە تورک بوون، بۆیە زوو بە زوو ئەو تورکانە، لەو ویلایەتانەی بۆیان براوبوو فەرمانڕەوایی تێدا بکەن بوونە خاوەنی دەسەڵاتی راستەقینە، هەروەها دەستیان کرد، بە کارکردن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان و ئەو نازناوانەیان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد کە بۆیان دەشیا[١١٠].

(ئەتابەک)ەکان لە دوای مردنی سوڵتان(مەلەکشاه) لاوازی دەوڵەتی سەلجوقی و دروستبوونی شەڕی نێوان کوڕ و کوڕەزاکانیان، بە هەلزانی بۆ سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر ئەو ناوچانەی لە ژێر فەرمانڕەوایەتیاندابوو، هەر بەوەش وازیان نەهێنا، بەڵکو لە نێوان خۆشیاندا کێبڕکێی ئەوەیانکرد، کە قەوارەی موڵک و دەسەڵاتەکەیان فراوانتر بکەن، بۆیە مەسەلەکە لای هەندێکیان وای لێهات، لە دوای خۆیاندا فەرمانڕەوایەتیان لە بنەماڵەکانیاندا کردە بۆ ماوەیی(وراثي) و خانەوادەی فەرمانڕەوای سەربەخۆیان پێکهێنا، کە لە دواتر بەو خانەوادە و دەوڵەتانە گوترا (ئەتابەکیەتەکان)[١١١].

ئیتر لە ماوەی مێژووی سەلجوقیدا ژمارەیەک (ئەتابەکی)ی بەهێز دروستبوون، دەسەڵاتی هەندێکیان لە دەسەڵاتی خودی سوڵتانیش بەهێزتربوو، بەمەش یەکیەتی سەلجوقییەکان هەڵوەشایەوە، کە دەشێت گرنگترین (ئەتابەکیەت)ەکانیش، کە لە

هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامی دامەزران، ئەتابەکیەتی زەنگی بێت لە (موسڵ)[١١٢] لەگەڵ ئەتابەکیەتی (شام)[١١٣] و ئەتابەکیەتی (کرمان)[١١٤] و ئەتابەکیەتی (فارس) یان ئەوەی پێی دەگوترا دەوڵەتی سەلغەری[١١٥] و ئەتابەکیەتی لورستان(هەزار ئەسپی)[١١٦].

هەرێمە کوردییەکانیش لەو رووداوگەل و سەرهەڵدانەی ئەتابەکیەتەکان بەدوور نەبوون، بەڵکو لەو هەرێمانەش ئەتابەکیەتەکان دامەزران، لە گرنگترینیشیان: ئەتابەکیەتی ئەرتەقی (ئەرتەقییەکان) لە (دیاربەکر)ە، کە لە دواتر ئەمە بۆ دوو لق دابەشبوو، یەکێکیان لە (حسن کیفا) و ئەوی دیکەشیان لە (ماردین) فەرمانڕەواییان دەکرد.. هەروەها ئەتابەکیەتی ئازەربێجان (ئێلدکزی)[١١٧] و ئەتابەکیەتی (ئەربل)[١١٨]، کە شوێنی میرنشینی هەزبانی کوردیی گرتەوە، لە شارە کوردییەکانی (ئەرمینیا)ش خانەوادەی (شاکانی ئەرمەن) سەریانهەڵدا.

ئەم ئەتابەکیەتانە هەر لەگەڵ دروستبوونیانەوە رۆڵێکی گەورەیان لە مێژووی کورد و وڵاتەکەیان یاریکرد، چونکە زۆربەی هەرێمەکانی وڵاتەکەیانی گرتەوە و، لە شوێنی میرنشینە کوردییە خۆجێییەکان، هاتن فەرمانڕەوایێتی ئەو ناوچانەیان کرد.

ئەمە ئەگەرچی لە پاڵ ئەوان بنەماڵە فەرمانڕەوا کوردییەکانیش مابوون، بەڵام بێ ئەوەی بە کارەکی هیچ دەسەڵاتێکی ئەوتۆیان هەبێت، شایەنی ئاماژە پێدان بێت، ئەوەتا فەرمانڕەوایی میرە عەننازییەکان لە هەندێ لە شارەکانی هەرێمی چیاکان مابوویەوە، هەروەها پاشماوەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای (شەدادی)ش پارێزگارییان کردبوو، لە فەرمانڕەوایێتی (ئانی)، تا کۆتاییەکانی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی، لە (ئازەربێجان)یش میر (ئەحمەدیلی کوردی) پارێزگاری کردبوو لە دەسەڵاتی میرنشینی رووادی، هەروەها میر و سەرەک هۆزە کوردییەکانی بڵاوەبووی قەڵاکانیش بە هۆی شوێنە سەختەکانیان توانیبوویان پارێزگاری لە فەرمانڕەوایێتی سەربەخۆیی خۆیان بکەن، هەروەها میرنشینی هەزبانی توانی هاوڕەوتی دەوڵەتی سەلجوقی بێت، بە درێژایی مانەوەی لە فەرمانڕەوایێتی کردنی هەولێر و دەوروبەری، کە دوای رووخانیشی لەسەر دەستی ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی)، لەسەر پاشماوەکانی ئەو میرنشینە ئەتابەکیەتی (ئەربل) دامەزراو، ئیتر بەم شێوەیە، لە چوارچێوە مێژووییەکەی ئەم لێکۆڵینەوەیەش،



هەندێ لە ئەتابەکیەتەکان لە وڵاتی کورددا خۆیان سەپاند، لەوانە:

١- ئەتابەکیەتی ئەرمینیا (شاکانی ئەرمینیا لە خەلات):

زانیاری تەواو لەسەر ئەو بنەماڵەیە لەبەر دەستدا نییە، کە هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی فەرمانڕەوایەتییان لە (خەلات) و ناوچەکانی دەوروبەریدا کردووەو، کە دواتر بە (شاکانی ئەرمەن) ناسران.

هەندێ لە میر و سەرکردە سەلجوقییەکان، هەلی ئەو لاوازیەیان قۆزتەوە کە لە دوای ساڵی(٤٨٥ک/ ١٠٩٢ز) دەوڵەتی سەلجوقی تێیکەوت و کاتێک دەرکیان بە تێکچوونی باری ناوخۆ کرد، کاریان لەسەر ئەوە کرد، فەرمانڕەوایەتیەکی سەربەخۆ بۆ خۆیان دابمەزرێنن، لەو هەرێمانەی دەستیان بەسەر داگرتبوو، ئەوانەش هەندێکیان پۆستی (ئەتابەک)یان هەبوو.

یەک لەو خانەوادە تورکانەی سەرکەوت لە جیابوونەوەی لە سەنتەری فەرمانڕەوایی سەلجوقی، بنەماڵەی (شاکانی ئەرمینیا) بوون، کە شاری (خەلات)[١١٩]، یان (ئەخلات)یان کردە پایتەختیان[١٢٠].

(ئەخلات) لە بنجدا بەشێک لە موڵکەکانی میرنشینی (مەڕوانی) بوو، چونکە ئەو میرنشینە توانی دەسەڵاتی بۆ سەر هەندێ بەشی(ئەرمینیا) درێژ بکاتەوە، لە ساڵی (٤٩٣ک/ ١١٠٠ز)یش ئەتابەک (سەگمانی قوتبی) دەستی بەسەر داگرت و ئەتابەکیەتێکی تێدا دامەزراند[١٢١]، لە دوای خۆیشی منداڵ و مەمالیکەکانی بە درێژایی سەدەیەکی تەواو، بەردەوامبوون لە فەرمانڕەوایەتیکردنی ئەو ناوچەیە.

هەرچی هۆی خۆ بەدەستەوەدانی خەڵکی ئەو شارەیە بۆ (سەگمان)، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە خەڵکی ئەو شارە بێزاربوون لە مەڕوانییەکان و بە کارگێڕییەکەیان رازی نەبوون[١٢٢]، بۆیە پەیوەندییان بە (سەگمان) کرد بۆ ئەوەی بێت بەرێوەبردنی شارەکەیان بگرێتە ئەستۆ، چونکە ئەو بە (دادگەری و ویژدان) لە مامەڵەیدا لەگەڵ خەڵکەکەی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە لەسەر داوای خەڵکی شار، (سەگمان) هێرشی هێنایە سەر ئەو شارە و بە یارمەتی خەڵکەکەی دەستی بەسەردا گرت و مەڕوانییەکانی تێدا دەرپەڕاند[١٢٣].

(سەگمان)ی دامەزرێنەری بنەماڵە فەرمانڕەواکەی، پێشتر یەک لە مەمالیکەکانی

سەر بە (قوتبەدین ئیسماعیلی سەلجوقی)ی فەرمانڕەوای شاری (مەرەند) بوو- کە ئەمە یەک لە شارەکانی ئازەربێجانە- بۆیە وەکو درانە پاڵێک بۆ ناوی گەورە (سەیید)ەکەی بە (قوتبی) ناسرا(١٢٤).

بێگومان بوونی تورک لە (ئەرمینیا) شتێکی ئاسایی بووە، چونکە شەڕی (مەلازگەرد) سەرەتایەک بوو، بۆ کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی بێزەنتی بەسەر (ئەرمینیا) و، هاتنە ناو و جێگربوونی تورکمان لەو هەرێمە، چونکە بەشانێکی فراوانی ئاسیای بچووک کەوتنە سەر دەوڵەتی سەلجوقی، بەمەش بوار لە پێش سەرکردە و میرە تورکمانەکان فراوانبوو، بۆ ئەوەی بێن کاروبارەکانی بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانە بگرنە دەست، چ جای ئەوەی هەر لەو قۆناغەشدا باری ناوخۆی دەوڵەتەکەیان بە هۆی شەڕە ناوخۆییەکانیان خراپ بوو(١٢٥).

ئەوەی شایانی تێبینیش بێت، (سەگمان) دوای ئەوەی لە دەستگرتنی بەسەر ئەو ناوچەیەدا سەرکەوت، نازناوی (شای ئەرمەن)ی بە خۆیدا، بەشی یەکەمیش لەو نازناوە کە (شا) واتە (پاشا)یە، پەردە لە رووی تەماعی گەورەی (سەگمان) هەڵدەماڵێت، لە هەمان کاتیشدا گوزارشتە لە ئاستی ئەو هێزو و دەسەڵاتەی کە (سەگمان) پێی گەیشتووە(١٢٦).

بەڵام بەشی دووەمی نازناوەکە (ئەرمەن) ئەوا درانە پاڵە بۆ (ئەرمینیا)، چونکە ئەرمەنەکان لە هەندێ لە شارەکاندا، کۆمەڵەی نیمچە سەربەخۆیان پێکدەهێنا و لە زۆربەی کاتەکاندا لەگەڵ شای ئەرمەندا هاوپەیمانییان دەبەست(١٢٧).

(سەگمان) دوای سەقامگیربوونی دەسەڵاتەکەی بەسەر (خەلات) و دەوروبەری، دەستیکرد بە فراوانکردنی چوارچێوەی ئەتابەکیەتەکەی و، وردە وردە دەستی دەگرت بەسەر ئەو شارانەی هاوتخوب بوون لەگەڵ ناوچەکانی دەسەڵاتی خۆی، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، میرەکانی ئەو ئەتابەکیەتانەی لە ماوەی مێژووی سەلجوقیدا سەریانهەڵدا، لە پێناو باڵکێشان و فراوانبووندا کاریان دەکرد، بۆیە شارە کوردییەکانیش لە چاو تێبڕینەکانیان دەربازیان نەبوو، ئەوەتا لە ساڵی(٥٠٢ک/ ١١٠٨ز) (سەگمان قوتبی) دەستی بەسەر (میافارقین)دا گرت، ئەمەش دوای ئەوەی گەمارۆی خستبووە سەر ئەو شارە و چەند مانگێک خەڵکەکەی خستبووە تەنگانە، کە ئیتر خۆراک لە نێویدا نەماو،



برسیەتی زۆری بۆ خەڵکەکەی هێنا، ئینجا ناچار بوون بۆ (سەگمان)ی بە دەستەوە بدەن(١٢٨).

هەروەها (سەگمان) دەسەڵاتی بە ئاراستەی رۆژهەڵاتیش درێژ کردەوە، وایلێهات مولک و دەسەڵاتی لە هەرێمی (ئازەربێجان)یش پەیدا کرد، (ئیبنولئەثیر) باس لەوە دەکات کە: ئەو (بووە خاوەنی تەبریز و هەندێ بەشی دیاربەکر)(١٢٩).

میر (سەگمان) لە ساڵی(٥٠٥ک/ ١١١١ز) لە شاری (بالس)(١٣٠)دا، لە کاتی شاڵاوێکی سەربازیی لە دژی خاچپەرستان(١٣١)، لە ئەدەرەنجامی نەخۆشیەک کە دووچاری هات، کۆچی دوایی کرد، لەولاشەوە میر (ئەحمەدیلی کوردی رووادی) خاوەنی (مەراغە) (تەبرێز)ی بە بەشێک لە مولکەکانی باوانی دەزانی، بۆیە داوای لە سوڵتان(محەمەد) کرد، کە ئەو وڵاتەی هی (سەگمان) بوو، بۆ ئەوی ببڕێتەوە(١٣٢).

لەراستیدا میر و سەرکردە و ئەتابەکەکان لە پێناو زیاد کردنی ئەقتاعەکانیان کاریان دەکرد، میر (ئەحمەدیل)یش فەرمانڕەوای هەرێمی (ئازەربێجان) بوو، بۆیە ویستی هەلی مردنی (سەگمان) بقۆزێتەوە، بۆ فراوانکردنی ئەقتاعەکەی، چ جای ئەوەش کە (خەلات) هاوتخوبی (ئازەربێجان) و یەک لە شارەکانی (ئەرمینیا)ش بوو(١٣٣).

لە دوای مردنی میر (سەگمان) هەواڵ لە بارەی شاکانی ئەرمینیا کەم دەبێتەوە، سەرچاوەکان هەر بە تەنیا بە دەستنیشانکردنی ساڵەکانی فەرمانڕەوایی هەندێ لە میرەکانیان واز دێنن، بۆ وێنە: لە ساڵی (٥٠٦ک/ ١١١٢ز) (زەهیرەددین- ئیبراهیمی کوڕی سەگمان) فەرمانڕەوایی گرتە دەست و لەسەریدا بەردەوامبوو، تا لە ساڵی (٥٢١ک/ ١١٢٧ز)دا کۆچی دوایی کرد(١٣٤).. ئیتر (ئەخلات) و دەوروبەرەکەی بە دەست کوڕ و کوڕەزا و مەمالیکەکانی (سەگمانی قوتبی) مایەوە، تا (مەلیکی ئەوحەد- نەجمەدین ئەیوبی کوڕی مەلیکی عادل) لە ساڵی(٦٠٤ک/١٢٠٧ز) دا دەستی بەسەردا گرت و بەستیەوە بە مولکەکانی ئەیووبییەکان(١٣٥).

٢- میرنشینی ئەرتەقی(١٣٦) لە (دیاربەکر):

لە ماوەی ساڵەکانی کۆتایی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی لە هەرێمی (جەزیرە)دا میرنشینێکی سەلجوقی سەربەخۆ دروستبوو، بە میرنشینی ئەرتەقی (ئەرتەقییەکان) ناسرا.

کە بە (ئەڕتەقی)ش ناسرا، لەبەر درانەپاڵی بوو بۆ میر (ئەڕتەقی کوڕی ئەکسەب)[١٣٧]، کە ناوبراو یەک لە سەرکردەکانی سوپای سەلجوقی و یەک لە مەمالیکەکانی سوڵتان (مەلەکشاه)یش بوو[١٣٨].

میر (ئەڕتەق) رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە مێژووی سەلجوقی، بەشداریکردبوو لە فراوانبوونی سەلجوقییەکان، بە تایبەت لەو شاڵاوەی کە برایە سەر میرنشینی مەڕوانی لە ساڵی(٤٧٨ک/ ١٠٨٥ز)، وەکو دەستخۆشیکردنێکیش لەو کۆششە گەورەیەی لەو شاڵاوەدا کردی، (تاجولدەولە) بە (والی) بۆ سەر (قودس)ی دامەزراند[١٣٩].

چاکەی دامەزراندنی بناغەی میرنشینی ئەڕتەقی، بۆ میر (سەقمانی کوڕی ئەڕتەق) دەگەڕێتەوە، چونکە لە ساڵی(٤٨٤ک/ ١٠٩١ز)، (ئەڕتەق) کۆچی دوایی کردو، دوو کوڕی لە دوای خۆی بەجێهێشت، ئەوانیش (سەقمان) و (ئیلغازی) بوون[١٤٠]، کە ئەمانە رۆڵێکیان بینی لە رووداوە سیاسییەکانی ناوچەکە، لە ساڵی(٤٩٥ک/ ١١٠١ز) (سەقمان) سەرقاڵ بوونی سەلجوقییەکانی بە ململانێکانی ناوخۆیان، بە هەل قۆزتەوەو چالاکیەکی عەسکەری و سیاسی بەربڵاوی دەست پێکرد، توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ژمارەیەک لە شارە گرنگەکانی (دیاربەکر)دا بسەپێنێت... هەروەها (حسن کیفا)شی لە دواتردا دەست بەسەردا گرت، ئەمەش چونکە لە کاتێکدا میر (سەقمان) لە (دیاربەکر) بوو، (مەوسەکی تورکمانی) بە دوایدا ناردو، ئەوەی بۆ خستەڕوو، کە ئەگەر یارمەتی بدات، لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکەی (جگەرمش) بۆ سەر (موسڵ)، ئەوا لە بەرامبەردا (حسن کیفا)ی پێدەدات[١٤١].

بە باڵکێشانی (سەقمان) بەسەر (حسن کیفا)یش، فەرمانڕەوای ئەڕتەقییەکان بەسەر شارەکانی (دیاربەکر)دا دەست پێدەکات و، میرەکانی خانەوادەی ئەڕتەقی دەست بەسەر فەرمانڕەوایی شارەکانی ئەو هەرێمەدا دەگرن، بەڵام حەزەکانی (سەقمان) هەر بە باڵکێشان بەسەر (دیاربەکر) و (حسن کیفا) راناوەستێت، بەڵکو چاوەڕوانی هەلە گونجاوەکان دەکات بۆ فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی، بۆیە لە ساڵی (٤٩٦ک/ ١١٠٢ز) دەستی گرت بەسەر (ماردین)[١٤٢]، بەمەش لە ماوەی تەنیا دوو ساڵدا، (سەقمان) توانی دەست بەسەر ژمارەیەک لە ناوەندە عەسکەری و ئابوورییە گرنگەکانی (دیاربەکر) بگرێت، (ماردین) و (حسن کیفا)ش لە دواتردا بوونە بنکەی دوو میرنشینی



سەر بەخۆ، فەرمانڕەوایی لە هەر یەکەیاندا، بە دەست لکێک لە لکەکانی خانەوادەی ئەڕتەقی بوو.

ئەوەی شایانی باسە، میرەکانی خانەوادەی ئەڕتەقی، لە ماوەی دەرکەوتنیان لە (دیاربەکر) رۆڵێکی کاریگەریان لە مێژووی ئەو ناوچەیە گێڕا، لەوانەشە دیارترین کارەکانیان، بەشداریکردنیان بووبێت لەو شاڵاوانەی لە دژی خاچپەرستەکان ئاراستە دەکران، ئەوەتا میر (سەقمان) لە چەندین شاڵاودا لە دژی خاچپەرستان، بەشداریکرد، کە یەک لەو شاڵاوانە لە ساڵی(٤٩٧ک/ ١١٠٣ز) بوو، کە تیایدا میر (سەقمان) بە فەرماندەیی سوپایەکی پێکهاتوو لە حەوت هەزار سواری تورک بەشداریکرد، هەر لەو شاڵاوەدا (جگەرمش)یش یاوەری (سەقمان) بوو، کە ئەویش سوپایەکی پێکهاتوو لە سێ هەزار سواری تورک و عەرەب و کوردی بۆ ئەو مەبەستە دروستکردبوو[١٤٣]، بە هۆی بەشداریکردنە بەردەوامەکانیش لەو شاڵاوانە لە کاتی دەرچوونی لەگەڵ یەک لە شاڵاوەکان بەرەو وڵاتی شام، گیانی لە دەست دا.

لە ساڵی(٤٩٨ک/ ١١٠٤ز) (سەقمان) لەگەڵ هێزەکانی بۆ شەڕی خاچپەرستان هاتە دەر و، لە رێگادا کۆچی دوایی کرد[١٤٤]، ئیتر بە یاوەری (ئیبراهیم)ی کوڕی تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ (حسن کیفا)، شایانی باسیشە لە دوای باوکی (ئیبراهیم) کاروباری ئەڕتەقیەکانی گرتە دەست[١٤٥].

لە راستیدا دوور ناکەوینەوە، ئەگەر بڵێین: رۆڵی خانەوادەی ئەڕتەقی هەر بە تەنیا لەسەر بەرەنگاریکردنی خاچپەرستان کورت نابێتەوە، بەڵکو بەشداری دیکەشیان هەبوو، لە ساڵی(٤٩٨ک/ ١١٠٤ز) گەندەڵی تورکمانەکان لە رێگەی (خۆراسان)ی سەر بە (عێراق) بەرەو زیادی هات، خراپەکارییان دەکرد، ماڵیان بە تاڵان دەبرد و رێگرییان دەکرد، بۆیە (ئیلغازی) کوڕەکەی تری (ئەڕتەق) کە (شەحنە) بوو بەسەر (عێراق) وای بە باش بینی، سنوورێک بۆ ئەو دەستدرێژیانەی تورکمانەکانی ئەو رێگایە دابنێت، ئیتر (بلک کوڕی بەهرام کوڕی ئەڕتەق)ی برازای وەکو میرێک بۆ سەر ئەو ناوچە ئاماژە بۆکراوە هەڵبژارد، فەرمانی پێکرد ئەو ناوچەیە بپارێزێت و گەندەڵیەکانی ناوی یاساغ بکات، ئەویش لەم رووەوە بەڵایەکی باشی بەسەر ئەو گەندەڵچییانە داهێنا، وڵاتی پاراست و دەستی دەستدرێژیکەرانی بڕی[١٤٦].

دوای سەرکەوتنی میر (بلک) لەم ئەرکەی، هەوڵیدا بارەکە لە بەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە، بۆیە دەستدرێژی کردە سەر موڵکەکانی میرنشینی عەننازی و خۆی و هێزەکانی بەرەو (حسن خانیجار)[147]، هاتن -کە ئەمە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی میر (سەرخابی کوڕی بەدری عەننازی بوو)، سەرەتا گەمارۆی خستە سەر و لە پاشان دەستی بەسەردا گرت[148]، ئەوەی تریش کە لە موڵکەکانی ئەو میرنشینە مابووەوە لە دەستدرێژییەکانی میر و سەرکردە سەلجوقییەکان دەربازی نەبوو، چونکە ئەگەرچی ئەم میرنشینە مایەوە، بەڵام بەشانێکی زۆری موڵکەکانی بە دەستی سەلجوقییەکان لە دەستدا.

بەڵام سیاسەتی ئەرتەقییەکان لە بەرامبەر کوردانی دانیشتوانی ناوچەکە، وا دەردەکەوێت ئەوان سیاسەتێکی ئاشتییان لەگەڵ دانیشتوان و دەوڵەتەکانی ئەو ناوچەیە پەیڕەو کردبێت، ئەمەش وەکو هەوڵێکیان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان و راکێشانی سۆزی ئەوانیش بۆ لای خۆیان، بۆیە کاتێک (قەلج ئەرسەلان)ی سوڵتانی سەلجوقییەکانی رۆم (٤٨٥-٥٠٠ک/ ١٠٩٢- ١١٠٧ز)، لە ساڵی (٤٩٨ک/ ١١٠٥ز) لەسەر داوای خەڵکی (میافارقین) دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت، (سەقمان) لەگەڵ میرانی (دیاربەکر) ئامادەبوون، بێ ئەوەی کێشە دروست بێت، گوێڕایەڵییان بۆ سوڵتانی سەلجوقی پێشکەش بکەن[149].

(شترک) لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەرتەقییەکان سیاسەتی رەقیان لەگەڵ دانیشتوان بەکارنەهێنا، بەڵکو (حسن کیفا) و ئەو ناوچانەی سەر بە ئەوان بوون، لە رۆژگاری ئەواندا گەیشتنە لوتکەی گەشانەوە و بووژانەوەیان، هەرزانی هەموو شوێنێکی گرتەوە)[150].

یەک لە دەرەنجامەکانی ئەو سیاسەتە باشەی ئەرتەقییەکان لەو ناوچەیەدا، پەیڕەویان لێکرد، ئەوەبوو کە باڵکێشانیان بەسەر بەشی باشووری (دیاربەکر) فراوانبوو، بەڵام لە باکووردا دەسەڵات هەر بەدەست کوردان مایەوە، وەکو دەریش دەکەوێت، میرە ئەرتەقیەکان شارە کوردیەکانیان وەکو خاڵی تیا دەرچوون بۆ خۆیان گرتبوو، لە کۆچی هۆزە تورکمانییەکان بە ئاراستەی رۆژهەڵات و ناوەڕاستی ئاسیای بچووک[151].

ئەوەی سەرەنج راکیش بێت خانەوادەی فەرمانڕەوایی ئەرتەقی، بۆ بەردەوامبوونی



فەرمانڕەوایەتیان بەسەر (دیاربەکر)، کۆمەکی و پشتگیرییان لە هۆزە تورکمانییەکان وەردەگرت، هەروەها هێزەکانی ئەو خانەوادەیە، هەوڵیان دەدا خۆیان بە دووربگرن لەوەی کەوا لەگەڵ خەڵکە کوردەکانی ژێر دەسەڵاتیان لە ململانێ بکەون، ئەمە لەگەڵ بوونی شتانێکی پووچیش، کە لە بارەی مەڕوانییەکانەوە بە گوێیان گەیشتبوو، لە دواتریشدا لە سنوورەکانی رۆژهەڵاتیان ئەو سیاسەتەیان پەیڕەو کرد، کە بێن ئەو کوردە خاوەن قەڵایانە بۆ لای خۆیان رابکێشن، کە سەربەخۆییەکی خودییان هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) لە باشووری ئەواندا بە دوای میرە کوردەکاندا دەگەڕا[152].

میرنشینی ئەرتەقی فەرمانڕەوایەتی شارەکانی (دیاربەکر)ی لەبەر دەست مایەوە تا ساڵی(٥٠٢ک/ ١١٠٨ز)، لەو ساڵەدا فەرمانڕەوایەتیەکەیان بوو بە دوو بەش، بەشێکیان لە (حسن کیفا) بوو بە ناوی چینی سەقمانی، کە منداڵەکانی میر (سەقمانی کوڕی ئەرتەق) تێیدا فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، بەشێکی دیکەش لە (ماردین) کە ئەمەش بە چینی (ئیلغازی) ناونرا، ئەوەش وەکو درانەپاڵێک بۆ میر (ئیلغازی کوڕی ئەرتەق) کە خۆی و لە دوای خۆیشی منداڵەکانی لە (ماردین)دا فەرمانڕەوایەتییان کرد[153].

ئەم دووبەشەی میرنشینەکە، میرەکان یەک لە دوای یەک هاتن و فەرمانڕەوایەتیان کردن، ژمارەیەک میر لە دوای یەک هاتن فەرمانڕەوایەتی (حسن کیفا)یان کرد، کە هەموویان سەر بە خانەوادەی دەسەڵاتداری ئەو شارە بوون، فەرمانڕەوایی بەشەکەی دیکەش لە (ماردین) هەر بەردەوام بوو، بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوایەتی لەو ناوچانە لە دەست خۆیان بوو، هەروەها پاراستنی خاڵە سنووریەکانی بەرامبەر بە هێزە نائیسلامییەکانیش لە ناوچەی دەسەڵاتی خۆیاندا، هەر کەوتە ئەستۆی ئەرتەقییەکان، ئەوەتا بەپشت بەستن بەو دەقانەی کە لە سەرچاوەکاندا هاتوون، بۆمان دەردەکەوێت کە (ئەرتەقییەکان) بەرپەرچی ئەو هێرشانەی (کەرەج)یان داوەتەوە کە دەیانکردە سەر شارە کوردییەکانی (ئەرمینیا)[154]، ئەمە لە پاڵ ئەوەی کە بەرەنگاری هێرشی خاچپەرستانیشان کردۆتەوە[155].

فەرمانڕەوایەتی ئەرتەقیەکان لە (دیاربەکر) لەسەر دەستی ئەیووبییەکان لە ساڵی (٦٢٩ک/ ١٢٣١ز) رووخێنرا، دوای ئەوەش فەرمانڕەوایی (حسن) کە لە

سالّی(٦٥٨ک/ ١٢٦٠ز) مەغۆلییەکان هێرشیان هێنایە سەری و، وێرانیانکرد، ئیتر کەوتە دەست ئەوان[١٥٦].

٣- ئەحمەدیلی[١٥٧] لە (ئازەربێجان)

مێرنشینی روادی لە (ئازەربێجان)دا -وەکو پێشتر باسی لێوەکرا- لە کاتی هێرشەکانی سولّتان(مەلەکشاە) بۆ سەر هەرێمەکانی (ئازەربێجان) و (ئەرمینیا) و (ئاران) رووخا و، ولاّتی روادییەکان بەسەر میرە سەلجوقی و مەمالیکەکانیان دابەشکرا، ئیتر دوای رووخانی دەسەلاّتیان هەوالّی میرە رووادییەکان نەما.

لەگەلّ سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی، میرێکی کوردی لە (ئازەربێجان) دەرکەوت، لە ناوەکەیدا وا دەردەکەوێت کە لە نەوەی میرە رووادییەکانە، ئەویش میر (ئەحمەدیل[١٥٨] کوڕی ئیبراهیم کوڕی وەهسوزانی روادی کوردییە)و وا وەسف کراوە، کە (خاوەنی مەراغە و هەندێ شاری دیکەش بووە لە شارەکانی ئازەربێجان)[١٥٩]، هەرچەندە (ئیبنولئەثیر) و بێجگەی خۆی پەیوەندی ئەو میرەیان بە میرە روادییەکانی پێشەخۆی دەرنەخستووە، هەروەها نەزانراوە میر (وەهسوزان)(٤١٦-٤٥١ک/ ١٠٢٥- ١٠٥٩ز) کوڕێکی هەبووبێت بە ناوی ئیبراهیم، بەلّکو (قەترانی تەبریزی) شاعیری ئاماژەی بۆ سێ کوڕی (وەهسوزان) کردووە، ئەوانیش (ئەبو مەنسور مەملان) و (ئەبولهیجا منوجهر) و (ئەبو لقاسم عەبدوللاّ)ن[١٦٠].

بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا، ئەو شیعرەی (تەبریزی) بەلّگەیەکی رێگر نییە، لەوەی کەوا: (ئیبراهیم)ی -باوکی ئەحمەدیل- کوڕی (وەهسوزان) بێت، لە پاشان (ئیبنولئەثیر) گومان بە یەقین دەگۆڕێت، کاتێک (ئەحمەدیل) دەداتەپالّ میرە رووادییەکان، کە دێت ناوەکەی بە تەواوی دەنووسێت: (ئەحمەدیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی وەهسوزانی روادی کوردی)[١٦١].

بە پشت بەستن بەم رایەش دەتوانرێت (ئەحمەدیل) بە (یەک) لە میرەکانی بنەمالّەی میرە روادیەکان بژمێردرێت و، میرنشینەکەشی هەر بە درێژەوە بووی میرنشینەکەی ئەوان دابنرێت، لەگەلّ جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی، کە (ئەحمەدیل) کەمتر پەیوەندی بە ولاّتەکەی خۆیەوەی هەبوو، بەلّکو لە خزمەتی سەلجوقییەکان بوو، بۆیە هەوالّەکانیشی لە (مەراغە) خەریکە هەر تەواو نادیار بێت، چونکە لە بارەی فەرمانڕەوایەتیەکەی لەوێ،



هیچ نازانرێت. ئەوەی شایانی باسە، مانەوەی (مەراغە) لە دەست (ئەحمەدیل) باشترین بەلّگەیە لەسەر ئەوەی کە خانەوادەی (روادی)ش هەر بە وێنەی خانەوادە کوردییە فەرمانڕەوایەکانی دیکە، بە شێوەیەکی تەواو و یەکجاری دەسەلاّتی بەسەر مولّکەکانی خۆی لە دەست نەداوە، بەلّکو ئەو خانەوادانە، هەر لەگەلّ ئەوەی کە هەلێکی باشیان بۆ هاتە پێش کە ئەویش لاوازی سەلجوقییەکان و، ناکۆکی نێوان سولّتانەکانیان بوو، گەڕانەوە بۆ سەردەمی جارانیان و ئەوەندەی لە توانایاندا بووبێت، دەستیان بەسەر مولّکەکانیاندا گرتۆتەوە.

بۆ یەکەم جار ناوی (ئەحمەدیل) لە رووداوەکانی سالّی(٥٠١ک/ ١١٠٧ز) هاتووە، کە لە گوێڕایەلّی سولّتان(محەمەد)ی سەلجوقی (٤٩٨- ٥١١ک/ ١١٠٤- ١١١٧ز) دا بووە، خزمەتی سولّتانی کردووە، سوپای بۆ هەناردووەو لە شەڕەکانیدا لە تەکیدا وەستاوە، جا وەکو رێزلێنانێک لەو کۆششە گەورانەی، سولّتان(مەراغە)ی بۆ بڕیوەتەوە- کە یەک بووە لەو شارانەی مولّکی باوکی بوونە- لەگەلّ چەند ناوچەیەکی دیکە لە (ئازەربێجان)[١٦٢].

دەشێت بەخشینی (مەراغە) بە سەرەتای دامەزراندنی میرنشینی (ئەحمەدیلی) بژمێردرێت تیایدا، چونکە بەخشینی (ئەقتاع) بە میر و فەرماندەکان لە دەولّەتی سەلجوقیدا، بە تایبەت لە رۆژگاری لاوازییان، کە لە دوای مردنی سولّتان(مەلەکشاە) دووچاری هاتن، شتێکی باوبوو[١٦٣]، جا بە بەرچاوگرتنی ئەو مەکانە تایبەتەی میر (ئەحمەدیل) هەیبوو، بۆیە سولّتان(محەمەد) چەند (ئەقتاع)ێکی فراوانی پێبەخشی، کە سالاّنە داهاتێکی گەورەیان بۆ زامن دەکرد[١٦٤].

ئەو میرە بە هێزەکانیەوە بەشداری چالاکیە عەسکەریە جۆراجۆرەکانی سولّتان(محەمەد)ی کرد، بە تایبەت لەو هێرشانەیدا بۆ ولاّتی شام و شەڕ لە دژی خاچپەرستان... چونکە لە سالّی(٥٠٥ک/ ١١١١ز) سکالاّی موسلمانانی شاری (حەلەب) لە دەستدرێژییەکانی خاچپەرستان زۆر بوو، بۆیە هاتنە (بەغدا) و داوای یارمەتیان لە خەلیفەی عەباسی[١٦٥] و لە سولّتانی سەلجوقیش کرد، بۆ ئەوەی سنورێک بۆ ئەو دەستدرێژییانە دابنێن، بۆیە سولّتان(محەمەدی کوڕی مەلەکشاە) بڕیاریدا سوپا بۆ بەهاناوە چوونیان بەرێبخات، فەرماندەی ئەو سوپایەشی بە میر (مەودود کوڕی

تونتکین)ی خاوەنی (موسڵ)[١٦٦] بەخشی، کە ژمارەیەک میری موسڵمان بەشداری شاڵاوەکەی ئەو میرە ناوبراوەیان کرد، لە نێوانیان میر (ئەحمەدیلی کوردی)ش، کە بە سەرکردایەتی (سوپایەکی گەورە) و [١٦٧] بەرەو (تەلی باشر)[١٦٨] هات، گەمارۆی خستە سەر [١٦٩] و (جوسلینی یەکەم)ی -خاوەنی تەلی باشری خاچپەرستیش- هەوڵیدا قەناعەت بە میر (ئەحمەدیل) بکات، هێزەکانی بکێشێنێتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش پارەیەکی زۆری بۆ پێشکەشکرد[١٧٠].

ئەم پارەیەی (جوسلین) بەخشی، شوێنەواری بەسەر (ئەحمەدیل) جێهێلا و، بڕیاریدا گەمارۆکەی هەڵگرێت و، سوپاکەی بکشێنێتەوە، ئەم بڕیارەشی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە شکست هێنانی شاڵاوەکە، بۆیە میرە موسڵمانەکانی دیکە نارەزاییان لە بەرامبەر ئەو کارەی (ئەحمەدیل) دەربڕی و، لۆمەی شکستهێنانی موسڵمانانیان خستە سەر ئەو[١٧١].

(محەمەد ئەمین زەکی) بۆ پاساوی هەڵوێستی ئەو میرە کوردە، ئاماژە بە کۆمەڵێک هۆکار دەکات، لەم بارەیەوە دەڵێت: میر (سەگمانی قوتبی) -میری خەڵات و تەبرێز- و میر (ئەبولهیجائی هەزبانی) -فەرمانڕەوای ئەربل-یش لە پاڵ میر (ئەحمەدیل)دا لە بەشدار بووانی شاڵاوەکە بوون، هەموو ئەمانەش دەستێکی باشیان وەشاند و قارمانیەکی گەورەیان نواند، تا وای لێهات خەریک بوو (تەلی باشر) دەکەوتە دەستیان، ئەگەر هاتبوا میر (ئەحمەدیل) لە گۆڕەپاندا نەکشابووایەوە[١٧٢].

جا دەڵێت: (ئەحمەدیل) ناچار بوو بە پەلە بگەڕێتەوە (ئازەربێجان)، ئەمەش بە هۆی مردنی میر (سەگمان)وە، بۆ دەستگرتنەوە بەسەر ئەو زەویانەی کە لە ژێر دەستی (سەگمان) دابوو، ئەمەش بەو پێودانگەی کە (سەگمان) فەرمانڕەوایی بەسەر چەند ناوچەیەکدا کردووە، کە لە بنجدا ئەو ناوچانە موڵکی خانەوادەکەی بوونە، بۆیە میر (ئەحمەدیل) ترسی ئەوەی لێنیشت، کە ئەم ناوچانە لە دەست بچێت و، یەکێکی دیکە دەستیان بەسەردا بگرێت، بۆیە بە پەلە گەڕایەوە و، داوای لە سوڵتان کرد، ئەو زەویانەی بۆ ببڕێتەوە[١٧٣].

هەرچی (حیسامەدین نەقشەبەندی)یە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: میر (ئەحمەدیل) هاتە لای سوڵتان، داوای ئەو ئەقتاعانەی لێکرد، کە هی میری مردوو بوون[١٧٤]، چونکە (سەگمان) کاتێک (تەبرێز)ی خستە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی، کە خاوەنەکەی (مەودودی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی یاقوتی) خاوەنی لە ساڵی(٤٩٦ک/ ١١٠٢ز) کۆچی دوایی کرد... هەردوو میر(ئەحمەدیل) و (سەگمان)یش زاوا و، خەزورایەتییان لە نێواندا هەبوو، ژنی میر(ئەحمەدیل) کچی (سەگمان) بوو[١٧٥]، جا بەو پێیەی کەوا زاوای خاوەنی (تەبرێز)ە بۆیە لەو باوەڕە دابوو، لە بێجگەی خۆی مافی زیاترە، بۆ داواکردنی ئەقتاعەکانی.

زیاد لەوەش سەبارەت بە (ئەحمەدیل)ەوە، (تەبرێز) بە بەشێک لە موڵکەکانی باپیری دەژمێردرا، هەروەها سوپا گەمارۆدەرەکانیش عەزیمەی درێژەدان بە گەمارۆکەیان نەبوو، چونکە وەکو (ئیبنولقەلانسی)[١٧٦] لە ئەتابەک (تەغتکین) دەگێڕێتەوە، ناکۆکی کەوتبووە نێوانیان و ئیتر (ورەیەکی راستگۆیانەی بۆ جیهاد و پاسەوانێتی وڵات) لە لا نەهێشتبوون.

دوای کشانەوەی لەو شاڵاوەی بە ئاراستەی وڵاتی شامدا بردیان، تا کوژرانی، زانیاری لە بارەی خاوەنی (مەراغە)وە کەمە، سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ چۆنیەتی کوژرانی ئەو میرە کوردە کردووە، دەڵێن: لەبەر ئەوەی مەکانەیەکی تایبەتی هەبووە لە لای سەلجوقییەکان، بۆیە زۆرجار یاوەرێتی سوڵتانی دەکرد لە سەردانەکانی و بەشداری دانیشتنەکانی دەبوو، تا لە ساڵی (٥١٠ک/ ١١١٧ز) کە لە یەکێک لە دانیشتنەکانی سوڵتان(محەمەد)دا لە (بەغدا) دانیشتبوو، پیاوێکی باتنی بە گریان و وەکو ئەوەی زۆرلێکراوبێت، لێی هاتە پێش، نووسراوێکی لە دەست بوو، داوای لێکرد بیگەیەنێتە سوڵتان، ئەویش هەر هێندە دەستی بۆ برد لێی وەربگرێت، ئیتر پیاوەکە چەقۆیەکی لێداو، بەم هۆیەوە دەست بەجێ گیانی لەدەستدا[١٧٧].

ئەوەی شایانی باسە، مێژوونووسەکان بە کاسایەتی و ئازایەتی و دەسەڵاتی ئەو میرەیان هەڵگوتووە، (ئیبنولقەلانسی) لە بارەیەوە دەڵێت: (لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسایەتیەکی بەهێزو، پیاوانێکی زۆر و، کەل و پەل (عدة)یەکی بێ ژماری هەبوو)[١٧٨] بەڵام کوژرا، دیسانەوە مێژوونووس (سەبتی ئیبنولجۆزی)ش پیایدا هەڵدەداو دەڵێت: (ئازا و جوامێر بوو)[١٧٩].

لە دوای مردنی دامەزرێنەرەکەشی فەرمانڕەوایی ئەحمەدیلیە لە هەرێمەکەدا هەر

بەردەوامبوو، (ئەقسنقەر)ی مەملکوکی لە دوای ئەو فەرمانڕەوایی گرتە دەست، ئەو میرانەی دیکەش کە لە دوای ئەو دەسەڵاتیان گرتە دەست، هەموویان لە مەمالیکە تورکەکان بوون، ئەوەی لە دوای خۆشیدا دەسەڵاتی گرتە دەست – وەکو ئاماژەمان بۆی کرد– یەک لە مەمالیکەکانی خۆی بوو، کە وەکو درانەپاڵی خۆی، پێی دەگوترا (ئەقسنقەری ئەحمەدیلی)[١٨٠] (ئەقسنقەر)یش پارێزگاری لە فەرمانڕەوایەتیی کردنی ئەو ناوچانەدا کرد، کە پێشتر لەبەر دەستی خاوەنەکەی (ئەحمەدیل) دابوون، بەم شێوەیە بووە خاوەنی –مەراغە و تەبریز– و بێجگەی ئەوانیش لە زەویەکانی (ئازەربێجان)، (نەیسابوری) دەڵێت: (ئەقسنقەر)ی ئەتابەکی (مەراغە و ئازەربێجان) خولامی (ئەحمەدیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی وەهسوزان)ی فەرمانڕەوای (ئازەربێجان) بوو[١٨١].

دوای (ئەقسنقەر)یش فەرمانڕەوایی ئەحمەدیلی درێژەی بوو و، (ئازەربێجان) ململانێی نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکانی لەسەر دەسەڵات بە خۆوە بینی، بۆیە زۆرجار ئەو هەرێمە دەکەوتە دەست چاوتێبڕەکان و هەڕەشەیان لە فەرمانڕەوایەتی ئەحمەیلی دەکرد، بێگومان ئەم بارە سیاسییە خراپ و ناجێگیرەش، کاریگەری زۆری لەسەر کوردانی دانیشتووی ئەو ناوچەیە هەبوو.

چوارەم: بارە سیاسییەکانی کورد لە سەرەتای سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی و، تا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتی زەنگی:

لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، دەوڵەتی سەلجوقی ڕووداو وپێشهاتی ترسناکی بە خۆوە بینی، لە کاتێکدا ململانێی نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکان لەسەر دەسەڵات توند بوو، لە جیهانی ئیسلامیدا چەند کێشەی دیکەی سیاسی سەریان هەڵدا، کە دەشێت مەترسی باتنییەکان لە پێشەوەی هەموو ئەو کێشانەدا بێت، چونکە وایان لێهات بوونە سەرچاوەی هەڕەشەیەکی بەردەوام لە موسڵمانان و لە چەند شوێنێکی زۆری هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی... هەروەها ڕووبەڕووی کێشەیەکی دیکە بوونەوە، ئەویش خۆی لەو ململانێیە دەنواند، کە لە نێوان ئەتابەکەکان و میرە عەسکەرییەکان دروستبوو لەسەر ئەقتاعە عەسکەریەکانیان و گۆڕینی سۆزی سیاسییان (ولاء) لە سوڵتانێکەوە بۆ سوڵتانێکی تر[١٨٢].



لە گەرمەی ئەو کێشانەشدا، ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی ڕووبەڕووی مەترسی خاچپەرستان بووەوە، چونکە پاپەوییەکان و وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا بارە خراپەکانی ئەو ناوچەیان بە هەلزانی و هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر شارەکانی (شام)... لە سەرەتاشدا نە عەباسییەکان و نە سەلجوقییەکانیش بایەخێکی ئەوتۆیان بەو مەترسییە نەدا، بەڵام کاتێک لە بێئاگاییەکەیان ڕابوون، بینیان ئەوان شوێن پێیێکیان لە جیهانی ئیسلامی بۆ خۆ دوستکردووە و لە (ڕەها) و (تەرابلس) و (ئەنتاکیە) و (بەیتولمەقدیس)دا چوار میرنشینیان دامەزراندووە[١٨٣].

ئەمەیە وێنەی بارە گشتییەکەی جیهانی ئیسلامی لە سای فەرمانڕەوایی سەلجوقییەکان، بەڵام سەبارەت بە باری کورد، بە تایبەتیش لە دوا ساڵەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ ئەوا دیسانەوە ئەویش خراپ بووە و لە باری ناوچەکانی دیکە باشترنەبووە، ئەویش دوای ئەوەی ململانێیەکی توندی نێوان سوڵتانە سەلجوقییەکانیان لەسەر زەویەکانی خۆیان بە خۆوە دی و، لەسەر زەوی کورد چەند ئەتابەکیەتێکی سەربەخۆ دامەزران، بۆیە بارە سیاسییەکانی وڵاتی کوردیش جێگیر نەبوو، ئەمەش بووە هۆی شڵەژانی باری ناوەخۆی ئەو هەرێمانەی ئەو میللەتەی تیا دەژیا.

لەگەڵ کەمی زانیاریەکانیش لە بارەی هەڵوێستی کورد لەو ململانێیانە و لە سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتەکانیش دەکرێ بگوترێت: میر و پێشەوای هۆزە کوردییەکان لە بێجگەی ڕازاییبوون بە واقیع و بارە بەسەردا سەپێنراوەکانیان، هیچی دیکەیان لە پێشدا نەمایەوە، ئەمەش بێگومان دوای ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی سەربەخۆی خۆیان لە دەستدا و بوونە ملکەچی سەلجوقی و ئەتابەکیەکان.

لە نێو دەقە مێژووییەکاندا هەندێ ئاماژە لە بارەی کورد و میرەکانیانەوە هاتووە، کە لە ڕێگەیانەوە دەکرێت وێنەیەکی گشتی لەمەڕ باری سیاسی کورد و هەواڵەکانیان لە ماوەی نێوان (٥٠٠ک/ ١١٠٦ز) و تا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەتی زەنگی لە موسڵ ساڵی(٥٢١ک/ ١١٢٧ز)[١٨٤] پێشکەش بکەین، کە لە ڕاستیدا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەی ئاماژە بۆکراو، وەکو بانگێک بوو، بۆ ڕووخانی ئەو میرنشینە کوردیانەی کە تا ئەو مێژووە مابوون، دیسانەوە نامەیەکی کراوەش بوو بۆ کۆتا هاتنی پێشەوا و سەرۆک هۆزە کوردییەکانی بڵاوەبووی قەڵاکانی وڵاتی کورد[١٨٥].

لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی، باری سیاسی کورد خراپ بوو، چونکە وڵاتەکەیان بە بەردەوامی هەڕەشەی تاڵان و راوڕووتی بە سەرەوە بوو، لەو لاشەوە لە وڵاتەکەیاندا یاخیبووان لە دژی دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقی سەریانهەڵدا... ئەوەتا لە ساڵی (٤٩٨ک/ ١١٠٤ز) کۆمەڵەیەکی تورکمان لە هەرێمی (چیاکان) قەراریان گرت و بێهودەیی و گەندەڵییەکانیان تێدا زیادی کرد[١٨٦]، میری (عەننازی)ش سەرنەکەوت لە هەولی گێڕانەوەی موڵکەکانی، چونکە وەکو پێویست هێزێکی نەبوو، بە هۆیەوەی کار لەسەر پارێزگاری لێکردنیان بکات، ئەمە جگە لەوەی کە میر (سەرخابی کوڕی بەدر)یش لەو ماوەیەدا هەر بە ناو میربوو لەسەر میرنشینەکە.

لە لایەکی دیکەوە، هەندێ لە یاخیبووان لە دژی سەلجوقییەکان شارە کوردییەکانیان دەکردە لانەی چالاکیەکانیان، ئەمەش بەو هۆیەی کە لە ناوچەی شاخاوین و بە ئاسانی- سەلجوقییەکان- پێیان ناگەن، ئەوەتا کاتێک (منکەبرس کوڕی بوربرس کوڕی ئەلب ئەرسەلان) ئامۆزای سوڵتان (محەمەد کوڕی مەلەکشاە) لە ساڵی(٤٩٩ک/ ١١٠٥ز) لە دژی سوڵتان (محەمەد)ی ئامۆزایدا یاخیبوونی خۆی راگەیاند، لە (ئەسفەهان) بوو، بەڵام ئەوێی جێهێشت و بەرەو (نەهاوەند) هات، چونکە شوێنی جوگرافی (نەهاوەند) زۆر قایم بوو، بەم شێوەیە دەستی بەسەر ئەو شارەدا گرت و، تیایدا خوتبەی بۆ خۆی خوێندەوە، ئینجا نووسراوی بۆ میرەکانی ناوچەکە هەنارد تا پەیوەندی پێوە بکەن[١٨٧].

بەڵام سوڵتان کۆششێکی زیاتری کرد، بۆ زاڵبوون بەسەریدا، بۆ ئەمەش لە میرە سەلجوقییە بڵاوەبووەکانی شارەکانی هەرێمی(چیاکان) داوای یارمەتی کرد، چونکە وەکو دەزانرێت، دەسەڵاتی سەلجوقی بەرێوەبردنی شار و هەرێمەکانی سەربەخۆی بەو میر و سەرکردانەی خۆی دەبەخشی، کە جێی متمانەی بوون، بۆیە هەندێ لە مانە لە ماوەی شەڕەکەی لەگەڵ یاخیبوواندا، یارمەتی سوڵتان(محەمەد)یاندا[١٨٨].

لەگەڵ فشارە دەرەکیە جۆراوجۆرەکانیش، هێشتا ژمارەیەکی باش، لە میر و سەرۆک هۆزە کوردییەکان، پارێزگاریان لە دەسەڵاتە خۆجێییەکەی خۆیان کرد، لەگەڵ ئەوەشدا دانیان بەو سوڵتانە سەلجوقی و ئەتابەکانە نا، کە باڵیان بەسەر وڵاتی کورددا کێشابوو و، بەشداری چالاکیە سەربازییەکانیشیان دەکردن، لە ژێر رۆشنایی هەندێ دەقیش دەکرێ بگوترێت: سوڵتانە سەلجوقی و ئەتابەکەکان بەسەر میرە کوردە خوجێییەکانیاندا سەپاند



بوو، کە ساڵانە بڕە پارەیەکی دیاریکراویان پێبدەن و، ژمارەیەک لە پیاوانی ئەو هۆزە کوردیانەی لە ژێر دەسەڵاتیاندا کەل و پەلی سەربازی تەواویان بۆ زامن بکەن و، بیاننێرنە ریزەکانی سوپای ئەوان.

ئەوەتا لە باشووری (بەغدا) و ناوچەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی (دیجلە)، میری کوردی هۆزی جاوانی ناسراو هەبوون، کە هاوپەیمان بوون لەگەڵ میرە عەرەبەکانی (بەنی مەزید) پێکەوە رۆڵی گەورەیان بینی لە رووداوەکانی ناوەڕاستی (عێراق)،لە ساڵی (٤٩٩ک/ ١١٠٥ز) (سەدەقەی کوڕی مەنسوری مەزیدی) میری مەزیدیەکان، هێرشی کردە سەر شاری (بەسرا) و دەستی بەسەردا گرت، لەم هێرشەیدا کوڕە خاڵۆکەی خۆیشی لەگەڵ بوو، کە ناوی میر(ئەبو نەجم کوڕی ئەبی قاسمی ورامی جاوانی) بوو و، لە شەڕەکەدا کوژرا[١٨٩]... شایانی باسە میر (ئەبو نەجم) میرێکی ئازا و پێشەنگ بوو یەک لە شاعیرەکان بەم شێوەیە دەیلاوێنێتەوە و دەڵێت:

**تهني ياخير من يحمي حريم حمى**
**فتحا اغثت به الدنيا مع الدين**
**ركبت للبصرة الغراء في نجب**
**غر كجيش علي يوم صفين**
**هوى ابو النجم كالنجم المنير بها**
**لكنه كان رجما للشياطين**[١٩٠]

بەڵام بۆ هەواڵی میرنشینی هەزبانی کوردی فەرمانڕەوا لە (ئەربل) و دەوروبەری، ئەوا لە ساڵی(٥٠٠ک/ ١١٠٦ز)، سوڵتان (محەمەد) هەڵسا بە بڕینەوەی هەردوو شاری (موسڵ) و (دیاربەکر) بۆ (جاولی سقاو) لە بری (جگەرمش)[١٩١]، ئیتر والی نوێ دەستی کرد بە باڵکێشان بەسەر ئەو وڵاتەی بۆی بڕێنرایەوە، سەرەتا دەستی بەسەر (بەوازیج)[١٩٢] داگرت، ئینجا بەرەو (ئەربل)ی -پایتەختی میرنشینەکە- هات[١٩٣].

لەو کاتەشدا (جگەرمش) خۆی بۆ رووبەڕووبوونەوەی (جاولی) ئامادە دەکرد، نامەیەکی ئاگادارکەرەوەشی لە میری هەزبانی (ئەبولهەیجائی کوڕی مەوسەکی کوردی) پێگەیشت، تیایدا بۆی نووسیبوو، کە هێزەکانی(جاولی) لە ناوچەکانی (جەزیرە) نزیکبوونەتەوە، هەروەها ئەو میرە هەزبانییە ئاگاداریکردبۆوە، ئەگەر پەلە نەکات لە

یەکخستنی هەوڵەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو (والی)یە نوێیەیەی سەلجوقی، ئەوا خۆی ناچار دەبێت، بچێت لەگەڵ (جاولی) هاوپەیمانی ببەستێت، ئیتر(جگەرمش) بە پەلە لە (موسڵ) هاتە دەرو بۆ بەری ڕۆژهەڵاتی (دیجلە) پەڕیەوە، میر (ئەبولهیجاء)یش هێزە کوردییەکانی لەگەڵ منداڵەکانی بۆ ڕەوانکرد، بەمەش هەردوو هێزەکان لە نزیک گوندی (باکلبا)ی سەر بە (ئەربل) بەیەکیاندا داو[١٩٤]، شەڕێکی خوێناوی لە نێوانیاندا بەرپابوو، سەرەنجام بە شکستی (جگەرمش) کۆتایی بەو شەڕە هات، کە شایانی باسە (جگەرمش) خۆی بە دیل گیراو دواتر کوژرا[١٩٥].

هەندێ لە مێژوونووسان هۆی دوورخستنەوەی (جگەرمش) لە (والی)یەتی (موسڵ) بەوە دەستنیشان دەکەن، کە ئەگەرچی ناوبراو سەردانی سوڵتانی کرد، پەیمانی پێدا لەبۆی دڵسۆزبێت و پارەو سامانی بۆ ڕەوان بکات، بەڵام ئەو پەیمانەی بەجێنەهێنا و دواکەوت لە هەناردنی پارە و سامان بۆ سوڵتان (محەمەد)، بەمەش فەرمانڕەوایەتی (موسڵ)ی لە دەستدا[١٩٦].

منداڵەکانی میر (ئەبولهیجای هەزبانی)ش ئەوانەی لە پاڵ (جگەرمش)دا دەجەنگان، ئەوانیش بە دیل گیران، بەڵام دواتر ئەوان ئازاد کران، چونکە (جاولی) داوای یەک لە پیاوە شوێنکەوتووەکانی (جگەرمش)ی کرد، کە ناوی (ئەبو تالب کەسیرات) بوو و لای هەزبانییەکان بوو، لەولاشەوە میری هەزبانیش داوای ئازاد کردنی منداڵە دیلەکانی خۆی کردەوە، ئیتر هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە دیلەکانی یەکتر ئازاد بکەن[١٩٧].

لەوەی پێشوودا ئەوە دەخوێنینەوە کە میرە کوردە هەزبانییەکان، ئامادەیی هەمیشەییان هەبووە لەو ڕووداوە سیاسیانەی لە (جەزیرە) ڕوویانداوە، چونکە هەندێ لەو ململانێیانەی لەو ناوچەیە دروستبوونە و ڕوویانداوە، هەزبانییەکان دەستێکی گەورەیان هەبووە لە ڕووداوەکانی، ئەمەش لەبەر نزیکی (ئەربل) لە هەرێمی (جەزیرە) و بە تایبەتی لە (موسڵ).

وەکو دەردەکەوێت، ململانێ لەسەر داگیرکردنی (جەزیرە) و (دیاربەکر) و (موسڵ) بە کوژرانی (جگەرمش) لە ساڵی (٥٠٠ک/ ١١٠٦ز) بە کۆتا نەهاتووە، بەڵکو بە دەرکەوتنی کێبڕکێکەری دیکە لەسەر گۆڕەپانە سیاسییەکە، بارەکە خراپتربووە، ئەوەبوو لە هەمان ساڵی ئاماژە بۆ کراودا، (قلج ئەرسەلان)ی سوڵتانی سەلجوقییە ڕۆمییەکان هەوڵی



داگیرکردنی (جەزیرە) و (موسڵ)یدا[١٩٨]، لە نێو هێزەکانی (قلج)ش ژمارەیەک میر هەبوون لەوانە (ئیبراهیمی کوڕی یەناڵی تورکمانی) -خاوەنی ئامەد- و (محەمەدی کوڕی جەبقی تورکمانی) -خاوەنی حسن زیاد- کە ئەمە (خرتبوت)ە[١٩٩].

بەڵام لە بارەی چۆنیەتی کەوتنی ئەم دوو شارە بۆ دەست (یەناڵ) و (جەبق) ئەوا یەکەمیان واتە (ئیبراهیم یەناڵ) لە ساڵی (٤٨٦ک/ ١٠٩٣ز)دا لە کاتی باڵکێشانی (تاجولدەولە تەتش) بەسەر (دیاربەکر)دا، شاری (ئامەد)ی وەرگرت، ئیتر هەر لە دەست خۆی و دواتریش لە دەست منداڵەکانیدا مایەوە، لە پاشەخۆی[٢٠٠]... بەڵام هەرچی (محەمەد کوڕی جەبق)ە -ئەوا وەکو باسمان کرد- وەکو یەکەم (شەحنە) بەسەر (دیاربەکر)ەوە دامەزرێنرا، دوای وەرگرتنی ئەم پۆستەش، سەرکەوت لەوەی دەست بەسەر (حسن زیاد) بگرێت، چونکە لە دەست ڕۆمە بیزەنتییەکانی دەرهێنا، هەر لە دەستیشیدا مایەوە[٢٠١].

(جەبق) دیسانەوە لە دەست گرتن بەسەر چەند قەڵایەکی تریش لەو ناوچەیەدا سەرکەوت، بەمەش کەوتە ململانێ لەگەڵ فەرمانڕەوا بیزەنتییەکان و توانی هەندێ ناوچەی دیکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لە دوای مردنیشی، (محەمەد)ی کوڕی فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەی گرتە دەست، کە لە ژێر دەستی باوکیدا بوون[٢٠٢]، بەم شێوەیە شار و قەڵا کوردییەکانی ناوچەی (جەزیرە) هەر لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە ژمارەیەک لە میر و سەرکردە سەلجوقییەکان دەستی بەسەردا دەگرن، ئەو (والی)یانەش بەشداری لەو شەڕو و ململانێیانە دەکەن، کە لەو ناوچەیە سەرهەڵدەدەن، ئەمەش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کار لە بارە سیاسییەکە دەکات.

لە ڕۆژئاوای هەرێمی (چیاکان) و (شارەزوور)یش، هەرچەندە تورکمانیش تیایاندا بڵاو بوونەوە و میرنشینی عەننازی هەڵوەشابووەوە، بەڵام میر (ئەبولفەوارس سەرخاب کوڕی بەدر) لە نەوەکانی میر (ئەبو لفەتح محەمەدی عەننازی)، تا ڕادەیەکی گەورە هێز و توانای سەربازیی هەبوو، لەگەڵ سامانێکی زۆر و چەند ئەسپێکی لە ژمارە بەدەر[٢٠٣]، قەڵای (خەفتیکان)ی سەر ڕێگەی (شەهرەزوور–ئەربل)یشی کردە پایتەختی خۆی[٢٠٤]، وەکو دەریش دەکەوێت، ئەو تاکە میری عەننازییەکان نەبووە، بەڵکو ئەو خانەوادەیە میرێکی دیکەشی هەبووە، ئەویش (ئەبو نەسر موهەلهیلی کوڕی ئەبو لشەوک) بووە، کە شوێنکەوتەی سوڵتان (مەلەکشاە) بوو[٢٠٥].

شایانی ئاماژە پێدانە، لەو ماوە زەمەنیەدا، چەند میرێکی بە توانای کورد دەرکەوتن، دەسەڵاتی سەلجوقی -لەبەر متمانەی گەورەی پێیان- بۆ بە ئاکام گەیاندنی هەندێ لە مەبەستەکانی پشتی پێبەستن، ئەوەتا لە ساڵی(٥٠٢ك/ ١١٠٨ز) سوڵتان(محەمەد) بڕیاریدا (جاولی سقاو) لە (والی)یەتی (موسڵ) و (جەزیرە) و (دیاربەکر) لابەرێ و لە جێی ئەودا یەک لە سەرکردەکانی تری، کە ناوی (مەودود کوڕی تونتکین)بوو، ئەو بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێرێت، ئەمەش لە کاتێکدا کە پێشتر سوڵتان دەسەڵاتی تەواوی دابووە ( جاولی) بۆ فەتحکردنی هەرێمەکانی نزیک ناوچەکانی دەسەڵاتی، هەروەها بەڕێوەبردنی هەموو ئەو شارانەشی پێدابوو، کە فەتحیان دەکات(٢٠٦).

هۆی لادانیشی لە (والی)یەتیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەو (واتە/جاولی) لە ناوچەی (جەزیرە)دا دەستی بەسەر چەند هەرێمێکی فراواندا گرتبوو و ماڵ و سامانێکی زۆری ئەو ناوچانەشی خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام وەکو دابی باو، پارەو دیاری بۆ سوڵتان نەدەهێنا(٢٠٧)، بۆیە سوڵتان لەسەر کاری لابرد، بەڵام بڕیاردانی دوورخستنەوەی (جاولی) لە ناوچەکە، لەبەر ئەو دەسەڵاتە فراوانەی ناوبراو، کە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی دروستی کردبوو، لە مەسەلە ئاسانەکان نەبوو، بۆیە سوڵتان ناچاربوو نامە بۆ ژمارەیەک لە میرەکان بنووسێت، بۆ ئەوەی یارمەتیی بدەن لە وەرگرتنەوەی (جەزیرە) لە (جاولی)، ئیتر هات نامەی بۆ نەوەی (بەرسەق) و (سەگمانی قوتب) - خاوەنی ئەرمینیا و میافارقین-(٢٠٨) و (مەودودی کوڕی تونتکین) و (ئەقسنقەڕی بەرسەقی) نووسی(٢٠٩).

میرە کوردەکانیش بە هۆی هەڵکەوتەی جوگرافی وڵاتەکەیان دیسانەوە ئەوانیش ڕۆڵی خۆیان هەبوو لەو ڕووداوە سیاسییە ئاڵۆزانە، ئەوەتا سوڵتانی سەلجوقی، کورد لەو ململانێیانە دوور ناخاتەوە، بەڵکو نامە بۆ میر (ئەبو نەسر کوڕی موهەلهیل کوڕی ئەبی شەوکی کوردی) -کە ئەمە یەکە لە میرە عەننازیەکان- و بۆ میر (ئەبولهیجاء)ی - خاوەنی ئەربل- دەنووسێت، کە بەرەو (موسڵ) بەڕێ بکەون و، لە دەستی (جاولی) دەری بێنن(٢١٠).

هێزەکانی سەر بە سوڵتان(محەمەد)، کە لە چەندین سوپای عەرەب و کورد پێکهاتبوو، توانییان بێنە ناو (موسڵ)، ئەمەش دوای ئەوەی شکستیان بە هێزەکانی



(جاولی) گەیاند، بەوەش (مەودود) فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانەی گرتە دەست(٢١١).

لە ماوەی دەسەڵاتی (مەودود) بەسەر (موسڵ) و (جەزیرە)دا، لە (٥٠٢- ٥٠٧ك/ ١١٠٨-١١١٣ز)، وا هاتە پێش بۆ هەندێ لە پێشەوا و خاوەن قەڵاکانی کورد، دەسەڵاتی خۆیان بۆ سەر بەشێک لە قەڵا و شارەکانی خۆیاندا بگێڕنەوە، ئەمەش بە سوود وەرگرتن لە ململانێ توندەکەی نێوان فەرماندە تورکە سەلجوقییەکان و مەمالیکەکانیان، ئیتر ئەو میرانە سەرکەوتن لەوەی راستەوخۆ فەرمانڕەوایێتی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان بکەن(٢١٢).

خەریکبوونی (مەودود) بە شەڕەکانی لەگەڵ فەرنجیەکان(خاچپەرستان)، هەڵێکی گونجاوی بۆ میر و سەرۆک هۆزە کوردییەکانی شار و قەڵا بڵاوە بووەکانی (جەزیرە) هێنایە پێش، بۆ گەڕاندنەوەی سەربەخۆییە خۆجێییەکەیان، بە کارەکیش هەندێ قەڵا و ناوچە کەوتە ژێر دەستیان، بەڵام فەرمانڕەوایەتیەکەی (مەودود) زۆر درێژەی نەکێشا و لە ساڵی(٥٠٧ك/ ١١١٣ز) لەسەر دەستی باتنیەکان کوژرا(٢١٣)، بەمەش سوڵتان (محەمەد) میر (ئەقسنقەڕی بەرسقی)ی ڕەوانکرد، بۆ ئەوەی کاروبارەکانی ئەو ناوچەیە بگرێتە دەست، ئینجا سوڵتان نامەی بۆ سەرجەم میرەکانی تر و لەنێوانیشیان میرە کوردەکان و بە تایبەت میرانی هەکاری نووسی، کە گوێڕایەڵی (بەرسەقی) بکەن... دوای ئەمەش (والی)ی نوێ دەستیکرد بە باڵکێشانی بەسەر شارەکانی (جەزیرە) و لە نێویشیان (جەزیرەی ئیبنو عومەر) و (ڕەها) و(ماردین) و بێجگەی ئەوانیش(٢١٤).

هەوڵە لێبڕاوەکان بۆ ملکەچکردنی میر و سەرۆک هۆزە کوردییەکانی قەڵا بڵاوەبووەکانی (جەزیرە)، هەر لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد، کە میر(جیوش بەگ) کاروبارەکانی ناوچەکەی گرتە دەست، لە ساڵی(٥٠٩ك/ ١١١٥ز)یش لە لایەن سوڵتان (محەمەد)ەوە بڕیار دەرچوو کە ئەو مولکانەی پێشتر هی (ئەقسنقەڕی بەرسەقی) بوون، هەمووی ببرێتەوە بۆ میر (جیوش بەگ)(٢١٥).

لە دوو توێبینەکانی (ئیبنولئەثیر) لە خاوەنی قەڵا کوردییەکان، ئەوە دەردەکەوێت، کە ئەوان توانییان قەڵاکانیان ڕێکبخەنەوە و دەسەڵاتی تەواویان بەسەر -وڵاتی کوردی باکوور- هەرێمەکانی (هەکاری) و (زۆزان) و وڵاتی هۆزی بەشنەوی و جەزیرەی ئیبنوعومەر و ناوچەکانی سەر بەو هەرێمە چەسپاند، هەروەها هێرشەکانیان بۆ سەر

ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی (موسڵ) و ڕێگەکانی بەرەو ئەوێ زیاد کرد، بۆیە یەک لە گرنگترین ئەرکەکانی (جیوش بەگ) کاتێک کە بەڕێوبردنی (موسڵ)ی گرتە ئەستۆ لە ناوبردنی هەموو ئەو ناوەندانەی هێز بوو، لەبەر ئەوە خۆی سەرکردایەتی سوپای کرد و بەرەو ڕوویان هات، قەڵاکانی گەمارۆدان و زۆربەی فەتحکردن، بەمەش پیاوە کوردەکان خۆیان لە نێو شاخ و دۆڵ و تەنگەبەرەکان پاراست، خەڵکی دڵنیابوونەوە، ڕێگاکان ئارام بوونەوە، کوردیش ئیتر (لە ترسی ئەو نەدەوێران چەک هەڵبگرن)[216].

بۆ ماوەیەکی کورت نەبێت، ئیتر لە قەڵاکانی (هەکاری) بار بەو شێوەیە نەمایەوە، کە (جیوش بەگ) دەیویست، چونکە ڕووداوەکانی دواتر بەردەوامبوونی خاوەن قەڵا کوردییەکانیان لەسەر حاڵی خۆیان خستەڕوو و دەریانخست، کە پێویست بە هێرشەکانی (والی)یەکانی (موسڵ) بۆ سەر وڵاتەکەیان ناکات، بەڵکو بە شێوەیەکی بەرچاو ژمارەی قەڵا و شوێنە قایمەکان زیادی کرد، ژمارەی قەڵاکان گەیشتنە بیست قەڵای گەورە و بچووک، تیایان بوون کۆن و هەشبوو لە نوێ دروستکرابوون، هەندێکیان هەر بە دوور مانەوە لە هێرش و گەمارۆکان، چونکە هیچ یەکێک لەوەدا سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا کە فەتحیان بکات، یان بیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، تا سەرهەڵدانی (عیمادەدینی زەنگی) ئەتابەکی (موسڵ).

ساڵانی یەکەمی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی، جیهانی ئیسلامی ڕووداوی گرنگی بە خۆوە بینی، لەوانە مردنی سوڵتان(محەمەد) لە ساڵی (٥١١ک/ ١١١٧ز)[217]، کە وەسیەتی ئەوەی کرد، لە پاشەخۆی (مەحمود)ی کوڕی دەسەڵات بگرێتە دەست، گۆڕانگاریش بەسەر پۆستی (شەحنە) لە عێراقدا کرا، هەر لە سەردەمی سوڵتان(مەحمود)یش سەرەتا یەکەمەکانی بنەماڵەی ئەیووبی کوردی دەرکەوتن، چونکە لە ساڵی(٥١٢ک/ ١١١٨ز)یش (موجاهیدەدین بەهرۆز) لە پۆستی (شەحنە)ی (بەغدا) لادراو ناچاربوو بەرەو (تکریت) ڕابکات، بەمەش ئەو شارەی کەوتە ژێر دەست[218].

دەستگرتنی (بەهرۆز) بەسەر (تکریت)، بووە پێشەکییەک بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بنەماڵەی (سەڵاحەدین)یش بێنە (تکریت)، ئەوە بوو چەند ساڵێک دوای ئەوە، هەردوو برا (نەجمەدین ئەیووب) و(ئەسەدەدین شێرکۆ) کە لە کوردە ڕوادییەکان بوون، شاری (دوین)ی (ئازەربێجان)یان جێهێلا و گەیشتنە تکریت، لە پاڵ (بەهرۆز)ی هاوڕێیان



نیشتەجێ بوون، لەو قەڵاتەش لە ساڵی (٥٣٢ک/ ١١٣٧ز) (سەڵاحەدین)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبی لە دایک بوو[219].

زیاد لەوەی گوترا، سەرەتاکانی سەدەی ئاماژە بۆکراو، دیسانەوە مردنی (موستەزهیر بیللا)ی خەلیفەی عەباسیش بە خۆوە دەبینێ، ئەوەش دوای بیست و چوار ساڵ فەرمانڕەوایی لە (٤٧٨- ٥١٢ک/ ١٠٩٤- ١١١٨ز)، لە پاشەخۆیشی (موستەرشید بیللا)ی کوڕی لە جێی دانیشت(٥١٢- ٥٢٩ک/ ١١١٨-١١٣٥ز)[220].

لە پاش مردنی(سوڵتان محەمەد)، ململانێی نێوان تاکەکانی بنەماڵەی سەلجوقیی فەرمانڕەوا دیسانەوە نوێ بووەوە، ئەوەبو سوڵتان(سەنجەر)ی خاوەنی (خۆراسان) بۆ دەستگرتن بەسەر تەختی فەرمانڕەوایی، سەرکردایەتی هێزەکانی کرد و بە پەلە بەرەو هەرێمی (چیاکان) هات، لە شارەکانی ئەو هەرێمەش شەڕێکی بەهێز لە نێوان ئەو و لە نێوان هیزەکانی سوڵتان(مەحمود)دا بەرپا بوو، بە سەرکەوتنی (سەنجەر) تەواو بوو و، لە ساڵی(٥١٣ک/ ١١١٩ز) لە (بەغدا)دا خوتبە بۆ ئەو خوێندرایەوە، بەڵام دواتر ئاشتەوایی لە نێو هەردوو لادا کراو، جارێکی دیکە سەڵتەنەت گەڕێندرایەوە بۆ (مەحمود)[221].

بە هۆی ئەو ململانێ و شەڕە بەردەوامانەی نێوان میر و سوڵتانەکان لەسەر دەسەڵات، باری سیاسی دەوڵەتی سەلجوقی هەر بە ناجێگیری مایەوە، بێگومان زیان و خراپییەکانی ئەو بارەش هەموو هەرێمەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و، لە نێوانیشیان هەرێمە کوردییەکانیشی گرتەوە.

هەرچەندەش سەرچاوەکان بە درێژی باسی هەموو ئەو ڕووداوانەیان کردووە، کە لەو ماوەیەدا ڕوویداوە، بەڵام زانیاری گەیشتوو لە بارەی کورد بە شێوەیەکی گشتی کەمە، بە تایبەتیش زانیاری لە بارەی ساڵە یەکەمەکانی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی، چونکە لێرەدا دابڕانێک لەو زانیاریانە هەیە، کە تایبەتن بە کورد و ڕۆڵی لە ڕووداوەکان، ئەوەی تێبینیش دەکرێت، ئەوەی لە بارەیانەوە وەکو هەواڵ هاتووە، مەبەست بە دەستەوە نادەن، چونکە ئاماژە گەیشتووەکان باسەکانیان بۆ ئەو هەرێمانە تەرخان دەکەن کە کوردیان تیا دانیشتووە.

سەرچاوەکان هەر بەو هێندە واز دێنن، کە هەرێمە کوردییەکان لە ژێر فەرمانڕەوایی

راستەوخۆی سەلجوقییەکان دابوون، چونکە سوڵتانە سەلجوقییەکان وەکو دابی هەمیشەییان بەرەو زۆرکردنی (ئەقتاع)ەکانیان دەهاتن، جا دەشێت ئەو (ئەقتاع)ەی دەشبڕێتەوە بۆ یەکێک هەرێمێکی بە تەواوی بێت، ئەوەتا سوڵتان(مەحمود) لە ساڵی (٥١٢ک/١١١٨ز) (ئازەربێجان)ی وەکو (ئەقتاع)ێک بۆ پاشا (مەسعود)ی برای و (جیوش بەگ)ی ئەتابەکیی بڕیەوە[٢٢٢]، بەڵام وەکو دەردەکەوێت، براکەی رازی نەبووە بەوەی بۆی بڕاوەتەوە، بۆیە دەکەوێتە ململانێی لەگەڵ (سوڵتان)ی برای و، وای لێهات (مەسعود) داوای سەڵتەنەتی کرد[٢٢٣].

خاوەنی (ئەقتاع)ەکان دەسەڵاتی تەواویان هەبوو لە چۆنیەتی بە ڕێوەبردنی کاروبارەکانی (ئەقتاع)ەکانیان، (مەسعود) پاشان (مەراغە) کە یەک لە شارەکانی (ئازەربێجان) بوو، بۆ (قەسیمولدەولەی بەرسەقی)ی بڕیەوە[٢٢٤]، ئەمەش لە پێناو ئەوەی لە ململانێکانی لەگەڵ (سوڵتان)ی برایدا، (قەسیمولدەولە)ش راکێشێتە پاڵە خۆی، لە ماوەی ململانێی نێوانیشیان بە هۆی ڕوودانی شەڕ لە نێوان سوپاکانیان، شارەکانی هەرێمی (چیاکان) ڕووبەڕووی وێرانبوون بوونەوە، هێزەکانیان لە نزیک شاری (ئەسەد ئاباد) بەیەکیان داداو، بە سەرکەوتنی سوڵتان (مەحمود) شەڕەکە بە کۆتا هات، بەڵام ئەمانی بە (مەسعود) پاشای برای داو، ڕێگەیدا لە (ئازەربێجان) و (جەزیرە) و (موسڵ) خوتبە بۆ ئەو بخوێنرێتەوە[٢٢٥].

کاروبار لە شارە کوردییەکان راستەرێ نەبوون، بەڵکو فەرمانڕەوایەتیان لە دەستێکەوە دەگوێزرایەوە دەستێکی تر، سوڵتان(مەحمود) لە ساڵی (٥١٥ک/ ١١٢١ز)[٢٢٦] شاری (میافارقین)ی سەر بە هەرێمی (جەزیرە)ی بۆ میر ئەتابەک (ئیلغازی کوڕی ئەرتەق) بڕیەوە، ئەو شارەش زووتر و تا ئەو کاتە لە دەست میر (سەگمان)ی خاوەنی (خەلات) بوو، نەوەی ئەرتەق وەریانگرت و لە دەستیان مایەوە، تا ساڵی (٥٨٠ک/ ١١٨٤ز)[٢٢٧] (سەلاحەدینی ئەیوبی) دەستی بەسەردا گرت.

ئەوەی تا ئێستا ئاماژەی بۆ کرا، وێنەیەکی باری سیاسی کورد بوو، لە هەندێ لەو هەرێمانەی تیایاندا دادەنیشت، ئێستاکە هۆزی جاوانی کوردی ماوەتەوە قسەی لەسەر بکرێت، ئەم هۆزەش هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجی کۆچی/ یانزەی زایینی لە ناوەڕاستی عێراقدا دەسەڵاتی بەرەو زیادی هات، لە ساڵی (٤٩٥ک/ ١١٠١ز)[٢٢٨]



لەگەڵ میرە مەزیدیەکان بەشدارییان کرد، لە بنیاتنانی شاری «حلە»، بەمەش ناوچەکانی ژێردەسەڵاتیان، فراوانتر بوو، وای لێهات ناوچەکانی (دسکرە) و (بەلەدروز) و (مەندەلی) و (کوت) و باشوورو دەوروبەری (بەغدا)شی گرتەوە[٢٢٩].

یەک لە دیارترین میرەکانی ئەو هۆزە، میری شاعیر (ئەبو شوجاع عاسم کوڕی ئەبی نەجمی کوردی) بوو، کە لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی ئەستێرەی ناوی بریسکایەوە، ئەم یەکێک بوو لە ناودارانی جاوانی، لە خواروی (واست) دادەنیشت، کۆمەڵێک گوند و زەویی سەر کەنارەکانی رۆژهەڵاتی (دیجلە)ی لە ژێر دەستدابوو، ئەو زەویانەش وەکو ڕێزلێنانێک لە رۆڵ و کۆششەکانی باوکی لە نێو سوپای مەزیدی، (سەیفولدەولە سەدەقەی کوڕی مەنسوری مەزیدی) پێی بەخشیبوو[٢٣٠] (عیمادی ئەسفەهانی) بەو میرە جاوانییە هەڵدەڵێت و دەڵێت: (پیاوێک بوو لە نێو پیاوان و پاڵەوانێک بوو لە نێو پاڵەوانەکان، شێرێک بوو شێرانی دەشکاند، شمشێرێکی کاڵان درێژی هەبوو... دەشێت لە ماوەی تەمەنی خۆیدا پەنجا شێری کوشتبێ، بێ ئەوەی کەسێک لەم شەڕانەی یارمەتی دابێت)[٢٣١]، میر (عاسم) هەڵسا بە بیناکردنی گوندی (عاسمیە)، کە بە ناوی خۆیەوە ناونرا، بەڵام لەگەڵ ئازایەتی و کەسایەتی بەهێزیشی، ئینجاش بڕیاریدا دەست نەخاتە نێو ئەو شەڕوشۆڕ و مەسەلە سیاسیانەی لە ناوچەکەیدا ڕوودەدەن، بەڵکو هەوڵ و کۆششەکانی بۆ بوارەکانی شیعر و ئەدەب کورتکردەوە[٢٣٢].

سەرەنجام رۆڵی جاوانییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو گەورەبوو، هەواڵی زۆریان لە دەوروبەری (حللە)وە گەیشتووە، شار و شارۆچکەی زۆریان هەبووە، زۆریکیش لە میرەکانیان لەوانەی لە فراوانکردنی ئەقتاع و موڵکەکانیان سەرکەوتن، بە زەقی دەرکەوتن، وایلێهات بەشە گەورەکەی موڵکەکانی میری مەزیدی بووە هی کوردە جاوانییەکان، (ئەسفەهانی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە: میر (سیاکیلی کوردی) لە میرە بەشیریەکانە، کە ئەم بەشیریانە تیرەیەکن لە جاوانییەکان، لە ماوەی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی لە (حللە) نیشتەجێ بوون و لە ناوەڕاستی عێراقدا زەوی و زارێکی زۆریان دەستکەوت[٢٣٣].

بە هۆی ئەوەی میر (سیاکیلی کوردی) زەوی وزارێکی زۆری لە موڵکی مەزیدیەکان دەستکەوت، یەک لە شاعیرەکان هەجوی میر (سیاکیل) دەکات و لەم بارەیەوە دەڵێت:

**واصبحت لا ادري اذا رايته**

**اقد جن (سياكيل)، ام حذف الدهر؟**

**سلام على مال العراق فانه**

**مضى حيث لا نفع لذاك و لا ضر**

**فشطر لـ (اتراك) ومن دونها النهر**

**وشطر لـ (اكراد) ومن شأنها الغدر**[٢٣٤]

گومانی تیا نییە باڵکێشانی میر (سیاکیل) بەسەر ئەقتاعەکانی مەزیدیان، میرە جاوانییەکانی دیکەشی وروژاند، چونکە ئەو میرە لە ململانێیەکی توند دابوو، لەگەڵ میر (ئەبی شوجاع عاسم کوڕی ئەبی نەجمی کوردی) ململانێیەکەشیان لەسەر ئەقتاع و ناوچەکان بوو[٢٣٥]، (مستەفا جەواد) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە توند بوونی ململانێ و کێبڕکێی نێوان ئەو دوو میرە کوردە، بە هۆی دەستتێوەردانەکانی سوڵتان بوو لە نێوانیان، چونکە سەلجوقییەکان هەندێ جار دەهاتن ناکۆکییان لە نێوان کوردەکاندا دروستدەکرد، بۆ ئەوەی لاواز بکەون[٢٣٦]... وەکو دەریش دەکەوێت دەستتێوەردانی سەلجوقییەکان لە کاروباری جاوانییەکان شتێکی راست بووە، بە تایبەت، کە زۆربەی موڵکەکانی مەزیدیەکان بۆ کوردە بەشیری و نێرگسییەکان براوە، کە (نێرگسی)یەکانیش هەر تیرەیەکی جاوانییەکانن و ئەوانەش هەر دانشتووانی (حلە)ن، (ئەسفەهانی) دەڵێن: (ئەم دوو تیرەیە زیاتریان لەوە بۆ خۆ بڕیەوە کە هەقیان بوو)[٢٣٧].

یەک لە شاعیرەکانیش لە ماوەی چەند دێڕێکی هۆنراوەیەکی، گوزارەشت لەو ئەقتاعانە دەکات کە بەشیری و نێرگسییەکان بۆ خۆیان بڕیەوەو دەڵێت:

**ثلاثون الفا (للبشيري) وحده**

**فدع عنك فمن لايجوز له ذكر**

**وعشرون الفا اقطعت (نرجسية)**

**كثير لها الف ولو انها بعر**[٢٣٨]

لە لایەکی دیکەوە هەندێ فەرماندەی سەربازی هەر لە نێو ئەو هۆزەدا دەرکەوتن، رۆڵێکی گەورەیان بینیبوو لە سەرکردایەتی سوپای مەزیدی و لە شەڕەکانی دژی خەلافەی عەباسی و دەسەڵاتی سەلجوقی، چونکە نیشتەجێبوونی ئەو هۆزە کوردیە لە پاڵ



مەزیدیەکان لە (حلە)، بووە هۆی ئەوەی تاکەکانی هەردوو هۆز هاوکاری یەکتری بکەن.

ئەوەتا هەندێ سەرکردەی جاوانی بە وێنەی (موهەلهیل کوڕی ئەبیلعەسکەری جاوانی) و (عەنتەری کوڕی ئەبیلعەسکەری)ی برای.. کە لە فەرماندەیی سوپای مەزیدیدا رۆڵێکی دیاریان بینی، ئەمانە بە زەقی دەرکەوتن... لە ساڵی(٥١٢ک/ ١١١٨ز) دوای رەزامەندی سوڵتان مەحمود، کە رێگەیدا (دبیس) بگەڕێتەوە سەر فەرمانڕەوایێتیەکەی، میر (دبیسی کوڕی سەدەقە) گەڕایەوە (حلە) و لەگەڵ گەیشتنەوەی بەو شارە، میرە عەرەب و کوردەکان لێی کۆبوونەوە[٢٣٩].. میر(دبیس) ناکۆکی هەبوو لەگەڵ خەلیفە(موستەرشید بیللا) (٥١٢- ٥٢٩ک/ ١١١٨- ١١٣٤ز)، زۆرجار لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیدا کێشەی لە دژیدا دروستدەکرد، لە هەمان کاتدا ئەو هەلانەی دەقۆزتەوە کە لە کاتی ململانێی نێوان سەلجوقییەکان لەسەر دەسەڵاتدا دەهاتە پێش و، تیایدا دەستی بە تالان و وێرانکردنی وڵاتەکەی دەکرد[٢٤٠].

دەسەڵاتی ئەو میرە بە بەردەوامی گەورە دەبوو، بۆیە خەلیفە لێی ترسا و، داوای لە سوڵتان(مەحمود) کرد، کار لە پێناو رێگرتن لە مەترسییەکانی بکات، بەوەی کەوا: (شەحنە)یەکی بەهێز بۆ (بەغدا) هەڵبژێرێت، هەروەها داوای لێکرد، ژمارەیەک لە هێزەکان لە ئامادە باشی دابێت بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر مەترسییەک کە لە ناکاو رووبەڕووی بایتەختی خەلافەت ببێتەوە لە لایەن مەزیدییەکان سوڵتانیش (ئەقسنقەری بەرسقی) هەڵبژارد بۆ (شەحنە) (بەغدا)[٢٤١].

هەندێ شەڕو بەیەکدادان لە نێوان سوپای مەزیدی بە فەرماندەیی (موهەلهیلی کوڕی ئەبیلعەسکەری) و ئەو سوپایەی سەلجوقی روویدا کە پاسەوانێتی کردنی (بەغدا)ی پێسپێردرابوو، بە یەکدادانی یەکەم لە ساڵی(٥١٦ک/ ١١٢٢ز) بوو، کە میر (موهەلهیل) هێرشی کردە سەر ئەو سوپایەی لە شاری (واست) سنوور پارێزبوو، لەم بە یەکدادانەش ئەو میرە جاوانییە و هێزەکانی کە لە کورد و عەرەب پێکدەهاتن زەبرێکی گەورەیان وەشاند، ئەگەرچیش سوپای سەلجوقی توانی (موهەلهیل) و ژمارەیەک لە سەربازە ناودارەکانی بە دیل بگرێت و بەم شێوەیە مەزیدییەکان شەڕەکە بدۆڕێنن[٢٤٢].

سوڵتان(مەحمود) هەوڵیدا رێگە لە بەردەم مەترسییەکانی (دبیس) بگرێت، بەر لەوەی لە تۆڵەی ئەو شکانەی هێرشێکی دیکە دەست پێبکاتەوە، بۆیە لە هەمان ساڵدا،

واته له ساڵی (٥١٦ك/ ١١٢٢ز) ویلایەتی (موسڵ) و شاری (واست)یشی بۆ میر (ئەقسنقەر) بڕیەوە[٢٤٣]، له پاڵ ئەوەشدا (شەحنە)یێتی (بەغداشی هەر له دەستدا هێلایەوە، ئەمەش بە ئامانجی ئەوەی دەسەلاتی بەسەر ناوچەکانی ناوەڕاستی (عێراق)دا توند بکات.

کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان خەلیفەی عەباسی و ئەو میرە مەزیدییە بە کۆتا نەهات و له ساڵی (٥١٧ك/ ١١٢٣ز) بەیەکدادانی دووەم له نێوانیاندا دروست بووەوە، چونکە خەلیفە (موستەرشید بیللا) لەگەڵ هێزەکانی هێرشیان هێنایە سەر (دبیس)، کە ئەویش بە رۆڵی خۆی هێزەکانی ئامادە کرد و سەرکردایەتی سوپاکەی بە (عەنتەری کوڕی ئەبیلعەسکەر)ی برای (موهەلهیل) سپارد، (عەنتەر)یش دووجار هێرشی هێنایەوە سەر سوپای خەلیفە کە (ئەقسنقەر) سەرکردایەتی دەکرد، بەڵام بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێک بە دەست بێنێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی سوپای خەلیفە لە هەردوو رووی کەل و پەلی جەنگی و ژمارەی سەربازیشەوە گەورەتر بوو لە سوپای مەزیدی، بۆیە سەرەنجام (عەنتەر) و هێزەکانی بە دیل گیران و شەڕەکەی نێوان هەردوولا بە شکستی (دبیس) بە کۆتا هات[٢٤٤].

هەردوو برا (موهەلهیل) و (عەنتەر)ی کوڕی (ئەبیلعەسکەری) تا دەوروبەری ساڵی (٥٢٩ك/ ١١٣٥ز) بە دیلی مانەوە، ئینجا لەو ساڵەدا ئازاد کران، هەر لەو ساڵەدا سوڵتان (مەسعودی کوڕی محەمەدی سەلجوقی) (٥٢٧- ٥٤٨ك/ ١١٣٣- ١١٥٢ز) فەرمانیدا میر (دبیسی کوڕی سەدەقەی مەزیدی) بکوژێت، بۆیە لە شاری (خوێ)ی سەر بە (ئازەربێجان) کوژرا، بەمەش شوێنکەوتووەکانی بە دەوری (سەدەقە)ی کوڕیدا لە (حللە) کۆبوونەوە، بەڵام لەبەر بچووکی تەمەنی ئەو میرە نوێیە بۆیە میر (عەنتەر) بوو بە (وەسی) بەسەری[٢٤٥] بەمەش پایەیەکی بەرز و بەرچاوی لە (حللە) و دەوروبەریدا دەستکەوت.

میر (موهەلهیل)یش لە (عەنتەر)ی برای پلەو پایەی بچوکتر نەبوو، چونکە دوای کوژرانی (سەدەقەی کوڕی دبیس) ساڵی (٥٣٢ك/ ١١٣٧ز)[٢٤٦] لە یەک لە شەڕەکان، سوڵتان(مەسعود) (محەمەدی کوڕی دبیس)ی کردە میر بەسەر (حللە)ی مەزیدی و میر (موهەلهیلی جاوانی)شی کردە بەڕێوەبەری کارەکانی[٢٤٧]، بەمەش لە ساڵانی دواییدا (موهەلهیل) بووە پیاوی یەکەم لە نێوان جاوانی و مەزیدەکانیش...



وەکو لە درێژەی باسە مێژووییەکان دەخوێنریتەوە وا دەردەکەوێت، لەو قۆناغەدا ئیتر سەرکردە جاوانییەکان وازیان لە سیاسەتی دژایەتیکردنی خەلیفەی عەباسی هێنابێت و هەوڵیانداوە لێی نزیک ببنەوە و، لە ژێر سایەیدا بن، کار هەر لەسەر ئەمەش ناوەستێت، بەڵکو لە کاتی رووبەڕووبوونەوەی (بەغدا) لە مەترسی سەلجوقییە تورکمانەکان، ئەو میرە جاوانییانە لەگەڵ تاکەکانی هۆزەکەیان لە پاڵ خەلافەتدا وەستان.

زیاد لەو رووداوانەی لە ماوەی سەدەی شەشی کۆچی/ دوانزەی زایینی لە هەرێمە کوردییەکان روویاندا و، بێجگەش لە دەرکەوتنی توانا عەسکەرییەکان لە نێوان سەرکردە سوپاییە کوردەکان، هەمان سەدە رووداوگەلێکی دیکەی بە خۆوە بینی، چونکە شارە کوردییەکانی هەرێمی (جەزیرە) لە مەترسی خاچپەرستان دوور نەبوون، هەندێکیان دەکەوتنە سەر سنووری ئەو ناوچانەی ئەوان دەستیان بەسەردا گرتبوون، بۆیە کەوتنە ژێر هێرشەکانیان، ئەوەتا لە ساڵی (٥١٧ك/ ١١٢٣ز) کاتێک میر (بلەکی کوڕی بەهرامی کوڕی ئەرتەق) لە لایەکی دیکەوە خەریکی شەڕی فەرەنجەکان بوو، خاچپەرستان ئەو هەلیان قۆزتەوە و دەستیان بەسەر قەڵای (خرتبرت)دا گرت، بەڵام کە (بلەک) بەو هەواڵەی زانی، بە پەلە گەڕایەوە گەمارۆی قەڵای ناوبراوی دایەوەو، گەڕاندیەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، ئینجا ژمارەیەک هێزیشی تیا قایم کرد، نەبادا خاچپەرستان لە نوێ هێرشێکی دیکەی بێننەوە سەر[٢٤٨].

جگە لە مەترسی خاچپەرستان بەسەر شارە کوردییەکان، مەترسییەکی دیکەش دەهاتە پێش، ئەویش مەترسی (باتنی)یەکان بوو، کە ناوچە سەخت و پارێزراوەکانیان بە سەنتەری چالاکییە سیاسی و عەسکەرییەکانیان دەگرت، بۆیە دانیشتوانی (ئامەد)ی سەر بە (دیاربەکر) لە دژی ئەو فرقەیە راپەڕین کە لە شارەکەیان دروست ببوون و زۆر ببوون لەم راپەڕینەیان حەوت سەد پیاویان لێ کوشتن[٢٤٩]، ئەم ژمارە کوژراوەی دەقەکەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ژمارەیەکی گەورەی (باتنی)یەکان لە (ئامەد) هەبوون.

وا پێدەچێت خەڵکی ئەو شارە وەڕس بووبن لە بوونی ژمارەیەکی ئاوا گەورە لە نێویان، بە تایبەت کە ئەو فرقەیە بە چالاکییە تێکدەرە رووخێنەرەکانی دەناسرا، بۆیەش لە دژیان راپەڕین و ئەو حەوت سەد پیاوەیان لێ کوشتن، ئیتر دوای ئەم لێدانە (باتنی)یەکانیش لاواز بوون، شایانی باسە هەواڵەکانی میرنشینی هەزبانی لە سەدەی

شەشی کۆچیدا ناپچڕێت، چونکە میرەکانی ئەو میرنشینە پەیوەندی باشیان لەگەڵ سەلجوقییەکان هەبوو، زۆرجاریش لە شەڕەکاندا سوپاکانیان لە پاڵ سەلجوقییەکاندا دەجەنگان، بۆیە هەندێ لە هۆزە کوردییەکانی دانیشتوی (ئەربل) هەوڵیاندا بارەکە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بقۆزنەوە یەک لە دیارترینی ئەو هۆزانەش هۆزی (حەکەمی) بوو، کە لەسەر فەرمانڕەواییێتی (ئەربل) و دەوروبەری لەگەڵ هەزبانییەکان لە کێبرکێ دابوون[٢٥٠].

لە یەک لەو ساڵاوانەی سەلجوقییاندا، کە میر (ئەبولهیجاء) لەگەڵ هێزەکانی بۆ پاڵپشتی سەلجوقییەکان لە (ئەربل) هاتەدەر، دوو کوڕە بچووکەکانی بە ناوەکانی (فەزل) و (ئەبوعەلی)ی بۆ فەرمانڕەواییێتی (ئەربل) لە جێی خۆی دانان، میرە حەکەمییەکانیش ئەم هەلەیان قۆزتەوە و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر شارەکەدا توند کرد، ئەوەبوو میر (بابەکر کوڕی میکائیل) بە پشتگیری کوڕە براکەی توانی لەو ساڵەدا، کە ساڵی (٥١٧ک/ ١١٢٣ز) بوو، باڵ بەسەر ئەو شارەدا بکێشێت و بۆ چەند ساڵێکیش فەرمانڕەواییێتی تیادا کرد[٢٥١]، وەکو دەریش دەکەوێت، والی سەلجوقیی (موسڵ) (ئەقسنقەڕی بەرسقی) ڕازی بووە لەوەی (میکائیل) دەست بەسەر (ئەربل)دا بگرێت، بەڵام (بەرسقی) لە ساڵی(٥٢٠ک/ ١١٢٦ز) کوژرا و (عیزەدین مەسعود)ی کوڕی لە جێیدا بووە فەرمانڕەوایی (موسڵ)، ئەم (مەسعود)ەش پەیوەندی دۆستایەتی هەبوو، لەگەڵ میر (ئەبولهیجاء)ی هەزبانی، ئەمە وای لێکرد، میر (بابەکر) بگرێت و داوای لێبکات شارەکە بۆ دوو کوڕەکانی (ئەبولهیجاء) بەجێ بهێڵێت، ئیتر ئەم میرە حەکەمییە لە بەرامبەر ئەو بارە نوێیەدا ناچار بوو (ئەربل) بداتەوە هەزبانییەکان[٢٥٢].

میر (ئەبولهیجاء)ی هەزبانی بەم شێوەیە تا دوای ساڵی (٥٢٥ک/ ١١٣٠ز) پارێزگاری لە فەرمانڕەواییێتییەکەی کرد بەسەر (ئەربل)، لەو ماوەی فەرمانڕەوایەتیەشی یەک لە دیارترین میرە کوردەکان بوو، تا وایلێهات بوویە خاوەنی دەسەڵاتێکی بەهێز و ژمارەیەکی گەورەی پیاو، ئیتر لە توانایدا بوو گۆڕان بەسەر پارسەنگی هێزدا بێنێت، ئەوەتا لە ساڵی(٥٢٠ک/ ١١٢٦ز) لە کاتێکدا لە نزیک (بەغدا) شەڕ کەوتبووە نێوان خەلیفەی عەباسی (موستەرشیدبیللا) و سوڵتانی سەلجوقی، میر(ئەبولهیجاء) لەگەڵ هێزەکانی سوپای خەلیفەی جێهێلا و هاتە پاڵ سەلجوقییەکان، ئەمە لە کاتێکدا سوپای



خەلیفە خەریک بوو ململانێیەکەی بە بەرژەوەندی خۆی بە کۆتا بێنێت، ئەگەر هاتبووا ئەو میرە هەزبانییە لێی جیانەبووایەوە، بەڵام ئەو میرە هەزبانییە بە جیابوونەوەی لە سوپای خەلیفە، وای کرد خەلیفە ئەو سەرکەوتنە بە دەست نەهێنێت، کە ئەوپەڕی پێویستی بوو[٢٥٣].

شایانی ئاماژە پێدانە (ئیبنولجۆزی) کە لە (٥٩٧ک/ ١٢٠٠ز) کۆچی دوایی کردووە، هەموان نزیکتربووە لەو ڕووداوانە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەو میرە هەزبانییەی لە سوپای خەلیفە دەرچوو، پەیوەندی کرد بە سوڵتان (مەحمود) میر (ئەبولفەتحی جاوانی) بوو[٢٥٤]، بەڵام (ئیبنولئەثیر) کە لە (٦٣٠ک/ ١٢٣٢ز) کۆچی دوایی کردووە، دەڵێت: ئەو میرە (ئەبولهیجاء)ی هەزبانی خاوەنی (ئەربل) بوو[٢٥٥]، جا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم دوو مێژوونووسە هەردووکیان جێی متمانەن، بەڵام دەتوانین بڵێین، ڕاکەی (ئیبنولئەثیر) ڕاستتر و نزیکترە لە ڕاستی، بە بەڵگەی زۆریش جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە، کە یەک لەو بەڵگانە ئەوەیە، کە میری هەزبانی ناوبراو، لە میری جاوانی ناوبراو، زیاتر مەیلی بەلای سەلجوقییەکانەوە بووە.

لە ماوەی مێژووی میرنشینی جاوانی، یەک هەڵوێستی باش و ڕوون و ئاشکرای میرەکانیان لە بەرامبەر خەلافەی عەباسی بەرجەستە ناکەین، بۆیە بە دوور دەزانرێت ئەو میرە جاوانییە لە پاڵ خەلیفەدا بووەستێت، هەروەها میرنشینی هەزبانیش بە درێژایی مانەوەی خۆی لە فەرمانڕەواییێتی و تا ڕۆژی ڕووخانیشی لەسەر دەستی (عیمادەدینی زەنگی) هەر گوێڕایەڵ مایەوە بۆ دەسەڵاتی سەلجوقی، بۆیە بە دوور نازانرێت لە دەقەکە میر (ئەبولهیجاء) مەبەست بێت، بە واتا ئەو لە پاڵ خەلافەتدا بووبێت، بەڵام لە بارێکی زۆرناسکدا وازی لە پشتگیری خەلیفە هێنابێت و، پەیوەندی کردبێت بە سەلجوقییەکان.

**دروستبوونی ئەتابەکیەتی زەنگی لە (موسڵ) و کاریگەرێتیی لەسەر میرنشین و دەسەڵاتە کوردییەکان:**

چاکەی دامەزراندنی ئەتابەکیەتی زەنگی لە (موسڵ)، بۆ عیمادەدینی زەنگی کوڕی قەسیمولدەولە ئاقسنقەڕ) دەگەڕێتەوە، ئەو (عیمادەدین)ەی کە باوکی یەک لە مەمالیکەکانی سولتان(مەلەکشاه)ی سەلجوقی بوو[٢٥٦]، بە بنەچە بۆ هۆزەکانی (ئەلساب بۆ)ی تورکمانی دەگەڕێتەوە[٢٥٧].

(قەسیمولدەولە)ی باوکی (عیمادەدین) رۆڵێکی دیاری لە رووداوە سیاسی و عەسکەرییەکانی دەوڵەتی سەلجوقیدا دیاری کرد، چەندین پۆستی گەورەی بە دەست هێنا لەوانە: لە ساڵی (٤٧٩ک/ ١٠٨٦ز) بۆ فەرمانڕەوایێتی شاری (حەلەب) هەڵبژێردرا[٢٥٨] و، دوای مردنی سولتان(مەلەکشاه)یش پشتگیری لە (بەرکیاروق)ی کوڕی کرد، لەو کاتەیدا کە لەململانێیی دابوو لەگەڵ (تاجولدەولەتەتش) تا سەرەنجام لە ساڵی (٤٨٧ک/ ١٠٩٤ز) (قەسیمولدەولە) کوژرا و، کۆتایی بە ژیانی هات[٢٥٩].

سەرچاوەکان بە درێژی باس لە (عیمادەدینی زەنگی) دەکەن لە ماوەی دوای کوژرانی باوکی، کەسێک بووە بەهێزی کەسایەتی و ئازایەتیی جیادەکرایەوە، وا وەسف کراوە، کە پیاوێک بووە (هەیبەتێکی زۆری بەسەر خەڵک و سەربازەکانیەوە هەبووە)[٢٦٠]، هەروەها لە هەمان کاتدا ئاواتێکی زۆری هەبووە و، زەحمەتکێش بووە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی[٢٦١].

دروستبوونی دەوڵەتی زەنگی بە شێوەیەکی سەرەکی بە پێگەیشتنی (عیمادەدین)ی دامەزرێنەری دەبەسترێتەوە، چونکە وەکو گوتمان (قەسیمولدەولە)ی باوکی رۆڵێکی ئاشکرای هەبوو لە کاروبارەکانی دەوڵەتی سەلجوقی، ئەمەش بووە هۆیەک بۆ دەرکەوتنی (عیمادەدین)، چونکە بەم هۆیەوە سوڵتانە سەلجوقییەکان لە بیلاتی خۆیان نزیک کردەوە و، بۆ شەڕوشۆڕەکانیان سوودیان لە توانا عەسکەرییەکانی وەردەگرت، لە ئەنجامی دەرکەوتنیشی وەکو پیاوێکی عەسکەری، بووە جێی متمانەیەکی گەورە بۆ بەڕێوەبردنی هەرێمەکان، بۆیە بەر لەوەی لە (موسڵ)دا ئەتابەکیەتەکەی دامەزرێنێت، بەڕێوەبردنی هەندێ هەرێمی پێ سپێردرا[٢٦٢].

لە دەوڵەتی سەلجوقیدا پۆست لە دوای پۆستی وەردەگرت، ئەوەبوو دوای ئەوەی لە ساڵی(٥١٦ک/ ١١٢٢ز) بۆ (شەحنە)ی (عێراق) هەڵبژێردرا، سوڵتان وای بە باش



بینی پایەی گەورەتری لە دەوڵەتەکەیدا پێبدات، بۆیە لە ساڵی (٥٢١ک/ ١١٢٧ز) کە (عیززەدین مەسعود)ی خاوەنی (موسڵ) مرد[٢٦٣]، سەلجوقییەکان بە دوای پیاوێکی ئازادا گەڕان تا بیانپارێزێت، چونکە مەترسی خاچپەرستانی بەسەرەوە بوو، ئیتر را هاتە سەر ئەوەی (عیمادەدین) بۆ ئەو کارە هەڵبژێردرێت، ئەمەش چونکە توانای جۆراجۆری تیایە، لە هەر کەسێکی دیکە باشتر دەتوانێت ئەو شارە بپارێزێت، ئیتر (عیمادەدین) کاروبارەکانی (موسڵ)ی گرتە ئەستۆ و بەمەش بناغەی فەرمانڕەوایێتی ئەتابەکیی لەو ناوچەیەدا دانا[٢٦٤]، دوای ئەوەش هەوڵیدا ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فراوانبکات و بەرەی ئیسلامی یەکبخات.

(عیمادەدین) بڕیاریدا زۆربەی هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی ئیسلامی یەکبخات و بیکاتە بەرەیەکی یەکگرتوو بۆ وەستان لە رووی مەترسی خاچپەرستان، ئەم بڕیارەش وای دەخواست، خۆشی و جێگرەکانیشی هەوڵی گەورەتر بدەن، بۆ ژێر رکێف خستنی سەرجەم هێزە سیاسییەکانی نێو شار و قەڵاکانی دەوروبەری (موسڵ)، هەرچی پەیوەندی بە کوردیشەوەیە، ئەوا کەوتنە نێو پلانەکەی (زەنگی)[٢٦٥] لە ماوەی چەندین ساڵ هەڵسا بە ئاراستەکردنی شاڵاوە عەسکەرییەکانی بۆ سەر قەڵا سەربەخۆکانی کوردی بڵاوە بوو لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری (موسڵ)[٢٦٦].

ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەری (موسڵ) ئەوانەی دەکەوتنە هەردووبەشی باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی ئەو شارە، گرنگییەکی گەورەیان هەبوو سەبارەت بە میرنشینی زەنگی، ئەمەش بۆ مسۆگەر کردنی ئاسایش و بووژانەوەی، چونکە نزیک بوون لە (موسڵ)، هەروەها ئەو ناوچانە توانای ئابووری گەورەیان هەبوو، ئەمە جگە لەو مەترسییانەش کە لەوانەبوو سەرهەڵبدەن، لە کاتێکدا ئەگەر (عیمادەدین) نەیتوانیبووایە دەست بەسەر هۆزە کوردییەکانی ئەو ناوچانەدا بگرێت، کە ئەمە وایلێکرد دەسەڵاتی درێژ بکاتەوە، بۆ ئەوەی چەندین هێلی بەرگری سروشتی بۆ میرنشین و دەسەڵاتەکەی زامن بکات، لە کاتێکدا کە خەریکی شەڕەکانی بێت لە بەرەی (شام) یان (جەزیرە)، ئەوان لە دواوە بیپارێزن[٢٦٧].

لەو ناوچانەدا میر و سەرۆک هۆزی کوردی سەربەخۆ لە فەرمانڕەوایی سەلجوقی بڵاوببوونەوە، زۆربەی شوێنەکانیشیان قەڵای زۆر دوور بوون، زەحمەت بوون بکەونە دەست ئەوانەی چاویان تێدەبڕن، بۆیە (زەنگی) هێرشی بەهێزی کردە سەر ئەو میر و سەرۆک هۆزانە، بەمەش توانی دەست بەسەر ناوچەیەکی فراوانی وڵاتی کورددا بگرێت،

قەڵاکانی (هەکاری و بەشنەوی و حەمیدی و مەهرانی و دیاربەکر و زۆزان و جەزیرەی ئیبنوعومەر و شەهرەزور و ئەربل)ی گرتەوە[٢٦٨]، بەم شێوەیەش کۆتایی بە هەموو شێوە سەربەخۆییەکی ئەو ناوچانە هێنا، ئەوەش کە سەرنج راکێش بێت: سەلجوقییەکان لەگەڵ هێزی عەسکەری گەوریان و تەنانەت لە سەردەمی سوڵتان(مەلەکشاه)یش کە لە نێوان سەرجەم سوڵتانەکانی دوای خۆی بەهێز و دەسەڵات جیادەکرێتەوە، ئینجاش نەیانتوانی بگەنە ئەو ناوچە دوورانە، بەڵام (عیمادەدین) سەرکەوت لەوەی لە رێگەی فتوحاتەکانی بگاتە ئەو ناوچە کوردیانە، کە خەڵکانی پێشەخۆی دەستەوسان بوون لەوەی پێیان بگەن، ئەمەش چونکە: (ئەو بە هیچ شێوەیەک نەیدەویست لە ناوەڕاستی وڵاتەکەی خۆیدا، کەسێکی موڵکی دی هەبێ)[٢٦٩].

بێگومان ئەو شاڵاوانەی ئەتابەک (عیمادەدینی زەنگی) بۆ سەر قەڵا کوردییەکان ئاراستەی کرد، ئەوە دەگەینێت کە میرە کوردەکان، بەر لەوەی (زەنگی) فەرمانڕەوایێتی (موسڵ)بگرێتەوە دەست، ئەوان توانیوویانە کاروباری قەڵاکانی خۆیان رێکبخەنەوە، زیاتریش پێدەچێت لە دوای لابردنی والی (موسڵ) و (جەزیرە) (جیوش بەگ) لە ساڵی (٥١٥ک/ ١١٢١ز)[٢٧٠] ئەمەیان بۆ کرابێت، لە دیارترین میر و خاوەن قەڵای کوردیش لەو رۆژگارە، میر (ئەبولهیجاء کوڕی عەبدوڵڵای هەکاری)[٢٧١] خاوەنی قەڵاکانی (ئاشب)[٢٧٢] و (جەزیرە) و (نوشی) و میر (عەبدوڵڵای کوڕی عیسای کوڕی ئیبراهیمی مەهرانی) خاوەنی قەڵاکانی (ربیە) و (قەی) و (فەرەح)[٢٧٣] و هەروەها میر (حەسەن کوڕی عومەر)ی هۆزی مەهرانی و میر (عیسای حەمیدی) خاوەن قەڵاکانی(عەقر) و (شۆش) و بێجگەی ئەوانەش بوون[٢٧٤].

لەگەڵ هێز و دەسەڵاتی خاوەنی ئەو قەلایانەش، بەڵام نەیانتوانی لە بەردەم شاڵاوەکانی (زەنگی) خۆ رابگرن، بەڵکو (زەنگی) و (نەسیرولدین جەقر)ی جێگری[٢٧٥] توانییان دەست بەسەر زۆربەیاندا بگرن، بە زاڵبوونی (عیمادەدین)یش بەسەر قەڵا و ناوچە کوردییەکان، کۆتایی بە قۆناغێکی مێژووی گرنگ، لە قۆناغەکانی مێژووی کورد لە ماوەی چەرخی ئیسلامی دێت، ئەو قۆناغەی کە بەوە دەناسرێت زۆربەی هۆزە بڵاوەبووەکانی وڵات سەربەخۆیی خودی خۆیان هەبوو.



## پەراوێزەکان

١- لە بارەی (ئەقطاع) و پەیوەندییەکانی بە دەسەڵاتی ناوەندی سەلجوقی، بڕوانە: نیزامولمەلیک: سیستنامە، بەشی سی و هەشت، لە کتێبی (الاقطاعیین)، هەردوو لاپەڕەکانی (٧٠-٧٧)؛ ئیبراهیم عەلی تەرخان: النظم الاقطاعیة، لاپەڕە (٢٦)؛ نافیع تۆفیق عەبود: الدولة الخوارزمیة، (بەغداد، ١٩٨٧ز)، لاپەڕە (٣٣٨).

٢- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٦١-٦٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢٠٥- ٢٠٦).

٣- نەیسابوری: سەلجوقنامە، لاپەڕە (٣٣)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەرە(٢٠٥)؛ ئیبنولعیبری: تاریخ مختصر الدول، لاپەڕە (١٩٣).

٤- نەیسابوری: سەلجوقنامە، لاپەڕە (٣٣)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٠٥- ٢٠٧)، حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، لاپەڕە (٧٦).

٥- (بەنداری) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سوڵتان(مەلەکشاه) دوای کوشتنی وەزیرەکەی (نیزامولمەلیک) هاتە نێو بەغداد.. تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨٠).

٦- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٦٦)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەرە(٢٠٤)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٦٤)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزەم، لاپەڕە (١٣٨)؛ ئیبنوعیمادی حەنبەلی: شذرات الذهب، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٣٧٤).

٧- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢١)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٤٠)؛ یەزدی: العراضة في الحکایة السلجوقیة، لاپەڕە (٦٧)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٧٨).

٨- حلمی: السلاجقة في التاریخ والحضارة، لاپەڕە (٤٤).

٩- ئیبنولئەثیر: التاریخ الباهر، لاپەڕە (٩)؛ ئەبوشامە: الروضتین، بەشی یەکەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٦٢).

١٠- ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزەم، لاپەڕەکانی (١٤٢-١٤٣).

١١- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنولجۆزی: دەستنووسی: شذور العقود، پەڕەی(٧٦)؛ نەیسابوری: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣٣)؛ یزدي: العراضة في الحکایة السلجوقیة،

لاپەڕە (٦٩)؛ (بنداري) تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨٠)؛
The cambridge history of Iran, vol 5, P 234.

١٢- ئەمین: تاريخ العراق في العصر السلجوقي، لاپەڕە (٧٩).

١٣- عاشور: تاريخ العلاقات بين الشرق والغرب، هەردوو لاپەڕەکانی (٤٦-٥١).

١٤- لە بارەی منداڵەکانی سوڵتان(مەلەکشاه) بگەڕێوە بۆ ئیبنوخەلەکان: وفيات الاعيان، بەرگی یەکەم، لاپەڕەکانی (٢٦٩- ٢٧٠)، بەرگی پێنجەم، لاپەڕەکانی (٧١-١٨٢)، بەرگی دووەم، لاپەڕەکانی (٤٢٧- ٤٢٨).

١٥- حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٥٣)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢١٤-٢١٥)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨١)؛ قەرمانی: اخبار الدول، لاپەڕە (٢٧٣)؛ ئیبراهیم بەیضون و، سوهەیل زەکار: تاريخ العرب السياسي، لاپەڕە (٢٩٩).

١٦- تورکان خاتون: یەک لە ژنەکانی سوڵتان(مەلەکشاه)، هەروەها کچی یەک لە پاشا تورکەکانی وڵاتی ئەودیو زێ بووە، بۆ زانیاری زیاتریش، بگەڕێوە بۆ: ئیبنولساعی خازن: نساء الخلفاء، میسر،(بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕەکانی (١٣١-١٣٢).

١٧- حوسەینی : زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٥٥)؛ بەنداری تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨١).

١٨- ئیبنولقەلانسی: ذيل تاريخ دمشق، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٧٤)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕەکانی (١٥٦-١٥٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٠٣)؛ حەسەنێن: سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕەکانی (٨٤-٨٥).

١٩- نەیسابوری: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣٥)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٧٤)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢١٥).

٢٠- راوندي: راحة الصدور، لاپەڕە (٢١٨)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢٢٤)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٥)؛ حەسەنێن، سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕە (٨٦).

٢١- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٢٢٤).

٢٢- لە بارەی رووخانی میرنشینی رووادی، بگەڕێوە بۆ لاپەڕەکانی (١٩٧-١٩٩)ی دەقە عەرەبییەکە.

٢٣- تەرخان: النظم الاقطاعية، لاپەڕە (٢٦).

٢٤- الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٢٤).



٢٥- راوندي: راحة الصدور، لاپەڕە (٢١٨)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕەکانی (١٥٥- ١٥٦)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨١).

٢٦- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٨٤)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩٩)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٢٠٣-٢٠٤)؛ حەسەنێن، سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕەکانی (٨٦-٨٧).

٢٧- نەیسابوری: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣٥)؛ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٨٤)؛ راوندي: راحة الصدور، لاپەڕە (٢١٩)؛ حوسەینی: زبدة التواريخ، لاپەڕە (١٥٧)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨١).

٢٨- ئیبنوعەمەرانی: الانباء، لاپەڕە (٢٠٨)؛ ئیبنولقەلانسی، ذيل تاريخ دمشق، لاپەڕە (١٢٥)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕەکانی (١٣٩-١٤٠)؛ سیوەتی: تاريخ الخلفاء، ساغکردنەوەی، محەمەد محێ دین عەبدولحەمید، (بەبێ ساڵی چاپ)، لاپەڕە (٤٢٦).

٢٩- ئیبنوعەمەرانی: الانباء، لاپەڕە (٢٠٦)؛ئیبنوکازرونی:مختصر التاريخ، هەردوو لاپەڕەکانی (٢١٥- ٢١٧)؛ سەفەدی: فوات الوفيات، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٨٨)؛ زەرکەلی: الاعلام، (بەیروت، ١٩٧٩ز) بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٥٨).

٣٠ راوندي: راحة الصدور: لاپەڕە (٢٢٣)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧)؛ بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (٨٥).

٣١- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٠٩)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧)؛ تاريخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٩)؛ زەهەبی، دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١).

٣٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٧)

٣٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو؛ زەهەبی: دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١).

٣٤- بەنداری: تاريخ دولة آل سلجوق، لاپەڕە (١١٦).

٣٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨١).

٣٦- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٠٩)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨١)؛ حەسەنێن: سلاجقة ايران والعراق، لاپەڕە (٩١).

٣٧- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٩)؛ نەقشەبەندی: الكرد في الدينور وشهرزور،

لاپەڕە (٢٤٥-٢٤٦).

٣٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٩)؛ نەقشەبەندی: الکرد في الدینور وشهرزور، لاپەڕە (٢٤٦).

٣٩- حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٦٣)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٨٩)؛ حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، لاپەڕە (٩٢).

٤٠ ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٧)؛ ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١١٢)؛ زەهەبی: دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢).

٤١- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٩)؛ ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١١٢)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩٤)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٣).

٤٢- المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١١٢).

٤٣- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩٤).

٤٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩٥).

٤٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٩٤).

٤٦- (ئەسپیذرۆز) بە واتای ڕووباری سپی دێت، لە دووری چەند فەرسەخێکە لە (هەمەدان)... یاقوت: معجم البلدان، بەشی یەکەم، لاپەڕە (١٧٢).

٤٧- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٩٥)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٣).

٤٨- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٧)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١٢)؛ زەهەبی: دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٢).

٤٩- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٠٤)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٨٤- ٤٨٥).

٥٠- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٩)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٦٠).

٥١- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٠٦)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٥).



٥٢- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٣٠٦-٣٠٧).

٥٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٣٠٧)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٧).

٥٤- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٢٤)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٠٩)؛ زەهەبی: العبر في خبر من غبر، بەشی سێیەم، لاپەڕەکانی (٣٣٧- ٣٣٨).

٥٥- ڕوزراور: دەڤەرێکە لە نزیک نەهاوەند سەر بە ناوچەی چیاکانە... معجم البلدان، بەشی سێیەم، لاپەڕە (٧٨).

٥٦- حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٦٤)؛ ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٣١)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٦)؛ (ئیبنوخەلدون) دەڵێت: (سەرمای سەخت ڕێی لێگرتن شەڕ بکەن).

٥٧- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٣١)؛ زەهەبی: دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٤).

٥٨- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٣١)؛ سەبتی ئیبنولجەوزی: مرآة الزمان، بەشی هەشتەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٨).

٥٩- ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٣١)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٦).

٦٠ - ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٣١).

٦١- ئیبنولجەوزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٣١)؛ زەهەبی: دول الاسلام، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٤).

٦٢- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٣٩)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١٥)؛ ئیبنوکەثیر: البدایة والنهایة، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (١٦٢)؛ تاریخ ابن خلدون: بەرگی سێیەم، لاپەڕەکانی (٤٨٦-٤٨٧).

٦٣- بڕوانە ئیبنولئەثیر: الکامل، بەشی دەیەم، لاپەڕەکانی (٣٤١) و (٣٤٣)، (ڕووداوەکانی ساڵی ٤٩٥ک)؛ بەشی دەیەم لاپەڕەکانی (٣٥٩) و (٣٦١) (ڕووداوەکانی ٤٩٦ک)یش.

٦٤- ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١٥)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٣)؛ عیمادەدین خەلیل: الامارات الارتقیة في الجزیرة والشام، (بەیروت، ١٩٨٠ز)، لاپەڕە (٨٨).

٦٥- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٤٢)؛ خەلیل: الامارات الارتقیة، لاپەڕە (٨٨).

٦٦- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٤٢).

٦٧- لە بارەی ڕۆڵی (سەقمانی کوڕی ئەرتەق) لە دامەزراندنی فەرمانڕەوایێتی ئەرتەقی لە (دیاربەکر)، بڕوانە لاپەڕەکانی (٢٦٣-٢٦٤)ی دەقە عەرەبییەکە.

٦٨- ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١٥)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٤)؛ تاریخ ابن خلدون، بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٤٨٨)؛ خەلیل: الامارات الارتقیة، لاپەڕەکانی (٨٨-٨٩).

٦٩- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (١٣٣- ١٣٤)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٦١)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢١٦)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٤)؛ (حوسەینی) دەڵێت: شەڕی نێوان هەردوو برا لە دەروازەی (دوین) بوو، بە شکانی سوڵتان(محەمەد) بە کۆتا هات، کە بۆ (ئانی) کشایەوە؛ زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٦٤).

٧٠- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (١٣٣-١٣٤)؛ ئیبنولوردی: تتمه المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (١٤).

٧١- میر (منوجهەر)(٤٨٤- ٥٠٤ك/ ١٠٩١- ١١١٠ز).

٧٢- ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٣٦٩)؛ حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، لاپەڕە (٩٣).

٧٣- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (١٣٨)؛ سەبتی ئیبنولجۆزی: مرآة الزمان، بەشی هەشتەم، پاری یەکەم، لاپەڕە (٨)؛ حەسەنێن: سلاجقة ایران والعراق، لاپەڕەکانی (٩٣-٩٤).

٧٤- حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٦٥)؛ ئیبنوتەغری بەردی: النجوم الزاهرة، بەشی پێنجەم، لاپەڕە (١٨٧)؛ ئیبراهیم بەیضون و سوهەیل زەکار: تاریخ العرب السیاسي، لاپەڕە (٣٠٠).

٧٥- بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی (تاجولدەولە) بگەڕێوە بۆ ئیبنوخەلەکان، وفیات الاعیان، بەرگی یەکەم، هەردوو لاپەڕەکانی (٢٩٥) و (٢٩٧).

٧٦- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی هەشتەم، لاپەڕە (٣١٣)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕەکانی (١٤٨-١٤٩).

٧٧- (باغی سیان کوڕی محەمەد کوڕی ئەلبی تورکمانی) لە مەمالیکەکانی سوڵتان (مەلەکشاه)ە، لە



ساڵی(٤٧٩ك/ ١٠٨٦ز) سوڵتانی ناوبراو شاری (ئەنطاکیە)ی بۆ بڕیەوە... نەیسابوری: سلجوقنامە، لاپەڕە (٣١)؛ دیوەجی: تاریخ الموصل، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٥٣).

٧٨- میر (بوزان) یان(بزان) ناوی خۆی(موجاهیدەدین کوڕی ئەبو لفەوارس بزان کوڕی مامین کوڕی عەلی)یە، لە کوردانی جەلالییە، لە ساڵی(٤٧٩ك/ ١٠٨٦ز) سوڵتان(مەلەکشاه) شاری (ڕەما)ی بۆ بڕیەوە؛ ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (٣٥٩)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٤٩)؛ جەمیلی: دولة الاتابكة بعد عمادالدين زنكي، (بەیروت ١٩٧٠ز)، لاپەڕە (٣٣).

٧٩- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢٢)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٧٦-٧٧)؛ حوسەینی: زبدة التواریخ، لاپەڕە (١٤٩)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕەکانی (٨٢-٨٣).

٨٠- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢٢)؛ ئیبنولجۆزی، المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕەکانی (٧٦-٧٧)؛ بەنداری: تاریخ دولة آل سلجوق، لاپەڕەکانی (٨٢-٨٣).

٨١- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢٢)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕەکانی (٢٠٣-٢٠٤)؛ ئیبنولوەردی: تتمة المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٦).

٨٢- ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٧٧)؛ ئیبنولئەثیر: الكامل، بەشی دەیەم، لاپەڕە (٢٢٠) ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (١٤٤).

٨٣- تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (١٤٤).

٨٤- ئیبنولقەلانسی: ذیل تاریخ دمشق، لاپەڕە (١٢٣)؛ ئیبنولجۆزی: المنتظم، بەشی نۆیەم، لاپەڕە (٧٧)؛ ئیبنوکەثیر: البداية والنهاية، بەشی دوانزەهەم، لاپەڕە (١٤٤).

٨٥- فارقی: تاریخ آمد ومیافارقین، لاپەڕە (٢٣٦).

٨٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨٧-هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (١٢٤).

٨٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٣٩).

٩٠- ئیبنولعیبری: تاریخ الزمان، لاپەڕە (١٢١)؛ ئیبنوواسڵ: مفرج الكروب، بەشی یەکەم، لاپەڕە (٢٥)؛ ئەبولفیداء: المختصر، بەشی دووەم، لاپەڕە (٢٠٤).

